# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

بەرگی چوارەم

کەلیموڵڵا تەوەحودی

وەرگێڕ: عەدنان بەرزنجی

سلێمانی ٢٠٠٩

# ناوەرۆک

## پێشەکی وەرگێڕ:

هەمیسان کۆچ، دەمکۆچێنێ و بەرەو باکووری خوراسان دەمبات تا بەشێکی‌تر لە بەڵگەکانی کوردانی ئەو دەڤەرە بێنمەوە سەر زمانی کوردی. واتا ئەو زمانە هەژارەی کە بە پێچەوانەی بەربڵاوی و پاراوییەوە کەوتووەتە بەر شاڵاوی نەهامەتی زلهێزەکانەوە و لە مێژووی سەرانسەر ماتەمینی کورددا وەک تاپۆیێکی ڕەش دیارە، هەر چەند زۆربەی کەسان لە ڕابردوودا هەوڵیان بەقەوەت بووە بۆ ڕزگاری زبانی کوردی، وەک: ئەحمەدی خانی، نالی، حاجی قادری کۆیی، هەژار و... بەڵام نەبوونی دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام ئازاری زۆری داوین و ئێستا لە سایەی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی باشوورەوە زبانەکەشمان لە ساڵی ٢٠٠٨ کە بە ساڵی زمانی زگماکی لە دنیادا ناسرا، کۆدی پێی درا و هەموان وەک زبانێکی زیندوو دەیناسن و هەمووشمان گەشاینەوە.

خوێنەرانی ئازیز! پاش دەرچوونی بەرگی ١ و ٢ی «کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان» بە چەند هۆوە بەرگەکانی‌تری کەوتە درەنگ و قەزا، کە بڕێکیان بریتی بوون لە:

١- کێشەی خۆم و سەرقاڵیم بە کارانێکی‌تر و کتێبانێکی‌ترەوە کە دەرفەتێکی بۆ نەما بوو و ئەم کتێبەش زۆر بە حەجم بوو.

٢- وەرگێڕانی ئەم کتێبەم (بەرگی ٣ و ٤) وەکو ڕاهێنانێ دانا بۆ قوتابیەکانم لە بەشی کوردی زانستگای کوردستان و فێرگەی ڕاژە کە هەموان چاک دەزانن کاری قوتابی زۆر شپرزە و بەو بۆنەوە دووبارە لە سەرەتاوە بۆ دووەمین جار وەرمگێڕاوە کە هیوادارم ئێوەی خاون ڕا و ئەندێشە لێم ببوورن.

ئەم دوو بەرگە داگری زۆربەیەک بەڵگەی‌تری کوردەکانی خوراسانن لە سەردەمی قاجاڕ و پالەویدا و هەروەها باسی سەفەرنامەی ئەو کەسانەی دەکات کە هاتوونەتە کوردستانی خوراسان و بیروڕای خۆیانیان سەبارەت بەو خەڵک و ئاو و

خاکە دەربڕیوە و هاوکات باسی بوومەلەرزەی قووچان و شەڕی کورد و تورکمان و ئاماژە بە پاڵەوانێتی تاقمێک لە کوردان وەک ئەڵلاوێردیخان، جەجووخان و... و ئاوڕدانەوە لە نامەی هەڤالانی نووسەر پاش چاپبوونی بەرگە پێشووکان کە تاقمێکیان بۆ خۆی بەڵگەیەگی گەورەیە لە ناساندنی فەرهەنگ و مێژووی ئەو دەڤەرە.

هیوادارم بتوانم لە کەمترین کاتدا بەرگەکانیتری ئەم کتێبە وەربگێڕمەوە سەر زبانی کوردی.

لە ئاکامدا لە هەمووی ئەو دۆستانەی یارمەتیان داوم بۆ چاپی ئەم کتێبە سپاس دەکەم کە بریتین لە: ڕەزا ئەسەدی، بێهزاد بەنەفشی، لەتیفە ئەحمەدی، ڕۆژیار مستەفاپوور، ئەدیبە مەهدەوی، سوەیلا ڕۆستەمی، سەباح سەلیمی، عێسمەت خەڵوەتی، خالید گەوێلی، چنوور ئینتزاری، ئەفراسیاب ئیبراهیمی، بێهناز بەنەفشی، ئیقباڵ فەتحی، مەعرووف موحەممەدی، عەلی ڕەسوولی، شەریفە سەلیمی. و هەروەها کاک ئاری عەبدی کە ئەرکی ڕازاندنەوەی ئەم کتێبەی لە ئەستۆ بوو.

هیوام سەرکەوتنی هەر مرۆڤێکی تێکۆشەرە

بە سپاسەوە

عەدنان بەرزنجی - پاییزی ٢٠٠٨ سنە

Adnansanandaj@yahoo.com

# پێشەکی «نووسەر»

**بە نام خداوند جان آفرین**
**حکیم سخن بر زبان آفرین**

بە یارمەتی خوای دلۆڤان و هاریکاری هەڤالانێک کە تامەزرۆی سەروەری ئێرانن و زۆر وێنە و بەڵگە و نووسراوەیان بۆ ناردم. نووسەران و بلاڤۆگەکان هانیان دام تا بەرگی چوارەمی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بێتە بازاڕ. سەبارەت بە بەڵگە و وێنە و... باس ناکەم چون سوور دەزانم خەڵکی ئەمەگناسی کورد خۆیان پێداویستەکانم بۆ دەنێرن. خوا ئەزانێ بۆ وەدەست هێنانی بەڵگەکان چەندە شار بە شار و دێ بە دێ گەڕاوم، ئاخۆ چەندین بەڵگەش ون بووبێ.

بەڵام سەد مخابن بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی بە پێچەوانەی وتەی خۆیان هیچ یارمەتییێکم نادەن بۆ نووسین و بلاو کردنەوە، هەر ڕۆژە نرخی کاغەز و چاپ و ڕازاندنەوە دەڕواتە سەرەوە و نرخی کتێبەکانیش هەر بەرەو ژوور دەڕوا و خوێنەری منیش لە هەژاران و نەدارانن و توانایی کڕینی کتێبیان بۆ نامێنێتەوە، دەوڵەمەندانیش هاتوو کتێبێکیان کڕی، تەنیا لە سەر تاقەکان یان لە کتێبخانەکانیان دایدەنێن و نایخوێننەوە و دەبێ زۆربەی کات چاوەڕێی پارەی کتێبەکانم بمێنم. ئێوە ئێستا پێم دەڵێن کاتێ ئەمە دەزانی بۆچی کاری وا دەکەی؟ شاریار وتەنی:

آمدي جانم به قوربانت ولي حالا چرا بي‌وفا،
حالا كه من افتاده‌ام از پا چرا؟

باوکی مەجنوون پیاوێکی ژیر بوو، دەستی کوڕەکەی گرت و بردی بۆ ماڵی خودا تاکوو لەیلی لە بیر بباتەوە و مەجنوون هاتە گوفتارا و گوتی:

چو بشنيد اين سخن مجنون فغان كرد بە زاري
سر به سوي آسمان كرد
خدايا توبه كردم توبه اولي زهر
چيزي به غير از عشق ليلي

وایە ئەگەر دووری لە دێوانەیی، عەقڵ دەهێنیٚ، مەجنوون لە عەشق لەیلا و جەعفەر قولی لە عەشق ملواری تۆبەیان دەکرد.

بەم بۆنەوە لە یاران تکاکارم داوا لە من نەکەن کە دێوانە نەبم. هەروەها تکاشم لە بەرپرسانی دایرەی گشتی ئیرشاد ئەوەیە بە نەرمی لەگەڵمان تا بکەن و لێمان تووڕە نەبن. ئێمە جگە لە بەدبەختی و هەژاری چی ترمان نەبینیوە. ئێمە بە دوای پارەوە نین، بەڵام حەز دەکەین کتێبەکانمان زوو بفرۆشرێت تا بەرهەمی تازەمان بێتە بازاڕەوە. لە ئاکامدا بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم لە بەڕێز جەوادی مەنسووری و سەفایی لە لیتووگرافی ڕەزای مەشهەد، جەلال واقفی لە چاپخانە (مودیری چاپخانە) و براکانی و هەروەها خێزانەکەی خۆم و منداڵەکانم کە ئازاری زۆریان کێشاوە، ئەوپەڕی پێزانین و سپاسی خۆمیان ئاراستە بکەم؟

مەشهەد ٢٢ی جۆزەردانی ١٣٧٢ هەتاوی

کەلیمولڵا تەوەحودی (کانیماڵ)

ناونیشان: مەشهەد، کوی ئاووبەرق، شەقامی لالە، شەقامی ٣، پلاک ٤، تەوەحودی.

---

تێبینی: بەرگی پێنجەم کە باسی شۆڕشی موحەممەد تەقیخان پسیان و ئاکامی کاری ئەو بە دەستی کوردانی خوراسان هاوڕێ وێنە و بەڵگەی باوەڕپێکراوی بلاو نەکراوە لە بەر دەست دایە و بەم زوانە دێتە بازاڕ.

**کۆبوونەوەی دووەمی دادگا، سێشەمە ١٣ی جیمادی ئەوەڵ**

وەزیر: قووچانیەکان ئامادە بکەن.

عەلی بەیگ و یووسف بەیگ هاتنە ناوەوەو دانیشتن.

وەزیر: بڕیار وا بوو ئاسەفوددەولەش زانیارییەکانی خۆی بخاتە ڕوو کە ئەمەخۆی بۆ ڕزگاربوونی ئەو پێویستە.

ئاسەف: شتێکی وام نەنووسیوە و ناشزانم، چون بەرپرس لە تارانەوە ڕۆیشتووە.

میرزا مەحمووی کتێب فرۆش: وادیارە حەقیقەت شتێکی دیکەیە.

وەزیر: ئێمە پێنج شەممە گوتمان ئاسەفوددەولە و سالار لەسەرەتای زانیاریانەوە بەهۆی هەرکارێکەوەکە کردوویانە چ بۆ وەزارەتی ناوەخۆ وچ بۆ وەزارەتی دەرەوە و چ بۆ حکوومەتی قووچان و بجنوورد و... دەبێ بەڵگەیان پێ ببێ.

ئاسەف: هەمووی لێکۆڵینەوەکان لە کابینەدا نووسراوە، بە پێچەوانەی ئەوەی کەبەرپرس ڕاستەوخۆ لە تارانەوەهاتووە، ئیتر نازانم چ کارێکیان بەسەری منەوەیە.

وەزیر: وەزارەتی داد ئەبێ ئەم باسانەی تۆ بژنەوێت و بیخوێنێتەوە.

پرسیاری وەزیری داد: لەبەڕێزی ئەمیرتان داواکارین کەسەبارەت بە ئەسیرەکانی قووچان هەرچێ دەزانن بۆمانی ڕوون بکەنەوە وتکایە لە ناو ئەم بەرگەدا هەمووی بنووسن.

ئەمیر: هەروەک بە شەفایی لە خزمەت حاجی غولام حوسەینی ئەستەر ئاواییدا پێتانم ڕاگەیاند، ئەسیرەکانی قووچان بە دەستی سالار موفەخخەمەوە گیریان کردووە.

هەمیسان بزمار و کەوشیان لە لایەن سالارەوە برد بۆ دەوەچییەکان و چەند ڕۆژە داوای دەکەن تا ئیزنیان پێی بدرێ خۆیان بگەیەننە قووچان، تورکمانەکان بەپێی یاسای خۆیان ئیزن نادەن سوارکارێک لە ناویانەوە بڕوات، عەشایرەکانی ژوورو دەوەچییەکان لە ئیلخانی ئیزنیان وەرگرتووە، دەوەچییەکان دووسەدسوارن و تەنانەت لە گوندەکانی نزیکی بجنووردیشدا نەهار دەخۆن تاڕادەیەک ٧٠٠ سوارە

پێکەوە دەچن بۆ «ئەلئەمان»[1]، پاش گەڕانەوەیان هەرکامەیان بە ئەندازەی خۆی ئامێرو ماڵ و کەرستەی دزدی دەباتەوە و پاشان ئەسیرەکان بەیەکتر دەفرۆشنەوە و ئێستا ٢٢ کەسیان لە چەمپووری دەوەچی دایە، ئەسیرەکانیش هەرکامەیان چەندمنداڵیان لە تورکمانەکان هەیە و ئەوان بەم ڕاحەتیە لە دەستیان نادەن و بانیی ئەم کارەش سالار موفەخخەمە و ئیلخانیش یاریدەدەری دەکات ئەگەر ئیلخانی ڕەزای لەسەر ئەم کارە نەبێ دەوەچی ناتوانێ کاری وابکات.

یەکێ لە قووچانیەکان: ئەی خودا، ئەی موسڵمانەکان، ئەمە چ بارودۆخێکە، کچەکەمیان بەدیلی بردووە و ئێستا وا لە دەستی موراد مورگانی خەرتووتییەوە[2]، کەرایەتی ئەم سالارە ناپیاوەیە کە دەڵێ من تاوانبار نیم

سالار: ئەم پیاوەی کە ئەو دەڵێ گۆگانیە.

لێرەدا ئەو نامەی کە ئەمیر ئەعزەم لە مەفاخێرئەلمولکی وەرگرتووە بەم شێوەیە:

لە بەرواری ٢٥ی سەفەری١٣٢٥، بڕیارنامەی دەوڵەتی دەرکراو بڕیار وابوو ئەمیر ئەعزەمی والی ئەستەرئاباد هەمووی دیلیەکان ئازاد بکات.

ئەمیرئەعزم: بڕیار بێ هەموویان ئازاد بکرێن و ئەگەر کاری وام نەکردخوێنم حەڵاڵ بێت ئامادەی کوشتنم. «عەلی موحەممەد کوڕی ئاقاخان کەتوول».

پاش خوێندنەوەی ئەم بڕیارنامەیە، بڕیارنامەکەی سالار[3] خوێندرایەوە کە بەشێکی بەم شێوەیە:

---

١- دزی

٢- خەرتووت لەگوندە تورکمەنیەکانی با کووری ڕۆژ ئاوای بجنۆردە، نووسەر ڕۆژی ١٣ی خاکەلێوەی ١٣٧٠ی کۆچی هەتاوی سەردانێکی ئەوێ کردووە و بەدڵ بۆ ئەوکارەساتە دڵتەزێنەگریاوە. وای ئەو شوێنە چ شوێنێکی ترسناک و سەیر بوو، پیاوی ئاسایی ناتوانێ لە ناو هەمووداروو دەوەری ئەوە سەر دەربهێنێ بەح بکات بەوەی کە ئەسیرێک لەوێوە بیەوێ دەرچێ.

٣- مەفاخێرئەلمولک بەهاوکاری ئەمیر سەعدۆلاخانی ئیلخانیەوە هاندەری تورکمانەکان بوون بڕوانە بۆ ڕاپۆرتی بالاوێز خانەئینگلیز لە ئێران، ڕەشت لە٢٨ی مارسی ١٩٠٨کتێبی موخابەراتی ئەستەرئاباد ب١ ل٢٧

«دوو قسەم هەیە، ١- خاکی بجنوورد وەک رووسیە، قەلای وای نیە و هەروەها چل فرسەخ لە خاکەکەشی دەور نەدراوەتەوە، بجنووردییەکان هەر ٦٠٠ سوارەن کە ٢٠٠سوارەیان هەمووکات سەربازن، بەهێرشی تورکمانەکانەوە ٢٠٠کـەس چـی پـێ دەکرێ. دەبێ دەولەت بەرگیری لەم کارەبکات.

دوومەن: دەسەلاتدارانی ئەستەرئاباد بۆ خەرجی سـەربازەکانیان هـەموو سالـێ پارەیێکی زۆر لە عەشایرەکان وەردەگرن لە ترسی ئـەوەی نـەوەک یـاغی بـن، دەی ئەم دەوەچیانە کە یاخی بوون بۆ هیچیان پێـی نـاگوترێ؟ و دەبـێ هەمیـسان هـەر ئێمە ببینە تاوانبار!؟

وەزیر: حاکمی ئەستەرئاباد بەرپرسی ئەم کارەیـە، لەبـەر ئـەوەی تورکمەنـەکان رەعیەتی ئەستەر ئاوان.

تەقیزادە: بە بڕوای من مەفاخیرولمولک تاوانبـارترە لەبـەر ئـەوەی ئیـل بـەبێ ئیزنی ئەو هیچ کارێ ناکەن.

وەزیر: چلۆن دەکرێ ٧٠٠سوار لە شوێنێکەوە بەڕێ کەون و حاکم ئاگـای لێـی نەبێ، وابیربکەینەوە کاتی چوونی ئەوان پێیانی نەزانیبێ، بـەلام کـاتی گەڕانـەوەیان پێیانی زانیوە.

دەبوایـە بـە هێـزی سـەربازییەوە بـەرنگاریان ببوایاتــەوە و لانی کـەم ١٠-٢٠ ئەسیری لێیان وەربگردبایاتەوە.

هــەموویان تاوانبــارن چ حــاکمی بجنــوورد و چ حــاکمی ئەســتەر ئابــاد و چ ئیلخانیش.

ولامی خالی /٥٢لەمەشهەدەوە بۆ بجنوورد. ولامی بەڕێز حاجی میرزا حەسن:

وشەی باشکانلوو دڕۆستە، بۆ تاران و بجنوورد، تەلگرافم ناردووە بەو ناوەڕۆکـەوە کە دەبێ ئەسیرەکان ئازاد بکرێن، هەروەها لە لایەن دەسەلاتیشەوە حوکمی لەسـەر دراوە و پێویستە ئێوە خۆتانیش بێن بۆ تاران کە گوتووتانە: بە پێچەوانـەی تورکمـان بوونیەوە لاینگری لە شادلوو کردووە و هەمووی وتەی قوچانیەکانم گەیاندەوەتاران.

«ئاسەفوددەولە».

لەم تەلگرافەدا ئاسەفوددەولە، فەرمانی داوە تا لـە دەسـتی سـالارەوە شـکایەت بکرێ.

ولامی ئاسەفوددەولـە بـۆ ڕایـەت و ژێردەسـت و فەرمانبـەردارەکانی قووچـان:
«ولامی خالی ژمارە/۳/لەمەشهەدەوە بۆ سەوزەوار: ولامی ڕایەتـەکانی باشـکانلوو بـە تەلگراف گەیشتە ئێـوە ئینتـزام دیـوان ڕامیاریـەکانی خـۆی ڕووی کـردەوە. سـالار ورەشیدنزام بوونە بەرپرسی ئازاد کردنی ئەسیرەکان.

لەو لاشەوە دەسەلاتداری ئەستەر ئاباد بڕیاری داوە تورکمانە دزەکان بگەیەنێتـە تاوانیان.

«ئەسەفوددەولە ۲۷ی ڕەبیعولئەوەلی ۱۳۲٤»

عەینوددەولە لەولامی خەلکی قووچاندا:

ولامی خال ٦/ لە تارانەوە بۆ بجنوورد

عەشـیرەتی باشـکانلۆیی گوتوویانـە ماوەیـەک لـە بجنـوورد بوەسـتن سـالار موفەخخەم و ڕەشیدنزام ئامادە بکەن تا دەی ئەم مانگە بەڕێ بکەون بە هۆی ئەوەی حکوومەتی گووگلان بەشێکە لە خاکی ئەستەرئاباد، کە چی ئـەوان وەسـتاونەتەوە و بیستوومە دەبێ ڕەشیدنزام مال و کەلوپەلی ئێوە لە سالار وەربگرێتـەوە و لـە کاتـێ خۆیدا ئەسیرەکانیش ئازادبکات.

«سولتان عەبدولمەجید ۲۲ی ڕەبیعولئەوەلی۱۳۲٤»

وەزیر بە سالار دەلێ: سەبارەت بەم تەلگرافانە چیت کردووە؟

سالار کاتی ئەنجام دانی کـار،تـەلگرافێکم بـۆ هـات لـەنێوانیـدا نووسـرابوو کـە حکوومەتی گۆگلانت لێـی وەرگیردرایـەوە و زوو حـوکم بـدە بـە دەسـتی سـەردار ئەفخەمی لاریجانیەوە. بەسەد سوارەوە لەڕێ ناچارییەوە، منیش خێرا ڕۆیشتم، میرزا سەعدوللاخان بەهێزێکەوە هات و بەرنگاری من بووە. و ۲٤کات ژمێر شـەڕمان کـرد و ۱۰ سەربازم لێی کوژرا و پاشان پاشەکشێم کرد و هاتمە دواوە.

عەدلوسسەلتەنە: بۆچی بە دەولەت ڕاتاننەگەیاند.

سالار: ڕامگەیاند، وڵامیان دایەوە بیانووەکەت قەبووڵ ناکرێ و دەڵێن دەبێ هەربڕۆی

وەزیر بە قووچانیەکان دەڵێ: ئێوە دەزانن؟ ڕاست ئەڵێ؟

عەلی بەیگ: بەڵێ کاتێ کە ڕەشید نزامی ئاسەفوددەولە لە بجنووردا بوو دوای داواکاری زۆری ئێمە، چەند سواری برد و پاش چەند ڕۆژ خەوتن و گەڕایەوە.

یووسف: من لە تارانەوە ڕەشید نزامم کردە بەرپرس، خۆی گەیاندە تورکمانەکان و لەویەوە ڕووی کردە بجنوورد و پاشان ٢٠دیلی هێناوەتەوە.

وەکیلوتوجار: ئاماژە بە خاڵێک بکەم، کاتی بردنی ئەسیرەکان سالار بەرپرسی گۆگلان بووە.

ئاسەفوددەولە: وەک لەسەرەتاوە گوتم ئەسیرەکان لە ماڵی سەعدوللا خان و عەلیموحەممەد خانی کەتوولی دان.

یووسف: نە، وان لە نێو چادرەکاندا

سەید مێهدی: من ئەڵێم ئەگەر مەفاخێرولمۆلک نەبوایە و ئەوی نەویستابا هەزار سواریش نەیدەتوانی کاری وابکات.

تلگرافەکانی وەزارەتی دەرەوە خوێندرانەوە کە سەبارەت بە دوو ئیش بوو: ١- دەبێ تورکمەنەکان پیاوەکانیان ڕاسپێری سالار بکەن.

٢- مالیەی ئەو خەلکە کەم بکرێتەوە.

سالار: تورکمەنەکان ناتوونەتە لای من.

یووسف: من خۆم بە چاوی خۆم دیویانم کە هاتوونەتە لای تۆ واتە ئەو کاتەی کە ڕەشیدنزام لەوێ بوو.

سالار: کاتێ کەڕەشیدنزام هات و لەبەر ئەوەی خۆی لەئیلی یەمووتە دووکەسی لەگەڵابوو، ڕەشید نزام و دوو یارەکەی لە ماڵی مندا بوون و هیچ پێوەندێیکی بە منەوە نیە.

پاشان وڵامی نامەکەی دایەوە.

وڵامی نامەکەی قووچانیەکان: سەبارەت بە باسی ئەسیرەکان کار کراوە و

دەبێ ئێوەماڵیەکانتان بدەن.

ئاسەفوددەولە: من ئەم ماڵیەیەم وەرنەگرتووە.

یووسف: بڵێ داروەدەستەی ئاسەفوددەولە وەریان گرتووە.

وەزیر: گوێ ڕاگرن باسێکی نوێم هەیە.

دەڵێ بەقووچانیەکان: ئێوە لە تاران لە کوێ دەژین؟

قووچانیەکان: لەکاروانسەرایەکی نزیکی تۆپخانە.

وەزیر: لەکەیەوە لە تارانن.

قووچانیەکان: ساڵی پار لەمانگی جۆزەردانەوە.

وەزیر: خەرجتان کێ دەیدا.

قووچانیەکان: تا کاتێ کەعەینوددەولە جێگری پاشا بوو ئەوخەرجی دەدا. پاش ئەو کەس خەرجی پێی نەداوین، ملکێمان بوو، فرۆشتمان و ماوەیەکیشە هیچمان نییە و بەسەختی ڕایدەوێرین.

وەزیر: دەبێ سالار هەر ڕۆژە یەک تمەنتان پێی بدات تاکارەکە تەواو دەبێتەوە و دەبێ ئەم مانگە سی تمەن پێشتر بدات.

موتیعوسسەڵتەنە: دەبی ئەمڕۆ ئەو پارە لە سالار بستێننەوە ئەسیرەکانیش بەم زوانە ئازار دەکرێن، ئاسەفوددەولەش دەبێ پارەتان پێی بدات، بەلام جارێ لە سالاری وەربگرن.

تەقیزادە: هەمووی دنیا ئەمڕۆ چاوی لەم حوکمەوەیە.

## کۆبوونەوەی سێهەمی دادگایی (شەممە ١٥ی جیمادیولئەوەڵ)

حازر بوانی کۆبوونەوە هەر ئەوانەی پێشوون، تەنیا سەردار موفەخخەم و ئەمیر حوسەین خانی حاکمی قووچان کە کوڕی ئاسەفوددەولەیە و هەروەها شوجاعوددەولەی قووچانی (عەبدورڕەزاخان کە لە نەبوونی دا لە قووچان ئەم نەهامەتیە ڕووی دا) و موعێززوددەولە، ئەمیرولمەلیک، مودیر دیوانی (ئەفشارقووچانی،) هوژبەر دیوان قووچانی (لە شوێنێکی تردا سەبارەت بە هاتنی مودیر دیوان و هوژەبر بۆ تاران باس دەکەین).

وەزیر: سەرەتا لەسەردار موفەخخەم دەپرسین: ئێوە لە کاتی ڕووداوەکەدا لەکۆی بوون.

سەردار ئەفخەم: گورگان، لەوێ حاکم بووم.

وەزیر: سەبارەت بە ئەسیرانی قووچانی چی دەزانی؟

ئەفخەم:... ئەم نەهامەتیانە وا لە ژێر سەر دووکەسدا کە خۆشیان دەسەڵاتدارن. لە کاتی فەرمانڕەوایی مندا، کە تورکمانەکان چەند کەسێکیان بەدیلی گرتبوو و ئەمن چووم لێیانم وەرگرتەوە و تاوانبارەکانیشم زەنجیر کرد.

وەزیر: ناوەرۆکی باس چیە، ئەم هەواڵەتان پێی گەیشت یان نە

ئەفخەم: بەڵێ پێم گەیشت، پاش گەڕانەوەی ئەکرەمولمەلیک لەو دزییە، مەحموود ئاغای بەرێ کرد بۆلای من کە ئەو ساڵە لە مورادتەپەدا نوورموحەممەد قوربانلوو خۆی گەیاندە دووجەردەی بە ناو بانگ واتا شێخی وساتلووق و هاوڕێ لەگەڵ شادلوودا چوون و قووچانیان کاول کردو ئەسیری زۆریان گرت.

وەزیر: ئێوە بۆ لێکۆڵینەوە چووبوون، بەرهەمی کارەکەتان چی بوو.

ئەفخەم: کاتێ لەم کارەدا خۆمم تێکەڵ کرد تاقمێک ئەم کارەمیان بە دوژمنایەتی دەزانی و تاقمێکیتر دەیانگوت هاو دەستی سالار موفەخخەمی بجنووردییە.

وەزیر: سوارەکان لە کام ڕێوە هاتنە قووچانەوە؟

ئەفخەم: لەسەمەرقانەوە (سمڵغان لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوایی بجنووردەوەیە).

وەزیر: لەوێوە تا قووچان نێوانی چەندە؟

ئەفخەم: سێ مەنزڵەتا سەمەرقان و لەوێشەوە تا قووچان سێ مەنزڵ.

وەزیر: نان و ئاو و ناڵ و مێخ (بۆ ئەسپەکان) کێ دەیدا.

ئەفخەم[٤]: تاقمێک دەیانگوت سالار و بڕێکی‌تر دەیانگوت دوژمن.

وەزیر: چویتە شوێنی ئەسیرەکان؟

ئەفخەم: نا،

وەزیر: لە ڕووی لێکولینەوەی ئێوەوە، لە بجنووردەوە سوارەکان ڕۆیشتوون؟

ئەفخەم: بەڵێ ژمارەشیان دووسەدکەس بوو

وەزیر: نان و پێخۆریان لەکوێوە هێناوە؟

ئەفخەم: نازانم.

وەزیر: بەزۆر پێخۆر و کەل و پەلیان پێی داون یان خۆیان ویستوویانە؟

ئەفخەم: زۆرم نەبیستووە.

وەزیر: مەڕوماڵیشیان بردووە؟

ئەفخەم: نا کەل و پەلیان بردووە.

وەزیر: ئەوانەی کە دەیانگوت سالار تاوانبارە زۆرتر بوون یان ئەوانەی کە دەیانگوت سالار تاوانبارنیە.

ئەفخەم: ئەوانەی کە سالاریان بە تاوانباردەزانی.

وەزیر ڕوولە ئەمیر ئەعزەم دەکات: زانیارییەکانتان لەم بارەیەوە چیە؟ تورکمانەکان خۆیان چوون یان شادلووەکان بردیانیان؟

ئەمیر ئەعزەم: دەوەچییەکانی مەفاخێرولمەلێک چوون و لە خاکی بجنوورد پەڕینەوە.

---

٤- سەردار ئەفخەم لە لایەنگرانی موحەممەدعەلیشا بوو و کاتێ کە موحەممەد عەلیشا مەجلیسی بەر تۆپ دا، ناو براو حاکمی گیلان بوو. (بیرەوەرییەکانی سیاسی فەرۆخ، ل ٥٤)

وەزیر: شادلۆکانیش بوون یانە؟

ئەمیر ئەعزەم: لە خاکی ئەستەرئاباددا نەبوون بەڵام لە نیوەی ڕێ دا پێیان گەیشتوون.

وەزیر: کاتێ کە تۆ بووی بە بەرپرس چیت کرد؟

ئەمیر ئەعزەم: من کەوتمە بیری ئەوەی تا بچمە نێوانی تورکمانەکانەوە، حاجی میراخوڕ، ئادەم سالار تەلگەرافی بۆی کرد کە ناوبراو دەیەوێ بڕواتە ڕێزی تورکمانەکانەوە، سالار وڵامی دایەوە، بە هەر جۆرێک دەبێ بیهێننە بجنووردەوە، بەڵام من حەزم نەکرد، چوومە ئەوێ حاجی موحەممەد دەوەچی بۆ ئەوەی تێ بگات من چیم دەوێ هاتە پێشەوە و زانی من کارم چیە و بەرپرسەکانی کۆ کردەوە دەورم و هەموویان گوتیان سالار ناردوویە و ئێمەی دەعوەت کردووە و گوتیان لەبەر ئەوەی ئاسەفوددەولە، شوجاعوددەولەی بێدەسەڵات کردووە، نەیاندەویست تەلافی بکەنەوە.

ناوی ئەم بەرپرسانە: مووساخان، شیرخان، باباخان، قولدوڕخان کە گوتیان بە ڕێنوێنی سالارەوە ئێمە چوین و دزیمان کرد، لەوێوە چوینە کوێ؟ عەشیرەتەکان لە ماڵی قلیچ کە خۆی مامۆستای عەشیرەتەکەیە. دووشەو ئیزنی نەدا وەرگەڕینەوە و ئەویش ڕێنوینی سالاری پەسند کرد و گوتی سوارەکە کەوتە ڕێ، چووە نزیکی مانە (گوندێکی بجنوورده) و نزیکی بانگی بەیانی هێرشیان کردە سەر عەشیرەتی باشقانلوو.

وەزیر: کویخا حەسەنیش لەوێ بوو؟

یووسف: بەڵێ.

هەمیسان ڕەشید نزام دەستی کرد بەقسە کردن:

من لە ماڵی ئەو مەلایە مامەوە (ماڵی قلیچ ئیشان[٥]) ساتەلەق شیخی هات و

---

٥- تورکمانەکان بە مەلاکانیان دەڵێن «ئیشان». گوندی قلیچئیشان لە باکووری کەلالەوەیە لە نێوان شیوی قووڵ لە سەر ڕێی مراوەتەپەوە. ئەمیرجان موحەممەدخان قاجاڕ لە تەنیشتی قلیچئیشاندا ئوردووی دا و تاقمێ ماڵی گر دا.

وتی ئێمە ئامادەین، ئەگەر سالار ١٥ هەزار تمەنی کە لێمان وەرگرتووە بیداتەوە تا ئەسیرەکان ببەین و لێرە ڕەدیان بکەین، دوو ئەسیریشیان بۆ من هێنا، من گوتم بردنی دوو ئەسیر کارێکی باش نیە، ئەبێ ئەسیرەکان بگەڕێنەوە، کوڕی حاجی موحەممەد کە هاوڕێم بوو منی هێنا نزدیکی چادرەکەی حاجی موحەممەد و لەوێوە خۆم چوومە بجنوورد.

ڕەشید نزام: لەگەڵ سالار دانیشتن، سەرەتا من گلەییم کرد کە بۆچی چویتە ناو تورکمانەکان، گوتم سەرەڕای ئەمانە، ئەوەی کە دەبێ بیزانم زانیوومە، هەر چەندە هەوڵی دا بە پێچەوانەی زانیارییەکانم کاربکەم و نەمکرد، ڕووداوەکەم بۆ پاشا و سەدرئەعزەم تەلگەراف کرد، سالار گوتی نیوەی من دەیدەم و نیوەشی قووچانیەکان بیدەن، لەتارانەوە وەڵام هاتەوە کەپێوەندی بە خەڵکی قووچانەوە نیە، لە سالاری وەربگرن، بەبێ هیچ باسێ دەبێ یەک ساعەتە لێ وەربگرنەوە.

وەزیر ڕووی کردە سالارموفەخخەم: ڕەخنەیەکت لەم باسانە چیە؟

سالار: بۆعەینوددەولە تەلگەرافێ بنێرن و دەزانن کە ئەم باسانە کە کرا لەگەڵ وتەکانی ئەودا جیاوازی دەبێ.

ڕەشید نزام: من بە زۆر سالارم حازر کرد تا پارەیەک بدا بە شازادە عەینوددەولە (سەرۆک وەزیری ئەوکاتە) بەڵام شازادە ئەم داخوازییەی ڕەدکردەوە وگوتی دەبێ ئەسیرەکان بدرێنەوە.

«سێ شەممە کۆ بوونەوەی چوارەم ٢٠ی جیمادیولئەوەڵ»

وەزیر ڕووی کرد لە هوژەبردیوان: ئێوە ناوتان چیە؟

هوژەبر: حوسەین، نازناوی هوژەبر دیوان.

وەزیر: خەڵکی کوێی؟

هوژەبر: قووچانیم.

وەزیر: سەبارەت بە ئەسیرەکانی باشاقانلوو چ زانیارێکت هەیە.

هوژەبر: من هاوڕێ مودیری دیوان بۆ وەرگرتنی ماڵیە چوومە شیروان لەوێوە تا

ئووبەی باشکانلوو[٦] ۱۲ فرسەخ ڕێگایە. پاش ۳ ڕۆژ دوای دزییەکە، چەند کەس، کوژراوەیەکی خۆیانیان هێنا و لەیەکێ لە گوندەکانی خۆیان لە ئیمام زاد دا کفن و دفنیان کرد، لەبەر ئەوەی نوێنەرەکەیان لە لای ئێمەوە بوو، کەسێک هات تا بە ئەو بڵێ گوتم پرسیاری لێ بکەن کە ئایا شۆڕشگێڕەکان لە تورکمانەکان بوون یان نە؟ پیاوانی ئێمە چووبوون و سێ کەس لە سوارەکان کوژرا بوون و سەری یەکیانیان بڕیبوو و ڕەوانەی قووچانیان کردبوو، ئیزنیان بەدوو کەسیان نەدابوو. لە کەریمخانیان پرسیبوو، گوتبووی وادیارە چل کەس شادلوو هاوڕێ کوێخا حەسەن لە گەڵیاندا بوون، شەوانە هێرشیان هێناوە و دزیەکەیان کردووە و دەرباز بوون. دوو ژن خۆیانیان نەجات دابوو و لە دەستی تورکمانەکان دەرچووبوون. مەلایەک هاوڕێ فەرەجوڵڵا ئەو دووژنەیان کەلەبچەکردو دایانەوە دەستی تورکمانەکانەوە و ئەمەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە نێوانی زافەرانلوو و شادلووکاندا هەموو کاتێ دووژمنایەتی هەبووە.

ئەمە لێکۆلینەوەگەلێکە کە کەریم خان گوتوویە[٧].

وەکیلوتوججار: کوێخاحەسەن دەناسن؟

هوژەبر: بەلێ سەمەلقانیە.

وەکیل: سملقان لەکوێوەیە.

هوژەبر: لەئاشخانەدایە.

وەزیر: کوێخاحەسەن دوژمنتانە.

هوژەبر: بە شێوەی عەشیرەیی دوژمنی یەکن. ئەوەش لەسەردەمی ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوودەولەوە هەربەردەوامە.

ئاغای سەیید مەهدی ڕووی کرد لە کوێخاعەلی: ئێوەش لەو دووکەسەی کە

---

٦- «ئووبە»یانێ گوند، ئاوایی و بەشوێنێک دەگوترێ کە چادری عەشایری کوردی تێیدا هەلدرابێ کە تورکمانەکان پێی دەڵێن «یوورت».

٧- کەریم خان ڕەشوانلوو حاکمی قۆشنی لێ بوو کە یەکەمین کوردێکە کەوتە شوێنی ئەم زلمە تورکمانەکان دەسگیر بکات.

دەرباز بوون و لە لایەن ئەو مەلاوە دووبارەگیراون خەبەرتان هەیە؟

کوێخاعەلی: بەڵێ، ئەو دووژنە لە لاڕێکەوە خۆیانیان دزیەوە و مەلاو فەرەجولـلا گوتوویانــە لــە ســالار دەترســین و دەبــێ بیاندەینــەوە، بــە پێچەوانــەی ئــەوان ئەسغەروەکیلی موورگان حەزی نەکردووە بەم کارەیان و بۆیـە ئیـزنی چوونیـان بـە ئەویش نەداوە.

میرزا مەحموود: هەمیسان لە ڕەشید نزام بپرسنەوە

وەزیر: دەتانەوێ چی لێ بپرسن؟

میرزا مەحموود: دووباس. سەرەتا دەبێ سالار ٥هەزار و پاشان ١٠ هـەزار ڕیـاڵ بدات، دووهەم_ سالار گوتی دووتورکمان هـاوڕێ ڕەشـیدنزام هاتنـە مالـی منـەوە، پرسیم بۆچی ڕەشید نزام هێناویانی؟

سالار موفەخخەم: تەلگرافی ڕەشیدنیزام کە ئەو ڕۆژەی عەرزتانم کرد هێناومە.
تەلگەرافەکە دەخوێندرێتەوە:

«لە بجنووردەوە بۆ تاران. لە لایەن وەزیـر بـەڕێز نـزام سـەرداری کوللـەوە[8] بـۆ خزمەتی والائەتابەک ئەعزەم، ئەوا من بۆ خۆم جارێکیـان لـە شـاهڕوودەوە چوومـە یەمووت، خودی یەمووتیەکان دەیانگوت ئێمە خۆمان ١٥٠ کـەس سـوار بـووین، لـە گووگڵانەوە بەرەو خاکی ڕووسیە و خاکی شـادیلوو کـە ناسـراوە بـە گولـی داغـی و بوتری، چووین لەقەڵاکانی قووشخانە پەڕینەوەوە و ناوچـەی زەعفـەرانلوومان بـەجێ هێشت و ناوچەکانی ئەمیرئاوا وخەنجەر قەڵا، قازی،شاتەپە، ئـەزخان، باکـل شـێخی سـەروو قـەڵای چـەنکار ڕەشماڵـەکانمان ڕووت کـردەوە و چـل و دوو ئەسـیرمان وەدەست هانی، جگە لە ئەسیرگرتن شتێکی ترمان نەدزیوە.

قوربان! من خۆم لەو شوێنەوە ڕۆیشتم و چاوم بە سالاریش کەوت هەرچێ پێی دەڵێ لە وڵامدا دەڵێ من نۆکـەری تـۆم و دەڵـێ هـەموو شـتێکم لـە خزمەتتدایـە، ئەمڕۆکە ٢١ی مانگە، خاوەن ئەسیرەکان لە ماڵی ئێمەدا کۆ بوونەتەوە و سـەرۆکیش تەلگەرافێکی ناردووە، کە تەنیا ٤٢کەس ئەسیر کراون و هاوکات دەبـێ ١٠٠٠تمـەن

---

٨- خەزوورەی سالار موفەخخەمی بجنۆردی بوو.

له شادیلوو و ۱۰۰۰تمەنیش لـه زافـەرانلووەکان وەربگـیردرێ و بـدرێ بـه خـاوەن ئەسیرەکان، تا بچن ئەسیرەکانیان بکڕنەوە ئەم باسەشـم بـه ئاسەفوددەولـەی والی خوراسـان ڕاگەیانـدووە و وەڵامێکـی نەداوەتـەوە و ئێـستا ئێـوە چـی دەفـەرمۆن تـا وابکەین...

ڕەشید نزام سێ شەممە ۲۰ی جیمادی ئەوەڵ.

وەزیر: ئەم تەلگرافە هەرچەندە له مەڕ واتاکانی ڕەشید نزامدا نیه، بـەڵام لەگـەڵ وتەکانی سالاریش دا ناخوێنێ و بە مانای ڕزگار بوونی سالارنیه.

کوێخا یووسف: باشه سالار دەڵێ ئێمەیان تاڵان نەکردووە، ئەو کاتە تـۆ لـەکوێ بووی، تابزانی دزراوە یان نە.

سالار: ڕەشید نزام له خۆیـانی بیـستووە و بـۆ مـن تەلگـەرافی لێـی داوە و بـه منیشی گوتووە و چون منیش نزیـک بـووم، خـۆم لەخەڵـکم بیـستووە کـه دزیـان نەکردووە.

وەزیر: ڕەشید نزام! بیروڕات سەبارەت بەم تەلگەرافە چیە؟

ڕەشید نزام: خوادەزانێ من هیچم بۆ گوتن نییە... من که خۆم تورکمانم بـەڵام تەلگرافی وام نەکردووە، بە ناو منەوە تەواوی دەکەن.

ئەمیر ئەعزەم: هەموان دەزانن که عەینوددەولـه کەسـێک نـەبووە بـه خۆیـەوە حوکم بدات.

پاشان چەند پرسیارێک ئاراستەی سالار موفەخخـەم دەکـرێ ئـەویش وەڵامیـان ناداتەوە و زیرەکانه له ژێـری دەردەچـێ. پاشـان دەبـیری تایبـەت چەنـد ڕاپـۆرت دەخوێنێتـەوە کـه هـەمووی تیـشک دەخاتـه سـەر ئـەوەی کـه سـالار بـۆ خـۆی تورکمانەکانی بۆ ڕووتەوە کردنی زافەرانلووەکان دەعوەت کردووە و یارمـەتیانی داوە و وتراوە کە تاسالار نەبرێتە تاران و جورم نەکرێ. ئەسیرەکان نادرێنەوە.

«تەواو بوونی کۆ بوونەوە»

## چوارشەممەی ٢١ی جیمادیولئەوەڵی، کۆبوونەوەی ٥

لە وزارەتی داددا کۆ بوونەوەکە بەڕێوە چوو، سەبارەت بە ئەسیرەکانی قووچان لێدوانەکان گەیشتە ئاکام و بەرهەمی لێکۆڵینەوەکان لەچەند کۆ بوونەوەدا ڕوودەکرا و سالار بە تاونباردەرچوو، حوکم دراوە کە بەند بکرێ و هەر ئەو ڕۆژە کەلەبچە کرا، ڕۆژی دوایی کە دوو ژن لە ئەسیرەکان ڕزگارکران و ڕوون بووەوە کە خەڵکی بجنووردن و تەلگەراف کرا بۆ بنەماڵەکانیان.

کوڕێکی منداڵیشی کە ئەمیری ئەمیران هێنابووی ودابووی بە دەستی کوێخا عەلی و کوێخا یووسفەوە تا بیدەنەوە دەستی خاونی خۆیەوە.

## نۆینەرانی پارلەمانی نەتەوەیی سەبارەت بە حوکمی دادی ئەسیرەکانی با چیانلوو ناڕەزاییان دەربڕی

پاش ماوەیێکی زۆر کە وەزارەتی ناوەخۆ و داد خۆیان بەدەستەوە نەدەدا تا ئاسەفوددەولە و سالار موفەخخەم شادلووی بجنوورد. دادگایی بکرێن پاشان بە هۆی هەوڵی زۆری میرزا حەسەنی شەبستەریەوە کە متمانەدارترین دڵخۆشی کوردان بوو، بۆ یەکەم جار لە ئێراندا دادگایی کردنی تاوانباران لە دادگا و جێ دادەکاندا کەوتە ڕێ، هەرچەندە لەبەر ئەوەی دەسەلاتداران پشتی یەکتریان خاڵی نەدەکرد و زۆرتر دادگاییێکی سووری بوو.

وەزیری دادیش دەبێ لێکۆڵینەوەکانی خۆی بخاتە بەردەستی پارلەمانتاران.

## وتووێژەکانی سێ شەممە ١٩ی جیمادیە سانی لە نێوان ١٣٢٥ نوێنەر لە پارلەماندا

لە لایەن وەزارەتی دادەوە لایەحەی (ئی)سەبارەب بە قووچان و سالار موفەخخەم و ئەو کارانەی کە لە لایەن وەزارەتی دادەوە کرابوو خوێندرایەوە.

وەزیری داد (شازادەفەرمانفەرما): لەم بارەوە چەند کۆبوونەوەمان لەگەڵ

خوێنەرەکاندا بووە و لێکۆڵینەوەی زۆریشمان کردووە و خودی وەزارەتی دادیش کاری زۆری لەسەر کردووە، بڕیارنامەیەک لەسەرتاوە لە لایەن جێ دادەوە درایە کومیسیۆنی تایبەت و لەوێشدا پەسند کراو کار بەم شێوە دەستی پێکرا و پاشان سالار کەلەبچەکرا و ناو براو، میرزا ئەحمەد خانی کرد بە وەکیلی خۆی تا لە مافی خوراوی بەرگری بکا. ئەم حوکمەم بردە ئەنجومەنی وەزیران و گوتم دەیخوێنمەوە و ئیزنی خوێندنەوەی درا و گوتیان دەبێ دووبارە ئاوڕی لەسەر بدرێتەوە و حوکمی چاوەدێری دادگای دەبێ لەسەر بێ.

دەنگی کومیسیۆنی داد لە لایەن سەید موحەممەدتەقیەوە خوێندرایەوە و ئەمەش دەقەکەی:

وەزیری داد: تا ئێستە نەماندیوە لەسەر حوکمێک ئەوەندە بە وردی کار کرابێ ئێستا هەمووی تاوانبارەکان ڕەخنەیان لەسەر حوکم هەیە و تاقمێکیان بەڵگەیان پێیە.

ئاغا میرزا مەحموود: سپاس بۆ خوا، تاوانی سالار بۆ هەموان ڕوونە، هەموان چاویان بەم دادگاییەوەیە و هەروەها لە ئورووپایشەوە چاوەڕوانی بڕیاری ئاکامن، دەکرێ کەسێ کە ٦٢ئەسیری دابێ بە دەستی تورکمانەکانەوە و هێشتا تاونبارنەبێ؟

ئاغا سەید حەسەنی تەقی زادە (کە خۆی وەک یەکێ لە چاوە دێرەکان چاوی بەهەمووشتێکەوەبوو): من گلەییێکی زۆرم لەم حوکمە هەیە هەمووومان بینیمان کە سالار تەنانەت خەڵکیشی کوشتووە و قووچانیەکانیشی داوەتە ئەسارەت؛ بەڵام عەینوددەولە بەتەلگراف و بە پارەی ٢٠هەزار تمەنیەوە دەیەوێ ڕزگاری بکات، هەربڕیارێک لەم ولاتەدا بەپارە دروست دەبێ دەی ئەگەر بە پارە دروستی بکەم، ئورووپاییەکان چیمان پێی دەڵێن.

بە بڕوای من کوشتنی سالار واجبە، لانی کەم ئەسیرەکانیش وەرگەڕێنینەوە؛ بەڵام پاشان گوتیان نابێ. هەمووی جەماوەر کەوتنە لەرزین و تا ئەوەی کە ٥ ساڵ زیندانیان بۆی بڕیەوە و لەهەموو کارەئیداریکیش دوورخرایەوە؛ بەلام پاش١٥ی جیمادی سانی ساڵی پار و دوابەدوای ڕاپەڕینی مەشرووتەوە تۆڵە کردنەوەش

گەیشتە ئاکام، لەم ولاتەدا (لەبەر ئەوەی موحەممەد عەلیشا خۆی لە زاڵمەگەورەکان بوو) هەمووی ڕۆژنامەکانی ئەم سا چاویان بەم بڕیارەوە بوو و هەموو بەو ڕایەن گەر تۆڵە کردنەوە نەبێ ولات بۆ وێرانە چاکە.

ئاغای سەید موحەممەد جەعفەر: ئەگەر کارێکی بێدعەتی کرد بێ کافرە ودەبێ بکوژرێ

ئاغا سەید حەسەنی تەقی زادە: وەزارەتی داد هەمووی کارەکانی خراپە و بەبێ لێکۆڵینەوە کار دەکات.

حسام ئیسلام: پاش ئەم بڕیارەتان ئەوەش بنووسن کە حەرمەلە عەلی ئەسغەری کوڕی ئیمام حوسێنی گوشت.

وەزیری داد: من شتێکم وەرگرتووە؟

ئاغا سەید حەسەن: نازانین.

وەزیری داد: مەبەستم هەیە(؟)

ئاغا سەید حەسەن: ئەوەش نازانین.

ئاغا سەید جافر: دەبێ شەرع حوکمی لەسەر بدات

وەزیر: ٦کەس لە مەلا و وەکێل و شەش کەس لە وەزارەتخانە هەڵبژێرن تا حوکم بدەن.

ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە: ئەم هەڵبژاردنەتان بۆچی وا کرد. ئەگەر ئێمەتان وەک چاوەدێر قەبووڵ کرد، ئەندامانی خۆتان چین.

ئاغا میرزا مەحموودی خانساری: هەر کاتێ لە خزمەتی مامۆستایاندا دووکەس شایەتیان دا حوکم کاری پێی دەکرێ دەی ئەوهەموو خەڵکەش شایەتیان داوە و پێویستی بەچی تر هەیە؟

ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە: ئەم بڕیارەی وەزارەتخانەی داد بەپێی کام یاسا دراوە؟

ئاغا سەید حەسەن: بەو ئەرکەی کە خرایە ئەستۆی ڕەشید نزام و ئەویش بەو لێکۆڵینەوەی کە چادر بە چادر گەڕا و بەو هەموو تەلگەرافانەی کە عەینوددەولە

کردی و بەو کەل و پەلانەی کە تورکمانەکان دەیانویست باز جێ متمانە نیە.

شک لەچی سالار دەکەن کە تاوانبارنەبێ؟

وەزیر: من کە دەڵێم ئێوە بە من بڵێن چی بکەم.

ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە: هەموو شتێک بۆ تاوانباری سالار هەیە من تاوانەکانیم کە لە ڕۆژ نامەیەکی ڕووسیدا نووسراوە وەرگێڕاوەتەوە و لە لای میرزا مەحموودەوەیە و وادیارە دەبێ ئەم کابرایە بدرێ لەدار.

حاجی میرزا عەلی ئاغا: گەیشتن بەو ئاکامەی کە شکایەتێکی زۆر لە وەزارەتی دادکراو ئەمەش کارێکی باش نیە و وادیارە خەتاکارەکان کەبریتین لە سالار موفەخخەم ئەمیر حسێن خانی کوڕی ئاسەفوددەولە و دەبێ بەپێی شەرع ئەم چوار کەسە ئەم حوکمەیان لەسەر بدرێ.

یەکەمیان کوشتن، دووهەمیان دەست بڕینەوە و پابڕینەوە سێهەمیان دوورخستنەوە و چوارەمیشیان ساڵێک دووربخرێتەوە لەکار.

میرزا مەحموود: من دەڵێم لەبەر ئەوەی ئەم کابرا ئەم زلمە گەورەیە کردووە خوا ویستی بۆ هەموان ڕوونی بکاتەوە، پێویستی بە پارلەمانتارو مامۆستاکانیش نیە.

حێسام ئیسلام: لەوەی کە پیاو کوژراوە و ئەسیر براوە هیچ قسەیەک نیە و هەرکەس هەرکەسێتری کوشتبێ دەبێ ئەویش بکوژرێ.

میرزا مەحموود: بڕیاری میرزا حەسەن درۆستە و داوای لێ بکەن بزانن ئەوچی دەڵێ.

سەید حەسەن تەقی زادە: دووپاتی دەکەمەوە دەبێ بکوژرێ بەڕێزمیرزا حەسەن خۆی هەمووشتێک دەزانی و دەزانێ چەند کەس چوونەتە لای و لەعەشیرەتی باشکانلوو داوای حوکمیان لێ کردووە.

ئاغا سەید جەعفەر: ئەگەر هێزوتوانایەک هەبێ حوکم دەبێ جێبەجێ بکرێ، براکەی عوسمان لە کۆفەدا شەرابی خوارد حەزرەت عەلی چێوی حەددی لێی دا، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا زلم لەوڕادەیەدا کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.

میرزا حوسێن: ئەو بەڵگانە (ئاغای میرزا حەسەن سەبزەواری) بهێنن ببینن

حوکم هەرچێ بوو بەڕێوەی ببەن.

ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە: من گوتم کە ڕشوە ئیزن بە بەڕێوە چوونی هیچ کارێ نادات؛ بەڵام ئێوە بێن و لەم کارەدا قۆڵی هیمەت هەڵماڵن بەڵام خەزوورەی[9] سالار هەر خەریکی ڕشوەیە و تەنانەت بیستوومە خۆشی خستووتە ماڵ سەرۆکی پەرلەمان ودووهەزار تمەن ڕشوەی داوە بە کەسێکی‌تر.

وەزیر:بەمنی داوە؟

سەید حەسەن: نازانم بۆ ئێوە؛ بەڵام بە ڕۆژنامەنووسێکی داوە.

بەرپرس: ئەوەی کە گوتتان هاتۆتە ماڵی من، نە وانیە وناتووە جارێکیان کوڕی وەزیرهات تا لە پارلەماندا چاوی بەمن بکەوێ وکەچی چاومان بەیەکتر نەکەوت، ئەگەر دەتانئەوێ تا بەڵگە بهێنین.

سەید حەسەن: بەجۆرێکی‌تریش دە کرێ، ئەوەش دەتوانن سەدوبیست نوێنەر هەڵبژێرن بۆ ئەم مەبەستە

بەرپرس: ئەمە خراپەیەکی هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە نابێ ١٢٠کەس بەڵگەکان ببینن.

سەید حەسەن: بیست کەسیان هەڵدەبژێرین و کەسی تر هیچ نالێ

پاش باسێکی زۆر، بڕیار درا کە بەم شێوەیە لە بەربەیانی شەممەدا بەڕێوە بچێ.

«دیالۆگەکانی ڕۆژی پێنج شەممە٢١ی جیمادی ئەوەڵ شۆرای نەتەوەیی»

کورتەیەک لە باسی سێ شەممە ١٩یەم لە لایەن سەیدموحەممەدتەقیەوە خوێندرایەوە.

حاجی سەید عەبدولحوسەینی شەهشەهانی: ڕۆژی سێ شەممە پاش ئەو هەموو وت و وێژانە بڕیاردرا کە ڕۆژی شەممە سەبارەت بە سالار موفەخخەم باس بکرێ و من دەبێ بڵێم کە ئەم ئەرکە بۆ پارلەمان ناگونجێ.

---

٩- خەزوورەی سالار، وەزیر نزام واتا سەرۆکی ئێلی ئەفشار، خوالێخۆشبوو ئیلخانی کوڕی سەردار لەم ژنە ئەفشاریە بوو کە دوایی باسی لێی دەکرێ، وەک چلۆن خەسرەوخان شادلووی کوڕی سالار موفەخخەم گوتی، زێڕی زۆر درا بەڵکوو سالار نەکوژرێ.

حاجی میرزا عەلی ئاغاش کە دووڕۆژی پـێش حـوکمی کوشـتنی و دەسـت و پابـڕین و دووخـستنەوەی تاوانبـارانی دەدا ئەمـڕۆ وتـەکانی سەیدعەبدولحوسـەینی پەسند دەکرد.

چەند کەس لە نوێنەرانیش هەر ئەمەیان گوت.

ئەوەی کە مرۆڤ دەخاتـە گێجـاوی خەیالـەوە ئەوەیـە کـە ئەگـەر نوێنـەرانی پارلەمان یا وەزیرانی بەرپرس زۆر پیاو مـاقوڵ بـوون. ئەگـەر ئاسەفوددەولـە شـەوی پێش بە زێڕوپارەوە نەدەچووە بەردەرگایان، قەت شتی وایـان بـە زمانـدا نـەدەهات، کاتێ سەید حەسەن تەقی زادە ئەم وتانـەی بیـست، تـووڕە بـوو و گـوتی «بـەڕێزان دەڵێن ئەمە ئەرکی پارلەمان نییە، نازانم ئەی چۆن دووڕۆژی پێش ئـەرکی پارلـەمان بوو، پاش چوار مانگ هێنان و بردن ئێستا دەڵێن ئـەرکی ئێمـە نیـە، بەڕاسـتی ئـەم وتەیە یانێ ئـاگرگرتنی قـەلبی نەتەوەیـەک نـا دەبـێ کۆبوونەوەیـەکی تایبـەت لـە پارلەمان بەرێ خرێ و بەم کارەدا ڕابگەن.

وت و وێژە پووچەڵەکانی نوێنەرەکان بێ دەرئـەنجام مایـەوە، تـەقیزادە ڕوونی کردەوە کە وەزیری عەدلیە لە دەرکردنی بڕیاری تاوانباری سـالار و ئاسەفوددەولـەدا غەدری کردووە و نوێنەرەکانیشی فریوو داوە. بۆیە تـەقی زادە بڕیارەکـەی وەزارەتی دادی پووچەڵ خۆیندەوە.

لە کۆبوونەوەی شەممە٢٢ی جیمادیسـانی سـالی ١٣٢٥ شەهـشەهانی ڕووی کرد لەوەزیر مالیە و گـوتی: «سـەبارەت بـە جیـاوازی وەگـرتنی مالـیەی قووچـان نزدیکە ولات بشێوێ»

سەرۆکی پارلەمان گوتی: باس لەم بارەوە بێکەڵکە دەبێ بینووسیت، ولامت لـە ئێمە بوێ.

لە کۆبوونەوەی ٥شەممە ٢٨ی جیمادیسانی حاجی سـەید میرزابابـا نوێنـەری قووچان کە وەک لال وابوو، دەستی دا بەقسە کردنەوە و ڕووی کرد لە وەزیری مالیە و سەبارەت بە قووچان گوتی:

«پێش لە وەرگرتنی مالـیەیەک کـە مـیرزا قاسـم خـان وەری گـرت مالـیەی

قووچان ٣٠ هەزرا تمەن بوو کە ئەو کردی بە ٤٥ هەزار تمەن کە خودی ئاسەفوددەولە گوتوویە بڕیاروا بوو ٢٣ هەزار تمەن وەربگیردرێ. بەرپرسایەتی ئەم باسانە لە ئەرکەکانی پارلەمان نییە.

بەڕێز شێخ حوسەین: ئەم بەڕێزانە ئەوەی کە سالی پێش بردیان وتیان دەیکە نیە، نابێ ئەمساڵ بکرێتە خەرجی دەردەبێ دەرمانەکانمان لەجیاتی دروست کردنی پارک.

لە کۆبوونەوەی ٣٠ جیمادیسانیدا لە لایەن حاجی مەلاموحەممەدحوسێنەوە کە لە مامۆستا کوردەکانی مازندران بوو سەبارەت بە ئەسیرانی قووچانی تەلگەرافێک هات کە گوتبووی ئەسیرێک لە تورکمانەکان هێنراوە و لە مالی ئەوان دایە، داوای ڕێگەچاری کردبوو کە چی بکات، بڕیاردرا پارلەمان بە تەلگەراف ڕێزی بۆ بنێرێ.

## گوزارشتی لوتفعەلی خان لە شێوەی کاری یەکەمین دادگای مێژووی ئێرانەوە سەبارەت بە ئەسیرانی باشکانلوو

لوتفعەلیخان سەرهەنگ کوڕی ئەللاهیارخانیسەرتیپ دەرەگەزی کەلەم کاتەدا عەبدووڕڕەزاخانیشوجاعوددەولە حاکمی قووچان بۆ باسی کچە باشکانلووییەکان بۆ تاران بانگهێشت کرابوو و کەلەبچەیان کردبوو، لوتفعەلیخانیش هاوڕێیانی دەکرد کە لەم بارەوە وای گوتووە:

٠٠٠ ڕۆژی پێنج شەممە ١٥ی جیمادی ئەووەل ١٣٢٥ ئەمڕۆ بە هۆی ئەسیرەکانی قووچانەوە تاقمێک لە پیاوان بۆ دادگا بانگهێشت کراون و بەڕێزان هوژەبردیوان و مودیردیوانیش لەو کۆڕەدا بوون، من –لوتفعەلی- بۆ تەفریح لەوێ بووم هێشتا وەزیر نەهاتبوو و لە دەوری ١٠٠کەس لەژن و پیاو لەوێ بوون، لەم دیوانخانەدا ١٠ژوور هەیە کەهەرکامەیان بۆ کاروئیشێکە، بەڵێ،ئاسەفوددەولە وەزیری ناوەخۆی ئێستا و والی پێشووی خوراسان و ئەمیر حوسێن خان کوڕی کە ئەو کات حاکمی قووچان بوو و ئەمیرئەلمولک و موعەزەزودەولەی برای هاتنە ژوورەوە.

ئەمیرخانی سەردار حاکمی پێشووی گورگان و سالار موفەخخەم ئیلخانی بجنوورد و شوجاعوددەولە ئیلخانی قووچانیش لەوێدا هەن. بارودۆخی ئەم دیوانخانەیە بە شێوەیەکە پاشا وگەدا وەکوو یەک وان؛ بەڵێ لە نزدیکی نیوەڕۆدا فەرمانفەرما هاتن پاشان دەست کرا بە باس لەسەر ئەسیرەکان.

سەردار یووسف خانی هەراتی[10] خاوەنی ڕۆژنامەی «فەوایید عامە[11]» و کوڕی خوالێخۆش بوو سەهامولمەلێک و چەند کەسێکی تری بینی و لە سێبەر دارێکدا دانیشتن و جگەرەکانیان ڕۆشن کرد، پاش نیوەڕۆ، پارلەمان شێوا و خەڵکەکەچوون، ئێمەش لەگەڵ دۆستان هاتینەوە و عەسریش چوین بۆ ماڵ شوجاعوددەولە و ئێوارە گەڕاینەوە.

## جوانترین ڕاپۆرت سەبارەت بە ئەسیرەکانی باشکانلوو

خوالێخۆش بوو لوتفعەلیخان دەرەگەزی کە لە کاتی دوورخستنەوەی عەبدورڕەزا خان شوجاعوددەولە دا بۆ تاران هاوڕێیی دەکرد و لەبیرەوەریەکانیدا نووسیوویە کە ئەمرۆ ڕۆژنامەی ژمارەی ١١٩ی پارلەمان چاپ کرا کە باسی سالارودەولەی کردبوو کە لە کرماشان وهەمەدانەوە چەند باسێکی نووسیبوو و لە لایەن پارلەمانەوە چەند باسێک سەبارەت بە ئەسیرەکانی باشکانلوو نووسراوە و لە ژێر دێڕی مەکتووب شاری دا.

«مەکتووب شاری: بۆبەڕێز... ئاغا میرزا حەمەسادقی بەرپرسی هێژای ڕۆژنامەی پارلەمانی نەتەوەیی.

... من کە یەکێ لە خوێنەرانی ئێوەم کە گوتبووتان هەرکەس زانیارییێکی لە

---

١٠- سەبارەت بە سەردار یووسف‌خانی هەراتی لە بەرگی یەکەمدا باسمان کرد. بڕوانە بەرگی ١، ٢ و ٣.

١١- لوتفعەلی‌خان وا دیارە لێرەشدا بەرواری لێ تێکچووبێ و تەنیا نووسیویە (هەینی ٢٠) کە ١٦ دروستە. تەنانەت خۆشی لە شوێنێکی‌تردا سەبارەت بە نێوانی خراپەی خۆی و شوجاعوددەولە ٦ی جیمادیئەوەڵی نووسیوە.

ئەسیرانی باشکانلووی قووچانی هەیە بۆمانی بنێرێ بۆیە دەڵـێم مـن سـەبارەت بـە ئەسیرەکانی باشکانلووی قووچان هەمووزانیارییێکم هەیە؛ بەڵام لە بەر ئەوەی خەڵکی ئەوێم ناتوانم نووسراوەکانم ببـەم تاخەڵـک واژۆی بکـەن بۆیـە بـەبێ واژۆ دەیـڵێم و دەینووسم.

کاتـێ کەعەینوددەوڵـە بـە هـۆی هاندانیـەوە لـە لایـەن غولامـڕەزاخان ئاسەفوددەوڵەوە، شوجاعوددەوڵەی لـە حکوومـەتی قووچـان دوورکـردەوە و ئـەمیر حوسـێن خـانی شەوکەتوسەڵـتەنەی کـوڕی ئاسەفوددەوڵـەی کـرد بـەجێگری، شوجاعوددەوڵەش بەیارمەتی هاوشیرەکەی خۆیەوە کە ژنی شـوجاعولمەمالیک بـوو -برای سالار موفەخخەم- نامەیەکی بۆ سالار موفەخخەم نووسی و داوای لێی کرد تا تورکمانەکان هان بدات و بێن عەشیرەتی باشکانلوو غارەت بکەن.

سالار لەبەر ئەوەی لە فرەزانیەکانی ئاسەفوددەوڵە تووڕە بوو لەم کارە پێـشوازی کرد و بەدزیەوە بانگی کرد لە دوردی خـانی تورکـەمان کەبەرپرسـی تورکمانـەکانی ئەمەند وئینچەی بجنوورد بوو و پێی گوت کە میرۆی موراد مـەرگان کـە لـە مێـژە کوردەکان بردوویانـە و ئێـستا لـە گوگلانـە و خێـرا بـڕۆ عەشـیرەتی تورکمانـەکانی ساتەڵق بهێنە و عەشیرەتی باشکانلوو ڕووت بکەنەوە و ژنەکانیان بدزن.

دوردی خـان ئـەوکارەی بەیارمـەتی و هانـدانی سـالار بـەڕێوەی بـرد، مـوراد مەردەگانی بـینی و هـاوڕێ سـوارەکانی یـەحووت و ئەمەنـد ڕووی کـردە گونـدی قەتلیش کە خاکی بجنووردە لە لای قووچانەوە و عەشیرەتی باشکانلوو کە لـە چـوار فرسەخی ئـەوێوەن و ڕەشماڵـیان هەڵـداوە. لـە ناکـاو هێـرش دەکەنـە سـەریان و ئەوانیش لەبەر نـەجاتی خۆیـان دوژمنیـان دەنێرنـە نـاو دێ قـەتلیش واتـە قـەڵای قەتلیش و تا خەڵکی قەتلیش ئەمانیان بدەن، گوند لە ترسی سـالار موفەخخەمـدا نەیانوێرا یارمەتیان بـدەن و تورکمانـەکان ئـەو دووژنـەیان کەلەبچـە کـرد و بـە زۆر بردیان، کۆیخا حەسەنی قەتلیشی کە ڕێنمای تورکمانەکان بـوو پاشـان گەڕایـەوە و ڕاستیەکانی بۆ سالار گوتەوە.

دەوڵەت لەم ئاکارە خەبەری پەیدا کرد،عەینوددەوڵە پـاش لێکۆڵـینەوەکە زانی

ئەم کارە وا لە ژێر سەری سالار موفەخخەمدا، خۆی نامەی بۆ سالار نووسی: یان دەبێ ئەسیرەکان بهێنیتەوە یان بیت بۆ تاران، سالار هەر ئەمڕۆ و بەیانی کرد، تا ئەوەی کە عەینوددەولـە ڕەشید نیزامی نارد تا بڕوات و ئەسیرەکان لەسالار وەربگرێتەوە؛ بەڵام ئەو ئەم کارەی کرد کەچی نەیتوانی.

هەمیسان عەلیئەکبەرخان سەرهەنگ کرایە بەرپرسی ئەو کارە تا بڕوات بۆ بجنوورد و لەوێوە سالار موفەخخەم بهێنێ بۆ تاران ئەمە چوار مانگە سالار لە تارانە و بە هۆی ڕەشوەوە و هاوکات پشتگیری کردنی لە لایەن وەزیر نزامەوە کە خەزوورەی سالارە ئیتر کەس ئەسیری لە ئەو نەویست.

بۆ ئەم قسەیەم ئەگەر دەولەت، کوێخاحەسەن، دوردی خان، موراد مەرگان بهێنێتە تاران ڕاستی وتەکانی من ڕوون دەبێتەوە.

ئیتر بزانین پارلەمانی نەتەوەیی چی پێی دەکرێ[12] هەروەها لە لاپەڕەیەکی تری دادگادا نووسراوە[13]: خوالێخۆش بوو لوتفعەلی خان پاش بەڕێوە چوونی جێژنی ساڵیوەگەڕی مەشرووتە سەبارەت بە شایەعەی لەسێدارەدانی سەردار دەنووسێت کە شەوی ڕابردوو لە ماڵ شوجاعوددەولەدا بوین کە هوژەبردیوان و مودیردیوانیش لەوێ بوون.

هەواڵیان هێنا کە سەردار دەبێ بدرێ لەسێدارە و ئەمە بڕیاری پارلەمانە کە ئەمە بوو بە هۆی دڵنگەرانیمانەوە.

کارێکمان لە دەست نەدەهات جگە لەوەی لەخوا بپاڕینەوە کەوا ئەبێ.

جەنابی عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولە: شەو تا نزیکی سێ سەعات لە دەرەوە بوون کە هاتەوە من گوتم ئەگەر بە خاتری من هاتویتەوە نامەوێ، تکایە بڕۆ.

گوتیان: دەچم؛ بەلام لێرەم بەلاوە خۆشترە،موحەممەد ڕەزاخانی کوڕی

---

۱۲- ئاکامی «مەکتووب شاری» مەلا لوتفعەلی خان دەرەگەزی لە ڕۆژنامەی مەجلیسەوە هێنا بوویەوە، پاش ئەوە بەسەرهاتەکانی ڕۆژی هەینی ۹ی جیمادیئەوەڵ بووە، وەبزانم لە لایەن مودیری دیوانی ئەفشاریەوە نووسرابێ کە لە دوژمنانی ژێر پەردەی شوجاعوددەولە بوو

۱۳- شەممە ۲۰جیمادی ئەوەڵ ۱۳۲۵

موستەشاردەفتەریش بوو. ماوەیەک خەریکی نووسینی نامەنووسین بووم.

کاتژمێری ٤ی پاش نیوەشەوە و من خەریکی نووسین ڕۆژنامەم و حاجی موحەممەد ڕەزاخان ٦تاری هەیە.

ئاغا میرزا حەسەن و شوکروڵلا خەریکی کایەی تەختەن و خەریکی شەراب خواردنەوەشن و بوتڵێکیشیان دا بە من خواردم، عەلیخانی پێشخزمەتیش هەر لەسالار باسی دەکرد.

بڕیار درا دووبەیانی دووبارە سالار بهێننەوە بۆ دادگا چی بڵێم لەم کارەدا هەموان حەز ئەکەن سالار بدرێ لەدار، هەرچەند تاقمێکش بە دوای بشێوەوەن، هەموان سەریان بە کاری خۆیانەوە قاڵە.

## بیروڕای یەکەمین دادگای ئێران

پاش ماوەیەک کە لێکۆڵینەوەکان بۆ وەدەست هێنانی قەناعەت لەم دادگاییە مێژووییەم ئەنجام دا، کتێبێکی بە نرخم کە پڕی بوو لە بەڵگەکانی ولەوێدا نووسرابوو: ئەم دادگاییە سەرەتای بەهاوارگەیشتن خەڵک بوو، ئەمەش دەقی ئەو دادگاییە:

وەزارەتی دادی بە نرخ: لەبەرواری ٢٠ی جیمادیولئەوەڵی ساڵی ١٣٢٥دەنگی کومیسیونی داد سەبارەت بە باشقانلووەکان پاش بازوخواستە جۆراوجۆرەکان وکۆبوونەوە جیاجیاکان و بینینی زۆربەی نووسراوەکان بە حازربوونی پارلەمانتارەکان هەمووی داروەستەی دادگا سوێند دەدرێن.

یەکەم: لە بواری ئەسیرەکانەوە، سالار موفەخخەم تاوانبارە.

دووهەم: تاوانباری دووەم سەردار ئەفخەمە کە دەسەڵاتداری ئەو کاتەی ئەستەرئاباد بووە.

سێهەم: ئەمیر حوسەین خانی کوڕی ئاسەفوددەولەیە.

چوارەم: خودی ئاسەفوددەولەیە.

پێنجەم: مەفاخێرولمەلێک و ئەکرەمەلێک کە تا ئێستا بۆ بازوخواست حازر نەبوون.

کومیسیۆنی داد بۆ تۆڵه کردنەوە لەم تاقمە کەسانە بەم شێوەیە کاری کرد.

ژمارەی یەکەم: سالار موفەخخەم کە دەبێ لەهەموو کارێکی نیزامی دوور بخرێتەوە و دەبێ دەسەڵاتی بجنووردیشی لێ وەربگیردرێتەوە، دەبێ هەمووی کەل و پەلی ساڵێکی تەواوی بجنوورد باتەوە. دەستی دەولەت و هەروەها دەبێ ئەسیرەکانیش وەربگەڕێنێتەوە و ئەگەر هەر ئەسیرێکیش نەتوانی وەری‌بگەڕێنێتەوە دەبێ لە جیاتی ۳۰۰تمەن جەریمەبدات بە خاوەنەکانیان.

ژمارە۲: سەردار کە حاکمی ئەوکاتەی ئەستەر ئاوا بوو و دەبێ لەوکاتەدا هێزوهەلمەت بنوێنێ و نەیکردووە و دەبێ پلەیەک لەپلەی نیزامی ئەوکەم بکرێتەوە و ٥هەزار تمەن جورمیش دەکرێ و ساڵێکی تەواویش هیچ کارێکی دەولەتی نابێ وەئەستۆبگرێ.

ژمارەی۳: ئەمیر حوسەین خان کوڕی ئاسەفوددەولەی قووچان دەبێ هەتا دوو ساڵ بەهیچ جۆری کاری دەولەتی پێی نەدرێ، لەبەر ئەوەی کە پاش بیستنی ئەم هەواڵە کاری خێرای نەکردووە و دەبێ ۳ هەزار تمەن جەریمە بدات.

ژمارەی٤: ئاسەفوددەولە بە هۆی تەلگەرافێکەوەیە کە عەینوددەولە بۆی ناردووە و لێکۆڵینەوەی دەرەوەی دادگا لەم کارە بوو بە هۆی پەرینوەی و ڕزگاری ناوبراو و دادگا تەنیا بەوە تاوانباری دەکات کە بۆچی بە نووسراوەکان و وتەکانی خۆی کاری نەکردووە بۆیە دەبێ دووهەزارتمەن جورم بکرێ.

ژمارەی٥: مەفاخێرولمەلێک و ئەکرەم مەلک؛ لەبەر ئەوەی خۆی لەوێ نەبوو و دادگایی بەبێ ئەو بەرێوە چوو و دەولەت حوکمی لەسەر دەدات، کومیسیۆنی داد لەم بارەوە تا ئەم ڕادەیە تۆڵەکەی تەواوە.

مۆری مەحکەمەی سەرەتایی ماف

بەشەکانی کومیسیۆنی داد، مۆر، عەداڵەتوسەڵتەنە، فەتحعەلی، باباخان، ئێحتشامولمەمالێک، حوسێن عەبدورڕاجی حوسێن، موحسێن حوسێنی- ئێنتزاموسوڵتان

پارلەمانتارەکانی پارلەمان لەم کارەدا تەنیا چاوەدێر بوون.

تەقی زادە: بەڕێز ئاغا سەید حوسێن برووجردی، سەید مەهدی وکیل توجار، میرزا مەحموودی کتێب فرۆش، حاجی سەید بابا و نوێنەری قووچان.

لەم حوکمەدا ئاماژە بەوە کراوەکە دەبێ بانی ئەسیر کردنی باشکانلووەکان تۆڵەی لێ بکرێتەوە و هەمووی لێکۆڵینەوەکان لە لایەن٦ کەس لە نوێنەرانی پارلەمانەوە چاوەدێری بکردرایا و دیوانی دادیش حوکمی چەسپاوی پەسند کرد.

عەبدولحوسێن فەرمانفەرما- مۆری وەزارەتی داد- مۆری دیوانخانە[١٤]

## ڕاپۆرتی وەزارەتی داد سەبارەت بە ئەسیرانی قووچان

نامەی وەزارەتی داد بۆ ئەتابەک سەبارەت بە ئاکامی دادگایی ئاسەفوددەولە و هاودەستەکانی.

بۆ بەڕێز و سەرۆکی پایەبەرز ئەتابەک ئەعزەمی وەزیری ناوەخۆ سەبارەت بەباسی وتوویژی ئەسیرانی قووچان کە بڕیار بوو لە وەزارەتی داد و بەحازربوونی نوێنەرانی پارلەمانەوە لە سەری کاربکرێ، بیروڕای کومیسیۆنی داد لەم بارەوە بە پێی ڕاڤەییەکە دەنووسرێ و بۆ بەڕێزتان بەڕێ دەکرێ.

مۆری وەزارەتی دادی لەسەرە

بەڵام باسی دادگایی کردنی ئەسیرە کوردەکان لێرەدا ناگاتە ئاکام. ناڕەزایی خەڵکی شیروان و بجنوورد و نوێنەرانی پارلەمان کار دەگەیەننە دادگایی و دووپات کردنەوەی حوکم.

## تەلگەرافی خەڵکی شیروان بۆ پارلەمانی ڕاوێژکاری نەتەوەیی سەبارەت بە ئەسیرەکانی باشکانلوو

باسی ڕاگەیشتن بەکاروباری ئەسیرەکانی باشکانلوو لە پارلەماندا خەریک بوو لە بیر بچێتەوە، لەبەر ئەوەی پووڵ و دراو بەرگری دەکرد لە بەڕێوە چوونی دادپەروەری، هەمووی ناپیاوان و زاڵمان هەر لە سەرکردەو دەرباریی و مەلاوە و

١٤- بەڵگە نوێیەکان- بەڵگەی ٩٤ل ٢٤٢

خـودی موحەممەدعەیـشاوە تـەواوی بـیرو هـۆش و ئەندیـشەیان ئـەوە بـوو تـا ئاسەفوددەولە پای نەکێشێتە سەرکورسی مەحکەمە.

نوێنەرانێ وەکوو تەقی زادە و میرزا مەحموودی کتێب فرۆش کـە حـەزیان بـە خراپ کردنی مـافی خەڵـک نـەدەکرد لەهەموولایەکـەوە هەڕەشـەیان لـێ دەکـرا، خەڵکی باشکانلوو کە بۆ تەقدیمی شکایەت بانگهێشتی تاران کرابوون پـاش دووسـاڵ دەربەدەری و بێ پارەیی لەهەموو جێگایەکەوە ولامی ڕەدیان پێیان دایـەوە و لەبـەر ئەوە بوو کە جارێکی تر خەڵـکی بەشـەرف و بـە توانـای شـاری سـنووری شـیروان تەلگەرافێکی توندیان ڕەوانەی پارلەمان کرد کە دەقەکەیمان لە خوارەوە هێناوە.

کۆ بوونەوەی ڕۆژی سێ شەممە٣ی ڕەجەب تەلگەرافێکە لە شیروانەوە کـە لـە لایەن کوێخا و بەسالاچووەکانەوە گەیشت، سەید موحەممەد تەقی خوێندیەوە.

بۆ پێشگای پارلەمانتاران:

سەبارەت بە گەڕاندنەوەی ئەسیرانی باشکانلوو زۆرمان هاوار کرد گوێبیـستێکی بۆ پەیدا نـەبوو، دەی ئەگـەر کـەس گـوێبیـستمان نابـێ بـا خۆمـان بخەینـە ژێـر دەسەلاتی ڕووسەکان،هەموومان لەتەلگەرافەخانەکاندا کۆبوینەتـەوە، تـا کارەکـەمان جێ بەجێ نەکرێ ناڕوینەوە، ئێوە بەرپرسن لەبەردەم دادگای خوا و پێغەمبەرەوە.

بەرپرس: ئەم باسە ڕۆژ نەڕۆژێک دەگات؛ بـەلام بـە هـۆی کارەکـەی ئورمیـە و هێرشی تورکانی عوسمانیەوە کەوتە درەنگ و دەبـێ ئەمـڕۆ دەنـگ بـدەین بـزانین دەبێ چی بکرێ.

میرزا فەزلعەلی ئاغا: هەمان دەنگ کە ئەو ڕۆژەکـەی دیکـە درا و لـە پارلەمانـدا هەر ئەوباسە ئاراستە بکرێ.

بەرپرس(سەنیعوددەولە): دەی ڕۆژێکی بۆ دیاری بکەن.

سەید حەسەن: سەبارەت بـە ئاسەفوددەولـەش هـیچ کـارێ نـەکراوە وادیـارە یەکسەرپایان بڕیوە و دەبێ سەرەتا ئەو دادگایی بکرێ.

بەرپرس: دەی خۆتان کۆکەنەوە تا وەزیری داد دێت.

سدێقی حەزرەت: وەزیر گۆڕاوە خۆ وەزارەتخانە لەسەر جێ خۆیە.

حاجی سەید عەبدولحسێن شەهشەهانی: لەم نامەی کە لە شیروانەوە گەیشتووە شکایەت لە دەستی ئاسەفوددەولەوە کراوە و ئێمە پێشتر سەبارەت بە سالارموفەخخەم باسمان کرد هەروەها ئاسەفوددەولەش لێرەدا نیە.

سەید موحەممەد تەقی: لەم تەلگرافەدا کە گەڕاندنەوەی ماڵ و دارایی خەڵکی باشکانلوویان ویستووە، دەبێ ئەم کارە لە لایەن ماموستایانی ئایینیەوە شی بکرێتەوە.

باسەکانی سێ شەممە ٨ی شەعبانی ١٣٢٥:

لەم کاتەدا کە عوسمانیەکان هێرشیان کردۆتە سەر سنوورەکانی کوردستان و دەوروبەری خووی و سەڵماس و کوڕی ڕەحیم خانی چەلەبیانلوو لە ئازەربایجان و کوڕی سپەهداری تونێکابونی لە ڕەشت خەریکی ئازاری خەڵکی بوون و هەروەها بە هۆی تیرۆری ئەمینوسولتانەوە، موحەممەد عەلیشا[15] ڕقی زۆری لە مەشرووتە خوازەکان هەڵگرت و بەم شێوە بوو کە سالار موفەخخەم هەر لە زینداندا بوو بە بێ ئەوەی حوکمێکی بۆ ببڕنەوە و ئاسەفوددەولەش لە دانیشتنی حوکمداندا نەبوو، لە وتوویژەکانی ئەم ڕۆژەدا سەید عەبدوڵلا بەهبەهانی گوتی: سەبارەت بە سالارموفەخخەم گوتی: دەبێ بەم کارە ناڕەوایە ڕابگەین، ناوبراو گوتوویە کە من ئومێد ئەکەم بتوانم ئەسیرەکان وەرگەڕێنمەوە بۆیە مانەوەی ئەو قازانجی نیە.

تاقمێک گوتوویانە کە سالار موفەخخەم تاوانبارە و دەبێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە.

بەڕێز سەید عەبدوڵلا موجتەهێد بەهبەهانی: تا وەرنەگەڕێتەوە ناتوانێ ئەسیرەکان وەرگەڕێنێتەوە، بۆ ئەم کارە زەمان بگرن. پاشان بە تاوانەکانیش ڕادەگەین.[16]

---

١٥- موحەممەدعەلیشا هەر لە سەرەتای منداڵیەوە لە ناوگێجاو و بیری ڕووسیەی تیزاری لە ئازەربایجان گەورە بوو، ڕووسیە قەت حەزی بە حکوومەتی مەشرووتە لە ئێران نەدەکرد، بۆیە هەمووکات بۆبنەبڕ کردنی هەوڵیان داوە لە ڕاپۆرتی سایکس باڵوێزی ئینگلیز لەمەشهەدەوە بۆ تاران ناردوویە و لەوێوە ڕەوانەی لەندەنی کردووە، تاران ١٧ی ژووئیەی ١٩٠٨بەژمارەی ٢٢٧ەوە

١٦- ڕۆژنامەی وتوویژەکانی پارلەمان، خولی یەکەم، ل٣١٦

بەرپرس: وایە، ئەم کاغەزە لە لایەن ڕەحیمەوە نووسراوە و ئەمن بەوڕایە نیم کە لە کاریاندا دەخالەت بکەم، دەنگ هەر لە دەنگی پارلەمانە.

سەید حوسەین برووجردی: بۆ ماوەیەک سالار کەوتە بەر پرس و باس و خواست لەوەزارەتی داد و تۆڵە کردنەوەکەشی لەسەر کاغەزنووسراوە، خودی وەزیری داد هاتە پارلەمان و داوای دەنگی کومیسیۆنی پارلەمانی کرد وتارادەی ئەوتۆڵەی کە لەبەر چاوگیرا بوو هاوکاریان نەکرد، پارلەمانیش لەبەر ئەوەی تۆڵەکردنەوەی کەم بینی و بۆیە ویستی تا لەم بارەوە لێکۆڵینەوەیەک بکرێ.

دەبیری نامەکان: ئەگەر ناوبراو زەمان دابنێ دەتوانێ بڕوات و ئەسیرەکان ئازاد بکات.

سەدری نەتەنزی: بڕیار بوو کە ناوبراو تۆڵەی لێوە بکرێتەوە، ئەگەر تۆڵەی لێ بکردرایەتەوە دەبوا عیبرەتی کەسانی تر و هەمیسان ئەگەر تۆڵەی لێ نەکرێتەوە دەبێتە هۆی سەرکەشی کەسانی ترەوە.

میرزا مەحموودی خانساری: لە دەوری ١٠ مانگ دا کە لێرەدا هاوارو دادێک بوو بۆ وەرگەڕاندنەوەی ئەسیرەکان ئێمە ڕقمان لەکەس نیە گەر دەیەوێ ئەسیرەکان وەرگەڕێنێتەوە شایەت خەڵک لە گوناحەکانی خۆش بوون، ئەوکاتە ڕزگاری دێت، بەڵام ئەگەر بیەوێ بڕوێ باوەڕ ناکەم خەڵک و پارلەمان ئیزنی پێی بدەن.

شەهشەهانی: یەکێ لە گرینگ ترین خراپەکانی نەتەوەکەمان ئەوەیە کە تکاکارێکی زۆر دروست دەبێ بۆ ڕزگاری ئەو، وەک: ئاسەفوددەولە و کوڕەکانی و سالار و سەردار.

حاجی ئیمامی جومعە: ئەم کابرایە ٦٠کەس ژنی فرۆشتووە...بووەتە هۆی کوژرانی ١٢کەسەوە و کەسێ ئەگەر ببێتە هۆی کوشتنەوە دەبێ بۆ هەتاهەتایە لەزیندان بمێنێتەوە، ئێوە ئێستا دەتانەوێ ڕزگاریان بکەن و ئەم هەموو ژنە بدەن بەگژی ئێمەدا.

ئاغا میرزا مەحمووی خانساری: وا ئەزانم ئەم کابرایە سالار موفەخخەم کە

دەڵـێ دەچـم ئەسـیرەکان دەهێنمـەوە، خـۆی دانی نـاوە بـەوەی کـە ئەوکچانـە فرۆشراون.

لێرەش دا تاقمێک نۆینەر باس و وتوویژیان کرد

حاجی میرزا عەلی ئاغا: کەسانێ کـە سـەرۆکی شەڕاشـۆکانن بـریتین لەسـالار موفەخخەم و ئاسەفوددەولە و کوڕەکەی و حوکمی ئەم ئاکارەش خـوای گـەورە لـە قورئانی پیرۆزدا هێناویە.

سەرۆک: ئاکامەکەی بوو بەچی؟

حاجی سەید باقر: لەزیندان بابمێنێتەوە تا ئەسیرەکان ڕزگاریان دێت[17].

**وتوویژەکانی ڕۆژی یەکشەممە ۲۰ی شەعبانی ۱۳۲۵:**

لەم ڕۆژەدا باسی ئەسیرەکانی قووچان بەم جۆرە هاتە ئاراوە:

سەرۆک ئەنجومەن: باسێکی تر کە دێتە ئاراوە ئەوەیە کە بڕێک ماڵـی یـەمووت لە قووچان ماوەتەوە و قووچانیەکان تەلگەرافیان ناردووە تا ئەسیرەکان ڕزگارنـەکرێن نایدەینەوە.

ئاغا میرزا سەید موحەممەد: بارمتەگرتن ناڕەوایە.

حاجی سەید باقر: هەمووی ئەم ئەسیرانەیان بەکڕین کڕیوویانە یان دزراون.

سەید نەسروڵلا: نا، دەبێ پیاوانە هەڵسوکەوت بکرێ و هاوکات هەم دەبێ ماڵـی خەڵکی یەمووت بدرێتەوە و هەم ئەسیرەکانیش ڕزگاریان بێت[18]

## ڕەنگدانەوەی غەدرەکانی ئاسەفوددەولە و ئەسیرکردنی کچە کوردەکان لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا

ئاسەفوددەولە لە ساڵی ١٩٠٤ بوو بـە سـەرۆکی خوراسـان و هێـشتا هـەر ئـەو ئەرکەی وەئەستۆیە. لە کاتی فەرمانڕواییەوە زڵم و زۆری کردووە و ماڵیەی زۆری لـە خەڵک وەردەگرت و هاوڕێ موشیروددەولە پیرنیا هاوبەشـە. پارلـەمانی ڕاوێژکـاری

١٧- وت وویژەکانی پارلەمان، خولی یەکەم، ل٣٢٢

١٨- ڕۆژنامەی وتوویژەکانی ئەنجومەن، خولی یەکەم، ل ٣٣١

نەتەوەیی لە کۆبوونەوە سەرەتاییدکانیدا کارەکانی ئاسەفی داوەتە بەر لێکۆڵینەوەی خۆی[١٩].

ئێستا کورتەیەک لە ڕاپۆرتی یەکەمین پارلەمانی ڕاوێژکاری نەتەوەیی دووەمی ئاڤریلی ١٩٠٧ کە لە لایەن ئێسپرینگ ڕاسیەوە بۆ لەندەن نووسراوە.

«سێ شەممە ٢ی ئاڤریل ١٩٠٧»

پاشان وەزیری ناوەخۆ سەبارەت بە ئاسەفوددەوڵەی حاکمی پێشووی خوراسان کە تاوانباری هاوکاری لە فرۆشی کچانی قووچان بوو خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بەم جۆرە چەند بەڵگەش کەوتە دەست بۆ بەرگری لە تاوانباربوونی ئاسەفوددەوڵە و تاوانبار کردنی دەسەڵاتدارانی بجنوورد و قووچان کە یەکەمیان بیست هەزار و دووەمیان ١٥ هەزار تمەن جورم کران، لە لایەن وەزیری ناوەخۆ وە خوێندرایەوە.

لەم کاتەدا لە لایەن تاقمێک لە نوێنەرەکانەوە داوا کرا تاکوو بۆ ڕاگەیشتن بە سەر ئەم باسەدا دادگایەکی تایبەتی بخرێتە ڕێ، بەڕێز سەید عەبدوڵلا موجتەهێد کە لەم کاتەدا هاتە ناوکۆبوونەوەکەوە لەوەی کە ئاسەفوددەوڵە لەوێ نەبوو زۆر سەرسام بوو و بە سەگی نەگبەت بیری لێ کردەوە.

وەزیری داد لەم کاتەدا بەسرتەوە شتێکی گوت بە موجتەهید و ناوبراو لەو وتەیە زۆر تووڕە بوو و لە ئاکامدا بەڕێز سەید موحەممەد تەباتەبایی موجتەهید بوو بە داوەری نێوانی ئەوان و ئەمەش کورتەیەک لەو کۆبوونەوە کە ٢٧ی ئاڤریل تا ٢١ی مەی ساڵی ١٩٠٧دا بۆ لەندەن نێردراوە.

٠٠٠ شەممە ٢٧ی ئاڤریل (گوڵانی ١٢٨٦)کۆ بوونەوە کە لەسەر فرۆشتنی ژنە ئێرانیەکان باسی کرد و گەیشتن بەو ئاکامەی کە دەبێ پارلەمان خۆی لەگەڵ وەزیری ناوەخۆدا قسە بکات و بەرگری لێوە بکات و ئەگەر ناوبراو کارێکی باش بەڕێوە نەبات دەبێ لەکار دوور ببێتەوە لە ناو وتوویژەکاندا چەند جار لەگەڵ

---

١٩- بەگوێرەی سەراپرینگ ڕایس وەزیر موختاری ئینگلیز لە ئێران کە لە ڕاپۆرتێکدا بۆ سرئەدواردەگەری وەزیری دەرەوەی بەریتانیای دەنێری لە بارەی ناساندنی پیاوە دەوڵەتیەکانی ئێرانیەوە لەڕەزبەری ١٢٨٥ تا بەفرانباری ١٢٨٥ نووسراوەی حەسەن مەعاسر، ل١٤١.

دەوڵەت بەشەڕهاتن و نامەیەکیان بۆ وەزیری ناوەخۆ نووسیوە و داوایان لێی کردووە تا لە ماوەی ١٥ ڕۆژدا ئەوبەرپرسانەی کە لە فرۆشی ژنەکاندا دەستیان بووە دەبێ تۆڵەیان لێ بکرێتەوە و ژنەکانیش لە ماوەی ٤٥ ڕۆژدا دەبێ وەربگەڕێنەوە و ئێستا بەشێ لە ڕاپۆرتی ٢٠ی ژۆئێن تا ١٦ ژۆییەی ١٩٠٧ دوایین ڕۆژەکانی جۆزەردان تا دوایین ڕۆژەکانی پووشپەڕی ١٢٨٦ کەجیپیچرچیل لە تارانەوە ڕەوانەی لەندەنی کردووە.

دادگایی کردنی کەسانێ کە تاوانباربوون بەوەی کە ژنانی ئێرانیان فرۆشتووە تورکمەنەکان. ئەم دادگاییە وەک خۆی نەبووە لە ئێراندا و بە پێی یاسای نوێ بەڕێوە چووە کە لە لایەن خودی وەزیری دادەوە بەڕێوە چووە و تاوانباران بریتی بوون لە ئاسەفوددەولە و سالارموفەخخەم کە هەردووکیان زۆر دەوڵەمەند بوون و خزمیش بوون و بە پێی بڕیارێکەوە کە لەم موحاکەمەدا دراوە، سالار موفەخخەم دەبوا جورمێکی قورس بکرێ و ٥ ساڵ دەسبەسەریش کرا و حوکمەکە دەتوانرێ پێدا چوونەوەی هەبێ؛ بەڵام وەک چۆن کە دیت میرزا ئەحمەد خانی حەیدەری نوێنەری سالار موفەخخەم و تاقمێک تر لە نوێنەرەکان و کار بە دەستەکان بۆ ڕزگاری سالار هەوڵیان داوە.

## بەند کردنی شوجاعوددەولە لە تاران

لوتفعەلی خان لەبیرەوەرییەکی خۆی لەبەرواری ٢٦ی جیمادی ئەوەڵ ساڵی ١٣٢٤ سەبارەت بە عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولە لە تاران و بە هۆی باسی بەندکرانی کچەکانی قووچان خەبەری داوە و دەڵێ تا مەیدانی تۆپخانە بە پیادە هاتم، بەڕاستی هیچ مالیک بێ خاوەن و هیچ نۆکەرێکیش بێ سەرکردە نەبوو هەر خۆیشی – شوجاعوددەولەی قووچان – و تاقمێکیش دەرباز بوون و تەنیا چەند کەسێکیان ماوە.

حاجیخان سەرتیپ قووچانی لەسەر کارەکانی شوجاعوددەولە ڕادەهات.

گوتی: ئەرێ بۆ کەل و پەلەکەمەکەی خۆم ڕوانیم هەموویم کۆ کردەوە و لە

تارەکەم پرسی [ئەم تارە لە پێش دا موشیرووددیوان قووچانی باوکی خوالێخۆش بوو کامبووزیا زەعفەرانلوو کە ئەودەم لە تاران بوو و کاری مونیشگەری موشیرووددیوانی بوو، دابووی بە لوتفعەلی خان]

گوتی: دوێنێ شەو جەنابی موشیرووددیوان تارەکەی بە ئەمانەت لە حاجی خان وەرگرتووە لەم بارەوە زۆر تووڕە بووم و بە خۆمم گوت ئیتر موشکیلە تارەکەمان پێ بدەنەوە ئەوە بوو کەربەلایی حەسەنیان [یەکێ لە کۆنە نۆکەرەکانی شوجاعوددەولە] نارد کە لە ماڵی جەنابی موشیرووددیوان تارەکە بهێنێ؛ وەلامی هێنا کە تارەکەیان بردووە بۆ شەمیرانات. زۆرتر تووڕە بووم. بەڵێ لەگەڵ حاجیخانا تا سێ سەعات لە ئەوێ ماینەوە و ئێوارەیش حاجیخان بەمنی گوت: بۆ خەرجی کومپانیا کە پارەمان کەمە ئەگەر پارەت هەیە دوو سێ ڕۆژێ پێ مان بدە. وتم بەڕاستی لە ئەم پارانە کە لەسەرۆکی ئێوە شەجاعوددەولە بە هۆی بڕیارێ کە لە خوراساندا دابووی بەمن گەیشتووە کە بۆ تاران و خوراسان خەرج کردووە و هێشتا هەر هەیە کە بە ئێوی بدەم. بەڵێ دوای بڕێ شۆخی بە هۆی ئەوەی کە پانزە تمەنم لە کەسێ قەرز کرد بوو. بەدەستەوە بوو، دوانزە تمەنم دا بە حاجیخان و دوو سەعاتی مابوو بۆ ئێوارە لەگەڵ ئاغای موحەممەدڕەزاخاندا بەدەم شۆخییەوە هاتین تا بەردرگای سەفارەتی[20] ئینگلیس کە هەمووی تاجرەکان و بازاڕیەکان و مامۆستایانی تاران لە سەفارەتدا پێک هاتبوون و خەڵکەکە ئەوندە زۆر بوو کە نەتدەتوانی بڕویتە پێشەوە، ئەمنیش لەهەموو بابەتێکەوە ئالۆزبووم لە ئەوێوە لەگەڵ موحەممەد ڕەزاخان ماڵ ئاواییم کرد و یەکراست هاتم بۆ ماڵ خانم و ڕۆیشتمە ماڵەوە، دیتم خانم تەلعەتولسەڵتەنە تەشریفیان نیە لە ماڵەوە، چووم بۆ خزمەتی شووی خانم، لە نێو حەساردا دانیشتبوو خەریکی قسە کردن بووین کە دوو سەعات لە شەومان تێپەڕ

---

٢٠- شۆڕشی خەڵکی تاران لە ڕۆژ پەنج شەممە ٢٧پووشپەڕی ١٢٨٥ بەرانبەری٢٦جەمادی ئەوەڵ ١٣٢٤دەست پێی کراو پاشان دەستووری مەشرووتیەت لە ڕۆژی یەک شەممە ١٣ گەلاوێژ ١٢٨٥ بەرانبەری ١٤جەمادیسانی ١٣٢٤ لە لایان موزەفەرەدین شاوە درا. (مەشرووتەی ئێران، ئەحمەد کەسرەوی، ل١١٩)

کرد بوو، خانم بە فەیتون لە ماڵی حـەزرەتی ئەقـدس والا ئاغـای ئەتابـەک ئـەعزەم شـازادەی عەینوددەولـە تەشـریفیان هێنـاوە؛ بـەڵام چ ڕواڵـەتێ و چ هەیکەلـێک؟ پێنووس لە باسی ئەو عاجزە. هەربەو قەیافەوە هات و لەسـەر کورسـیەکە دانیـشت، من لە جێگەی خۆم دا هەستامە سەر پا و سڵاوم لێ کرد و بەخێرهاتنی پێی گوتم و دانیـشتین. ڕووناکـایی دم و چـاوی و ڕوونـاکی ئەنگوسـتیلەکەی و سـینەڕێزەکەی ئەڵماس خانم حەساری ڕوون کردەوە، سیگارێکی کێشا و ڕۆیشتە نێـو ژوورەکـەی و چارشێوێکی هەڵگرت و جلوبەرگەکەی گۆڕی وچەندە جوان و مەلـەنگ بـوو، خـودا خۆی شاهێدە ئەمن کە لە خیلقەتی ئەو خاتوونـە سـەرم سـوڕما بـوو، و هەرچەنـدە دەمەوێت باسی ڕواڵەتی ئەو خاتوونە بکەم و بیهێنمـە سـەر کاغـەز دەبیـنم نـاتوانم، کورت بڵێم خەریکی قسە کردن و عەیش بوین. تـا شـەش، حـەوت شـەو شـێومان خوارد و خەوتین.

لوتفعـەلی خـان لـە ڕووداوەکـانی ڕۆژی داهـاتوودا وادەنووسـێ: تـۆزێ خـانم ئەحواڵی ناخۆش بوو کە بڕێ دەرمان و دەوای خواردو ئێوارە حاڵی چـاک تـر بـوو و بەتەواوی ئاسوودەیە و بێ هیچ گیروگرفتێک لە خزمەت خانمـدا خـەریکی کنیـاک خواردن و تار لێ دان و قـسەی چـاک چـاک بـوین. هەرچەنـد کـە مێـردی خـانم پیاوێکی چاک و ساحێب ناو و نیشانە بەڵام خانم دەستێکی زۆری بە سـەریدا دەڕوا و هەرچێ خانم بیلێت و حوکم بکات هەر ئەوەیە. بەڵێ کاتی نیوەڕۆ مێـردی خـانم ئاغای زیائیخان هاتنەوە، لە خزمەتیانـدا بـوین. خـانم فـەرموویان کـە دەبـێ پێـنج لوولەی خاڵی لە فتووگراف لە تاری لوتفعەلی خـان هـەر ئێـستا بـۆ یادگـاری زەوت بکرێ، دەبێ فەرمانی خاتوون بـەڕێوە بچـێ، ئـەبێ هـەر جۆرێـک کـە ببـوای سـێ لوولەمان لە سێ دەستگای تار پڕ بکردبای و تا فەرمانی خـاتوون بـەڕێوە بچێ،خـانم زۆری پێی خۆش بوو، وتیان چاکتر بوو کە لولەیێکیش لە دەنگی خۆتان پڕکەن تا بـۆ یادگاری بمێنێ، وتم بە داخەوە کـە گـۆرانیم لانیـە، هەرچەنـد کـە گـۆرانی بـەیات ئیسفەهانی چاک دەزانم، کە چی خوێندم و لە فتوگرافەکەدا زەبتمان دەکرد. وتیان ئەوە چ شێعرێکە؟

وتم:

ئەگـەر تـۆ چـاوم لـێ دەکـەی کـاری مـن هـەرئاخ
هەڵکێــــــــــــــــــــــــــــشاندنە
ئـەی بـەقوربانی چـاوی تـۆ ئـەوە چ چـاو لـێ کردنـە
ئەڵـێی ئەگـەر تمـشای مـن لـە تـۆ چـاو لـێ کردنـە
تـا تـو لێـرەدابی کـاری مـن هـەر گونـاح کردنـە

خانم بە بزەیێکی جوانەوە گوتی: کەسێ بە ئێوەی نەوتووە کە تماشـای جـوانی مەکەن، تماشا کردنتان لە ڕووی هیچێکـەوە نیـە، وتم: نـازەنین هـەمووی نـازەنین دەبینێت.

بە کورتی: نەهاریان هێنا و خواردمـان، خـانم چـووە بـۆ دیوەکـەی و خـەوتن، ئەمنیش خۆمم خەریک بە لوولەکانی فتوگراف کرد، زۆرتر تاری میرزا عەبدوڵلا[21] کە بە گۆرانییێکی زۆر چاکەوە زەبت بوو چەند جار گوێم لێ گرت.

## شوجاعوددەوڵە و جەشنی نەورۆزی ١٣٢٥ کاتێ کە بۆ تاران دوورخرابووەوە

شوجاعوددوەڵە بەبۆنەی گرتنی کچانی قووچانی لە تاران دا بەو پەری هـەژاری ونەدارییەوە ژیانێکی زۆر ناخۆشی بووە، دۆست و ڕەفێقـانی دەوروبـەری نۆکـەرەکان توانای ئەو ژیانە ناخۆشەیان نەبوو و هەر کامێکیان لە لایەکەوە هەڵدەهاتن. تەنانـەت چوارکەس لە نۆکـەرەکانی و لوتفعـەلی خـان کـوڕی ئـەلاهیارخان دەرگـەزی کـە نووسەری ئەم بیرەوەریانەیە و لـە هـەموو کاتێکـدا لـە خۆشـی و ناخۆشـیدا لەگـەڵ شوجاعوددەولەدا بوون و نەیانهێشتووە تەنیا بێت کە لەم بـارەوە لـە ڕۆژی ئـاخری ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٥ مانگی ئاوا دەنووسێ:

---

٢١- لەسەردەمی ناسرەدین شادا کە بە ماوەی ٥٠ ساڵ بوو، سێ کەس لە تارژەنەکانی زۆر چـالاک لەدەرباری ئەودا هاتووچۆیان دەکرد کە بریتی بوون لە ئاغای عەلی ئەکبەر ئاغای غولام حوسـەین و میرزا عەبدولا تارژەن، سرگزشت موسیقی ایران، روح الله خالقی، ل٤٦

هێشتا کە دوو سەعاتی ماوە تا گەیشتنی ساڵی تازە، بە ڕاستی لە کاری ئەم دنیایەو لە کارەکانی خۆمان دا مات بووم و سەرم سوڕ مابوو و ئەم شەو کە شەوی جێژنە هەرکەسێ لەماڵی خۆیدا لەگەڵ منداڵ و ژنی بەخەیاڵێکی ڕاحەتەوە دانیشتووە؛ بەڵام جەنابی شوجاعوددەولە و ئەمن لەگەڵ زۆربەیێکیتر غەریب و پەرێشان و سەرگەردان بوین و بە هیچ جۆرێ نەماندەزانی چیمان بەسەردێ و تاکەی دەبێ لە تاران بمێنینەوە و یان جارێکی تر دەتوانم بڕۆمەوە بۆ خوراسان یان نە؟ بەم جۆرە ئەمن و جەنابی شوجاعوددەولە لەبەر درگادا وکوو غەریب دانیشتبووین و سەیری ئەو خەڵکەمان دەکرد و تۆزێ باسی غەریبی خۆمان کرد و جارجارێک یەکترمان دڵداری ئەداوە تا کاتی مەغریب لەبەر درگای ماڵ کە لە ڕاستیدا دەم درگای دەوڵەتە دانیشتین و چایمان خوارد و لە هەمووشتێک باسمان کرد، ناردمان تۆزێ شیرینی لەبازار بهێنن، هێنایان و لەدیوەکەی خۆماندا دانیشتین و تەنیا هیوامان زاتی خودابوو، لە خزمەتیاندا گوتم لەبیرتان نەچێ ئەودەمانە کە وەکوو ئەمشەو کاتی جێژنە لە قووچاندا و چەندین کەس کە لە نێو قووچان و لە دەرەوەی قووچاندا لەبەر درگای دیواخانەکەدا هاتن بۆ خزمەتتان و تۆزێک ماتڵ بووبوون و ئەو هەمووە نۆکەر و حەشەمە لە خزمەتتاندا بوو کە ئێستا ئەمن و ئێوە لەم شارە غەریب و تەنیا و بێ ماڵ و هێلانە داکەوتوین.

ئەگەر بە هومێدی خودا جارێکی تر گەیشتنە ئەو پۆستانە نابێ ئەم دەسبەسەریە لەبیرببەنەوە و بە جۆرێک کە گوتوویانە:

«لە هەموو کاتێک دا ئەبێ شوکری خودا بەجێ بێرین» و هەروەها کە ئیمرۆ نەورۆزە، ماوەیکە کە لە خزمەتتدا بووم، جەنابی ئەمیر عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولەی کوڕی خوالێخۆش بوو ئەبولحەسەن خان لە تاران بوو و دوو بەرگ کتێبی ڕۆژنامەیەکەم نوسیوە و ئەمەسێهەمیەتی.[٢٢]

ئەم شەو شەوی جێژنە و هەرکەس خەیاڵی کڕین و دروس کردنی موبلی ماڵەکەیان و عەیش و عەشرەت دایە،ئێمەش لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە

٢٢- بە داخەوە تەواوی ئەو نووسراوانە جگە لە چەند لاپەڕەی هەمووی لەبەین چوون

دانیشتبوین و له خەیاڵی خۆماندا بوین و له دەریای خەم دا نـوقم بـووین و بـه ئـەم کـشتیه شـکاوەوه لـه قـوڕاوی تـاران دا ئومێـدی نـەجاتمان نـەبوو. جـار جارێـک هەڤاڵەکەم بەمن دڵداری ئەدا و جارێک ئەمن بەدڵی پڕ ئێش و دەردەوه بۆ دڵـداری دانەوەی ئەوان قسەم دەکرد. کورت باسی کەم غولام حـسێن خـان کۆنـه نۆکـەر و کەربەلایی نەقی میرئاخوڕ و دووکەسـی دیکـه کـه لـه ٥٠ نۆکـەرەکان مابوونـەوه و خۆیان بەوەفادار ناو ئـەبرد، لەگـەڵ تـەواوی کۆیلـەیی و برسـیەتی و چارەڕەشـی و غەریبی و چەند ساڵ دووری له ماڵ و منداڵ و شاری خۆیاندا ژیاون. له ئەوێ بـوون و لەحەوت سینی شەوی جەژنی نەورۆز باسمان کرد، وتم ئێمـەش حـەوت سـینی خۆمان مان هەیه:

## سەفەر، سەرگەردانی، سەیر، سەختی کار، سستی لەش، سکووت و بێ دەنگی

بەڵێ، لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولـەدا، بەتـەواوی پەرێـشانی و بەدبەختیـەوه ڕۆیشتیم بۆ حەمام و هاتینه دەرەوه، لەو جیگاوه کـه هـیچ شـتێکمان نـەبوو، پـاش بیرێکی زۆر لەتێک کەل و پەلی ماڵ مابوو هەڵم گـرت و هـاتم بـۆ بـازاڕ، هەرچەنـد قیمەتی پێنج تمەن بوو بەلام بەهەر سەڕافێکم دەدا کەبـەدوو تمـەن بیکـڕێت نـەی دەکڕی. لەشەقامی شەمسولعەمارەدا خاڵۆزاکەم بینی و باسی ئەمانم به تەواوی بـۆی کرد ئەویش به تەنباکۆ فرۆشێکی وت که دووتمەن بەمن قەرز بـدات. دووتمەنەکـەم وەرگرت و نزدیکی مەغریب هاتمەوه بۆ ماڵ، هەرچێکمان دەویست کڕیم و شەومان تێپەڕکرد.

ئەمڕۆ که جەشنی نەورۆزه لەخەونی بێ خەبەری هەسـتاین و لەگـەڵ جـەنابی شوجاعوددەوڵه له نێوان باغچەدا تۆزێ گـەڕاین، جارجارێـک خۆمـان و جارجارێـک بەبێ وەفایی دنیا پێ دەکەنین، هاتینەوه بۆ ماڵ، چەندێک له پیاوانی دەولـەتی و... بەجلوبەرگی تەواو ڕەسمیەوه بەسلاو ناردنەوه ڕۆیشتن و بینیمان چۆن ئەمـڕۆ ڕۆژی هەینییـه، وادیـاره زۆرتـری خەڵـکی تـاران بـۆ زیـارەتی حـەزرەتی عەبدولعـەزیم دەڕۆیشتن.

جەنابی شوجاعوددەولـە وتیـان: ئەگـەر ئێمـەش بمانتوانیبایـە بڕۆیـشتاین بـۆ حەزرەت عەبدولعەزیم، خراپ نەبوو عەرزم کرد: هەر چەند بـە ئـەم هـەموو خـەم و پەژارەوە نابێ لەسووچی دیوەکەمان بڕۆینە دەرێ. بەڵام لەبەر دوو شت ئەبێ بڕۆین. یەکەم ئەوەکە ڕوودەکەین لە درگای حەزرەت تا بەڵکوو بە هانامـان بگـات، دووهـەم سەرێکی خەڵکی ئەو ناوچە بدەین بەڵکوو دڵتەنگی لە دڵمان دەرچێ.

فەرموویان: بۆ خەرجی ڕێگە چی؟ دەبێ چی بکەین؟

عەرزم کرد: بەخەرجی شەوەوە ئەگەر بگەڕێتەوە ئاسودەین، دووسـێ تمـەنمان دەوێت، ئەویش ئەمن جۆری دەکەم؛ بەڵێ دووسێ تمەنم لەبرادەرێک قـەرز کـرد و فەیتونێکم لە نێو ڕێگادا دیت، سواری بووین لەفەیتوونچیەکەم پرسی چەندەمان لـێ دەستێنی تا ئێمە بەیتە حەزرەت عەبدولعەزیم؟

وتی: چون ئەمڕۆ جێژنە بە کەمتر لە دووتمەن نابێ.

ئەمن دیتم لەهەر بابەتێکەوە بەجەنابی شوجاعوددەولەم گوت: چاوڵی کـردن و سەیران و دانیشتن لە ماشین دا چـاکتر لەفەیتوونـە، قەبووڵـی کـرد و لەفەیتونەکـە دابەزین و ڕۆیشتین سواری ماشین بووین.

دوو ساعەت بە نیوەڕۆ مابوو گەیشتین حەزرەت عەبدولعەزیم و لە باخی سـەراج دا دابەزین و ئاسوەبوین بەڕاستی ئەمڕۆ ئەم باخە پڕ لـە حۆرییـە، نزیـک بـە پـەنجا، شەست خاتوون لە نێوان باخەکـەدا دەگـەڕان و قاقـای پێکـەنینیان وەکـوو دەنگـی کەوی دەشت گوێی پڕ دەکردەوە. لەگـەڵ جـەنابی شەجاعوددەولـە دەڕۆیـشتین، خاتوونێک بانگی لێ کـردم. چوومـە پێـشەوە ڕووبەندەکـەی هـەڵ داوە و چـاک و خۆشی لەگەڵم کرد، لەدیتن ڕووی وەکوو مانگی خانم شێت بووم، هەر ئەو خاتوونـە زۆر چاک بوو کە لەمەوپێش لەنێو ڕۆژنامـە دووهەمیەکـەدا باسـم لـێ کردبـوو دوای ئەوەکە تۆزێ قسەمان پێکەوە کرد، هاتمەوە بۆ خزمەتی جەنابی شوجاعوددەولە لـە ژێر دارێکدا دانیشتین، ئەو خاتوونەش لەگەڵ چوار خاتوون‌دا هاتنە لێو حەوزەکەو لـە نزیکی ئێمەدا دانیشتن. باخەوانی باخەکەم بانگ کرد و دیـوێکم دەویـست ئـەویش درگای دیوێکی کردەوە و ئەمنیش پارەیێکم پێ دا و پێم وت کە بچێ کـەواومان بـۆ

بێنێ، خانمیش تۆزێ نوقڵی پێمان‌دا؛ بەڵام کەم بوو جەنابی شوجاعوددەولە وتی: خانم ئێمە دووکەسین لە دیاری ئێوە غەریبین، ئەگەر دەکرێ تۆزێ زۆرترمان پێ بدە، خانم بانگی لێم کرد ڕۆیشتم، وتیان شوجاعوددەولە چی دەڵێ؟

وتم: جەناب و ئەمن دەڵێین ئێمە لەم شارەدا غەریبین و لەم مڵکەدا فەقیر و بەکەمەندی تۆ گرفتار و بەدوای تۆ دەربەند.

وتیان: ئێوە نە دەربەندن و نە فەقیر و نە کەسێ بۆ ئێوە داوی داناوە.

وتم: مەبەستم ئەوەیە کە تۆزێ نوقڵی زۆرترمان پێ بدە، لەم نێوانەدا لە خزمەتی خانمدا شووشەو ئیسکانم دیت.

وتم: خانم نوقڵ و مەی لەگەڵ یەکتردا خۆشە و هەڵبەت شێعرەکانی قائانیش خراب نیە کە دەڵێ: «کە واجبە نوقل و مەی بۆ مەی خۆر»

برێ لەم باسانەمان کرد و لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە دا هاتین بۆ دیوەکەی سەرۆی باخەکە کەبابەکەیان هێنا خواردمان خەریکی خواردنی چای بوین کە خانم هاتە سەر، لە دەم درگاکەدا ئیستکانێ چای خوارد و تۆزێ قسەی کرد، لەم ماوەیەدا جگە لەدووچاو و برۆی خانم شتێ دیار نەبوو.

هەڵبەت هەر جوانییێک کە بێت لە چاو دایە، چاکە کە ئەم چاو و برۆیە کە لە ئەسڵدا تیری موژگانی ئەم خانمە پیاو کوژەیە وەکوو شێعرێکی قائانی هەر لەم بارە وتوویەتی: «موژە مەڵێ کە تیروکەمانی کێشاوە»

بە ڕاستی لە هەوەڵ ئەم قەسیدەدا کە ئەڵێ: دوێنێ شەو ئەم سینەڕێزە شووشەییە و هەتا ئاخر. لەوەسفی ئەم خانمەدا بووە، بیستن کەی وەکوو دیتنەوەیە.

بەڵام لەم ماوەیەدا ئەسەدوللا کە لەنوکەرەکانی خانم بوو وتی: فەیتوونەکە ئامادەیە. خانم وتی: فەیتوونەکە ببە لادەرەوەی باخەکە و لە نێو دەشتدا ڕای گرە، منیش پاشان دێم، وتم: خانم دەبێ پێکەوە بچین، وەکوو نۆکەرێک لە ئێرەوە تا دەم درگای فەیتوونەکە لە خزمەتی ئێوەدا دەبین؟

وتی: زۆرچاکە بەڵام ئێستە ئێوە تۆزێ لە پێشەوە بڕۆن تا لەشەقام و ئەم خەڵکە دوورەوکەون تا منیش بە ئێوە بگەم.

لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە ڕێی کەوتین و لە نێوان دەشتەکەدا ڕاوەستاین تا خانم وەکوو تاوسێکی مەست لەگەڵ دووژنی‌تردا هاتن.

وتم بەخانم کە شێخ سەعدی شتێکی گوتووە بۆ ئەم کاتە زۆر باشە. ئەگەر دەستوور دەفەرمووی تا بیلێم (ئاخر ئەم خانمە لەسەوادو خەت و زانستی شێعردا، بەناو بانگە) وتی: بیخوێنە.

وتم: ئەمە تۆی لەگەڵ مندا و هاواری ڕەقیبان بەدوایدا.

و ئەوە ئەمنم کە لەگەڵ تۆدا ڕێگەی دەشتم لە پێش دایە.

بە بەختی خۆم باوەڕم نیە کە تۆ میوانی منی.

ئەو دەمە ئیتر چادری سوڵتانی هی دەروێشە.

خانم تاریفی لێم کرد و وتی: بۆچی ئەو پارچەیەت نەخوێند کە دەڵێ:

چلون بە دەست هاتوویی ئەی لە تاقەت زۆرتر.[٢٣]

چی عەرز کەم کە بیستنی ئەو پارچە شێعرە لە زمانی خانمەوە چەندە شیرین بوو و چەندە کاریگر بوو، کورت‌تر باسی کەم بەدەم قسە کردنەوە لە نێو سەوزەلانیەکاندا هاتین تا نزیکی ڕێگە کە فەیتوونەکەی خانمیان ڕاگرتبوو. خانم ماڵئاوایی کرد و سواری فەیتوونەکە بوو و چوو بۆ شار.

---

٢٣- ئەم غەزەلەی سەعدی ئەوا دەست پێ دەکا:

هەر کەسێ هەوەسێکی لەسەردایەوکارێکی لە پێش
ئەمنی سیابەخت گرفتاری هەوای دڵی خۆمم
قەت لەوە بیرم نەکردووەتەوە کە تۆلەگەڵ من بی
چۆن بەدەست هاتوویی ئەی جوانی لەوەش کە دەمویست زۆرتر
ئەمە تۆیی لەگەڵ من و هەرای ڕەقیبان لە دوومدا
وئەمە ئەمنم لەگەڵ تۆ ڕێگای دەشتم لە پێشە
هەروا داخی جیایی تۆ جەرگم دەسووتێنێ
مەگەر وەکوو مەرهەمێک بنیتە سەردڵی لەت لەتم
ئەی کە وتت بەخەیاڵەوە دڵ مەدە و عەشق دامەنێ
ئەمن ئاوام وتۆ بڕۆبیرێک بۆ خۆت بکەرەوە

وتم: ڕۆیشت لە لای ئێمە. ئەوەی کە وەکوو بەلا بۆ گیان بوو
لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولـەدا بـە لەشـێکی پەرێـشان و دڵـێکی لەدەسـت ڕۆیشتوو ڕوومان کرد لە حەزرەت عەبدولعەزیم.

وتم: چیرۆکی ئەمڕۆی ئێمە هەر ئەو چیرۆکەیە کە نزامی دەڵێ:

شەهبازێ لەسەر دارێکی سەرودانیشت
کە تەزەروێک بۆ خۆی ڕاوکات
و هەتا ئاخر:
زۆرتری ئەم شێعرانە چاکترە کە ڕاوچییێکی تر، ڕاوچی ئەم ڕێگەیە
پام قەت نانمەوە لەم باخەدا
بەبیرهێنانەوەی ڕاو دڵم داخی دەکرد

بەم جۆرە لە شۆفێری ماشین ئیجازەی سوار بوونمان گـرت و سـواری ماشـین بووین و لەدەرگەی دەروازەی شاردا دابەزین و فەیتوونێکمان پەیدا کرد و سوار بـوین و هاتینەوە بۆ ماڵ.

ڕۆژی شەممە دووهەمی خاکەلێوە، گەورەکانی قووچانیش فەیتونێکیان گـرت و بۆ سـەیاحەت دەچـن بـۆ بەهجـەت ئـاوای تـاران، لـەو جێگـەوە کـە خـودا یـاری موحتاجەکانە، بەبێ پارە بەو ئاوارەییەوە کەرسـتەی عـەیش و نۆشـیان بـۆ دەگـات. لوتفعەلی خان بەم جۆرە هێناویەتی کە: لەبەر دەرکەی باخی بەهجەتئاوا دابـەزین، چەند نەفەرێک لەخەڵکی تاران لە ژێر دارێکدا خەریکی تارژەنـدن بـوون و گۆرانیـان دەوت. دەنگی تارەکە ئێمەی ڕاگرت، تۆزێ گوێمان بۆ دەنگـی سـازە کـە ڕاگـرت و تۆزێکیش ئەمن تارەکـەم هەڵـگرت و ژەنـدم هـەموان مـاق بـوون و دوو ئیـستکان چاییمـان خـوارد و بـەڕێ کـەوتین لەگـەڵ جـەنابی شوجاعوددەولـە لـە قـەراخی ئیستەخرەکەوە دەڕۆیشتین، تۆزێ بۆ غەریبی ئەم سـەفەرەی خۆمـان دڵـتەنگیمان کرد و ئەمن دڵداریم داوە و وتم هیوا دارم کە هـەرچی زووتـر ئەسـبابی ئـازادی ڕێ بکەوێت و حەزرەتی ئەجەل لە حکوومەتی قووچاندا ببینم.

لەم ماوەیەدا چوارکەس لە فەیتوونێک دابەزین و هاتن بـۆ ئیـستەخرەکە یـەکێ

لەم خانمانە زۆر جوانە و ئەوی‌تریان خراپ نیە و دوو نەفەری دیکـەیان قەرەواشـن، لە نێو فەیتوونەکە چەند شووشە لیمۆیان بۆ خانم هێنا، ئەمن وتم ئەم لیموانە ئەسـڵ نیـە،خانم بیـستی و وتی: ئەگـەر حـەز دەکـەی وەرە بیبـە. ئـەمنیش لـە خـودام دەویست، دەست بە جێگە ڕۆیشتم بۆ خزمەتی خانم. خانم شووشـەیێک لیمـۆی دا بـە مـن، وتم ئـەمن ڕەفیقیـشم هەیـە وتی: کێیـە؟ وتم: شوجاعوددەوڵـە. وتی: شوجاعوددەوڵەی قووچان هەر ئەم پیاوەیە؟

وتم: بەڵێ شووشەیێکی‌تریان پێم دا ئەوەندە مەحوی نیگای ئەم خانمـە بـووم کە لە لیمو بردن و لەڕۆیشتنەوە بۆ لای شوجاعوددەوڵە و یا دانیـشتن لـە خزمـەتی خانمدا هیچم بەبیر نەهاتەوە.

لیمو لە دەستمدا بوون و نزیکی نیووسەعات بـێ خـۆ وەسـتابووم کـە هـەرچی خانم دەیگوت بۆ کردنەوەی درگای شووشەکە پێچت هەیە؟ من ئەبەدەن گوێم نەی دەبیست چی دەڵێن، تەواوی دم و چـاوی خـانم وەکـوو هـەتاو دەگەشـاوە، خـودا شاهیدە جوانی و قسە کردنی ئەم خانمـە دوور لـەباس کـردن و تـاریف دانەوەیـە و نانووسرێ...

شوجاعوددەوڵە و لوتفعەلی خان شەو دەگەڕێنەوە بۆ شار و شـەو لەگـەڵ ئاغـا میرزا ئەسەدوڵلا خەریکی خواردنی ئاوگۆشـتێک ئـەبن کـە درووسـتیان کـردووە و بـەیانی زوو ڕۆژی سـێهەمی خاکـەلێوە لـە خـەون هەڵدەسـتێن و هـەرکامێکیان بەلاییێکـدا دەچـوون. شوجاعوددەوڵـە کەوتـە دوای کـاری حکوومـەتی خـۆی. لوتفعەلی‌خانیش کە ئاوارە وبێ‌خەرجی بوو چاکتر وای دیت کە بۆ تێرکـردنی سـکی بڕوا بۆ ماڵ ڕەفێقە باوەفا و چاک و جوانەکەی خۆی (تەلعەتوسەڵتەنە) جۆرێـک کـە دەڵی: ئەمنیش ماوێیک بوو کە لـە خـانم... خەبـەرێکم نـەبوو و زۆر پەکـەر بـووم، چارەیێکم جیا لەوە کە بچم بۆ ئەوێ نەبوو، زۆر پەکـەر بـووم ڕۆیـشتمە مـاڵ خـانم، دیتم چەند ژنی دیکەش لەوێ بوون و مەجلسێکیان هەیە و دەنگی پێکەنینەکـەیان تا نێوان شەقامەکەش دەچێ. خانم تەلعەتوسەڵتەنە ڕۆیشتنی منی زۆر پـێ خـۆش بوو و سەندەڵییێک لە دەرەوەی دیوەکەوە بوو، دای پـێم و دانیـشتین، سـەنتوورێکم

لەوێ دیت، پرسیارم کرد وتیان ساحێبەکەی لێرەیە و هەر کاتێک دەتەوێ دەنگی ببیستی وەرە نێو دیوەکەوە کە چوومە نێو دیوەکەوە دیتم خۆرئاوایە و شەرابێکی زۆریان داناوە، یەکێ لە خانمەکان شەرابێکی بۆ هێنام، وتم لێم ببوورە حالم زۆر چاک نیە، ئەوەش ئێستا کاتی خواردنی مەشرووب نیە.

یەکێ لە خانمەکان وتی: بەڕاست کە خەلکی خوراسانی!

وتی: بۆ خواردنی مەشرووب بۆ بەڕێزتان هیچ کاتێک وەکوو ئێستا باش نیە ئەیزانی و ئێستا لێرەدا پێنج شەش خانم حازرە بۆ مەجلیسی مەشرووب و ساز و گۆرانی، واچاک ترە چۆن تارێکی چاک لەسووچی دیوودا هەیە و تۆش خۆت تارژەنێکی چاکی و لێرەدا هەیت، دووهەم ئەمە سەنتوور و سەنتوورژەن یانێ ژنێک زۆر جوان حازرە و گۆرانی بێژی چاوەڕەش کەهەیە، ئیتر بەم شتانەیشەوە دەڵێیت کاتی نیە؟ بەس دەبێ بڵێین خوراسانیت، ئەم خانمە کە ئەم قسانەی کرد لە خانمە زۆر ڕێکوپێکەکان بوو لە پێویستی بە تاریف نیە.

بەڵێ بەم جۆرەلوتفعەلی خان لە کەری شەیتان هاتە خوار و یا چاکتر بڵێین سواری کەری شەیتان بوو، تارەکەی هەڵ دەگرێ و بەساتێ عەیش بەرپا دەبێتەوە تا شەو لەوێ دەبێ بە جۆرێک کە خۆی دەڵێ و مەجلیس گەرم و نەرم بووە و خانمەکان بە بۆنەی کەیفی مەشرووب و دەنگی سیمی تار و سەنتوور کە پێکەوە کۆکیان کردبوو خەریکی هەڵپەڕین و خوێندن بوون. جوانی ئەم خانمانە کە پێنووس لە باس لێ کردنیان عاجیزە، لە بەیانیەوە هەتا خۆرئاوا کە تۆزە تۆزە، تیشکی مانگ لەسەر جەماڵی ئەم وەکوو مانگانە دەرکەوتووە...

تاشەش حەوت سەعاتێک لەشەو بە خۆشیەوە تێپەڕ بوو... بۆ بەیانی سێ ساعەت لە ڕۆژ ڕۆیشتبوو، هەستام لەخەو و هەر جۆرێک بوو خۆم لە دەست ئەو خانمانە خەلاس کرد و هاتمەوە بۆ ماڵ و لەگەڵ جەنابێ شوجاعوددەولە ڕۆیشتین بۆ دیتنی جەنابی میرزای بابای موشیروددیوان قووچانی کە ئەوانیش خەلکی قووچانن و یەکێ لە مونشیەکانی شوجاعوددەولە بوو و لە قووچانەوە هاتووە بۆ تاران

و ماوەیکە لە خزمەت موشیرووددەولە[٢٤]دا خەریکی کار کردنە و ئێستا کە گەیشتوونەتە مەقامی سەرۆکایەتی ئێران، ئاغای میرزا باباش گەیشتوەتە مەقامێ کە گەورەکانی دەوڵەت بۆ چاک کردنی کارەکانیان بێ شک و لەڕێ ناچاریەوە دەچنە دیداری موشیروددیوان، وەکوو ئەوە کە لە قووچاندا لەمەجلیسی شوجاعوددەولە بێ سەردانەواندن و بی ئیزن نەیدەتوانی دانیشێ و ئێستاش فەرق[٢٥] و توافەتێک هەیە زۆر جار بیستوومە کە پارە دێنن، بەڵام پیان دەداتەوە، ئەگەر کەسێک بۆ چارەسەر کردنی کارێک بە دزیەوە شتێکی پێ بدەن وەری ناگرێ[٢٦].

بەڵی ڕۆژی دووشەممە دەهەمی ساڵی ١٣٢٥ کە بەرانبەر بە چوارەمی خاکە لێوەیە، جارێکی تر لە ماڵی تەلعەتوسەلتەنەوە دێن بە دوای لوتفعەلی خاندا کە بڕوا بۆ ئەوێ، ئەویش کە بۆ نیوەڕۆ نانی بۆ خواردن نیە،بۆیە باشترم وادیت بچم بۆ ماڵ

---

٢٤- موشیرودەولە، میرزانەسروللاخان سەدر ئەعزەم ئێران لە کۆتایی دەسەلاتی موزەففەرەدین شا و سەرەتایی پادشایی موحەممەدعەلی شا دا، خەلکی نائینی ئیسفەهان بووە ئەو لەزەمانی میرزا عەلی ئەسغەر خانی ئەتابەکدا بووە بەوەزیری ناوخۆ و پاشان بووە بە وەزیری دەرەوە و نازناوی مسباح ئەلمولووک بووە لە ساڵی ١٣٠٨ی مانگی دا نێوی موشیرولمولکیان پێدا. دوای کوشتنی ناسرەدین شا لە ساڵی ١٣١٣کە موحسێن خان موشیروددەولە لە پاریسدا کۆچی دوایی دەکات، ئەتابەک میرزا، نەسروللا خانی لەوەزارەتی شەڕەوە هێناوە و کردی بەوەزیری دەرەوە و لە ساڵی ١٣١٧ بە موشیروددەولە ناوی دەر کردووە. موشیروددەولە لە ساڵی ١٣٢٤ بووە بە وەزیری یەکەم و لە شەعبانی هەر ئەو ساڵەدا کۆچی دوایی کرد. موعین، بەرگی ٦ لاپەڕەی ١٩٨٧

٢٥- لەم بارەوەیە کە شێخ سەعدی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی: هونەرمەند بۆ هەر جێگاییێک بڕوا، قەدر دەبینێ و لەسەرەوە دادەنیشێ و لەبارەی حاڵ و ڕۆژگاری شوجاعوددەولە و حاج میرزا بابا مونشی دەبن. جارێکی تر بەهونراوەی سەعدی ئیشارەبکەین کە دەڵی:

ئەوەی لە دێ لە دایک بوو بە زانا　　بوون بە وەزیری پادشا

کوڕەکانی وەزیری بێ عەقل　　بۆ سواڵکەری چوون بۆ دێ

٢٦- بە داخەوە یەک لاپەڕە لە باسەکانی لوتفعەلیخان کە باسی موشیروددیوان زەعفەرانلوو بووە لێرە داکەوتووە و گوم بووە.

تەلعەتوسەڵتەنە. سپاس بۆ خودا خۆشمان ڕابورد و شەویش لەوێ بوین.

ڕۆژی سێ شەممە یازدەهەمی سەفەریش لە ماڵی خانم ماینەوە و زۆر خۆشمان ڕابوارد، ڕۆژی چوار شەممە شەشەمی خاکەلێوە کەسێ خەبەری هێنا کە دووسبحەینێ حەزرەتی ڕوکنوددەولە عەلی‌نەقی میرزا برازای ناسرەدین شا ئەکەونە ڕێگە لەم خەبەرە زۆر دڵم گیرا. چون دەزانم جەنابی شوجاعوددەولە ئەگەر سێ چوار چەکی نەبێ، ناتوانن ڕێ بکەون و لەم دوورۆژەیشدا مەحاڵە، بەم جۆرە بیرم کردەوە کە ئەگەر جەنابی شوجاعوددەولە دوای ڕۆیشتنی حەزرەتی والا لەم شارە بمێننەوە هەموان پریشان‌تر دەبن.

چۆن ئەوان لە مێژەوە چاوەڕوانی ئەم کاتەبوون بەڵکوو پارەیێک پەیدا ببێ، بەرنگاری چوونی دەبن و بەم جۆرە حاڵەتی من زۆر خراپە کەبە بۆنەی وجوودی ئەم پیاوەو لەهەموو جێگەیێک ماومەتەوە و ئەوانیش کە حاڵ و وەزعیان و شێوەی ڕەفتاریان دیارە.

هەر جۆرێک کە بوو بە حاڵەتی خەون و یاوەوە دووسەعات لەشەوڕۆیشتبوو، ڕێکەوتین بۆ ماڵی جەنابی ئاغای ئەعزەمولمولووک کە مونشی باشی و سەرۆکی درگای والا حەزرەتە، ڕوکنوددەولە ڕۆیشتن چۆن ماڵیان زۆر دوور بوو بە زەحمەتێکی زۆرەوە گەیشتنە ئەوێ، دام لە درگا یەکیان هات و وتی هێشتا لە ماڵ شازادە نەهاتووەتەوە زۆر حاڵم تێک چوو لە ژێر بەرهێوانەکەدا دانیشتم. و کاغەزێکم بۆ خزمەتیان نووسی و دام بە دەست نۆکەرەکەیانەوە و لەوێ هاتمەوە و لە شەقامی چراگا، دیتم جەنابی ئاغای ئەفزەلوددەولە بەسواری دێت، سلاوم لێ کرد، جوابی دامەوە و خێرا دابەزی دەستی یەکترمان گرت و ڕێگاییێکی زۆر پێکەوە هاتین و ئەو شتانەی کە دەمەویست لە خزمەتیاندا عەرزم کرد و ڕامسپارد کەهەر بەو جۆرە دەبێ بە حەزرەتی والا شازادە ڕوکنوددەولە سەرۆکی نوێ خوراسانی ڕابگەیەنێ، ڕۆژی پێنج شەممە ١٣ سەفەر ١٣٢٥ ڕێکەوتە لەگەڵ ٧ی خاکەلێوەی ١٢٨٦ کە موشیروددەولە دەمرێ، ڕێکەوتم و گەیشتمە ماڵ جەنابی ئەفزەلولمولک و ڕۆیشتمە خزمەتی، فەرموویان حەزرەتی والا مەرحەمەتیان فەرمووە و بە ئێوە ئیزنیان داوە

بێنە خزمەتی، دووسبحەینێ دووشەمەیە بچن بۆلای موبارەکیان. لەوێ هاتمەوە بۆ ماڵ خۆمان بۆ خزمەتی شوجاعوددەوڵە دوو شەوە کە من نەبووم و لە ماڵی خانم تەلعەتوسەڵتەنە بووم تۆزێ پەشێو بوو تا ئەوەی کە تۆزە تۆزە چاک بوومەوە.

گوتم پایەبەرز ڕوکنوددەوڵەی نۆهەم[27] ئەم مانگە کە پێنج ڕۆژی دیکەیە کەونە ڕێ و بەڕێزتان کە لە لایەن ئاسەفوددەوڵەوە بێ کار کراون و ئێستە کە ئاسەفوددەوڵە حکوومەتی خوراسانی لێ وەرگیراوەتەوە و دوو ڕۆژی پێش ڕەوانەی تاران کراوە و شازادەش تا چەند ڕۆژی داهاتوو دەچنە ئەوێ و من سوور دەزانم ئێوەش دەبێ بچنە تاران و قەت وەرناگەڕێنەوە.

بەڵێ ئەم باسانەی کە بۆ بەڕێزیانم گوت زۆر قازانجی هەبوو و تا دەوروبەری یەک سەعات بیری لێ کردەوە و حاڵی گۆڕا.[28] گوتم: لەم نیوەشەوەدا خەم و خەفەتی پێ ناوێ و لەم کاتا سەر خۆش بوون خۆشە؛ بەلام بەیانی کاتی بەرلەبەیان دەبێ وەڕێ کەوین، بەڕێز حاجی ئەمینوززەرب و ڕەیسوتوججار و سەیید عەلیش دەبێ ببینم و پێیان بڵێم من دارو نەدارم هی ئێوەیە و بەهەر جۆرێک دەبێ بەڵکوو بە قسەم بکەن لەگەڵ سەرۆکی حکوومەتی خوراساندا بۆ قووچان بڕۆم.

بەڵێ بەهەر شێوەیەک بوو تۆزێ ڕامبوارد و هاوکات شەرابی گیلاسیشم دەخواردەوە و بەلام بیرم هەر بە لای زێد و ولاتەوە بوو.

ڕۆژی هەینی ١٤ی سەفەری ١٣٢٥ بەرانبەر بە ٨ی خاکەلێوەی ١٢٨٦ سەعاتێ پاش ئەوەی تیشکی خۆر دەربێ، وەڕێ کەوتین، بەڕێز شێخوددەوڵە بەیانی زوو

---

٢٧- پێم وایە لوتفعەلی خان حاڵی لەسەر خۆ نەبوو بەروارەکەی بەهەڵە نووسیوە، ناوبراو ئەم وتانەی لە بەرواری سێزدەی سەفەردا گوتووە کە دەبێتە شەوی چواردەی مانگ، دەی بەم شێوە نۆزدەهەم دروستە.

٢٨- لەدانیشتنی ئەنجومەنی شۆرای نەتەوەیی‌دا هەر لەبەرواری ١٣ی سەفەری ١٣٢٥ هەمیسان باسی دیلە قووچانیەکان لە لایەن سەید حەسەن تەقی زادەی نوێنەری ئەنجومەنی نەتەوەییەوە بەم شێوەیە خرایە بەردەست، سەبارەت بە دیلەکان دادگا تا ئێستا چی کردووە؟ ئەمە سێ ڕۆژە ئاسەفوددەوڵە لە خوراسانەوە هاتۆتەوە چی کردووە. (کۆچی مێژووی کورد بۆ خۆراسان، بەرگی ٣، ل٣٠٧)

خۆی گەیاندبووە ماڵی ڕەئیسووتتوجار...

ڕۆژی شەمەی ١٥ی سەفەر ڕێکەوت لەگەڵ ٩ی خاکە لێوەی ١٢٨٦ کاتی دەرهاتنی تیشکی خۆر لەخەو ڕاپەڕیم، بینیم هەموان نووستوون، لە بەر ئەوە لە لایەن ئەفزەلولمەلێکەوە بۆ خزمەتی شازادەی ڕوکنوددەولە دەعوەت کرابووم بەڕێ کەوتم و خۆم گەیاندە ماڵی بەڕێزیان و بەڕێز ئەفزەلولمەلێکیش هاتبوون و گەیشتنە خزمەت شازادە زۆربەخێر هاتنی منی فەرموو و نووسراوەیێکی نووسی و وەهای نوسیبوو:

«بەڕێز و پایە بەرز ئەفزەلولمەلێک مونشی باشی»

موعتەمێدوسوڵتان لوتفعەلی خان سەرتیپ لە پیاوە خۆش‌ناوەکانی دەرەگەزە و لە ڕۆژگارانی دوورەوە خزمەتگوزاری کردووە و هونەرمەندێکی خۆش خەتتە و ئێمە زۆر خۆشمان ئەوێ یان لە دارولئینشا کارێکی بۆ بدۆزنەوە یان کارێکی لە شانی خۆی دا پێی بدەن تاکوو بێکار نەمێنێتەوە

منیش زۆر سپاس بەڕێزیانم کرد و هاتمەوە بۆ ماڵ لەبەر ئەوەی داوبەستەکەی شوجاعوددەولە و ڕەیسوتتوجار ماوەیێکی زۆر بوو هەروا مابووەوە و هەر لایەک بە خەیاڵی خۆیان حەسێبێکیان دروست کرد بوو بە کاری ئەوی تریان نەدەهات و شوجاعوددەولەش چەندین جار سەبارەت بەم حەسێب و کتێبە لەگەڵ سەید عەلی قومیدا قسەی کرد بوو. منیش پێیانم ڕاگەیاند بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، داواتان لێ دەکەم بچین بۆ ماڵی ڕەیسوتوجار، بۆیە پێش ئەوەی ئێوارە بێت چوین بۆ ماڵی ڕەیسوتوجار و چایێکمان خوارد و خێرا گوتم جەنابی شوجاعوددەولە تەشریفیان هێناوە و دەبێ هیچ حەسێب و کتێبێکتان پێکەوە نەمێنێ.

بۆیە هەردوولایەن حەسێبی خۆیان دەرهانی و من هەرچێ کە ئەوان گوتیان نووسیمەوە و حەسێبیان لەدەوروبەری ١٣٠هەزار تمەندا بوو، بۆشەست هەزار تمەنی برێ لە خەڵکی قووچان دراو ڕەیسوتوجار ١٣ هەزار تمەنی بە شوجاعوددەولە بەخشی.

بۆ ٥٠ هەزار تمەنی دیکەش بڕیار درا بەیانی بەڵگەی بۆ بکەینەوە تاکوو قاسم

ئاوای قووچانی لە باتی پێی بدرێ، بە ماوەی ٣ ساڵ و دەبێ ڕەیسوتوججاریش ٣ هەزار تمەن بدات و بەڕێز شوجاعوددەولە لەگەڵ شازادەدا ڕەوانەی خوراسان بکات.

لەبەر ئەوەی هەمووی ئەمانەی کە گوتم من نووسیبووم لەم نامیکەیەدا نووسیم کە بڕیارمان لەگەڵ ڕەیسوتوججاردا ئەوە بوو شوجاعوددەولە لەگەڵ شازادەدا بڕوات بۆ خوراسان، ئەگەر وا نەبوای داوبستەتەکە هەڵدەوە شایەوە. هاتمەوە بۆ ماڵ پاش نیوەڕۆ لوتفعەلی خان و شوجاعوددەولە بۆ سەیران دەچن بۆ شەقامی عەلائوددەولە کە دەڵێ:

٠٠٠ لەوێوە گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان، بەرپرسانی دیوانی تازە لە قووچانەوە گەڕانەوە، شوجاعوددەولە زۆر ڕیزی بۆیان دانا.

تازە سەعاتێ لە شەو تێپەڕیبوو، بەڕێز شوجاعوددەولە بەمنی ڕاگەیاند بەڕێ بکەوین و بچین بۆ ماڵی خانم... بۆ ڕابواردنی کات منیش گوتم ئێوە بچن با من تۆزێ تەنیا بمێنمەوە پێم وابوو لەوێ ناتوانم خۆش ڕایبوێرم کەچی پاش چوونی شوجاعوددەولە زانیم لەوێ دەخەوێ ونایتەوە منیش لەگەڵ غولامحوسەین خان و موحەممەدخان وسێ کەسی تر کە لە ماڵ بوین، سازو گۆرانی وشەراومان تەیار کرد.

## پێوەندی و گیروکێشەی شوجاعوددەولە لەگەڵ ئەمینوززەرب و ڕەیسوتوججاردا

لە بەرگەکانی پێشوودا و لە لاپەڕەکانیتردا تا ڕادەیەک لەم بارەوە باسمان کردووە کە ئینگلیزییەکان بۆ لە ناو بردنی بنەماڵە بەناوبانگەکانی کورد لە خوراساندا واتا ئیلخانییەکانی زەعفەرانلوو لە قووچان و شادلووەکان لە بجنوورد.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە گەلاڵەی زۆریان بەدەستەوە بوو کە یەکەمینی لە ناو بردنی ڕەزاقولی خانی زەعفەرانلوو بوو کە لە شەڕی دژ بە نایبوسەڵتەنە لە ناوچوو، کوردەکانی خوراسان تووشی خەساری زۆرکران.

پاش کوژرانی سام خانی ئیلخانی زافەرانلوو، ڕەزاقولی خانی کوڕی کە ئالاهەڵگری هەرات بوو و پاشان هەر ئەم عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولەیە کە

خواوڕاستان پیاوێکی خوێڕی و بەرەڵا بوو، کەوتە دوای ئینگلیسیەکان. کوژرانی سەردار موعەززەز بجنووردی بە دەستی ڕەزاشای نۆکەری ئایرۆنساید، ئینگلیزییەکان بۆ ڕاگرتنی ئیلخانیەکانی کورد لە خوراساندا بەرنامەی باشیان تەیار کرد و تەنانەت لە قووچانیشدا بە لێدانی نووسینگەی شەریکەی نەتەوە بۆ دوژمنی کوردەکان و هەروەها لەسەردەمی موحەممەد ناسرخانی شوجاعوددەولەش‌دا بارودۆخی کوردەکان لە لایەن ئەوانەوە ئالۆز کرا، ئەمینوززەرب و ڕەیسوتوججار کە هەردووکیان ئامۆزای یەکتر بوون لەبنەڕەتدا لە یەهەموودییەکانی ئێسفەهان بوون کە لە دوایین ڕۆژەکانی دەسەلاتی قاجاڕدا دەسەلاتیان وەدەست هانی و لە باری ئابوورییەوە گەشەیان کرد و بەم شێوەیە خەریکی کلاو بەسەرنانی پاشاو دەسەلاتدارەکانی‌تری ئێران بوون، ڕەیسوتوججار لە خوراسان و ئەمینوززەرب لە تاران خەریکی فێڵە و مەکری خۆیان بوون. ئەم دووکەسە توانیان شوجاعوددەولە بێدەست بکەن و دەسەلاتی قووچانی لێ وەربگرن و هەمیسان بۆ ماوەیێکی‌تر ڕەوانەی قووچانیان دەکردەوە و هەمیسان بێدەسەلاتیان دەکردەوە.

ئێستاش لە دەوروبەری ٣ ساڵ دابوو شوجاعوددەولە لە تارندا لە ژێر چاوەدێری بوو، لەبەر ئەوەی دەوڵەت و ئەنجومەنی شۆرای نەتەوەیی و دادگا و سەدرئەعزەم و مەشرووتە و پادشا هەمووی خۆیان بوون.

بزانین لەم بارەوە لوتفعەلی خان چی نووسیوە: دەوڵەتێ کە خواداویە ؟؟

ڕۆژی یەکشەمەی ١٦ی سەفەری ١٣٢٥، پاش دەرهاتنی تیشکی خۆر چایم خوارد و بارانێکی خۆش لەسەر خۆ دەباری، دارچرۆی دەرکردبوو زۆر خۆشە! چووم بۆ ماڵی ئەمینوززەرب، ڕەیسوتوججار لەحەمام دابوو. سی کەس چاوەڕێی هاتن بوون، بەخێر هاتنی کردین، ئەم پیاوە، زۆر عاقڵ و زیرەک و زانایە و پیاوێکی پیاوانە و خاوەن ڕەحم و بەزەیە و هەروەها ماڵ و منداڵی زۆر و باشی هەیە.

بەڵێ هەرکەس ئەم هەموو گەورەییەی بێ دەتوانێ ماقووڵ بێ؛ بەلام پیاوێکی خوێڕی وەکوو شوجاعوددولەش هەمووی ئەمانە بە با دەدات و بۆ ئەوەی بێ عەقڵ و بیرو ئەندیشەیە، حاجی ئەمین بەم گشتە ماڵ و پووڵ و پارە بەم هەموو منداڵ و

ژنی باشەوە لەگەڵ گـەورەدا گـەورە و لەگـەڵ بچـووکـدا بچووکـە، لـە خوراسـاندا زۆرکەس هەن کە دەوڵەمەندیش نین، بەڵام زۆر لەخۆ بایین.

ڕەیسوتوججار لە حەمام هاتە دەرێ لە نێوانی باخچەدا تۆزێ پێکـەوە قـسەمان کرد و فەرموویان من دەچم بۆ خزمـەتی ئاسەفوددەولـە و زوو دەگەڕێمـەوە و ئێـوە لێرەدا ڕاوەستن تا دێمەوە. منیش لە خزمەت میرزا حوسەینی قـەزوێنیدا پێکـەوە دانیشتین و پاش دوو سەعات ڕەیسوتتوججار گەڕانەوە.

خزمەتەکانم لە نەبوونی شوجاعەدەولەدا کرد، وادابین کرا کەسێک نووسەر بێت و بەڵگەی ماڵەکەی شوجاعوددەولە ودانی ئەوبە ڕەیسوتوججار بنووسێت لە خزمەت ئەودا نەهارم خوارد و دوای نەهار زۆر ماندووبووم و گوتم: ئەگەر ئیزنم بدەن بـڕۆم تـا بڕێک بحەسێمەوە، گوتیان قەیدی نییە، ئێوە بـڕۆن بـۆ ماڵـێ و ئـەوڕۆ تـا سـبەینێ دەڵێم بەڵگەکان بنووسن و ئاگادارتـان دەکەمـەوە، لـەو وەختـەدا لەگـەڵ جـەنابی شوجاعوددەولە وەرن بۆ خزمەتی یەکێک لە پیاوەکان و بڵێن واژۆی بکەن و بڕۆن.

خواحافزیمـان کـرد و لەگـەڵ مـیرزا حوسـێن خـان گەیـشتینە بـەردەرگای نگارستان، باران شەستی دەکرد، چوینە نێو قاوەخانەیەکی گـەورە و ئێـستا بـارانێکی زۆر دەبارێ. دوروشکەکان لە نگارستان کە لە پێش پارلمانی شۆرای نەتەوایـەتی لـە گەڕان دایە و منیش لەگەڵ کاک میرزا حوسێنخان دانشتبووم و چاییم دەخـوارد و بیرەوەریەکانی خۆمم دەنووسی تا دوایی خوا چی دەکات. لەوێوە هاتمەوە بۆ ماڵـێ، بەکورتی بە جەنابی شوجاعوددەولەم گوت.

دوای نەهار لە خزمەت ئەودا ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی ئەمینوززەرب، گوتیان هەر دوو ئامووزاکە (ئەمینوززەرب و ڕەیسوتوججار) لە پارلمانی شۆرا بوون.

چوومە نێو چایخانەکـەی عـەلی ئـاودارچی کـە لاوێکـی ژیربـوو و لـە زانـستی ئاودارچی و قاوەچیگەری لە تاراندا بە ناوبانگە، چایی و سـیگاریان هێنـا و خواردمـان، ئەو شتانەی کە دەبێ بۆ ئاودارخانە ببێت، لێرە هەیە و سـەماوەری تـازەی بەزێـڕەوە ئاخنرا بوو، سەری قلیانەکان زێڕ و نوقرە بوون، نیو سـەعاتێکی بـە ئێـوارە مـابوو کـە هاتینە نێو باخچەی ماڵی ئەمینەززەرب، تاوێ باران شەستی دەکرد و تاوێ خۆرەتـاو

بوو و هەوا ڕەنگ و بۆنێکی پەیدا کردووە کە شێوەی پەیدا نابێ، بە تایبەت لەو باغچەیەدا کە داری کاج و شمشاد سەریان بەیەکەوە نابوو و ئەوندە سەوزە کە پیاو سەری سوڕ دەمێنێ و دەوروبەری شەقامەکان لە گوڵ و سونبوڵ و وەنەوشەگەلی جۆراوجۆر لە نێو باغچەکاندا لەهەر گوڵێکی فەرەنگی پڕ بووە و دارەکانی نارنج و پرتەقاڵەکانیان تازە لە گوڵخانە دەرهێنا بوو و فوارەی حەوزەکان ئاوی زۆری هەبوو، شەوگەڕەکان لە پڕێکدا هەڵکران و وێنەی شەوگەڕەکان لە نێو ئاوەکەدا دیار بوو و قەناریەکانی نێو قەفەس لەهەر لایەکەوە دەیانخوێند، لەو باغچەیەدا بۆ مرۆڤ جۆرێکی خۆش لە شەوێکی خۆش دا ڕادەوێرێ، بەڵام چۆن ئێمە لە هێڵی مرۆڤایەتی دوورین لەهەر جێیەک بین خەم و خەفەتمان زۆرتر دەبێت، هۆی ئەوەی کە حاڵی ئێمە ئاوایە: هەر ئەوەندە دەڵێم کە دوو هەزار دەردی بێ دەرمانمان هەیە کە هەر کامێکی بۆ کەسێک و جێیەکە بە تایبەت دەردێک کە ئێستا سەبارەت بە فەرمانی جەنابی ڕەیسوتوججار هەیە منیش لەو پازدە، شازدە[29] مانگەی لە خەم و خەفەتی جەنابی شوجاعوددەولە وەک هاورێ و شریکی بووم و بێجگە لە خۆم و خودا کەسی دیکە ئاگاداری نییە، خۆشی و شادی و خەم و دەردی خەڵک، شادی وخەمی خۆمە، بە کورتی، لە چوارمانگی پێش لەسەرماوەزی ١٢٨٥جەنابی شوجاعوددەولە بوو بە سەرۆکی وەزیران،[30] جەنابی ڕەیسوتوججار دەبێ لە خوراسان بانگ بکرێت و لە تاران پرس و ڕای بکەین و ڕوونی بکەینەوە کە هۆی گرتنی خواجە جەڕڕاح چی بووە.[31]

---

٢٩- ئێستا کە خاکەلێوەی ساڵی ١٢٨٦ه عەبدوڕەزاخان شوجاعوددەولە لە ئاخری خەزەڵوەر یان سەرەتای سەرماوەزی ١٢٨٤ بۆ تاران ڕۆیشتووە.

٣٠- سەرۆک لە سەردەمی خوالێخۆشبوو مشیروددەولە، نووسەری فەرمانی مەشرووتە بوو، دوای دەست پێ کردنی دەسەڵاتی عەینوددەولە سەرۆکی سەردەمی مەشرووتە پوستی سەرۆکایەتی وەدەست هانی و دوای ماوەیەک میرزا عەلی ئەسغەرخانی ئەتابەک بە دەعوەتی محەممەدعەلیشا بۆ ئێران گەڕایەوە و سەرۆکایەتی وەزیرانی گرت بەدەستەوە و مشیروددەولە بێدەسەڵات کرا بوو و لە شەعبانی ئەو ساڵەدا لە دنیا دەرچوو.

٣١- لە دەقی خاجەی جەڕڕاحدا هاتووە کە زەوین و گوندەکانی خاجەی جەڕڕاح لە نزیکی چنارانەوە

لەبەر پاڵپشتی موشیروددەولـە لـە جـەنابی شوجاعوددەولـە[٣٢] جـەنابی ڕەیسوتوججاریان بەپەلە بانگ کرد و دوای هاتنی و بە بێ وتوویژ و وەلام و پرسیار و دیداری دوولا، جەنابی ڕەیسوتوججار بـەهۆی دەسـەلاتێ کـە هـەبووی فـەرمانی گرتنی جەڕاحی نارد و برووسکەی بـۆ خوراسـان کـردو ئاکـامی کارەکـەی بەئـەوێ ڕاگەیانـد، چەنـد کۆبوونـەوەش بـۆ دیمانـەی دوولا دابـین کـرا جیـاوازییێکی بـۆ ڕەیسوتوججار نەبوو، قازانجێکیشی بۆ جەنابی شوجاعوددەولـە نـەبوو، وردە وردە لـە نێوان دوودەستەدا هاتوو چوون و وتوویژ داندرا، جـەنابی ڕەیـسوتوججار و جـەنابی شوجاعوددەولە بێ ئاگاداری من (لوتفعـەلی خـان) کەسـێکی دیکـەیان دانـابوو کـە شەست حەفتا هەزارتمەن لە زەوینەکانی قووچانیان کردبووە قەواڵە، دارودەسـتەی جەنابی ڕەیسوتوججار قەواڵەکەیان بەئەمانەت لە خزمەت کاک سەید عـەلی قـومی دابنێن، جەنابی ڕەیسوتوججار بەلگەکانی زولفەقار و حاجی موعاونی ڕەت بکاتەوە و پێنج هەزار تمەنیش بدەن تا لـە کاتـێ گـۆڕانی دەسـەلاتی ئەیالـەت لـە دڵـگیری شوجاعوددەولە کەم بکرێتەوە و لە تارانەوە ڕەوانەی خوراسان بکرێ و ئەوکاتە قەباڵـە ڕەت بکرێتەوەو بە ڕەیسوتوججاری بدەن.

ئاسەواری کاری بێ پرسیار و بێ ڕاوێژکاری بەم شرۆڤەی قەواڵەوە دیارە، ئەگـەر چی مونتەشێردیوان، میرزا غـولام ڕەزاخـان و حـاجی خـانی سـەرتیپ قووچـانی و ئەوانی دیکە لە جەنابی شوجاعوددەولە دڵیان ئێشا بوو و لەم ماڵە ڕۆیـشتن، بێجگـە لەم شتانە یەکتریان ئاگادار کردبوو و شەوێک چووینە خزمـەتیان و داوای پیاوتیمـان لێ کرد، ئەویش گوتی: ئەو مامەڵەیە و قیمەتێک کە لـە قەواڵـەکەدا دابـین کـراوە، بیست هەزارتمـەن لـە قیمـەتی ئـەو موڵـکانە، کـەم کراوەتـەوە، دوایـی تـا پـارەی بەڵگەکانیشیان لە جەنابی ڕەیسوتوججار نەگرتووە، نابـێ قەواڵـەکە بـدەن. جـەنابی شوجاعوددەولە ڕای گەیاند کە من قەواڵەکەم بەکەسێک سپاردووە،تا ئـەو شـتانەی

---

بووە کە لە بەرگی یەکەمدا سەبارەت بە موحەممەد ناسرخانی شوجاعوددەولە باسمان کرد.

٣٢- ئەم هاوڕێیە لەگەڵ موشیردیوانی قووچانی باوکی خوالێخۆشبوو کامبووزیا کە پێـشتر نێویمـان هێناوە ئەوسەردەمە مونشی موشیروددەولە بوو.

من دەمهەوێت نەیکات، قەواڵەکە بەڕەیسوتوججار نەدەن؛ بەڵام دوای چەند ڕۆژ ئاگادار بووین کە بێبەڵگەکان و بی حێسابەکان بە دانی پێنج هەزارتمەن پارەی نەخت (لە لایەن ڕیسوتوجار بەشوجاعوددەولە و بەرێ کردنی شوجاعوددەولە لەگەڵ شازادە ڕوکنوددەولە بۆ خوراسان) جەنابی سەید عەلی خۆی قەواڵەکەی بردووە و ڕەیسوتوججاریان داوە، کلاوێکی گەورە چووە سەر شوجاعوددەولەی ساویلکە کە بەمەلایەتی ئەو بڕوای بوو منیش کە شەو ڕۆژ لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە بووم و بەبڕوای خۆم هیچ کارێکی بێ ئاگاداری من نەدەکرد، لە نووسینی ئەو قەواڵەیەدا بە من هیچی نەگوتبوو و کاتێ بیستم، قەواڵەکە لە دەست چووبوو.

بەکورتی بڵێم، دوایی وردە وردە لەگەڵ جەنابی ڕەیسوتوججار وتووێژمان کردو پێنج شەش جاریش بۆ خۆم ڕۆیشتم و وت وێژم لەگەڵ کرد و حیسابەکەم نووسی، دوایی لەو زەوینانە ٥٠هەزار تمەنی دیکە ماوە بۆ جەنابی ڕەیسوتوججار کە بۆ ئەم ماوەیەش بۆ زەوینەکانی قاسم ئاوا (ئێسفراین) دەبوای پارەی چوار ساڵە بدەن.

بە ئەو مەرجە کە هەر پێنج هەزار تمەنەکەی دیکە پارەی ڕەیسوتوججار بێ و لەگەڵ شازادە ڕەوکنوددەولەی حاکمی خوراسان لە تارانەوە بنێرن، ئیدی ئەوەی کە قەرزێکی وا جەنابی عەلی ئاغای حاجی ئەمینوززەرب لە جەنابی شوجاعوددەولە هەیەتی، لەو بابەتەوە ئەوان ئاسوودە بکەن کە کاتێ ڕۆیشتن بەرنگاریان نەبن، دوای ئەو هەموو سۆیند و وتووێژە کە لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە و بەنوێنەرایەتی جەنابی سەید عەلی قومی و کەسانی دیکە کرد بووی، هەر بەزۆری خودی جەنابی ڕەیسوتوججار، منیش یەک دووجار چوومە ماڵی جەنابی ڕەیسوتوججار و لەوێوە ڕۆیشتین و قسەمان کرد، چۆن جەنابی ڕەیسوتوججار لە مێژەوە منی زۆر خۆش ئەویست و قەت قسە ڕاستەکانی خۆیان لەمن نەدەشاردەوە بەدزییەوە چوومە خزمەتی و گوتم چۆن دەزانم ئێوە منتان زۆر خۆش دەوێ بۆیە دەڵێم کە من لە لایەن جەنابی شوجاعوددەولەوە بۆ تەواو بوونی مامەڵەی زەوین قاسم ئاوا لەگەڵ

جەنابتان قسە دەکەم و جەنابی شوجاعوددەولـە بـەمنی وتـووە کـە ڕەیـسوتوججار دوای دانی قاسم ئاوا بەئـەو دەبـێ پێـنج هـەزار تمـەن بـەهۆی ڕۆیـشتنی مـن بـۆ خوراسان بدەن و مامەڵەی جەنابی حاجی ئەمینوززەرب بۆ خۆیان بڕیار بدەن  کە بۆ من زەحمەت نەبێت تا دوایی تاوانی بدەم، ئێـستاش مـن داخـوازی دەکـەم ئەگـەر ئەوەتان بەدڵە، بەقسەم بکەن، منیش لە وتووێژی ئەویێ خەبـەردار بکـەن تـا خـۆم بکێشمەوە چۆن مەبەستم لەم کارە چاکەیە؛ دەنا بـۆ دەبـێ بـەخاتری ئـەوە لـە لای جەنابی شوجاعوددەولە و ئێوە شەرمەزاربم.

فەرموویان: من لە خودی ئێوە شتێکم شاردۆتەوە، بەڵام بە ئێوە دەڵـێم کـەمن لە پێنج هەزارتمەن زیاتر نـاتوانم بـدەم و مامەڵـەی جـەنابی حـاجی ئـەمینوززەرب پێوەندی بەمنەوە نیە، لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولەدا چاک ئەم باسە دەزانن.

ئەوەبوو کە لە ڕاستیدا جەنابی ڕەیسوتوججار هەموو شتێکیان گـوت، زۆرباسـم کرد و هاتمە ماڵێ و جۆرێک بـە جـەنابی شوجاعوددەولـە ڕام گەیانـد کـە بـۆ ئـەم مامەڵەیە چاکتر ئەوەیە بۆ خۆتان لەگەڵ جەنابی ڕیسوتوججاردا قسە بکـەن، بـڕیاری بڕێوەبردنی لە لایەن ئەمینوززەربیش بدەن و چۆن زۆر پەرێشان بـووە ئێـستاش لـە ماڵی ئەوانین.

هاتینە سەر باسەکە لە حاڵێکدا کە لـە نێـو باغچـەدا هـەنگاومان هـەڵ ئـەهێنا، هێشتا سەعاتێک لەشەو تێپەڕیوە، لەدوای نیوەڕۆدا لەگەڵ جـەنابی شوجاعوددەولـە هاتینە ئەم ماڵە و جەنابی ڕەیسوتوججار لە شۆرای نەتەوایەتیدایە، ئێمـەش جارێـک لە ژوورەکە و جارێک لە چایخانەین ئێستاش لە نێو باغچەدا کە بارانێکی زۆر دەبـارێ و هەوا ساردە دانیشتووین و چاوەڕێ ئەوانین و من حاڵەتێکم هەیە کە خـوا تووشـی کەسی نەکات.

پیاوانێکی گەورە کە ڕۆژنامە دەخوێنن بەڵام هـەر جـەنابی شوجاعوددەولـە بـاو وباپیری خاوەنی گەورەیی و سەربەخۆیی بوون و ئێستاش بە هۆی بارودۆخی ڕۆژگار و نـەزانین وسـن و سالـی کەمـەوە ماڵـەکەی وا دوای خوالێخۆشـبوو محەممـەد ناسرخان شوجاعوددەولە و خوالێخۆشبوو خەسرەوخان بـۆ ئـەم پیـاوە بـەجێ مـاوە،

چوارسەد تمەن دەبوو. بەڵێ شوجاعوددەولەی خوێڕی لەماوەی شەش مانگ سەرۆکایەتی خۆی دا ئەو وڵاتەی دووڕاند و بە ئەم چارەڕەشی و خوێڕیتی و بێ دەرەتانیە کەوتووە و ئەو ماڵ و زێڕانەش هەرکەسێک لە لایەکەوە بۆ خۆی دزی و بردی و زەوینەکانی قاسم ئاواوخاجەی جەڕاح ماوە؛ بەڵام سەدوسی هەزارتمەنیش قەرزدارە.

بە کورتی دەڵێم کە سەعاتێک لەشەو تێپەڕیبوو وجەنابی شوجاعوددەولە هیچیان لە ماڵێدا نەبوو، تەنانەت بەقەت قرانێک نەوتیان بۆچرا نەبوو[٣٣] سەعاتێکی بە ئێوارە مابوو، ئەویش لەگەڵ من لە ئەم باران و باو و هەورە تریشقەیە کە تا ئێستا ڕاوستاوین تا جەنابێ ڕەیسوتوججار ببینین و شایەد پێنج شەش تمەنێک بۆ خەرجی ئیمشەو بگرین و بڕۆین.

ئامانج ئەوەیە کەمن لە تاران لە خزمەت ئەم پیاوە بەرێزەدا بووم وشتهایەکم دیوە و سەرم سوڕماوە کە ناکرێ لێکی بدەیەوە و سەیر لێرەدایە کە لە ئەم شتانە بە هیچ جۆرێک حاڵی نەدەبوو، و سەختی زۆرم کێشا کە بەقەت دەنکە جۆیەک قازانجی نەبووە و نیەتی. دووساعەت لە شەو تێپەڕیبوو کە جەنابی ڕەیسوتوججار لەگەڵ جەنابی ئەمینوززەرب لە شۆرای نەتەوایەتی هاتنەوە، ئێمەش چووینە پێشوازیان و سڵاویانمان کرد و ڕۆیشتینە ژوورەکە و زۆرێک دانیشتین و وتووێژمان کرد و ئەو کارانەی وامن تا ئێستا جۆرم کردبوو ئیمشەو ئەو دووگەورەیە تێکیان دا و جەنابی شوجاعوددەولە تۆرا و ڕۆیشت، منیش بەجەنابی ڕەیسوتوججارم گوت: ئیمشەو ئێوە دەبێ حەوت هەشت تمەن جۆ بدەن هەتا جارێکی تر کەدەگەڕمەوە خزمەتتان و ئەیدەمەوە پێتان، ئەویش سێ تمەنی داپێ وجەنابی شوجاعوددەولەڕانەوەستا شوێنم و زۆر بە پەلە بە نێو باران و قوڕو چڵپاو و تاریکیدا

---

٣٣- لەو سەردەمەدا نەوت بە کۆپێن نەدەدرا وەکو ئەمڕۆکە من لە ڕۆژی جومعە دەی بەفرانباری ١٣٦٧دەبێ لە ماڵێدا ئەم کارانەم لە ڕووی نووسراوە کۆنەکانی لوتفعەلیخان بنووسم، لەو سەرمایەدا دەست و پێم تەزیوە و ساڵهای ساڵە بەم جۆرە بە کڵۆڵی و چارەڕەشی ژیان بە سەر دەبەین، لە حاڵێکدا دڵمان بەوە خۆشە کە لە سەر چاڵی نەوت دانیشتووین.

ڕۆیشت[٣٤]، منیش لە ماڵی جەنابی ڕەیسوتوججار -کە وەکوو ڕۆژ لە نووری کارەباکان ڕۆشن بوو-[٣٥] هاتمە دەرێ و لە نێو کۆڵاندا چاوم نەی ئەبینی و سێ سەعات لەشەو تێپەری بوو و باران دەباریێ، نەفەرێکیش لە نێو بازارۆشەقامەکاندا نیە، لاقم لەهەر کوێ دادەنێم تا ئەژنۆم دەچێتە نێو قوڕەوە، چۆن بڵێم کەبەچ زەحمەتێک لە ماڵی حاجی ئەمینوززەرب، یانێ لە چوارڕێیانی موخبێرەددەولە کە فرسەخێکە تا شەقامی چراگاز کەماڵی ئێمەیە بەلارە لارە هاتم و پێنج شەش جار درام بەعەرزدا و تەواوی پانتۆڵەکەم قوڕاوی بوو و بنی پێلاوەکانم دڕابوو، کاتێک گەیشتمە ئەوێ پێڵاوەکانم دەرهێنا و پڕ لە ئاو ببوون و گۆرەوێکانم دەرهێناو پانتۆڵەکەم داکەند.

قاپۆکەم بە دوای خۆدا ڕاکێشاو لە کونجێک دامنیا. لەو وەختەدا هەموو ڕۆیشتبوون، چەند هیلکەم ساز کرد. چ بڵێم و کام دەردی خۆم پێت بڵێم و بەهەر جۆرێک بوو شەو خەوتم.

ڕۆژی دووشەممە ١٧ی سەفەر ١٣٢٥ بەرانبەری ١١ی خاکەلێوەی ١٢٨٦ بەیانی زوو بەڕێ کەوتم و سپاس خوام بەجێ هێنا و پیالەیەک چاییم خوارد و زۆربەکەسەلی جلە تەڕەکانی دوێنی شەوم لەبەر کرد و چوومە ماڵی حاجی ئەمینوززەرَب، کە میرزا حەسەن خانی قەزوینی لەوێ بوو. دیسان لەگەڵ جەنابی ڕەیسوتوججار سەبارەت بە شوجاعوددەولە وتووێژمان کرد و پاڕامەوە و کاری ئەمڕۆ بەجێگەیەک گەیشت و لە خزمەت جەنابی ڕەیسوتوججار نەهارم خوارد و جەنابی ئەمینوززەرب کوڕێکی هەشت ساڵەی هەیە کەبەڕاستی لەژیری و زیرەکی ئەم منداڵە سەرم سوڕما[٣٦]،خوا بیپارێزێ دوای نەهار ماڵئاواییم کرد و هاتمەوە ماڵێ و بە

٣٤- قوڕبەسەری شوجاعوددەولە یانێ ترسنۆکەددەولە کە تایەفەیەکی پەنجا هەزار نەفەری لە پشت سەری ئامادە ڕاوەستاون بەلام بەقسەی هەربێ کەس و کارێک گوێ دەدا و هیچ و پووچی و خوێریتی لەوە زیاتر و زۆرتر نیە تف لە تۆ ئەی ڕۆژگار.

٣٥- لەو سەردەمدا لە تاران تەنیا ماڵی پاشاو گەورەکان کارەبایان بوو و شەقامەکانی تاران بێ کارەبا بوون

٣٦- لەو کوڕەنابێ سەرت سوڕبمێنێ دەبێ لەو بابەیە سەرمان سوڕ بمێنێ کە ئەو کوڕەی ئاوا

کورتی قسەکانم بۆ شوجاعوددەوڵە لێکداوە ورێ وشوێنێکم بەهزرو فکری خۆم بـۆی گوت، فەرموویان ئەم جۆرە کە ئێوە دەڵێن بە قـازانجی مـن نیـە و دەبـێ فکرێکـی دیکە بکەمەوە وتم چ هزرێکتان هەیە وتی، دەبێ بچـم لەتەوێـڵەی شـاییدا دەسـت بەستە دانیشم[٣٧]، وتم: هۆی خراپەی ئێوە ئەوەیە کـە هـەر کـەس بەچاکـەی ئێـوە وتارێک بڵێت، دژی ئەو وەستاون، ئێستاش ئازادن و بۆ خۆتان دەزانن بـڕێک لـە نێـو باغچەدا بەرێگادا ڕۆیشتین و لـە خزمـەت ئـەمان هاتمـەوە و چوومـە ماڵـی خـاتوو تەلعەتوسسەڵتەنە و تـا ئێـوارێ لـەوێ بـووم. هاتمـەوە ماڵـێ، ئیمـشەویش وەکـوو شەوەکانی دیگە تێپەڕیبوو...

ڕۆژی سێ شەممە ١٨ی سەفەر ١٣٢٥بەرانبەر بە ١٢ خاکەلێوەی ١٢٨٦، بەیانی زوو بەخۆشییەوە ڕێکاکەوتین و چاییمان خوارد و خاتوو تەلعەتوسـسەڵتەنە بـۆ سـێ سەد تمەن کە بەڵگەی پێی بوو چوو بۆ ماڵی نایبوسـسەڵتەنەی ئـەمیری گـەورە[٣٨]، دوای قسەکردن، قەواڵەکەی پیشان دا دوای ئەوە فەرمانیان فەرموو دوو نەفەر بـڕۆن و ئەم پارەیە لە شوجاعوددەوڵە بستێنن بەخاتری ئەو ئیمڕۆ سێ تورکی تەورێز هـاتن و گوتیان فـەرمانی گەورەمانـە کـە ئـەم پارەیـە چـۆن ئێـوە بـە ئاگـاداری جـەنابی موحتەشەموسسەڵتەنەوە[٣٩] وەرتان گرتووە و قەواڵەتان داوە، بێ پرسیارو ولام بیـدەن، بە کورتی بڵێم تا نیـوەڕۆ هـەموو سـوێندو قـسەیەکیان کـردووە، جارێـک دەنگیـان

---

پەروەردە کردووە هەموو مرۆڤێک لەبنەڕەتدا باشە ئەگەر باشیش پەروەردەبن دەتوانن ئاسمانی خودا بگرن، ئەگەر خراپ پەروەردەبن وەکوو شوجاعوددەوڵەیان لێ دێ

٣٧- هەر ئەوەمان لە مێژووی کوردان دا نەبوو کە ئەوەش کـاک شوجاعوددەوڵـە بـەڕێوەی دەبـات پیاوی خوێڕی کارەکەشی هەر خۆێڕیانەیە بە پێ بڕیارە پێشووەکەی خۆی لەگـەڵ لوتفعـەلی خـان سواری ئەسب دەبێ تا لە نزیکی خاروورامین بە ئەوان بگەن و لە قووچان حاکم دەربکـەن زەویـن و ماڵەکەیان لە ڕەیسوتوججار و کەسانی دیکە بگرنەوە، عەشیرەتی خۆیان لـە هـیچ و پـووچی ڕزگـار بکەن، بەڵام ئێستا دەڕوات تا لە تەویلەی شاهی لەگەڵ ئەسب و کەرەکان ڕۆژ بدات بەسەر؟!!؟

٣٨- ماڵی کامران میرزا کوڕی ناسرەدین شا.

٣٩- موحتەشەموسسەڵتەنە حاج حەسەن ئێسفەندیاری لە پیاوانی سیاسی سەردەمی مەشرووتە کە ماوەیێک سەرۆکی پارلمانی نەتەوایەتی بوو و لەساڵی ١٣٢٤ هەتاوی یانی ٣٧ ساڵ دوایی مرد.

دەردێ و شەڕ دەکەن، جارێک ئاشتی و جارێک گژوهەڕەشە لە ئاردالّ سێ ڕۆژ بەڵێنی ویستووە و ئەوانیش لە خزمەت جەنابی شوجاعوددەولەدا چوونە مالّی میرزا بابای قووچانی کەبەرپرس بوو. لەوێ نەهارمان خواردو چۆن لە مالّێ هیچ شتێکمان نەبوو جەنابی شوجاعوددەولە لەگەڵ جەنابی سەید عەلی قومی زۆری کێشە و هەرا کرد و جەنابی سەید عەلی هەرشتێکی پێ خۆش بوایە دەی گوت ئێمەش لەقسەناحەزەکانی ئەو بە جەنابی شوجاعوددەولە ماندوو بووین[٤٠] دوای نیو ساعەت جەنابی شوجاعوددەولە بێ هیچ هۆیەک لەگەڵ من کردیە کێشەو هەراو تەواوی قسەکانی جەنابی سەید عەلی بەمن گوتووە و زۆر قسەی قۆڕی کرد، هەر ئەوەندەم گوت: من لوتف عەلی خان کوڕی ئیلاهیار خان دەرەگەزی پیاوێکی زۆر خراپم چاتر ئەوەیە کە لێم‌گەڕێن تا بڕۆمەوە بۆ خوراسان، چۆن زیاتر لەوە ناتوانم لەگەڵ جەنابتان بم و گوێم لەوقسانە بێت ئەگەر لە بیرتان بێت سەد تمەنیش بۆ خۆم قەرزدارم و تا ئێستا قرانێکم لە ئێوە وەرنەگرتووە و سێ سەد چوار سەد تمەنیش لەم یەک سالّ و نیوەدا خەرجی سەفەرەکانم بۆ تاران بووە و لە خوراسان بۆ خەرجی مالّێ قەرزدارم و ئێستاش هیچم لە ئێوە ناوێت، پیاوەتی هەر ئەوەیە وا ئێوە دەی‌کەن؟

باسە کە زۆرتر لەوەیە کە بیلّێم... شەو و ڕۆژێک هەر لەوێ بوین.

## شوجاعوددەولە و لوتف عەلی خان سێزدەبەدەر لە تاران

ڕۆژی چوارشەممە١٩ی سەفەر ١٣٢٥برانبەر بە ١٣ی خاکەلێوەی ١٢٨٦: ئیمڕۆ سێزدەی جێژنی نەورۆزە. هەموو جێگایەک داخراوە و پیاو وژن ڕۆیشتن

---

٤٠- ئەوەش یەکێ لەو شانازیانەی شوجاعوددەولەیە!! ئەوە سەید عەلی قومیە کە دوای مردنی ئەمیر حوسێن خان ئاسەفوددەولە خوشکی شوجاعوددەولە کە ژنی ئەو بوو لەو مندالّی نەبوو، مارەی کرد مالّ و سەروەتێکی زۆر لەو ژنە لە تاران مابوو، کەیەک دووسالّ پێش لە شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە دنیا دەرچوو، نەوەکانی شوجاعوددەولە لە قووچان ڕۆیشتن و بڕێک لەو سەروەتەیان بۆ خۆیان هەڵ گرت و حەق بە حەقدار گەیشت، ئەگەرچی ئەوانیش حەقدار نەبوون.

بۆ دەشت و سەیران، میرزا بابای بەرپرس بۆ نەهار لە ماڵی خۆیان ئاشی جۆی لێی نابوو و من و جەنابی شوجاعوددەولە لەگەڵ (براکەی خۆی) بەرپرسی زەعفەرانلووقووچانی و کاک میرزا غولام ڕەزا و محەممەد ڕەزاخان سواری فەیتوون بوین و ڕۆیشتن و گەیشتین بە ماڵێک کە جێگای سەیرانی تەواوی ژنەکانی تارانە، بە خاتری ئەوەی کە سەوزایی وەها لە هیچ کوێ دیکەدا نیە، جێگای سەرسەوز و خۆشی هەیە، بەڵام ئەوڕۆ قەدەغەیە و ناهێڵن ژنەکان بێن بۆ دەرەوەی شار، بێجگە لە ئەو خاتوونانەی وا بە فەیتوون هاتوون و نۆکریشیان لەگەڵ دایە.

بە کورتی بڵێم چوینە ماڵێ، ئامرازی خۆشیان زۆر دانابوو و تارو سەنتوور و تەنبوور و ئاش داندرابوو... و ئاشی جۆیەکیان لێنابوو کە قەت ئاشی وام نەخواردبوو، زۆر خۆش ڕابورد ئەگەرچی ئەم چەند ڕۆژە بێجگە لە ناخۆشی و پەرێشانی هیچ شتێکی‌تری بۆ من نەبوو... بەڵام خراپ نەبوو و سەعاتێک خەریک بووم دوای نەهار لەو ماڵە هاتینە دەرەوە تا سەر خەندەقەکە بەڕێگەدا ڕۆیشتین[41] ئەم دەوروبەرەیان جۆرێک ئاڵیوە کە لە هەموو جێگایەک خۆشترە، لەهەر هەنگاوێک دەستە دەستە ژن و پیاو دانیشتبوون و خەریکی چایی خواردن و قسە کردن بوون ئەوەندە ژن لێرانەبوو کە هەمووی ئەو دەشتە ڕەشی دەکردەوە، چۆن چارشێو و رووبەندەکەیان ڕەش بوو سەیرانێکی زۆرمان کردو لەگەڵ ئەو ژنانە قسەو پێکەنین و پرسیارو وڵامێکی زۆرمان کرد، برێک لە دۆست و ڕفیقەکانمان دیت و تا ئێوارێ لەوێ بوین و دوایی بەرەو ماڵێ هاتینەوە و فەیتوونچیەکە فەیتوونەکەی هێنا و ئەوەندەی عارەق خواردبوو مەستی کردبوو و ئاگای لە خۆ نەبوو.

لە نێو شەقامدا ئەسپەکان فەیتوونەکەیان لە نێوان خەڵکدا ڕاکێش کردبوو و بەجێی ئەوەی کە ئەسپەکە ڕاگرێت بۆ خۆی لەو سەرە کەوتبووە خوارێ ولاقی بریندار بوو.

---

٤١- پێشترو لە پشت دیوارەکان و بورجەکانی دەوری شار چاڵێکی گەورەیان هەڵ دەکەند و ئاوەڕۆکانیان تێدا ساز دەکرد و پێیان دەگوت خەندەق کە بەری هێرشی دوژمنی پێی دەگیرا تا بەرنگارەکان چاکتر بتوانن لە بورجی شار پارێزگاری بکەن.

باش بـوو خەڵـکەکە هـەڵاتبوون وفەیتوونەکـەیان ڕاگرتبـوو دوای ئـەوەی کـە زانیمان کەس هیچی لێ نەهاتووە، جەنابی شوجاعوددەولە، جەنابی بەرپرسی دیـوان و من سوار بوین و لەبەر دەرگـای جـەنابی بەرپرسـی دیـوان دا دابـەزین، ویـستمان شەوێ لە ماڵی ئەوان بین؛ بەلام دیتم حالی جەنابی بەرپرس زۆر لە ئێمە چاکترنیە.

چۆن دوای دەساڵ[٤٢] خزمـەت لـە وەزارەتی دەرەوە، وردە وردە موشیروددەولـە کە گەورەی ئەو بوو، بە سەرۆکایەتی ئێران گەیشت و هەروەها جـەنابی بەرپرسـیش بە هیوای خۆی گەیشت و پێشخزمەت و قاوەخانەی دانـا و نـەهار و شـامێکی زۆری دەدا و خەریکی خزمەت بە ڕژیم و حوکوومەت بـوو، ئەگـەر دۆسـتان و رفیقـەکانی پێیان دەگوت بۆ وا دەکەی ولامی دەداوە نێو چاکە دەرکردن چاکتر لە پارەیە، دوای یەک ساڵ دەتوانی هەمووشتێک بکەی؛ بەلام ڕاستیشی دەگوت، جـەنابی بـەرپرس دوای ئەو قەرزانەی پێشوو زیاتر قەرزدار بـوو و ئێـستا دەبـێ کـرێ مـاڵ و خـەرجی بیست کەس نۆکربدات، بێجگە لەو قەرزانەی وا بەلایەوەیە، دوێنێ شـەو یـەکێ لـەو تاجرانەی شار کە چوار سەدتمەن لە جەنابی بەرپرس داواکار بوو. سـەعاتێک لەشـەو تێپەڕی بوو کە دەپازدە تورک هاتنە نێو هۆدەکە وتوویژێکی زۆریان کرد و هـەرچی قسەبوو بەجەنابی بەرپرس دیوانیان گوت و ڕۆیشتن، ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە جەنابی بەرپرس لەگەڵ دووسێ کەس میوان دانیشتبوو.

بە کورتی بـڵێم بـەو حـاڵ و دووخـەوە بـە جـوانم نـەزانی کـە شـەوێ لـەوێ بمێنمەوە، ئەوە بوو کە هاتمەوە بـۆ ماڵـێ، دیـتم تاقمێـک لـەو داواکارانـە چاوەڕێ ئێمەن، بە هـەر جۆرێـک بـوو ولامـم دانـەوە و بـەڕێم کـردن و چوومـە هۆدەکـەو بەهەرخەم و خەفەتێ بوو شەوم گوزەراند.

ڕۆژی پینج شەممە کە بە هۆی نەدارییەوە نەچوومە دەرێ

ڕۆژی جومعە ٢١ی سەفەر ١٣٢٥ بەرامبەر بە ١٥ی خاکەلێوە ١٢٨٦:

---

٤٢- کاک مـیرزا بابـا، نووسـەری بـەناو بانـگ لـە سالـی ١٣١٥ مـانگی لەسـەردەمی حوکوومـەتی خوالێخۆشبوو محەممەد ناسـرخان شوجاعوددەولـە لـە قووچانـەوە بـۆ تـاران هـات و لـە دەزگـای موشیروددەولەی پیرنیا لە ڕێبەرانی مەشرووتەخوازی بوو لەوێ ڕێزو حورمەتی زۆری بوو.

بەیانی زوو ڕۆیشتمە دەرێ، چۆن ئیمڕۆ تەواوی پیاو و ژنی ئەو شارە چوونەتە دەرێ بۆ زیارەتی عەبدولعەزیم هەرچی دووکانە داخراوە و تەواوی فەیتوونی ئەو شارە لە ڕێگای دەریاوە کاردەکات، بە کورتی لەم شارە گەورەدا بێجگە لە من (شوجاعوددەولە) کەسێک ئاوا دڵتەنگ نیە، بە خاتری ئەوە کە لە سواڵکەرەوە تا دەوڵەمەند هەر کەسێک کە دەیبینین ڕێگاوشۆێنێکیان هەیە، و ڕێگەیان بۆ خویان ڕوونە بۆ وێنە ئەم چەند قووچانیەکە لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە دەگەڕێن ئەگەرچی غەریب و بێ کەسن بەڵام لە ئێمە خاتر جەم ترن، هیوادارم خوا کارەکانمان جۆر بکات.

وادیارە لەم ڕۆژانەدا جەنابی شوجاعوددەولە منی لە بیر چۆتەوە و ئەو کەسانەی وا ئێمەیان بە ئێرە گەیاند[٤٣] بوونەتە خاوەنی هەمووشتێک، بەڵام بەم جۆرەش هەر ڕازین کە بە ساغ و سلامەتی وەرگەڕینەوە بۆ خوراسان و منیش بڕۆمەوە بۆ لای ماڵ و منداڵ و هەر کەسێک کە دژ بە جەنابی شوجاعوددەولە خراپەی کردووە، ئەو خوالێخۆش بووە بە هەموو جۆرێک هاوکاری دەگەڵ کردوون.

بەهەر جۆرێک کە دەڵێ لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە بیرمان کردەوە کە بچین بۆ شازادە عەبدولعەزیم دیمان کە جۆر نابێت و پارەنیە زۆر بە کەسەلی هاتمە دەرێ کە برووسکەیێکی لە قووچانەوە بوو هات.

سپاسی خودام کرد و ڕۆیشتم و بە جەنابی شوجاعوددەولەم گوت: فەرموویان چی بووە؟

گوتم: پارەتان بۆ هاتووە، برووسکەم هەڵ بچڕی و بۆمان ڕوون بووەوە کە سەڕافی ئوسکۆیی پێنسەدتمەنی بە ماوەی یازدەڕۆژ ناردووە.

فەرموویان: وڵامی برووسکە و زەحمەتەکەی لەسەر شانی ئێوەوەیە دەبێ پەنجاتمەن لەم پارەیە بۆ ماڵی ئێوە لە مەشهەد بنێردرێ... لەو گەرمای نیوەڕۆدا پارەم وەرگرتووە و بەزحمەتێکی زۆر ڕۆیشتم بۆ کاروانسەرا و لەوێوە هەر بۆ ئەو

٤٣- مەبەست مودیرودیوان و هوژەبر دیوانی قووچان بوو کە لەدەزگای باووباپیرانی شوجاعوددەولە گەورە بوون و بەجێگایەک گەیشتن، دوایی بوونە هۆی بەدی هێنانی چارە ڕەشی ئەم چارەڕەشە.

دوکانەچووم پارەم داوکاغەزێکم بۆ قەبووڵی نووسی و لەوێوە بۆ وڵامی برووسکە چووم بۆ برووسکەخانە و هاتمەوە، لە مەیدانی تۆپخانە هێزم نەمابوو، بیرم کردەوە بۆ ماندووی دەرکردن بچم بۆ ماڵی خاقان و بحەسێمەوە، پاشان بگەڕێمەوە، ئەوە بوو کە بە ماندووی و زەحمەتێکی زۆر، وردە وردە خۆم بە ئەوێ گەیاند و بێ ئەوەی کە ئاگام لە خۆ بێت، کەوتم.

خاتوو تەلعەتووسەڵتەنە زۆر بە شڵەژاوی هاتن لێمانیان پرسی گوتم: بێجگە لە نەکێشانی تریاک و ماندووی و هیلاکی هیچ ناخۆشیەکم نییە و داخوازیتان لێ دەکەم بە ماوەی نیو ساعەت قسەم لەگەڵ مەکەن تا بڕێک بحەسێمەوە، دوایی هەر شتێکی پێت خۆشە بیڵێ

(لوتف عەلی خان لە برسیەتی و نەداری و پەرێشانی بەم رۆژە کەوتووە)

بە کورتی بڵێم بەو حاڵەوە تێگەیشتم کە ئەم ژنە یەکسەر دەگریێ و دەڵێ: خوایە سزای شوجاعوددەولە بدە کە ئەم پیاوەی لە دایک و خوشک دابڕیەوە و بەم حاڵەی خستووە.

دیتم خاتوون بەم حاڵەوە نایەڵێ بخەوم، بە خاتری ئەوە لەوێ ڕۆیشتم و گوتم هیچ ڕووی نەداوە کە ئێوە ئاوا پەرێشان دەبن، من ئەوەندەم پەرێشانم بینیوە کە ڕاهاتووم، ئێستاش جێگەی باس نیە. چرای تریاکیان هێنا، بڕێکم کێشا و چەند پەیک شەرابم خوارد و نەهارێکی زۆر چاکیان ساز کرد، خواردم و خەوتم؛ دوو سەعاتێکی بە ئێوارێ مابوو، ویستم لەوێ بڕۆم ئەگەرچی ماندوویم نەمابوو و کەمێک حاڵم باش بوو بەلام تەواوی گیانم تەزیبوو، خاتوون زۆری گوت کە نابێ بەم حاڵ و دۆخەوە بڕۆی و هەر لێرەبن.

ئەگەریش دەڕۆن چۆن سبەینێ کوڕەکەم -بەناندیوان- بە ماوەی یەک مانگ دەڕوا بۆ ڕاو، ئێوەش هەر لێرە بن، گوتم زۆر باشە. لەوێوە هاتمە خزمەتی جەنابی شوجاعوددەولە و دیتم هیچ شتێکی نیەو بۆ شامی شەویش ماوەتەوە.

فەرموویان: سی تمەن لە قووچانەوە دەنێرم بۆ ماڵتان بەو مەرجەی کە بە زوویی دە تمەنم بۆ جۆر بکەی.

گوتم: کەس متمانەی بە من نەماوە بەخاتری ئەوەیکە هـەرچی لـە خەڵـکمان وەرگرتووە نەمان داوەتەوە؛ بەڵام لەهەر کوێیەک بێـت قـەرزی دەکـەم. فـەرموویان خەیاڵتان ڕاحەت بێت، تەواوی قەرزەکانی ئێوە دەدەم. بە کـورتی بـڵێم یـەک دانـە برووسکەی سی تمەنیان بۆ قووچان بۆ ژن و منداڵەکەم نارد منیش ڕۆیشتم و چـووم بۆماڵی خاتووتەلعەتوسەڵتەنە و پرسیارم کرد کە چەندەیان پـارە لـە ماڵـێدا هەیـە؟ وڵامیان دامەوە کە شەش حەوت تمەنێک دەبێت، و خاتوو ڕۆیشت و حەوت تمـەنی هێناو منیش ٥ تمەنیم لـێ وەرگـرت و خـستمە نێـو پاکەتـەوە و ناردمـە خزمـەتی جەنابی شوجاعوددەوڵە، برووسکەی سی تمەنیشم نارد بۆ برووسکەخانە تـا بینێـرن، وردە وردە شەوهات و باران و هەورە تریشقەیەکە کە دەنگی ئاسمان دەلەرزێنێت.

نزیک بە دوو سەعات ونیو دەبوو کە لەشەو تێپەڕی بوو، لە خزمەت کاک بـەنان دانیشتبووم و خاتوو لە کونجی هۆدەکەدا کەبابی سازدەکرد جەنابی شوجاعوددەوڵـە وای بیر لێ کردبووە کە ئیمشەو لوتف عەلی خان خۆش ڕادەبوێرێ، چاک وایە لێـی بشێوێنین.

مەشەدی حوسێن قاپچی پاکەتێکی لە ئەوەوە بۆ هێنام، دیتم نووسیبووی هـەر ئێستا برووسکەیەک بە نێوی ئێوە لە خوراسانەوە هاتووە بە خاتری ئەوەیکە زانیم ئەو برووسکەیە دەبێتە هۆی شێواوی و پەرێشانی ودڵگیریتان نەمنارد؛ بەڵام بـە کـورتی دەنووسم زۆر زوو وەرێن. دوایی دیتم لە قەراخی لاپەڕەدا نووسیبووی: بـەزمی دنیـا هەروایە خودا بە ئێوە سلامەتی بدا، دواى دیتنی ئـەم لاپەڕەیـە زۆر پەرێـشان بـووم؛ بەڵام تا بڕێک جـەنابی شوجاعوددەوڵـەم دەناسـی، زانـیم کـە هـیچ ڕووی نـەداوە، ئەگەریش برووسکەیەک بێت بۆ لە کاتێکدا بهێـنن کەسـێ سـەعات لەشـەو تێپـەر بووە. وەڵام دراوە: ئەگەر فکرتان کردووە من لێرە بە خۆشی و کامەرانی ڕایـدەبوێرم کە دەبێ بڵێم وا نیە. چۆن بۆ خـۆت دەرگـای خۆشـیت لـەمن بەسـتووە و قایمـت کـردووە و کلیلەکەشـتان گـوم کـردووە. ئەگـەر خـودای نەخواسـتە کەسـێک لـە خوراسان مردووە کە ئیدی بە هاتنی من زیندوونابیەوە ئەگـەر ئیمـشەو دەتانـەوێت لەگەڵ من قسە بکەن دەبێ بۆ خۆتان زۆر چاکتر بزانن کە لە سێ سەعاتی شەودا لـە

تاران کەس نابێت هاتووچوو بکات و بارانیش دەبارێت و منیش زور ماندووم و لێرەش هەر شتێکی بمهەوێت هەیە و هەر قسەیەکیش کە پێم خۆش بێت دەڵێم و دەیبیسم هەزار نەفەریش بمرێت و زیندوو بێتەوە من لە جێگای خۆم جووڵە ناکەم عەقڵیش دەڵێ ئەوە دروست نیە کە سێ سەعات لەشەو ڕابوردووە و هەموو شتێک لێرە ئامادەیە بۆ خۆم ئاغا و کوێخای خۆمم، ئێوەش خۆش بن و هەر هەواڵێکی خراپ و چاکیش بە برووسکە بۆ من هاتووە. لێگەڕێن، تا دیکە ئەم ڕۆژنامەیەوە خەتێک دەنووسم کە چوار سەعات لەشەو تێپەڕیوە و ژنێک لەمماڵەدا هەیە کە ناتوانم نێوی بێنم و لەبارەیەوە بنووسم.

خاتووتەلعەتوسەڵتەنە کە پێم وابێ زۆر دلۆڤانە و میهری زۆرە چەند سێخ کەبابی ئامادە کردووە و شام ئامادەیە و خۆش ڕایدەبوێرین حەوت سەعات لەشەو تێپەریوە هەر کەس لە جێگای خۆی خەوتووە و منیش لە کونجێک خەوتم.

## شەڕی نایبوسەڵتەنە لەگەڵ شوجاعوددەوڵە و بارمتەدانانی تفەنگ و کاپی زێو

شەممە ٢٢ سەفەری[٤٤] ١٣٢٥ بەرامبەری ١٦ خاکەلێوە ١٢٨٦: سەعاتێک لە ڕۆژ تێپەڕیبوو لە خەو هەستام و شوکری خودام کرد، چایمان خوارد و کاک بەنان دەیەوێت بروات بۆ ڕاو. دایکی خاتوو تەلعەتوسەڵتەنە ئەوەندە ئاگای لە کوڕەکەی بوو کە ناتوانێ بنووسی کە بەنان یەک مانگ لەگەڵ خزمەکانی لە خۆشیدایە و ڕاو دەکات، دیسان بیست تمەنی نارد کە نان و پێخۆر و میوە بهێنێت و ئەو شتانەی وا دەیەویست بۆی ئامادەی کرد و کاک بەنان ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت، منیش دوای یەک سەعات لەوێ هاتمەوە بۆ ماڵی جەنابی شوجاعوددەوڵە، دیتم ئەو ڕۆیشتووە، من چوومە نێو چایخانەکەوە کە هیچی تێدا نەبوو دیتم کەریم خانی سەرهەنگ ماوەیەکە نایبوسەڵتەنە ناردوویە بۆ ئەو ناوچەیە تا سێ سەدتمەنی زیاخاقان مێردی خاتوو تەلعەتووسەلتەنە لە جەنابی شوجاعوددەوڵە وەربگرێتەوە و لەگەڵ دورئاردال دا دانیشتبوو. منیش ڕۆیشتم بەخێرهاتنم کرد و خەریکی قسە کردن بوین کە

٤٤- لە نێو دەقەکەدا ٢٢ ربیعولئەوەڵ نووسراوە.

دەنگ و هەرایەکم بیست، زانیم کوڕی کەریم خان هاتووتە بەردەرگا و لەگەڵ یەکێ لە نۆکەرانی جەنابی شوجاعوددەولە لەیەکتریان داوە. لەبەر خۆمەوە گوتم گوێ بدە لە باسی پشیلە و کەر[٤٥].!؟

کەریم خانیش کە کوڕەکەی خۆی ئاوا دیت، لەگەڵ ئاردالەکانی دارەکانیان بەدەستەوە گرت و ڕژانە نێو شەڕەکە و لەو لاوە نۆکەرانی جەنابی شوجاعوددەولە وەکوو هەمیشە دەستیان برد بۆ دار و شەڕیان داگیرساند و لەشەقام و نێو بازاڕیش خەڵکێکی زۆر هاتبوون و سەربازە پاسەوانەکانی حکوومەتی شا بەیارمەتی کەریم خان لەگەڵ سەرۆکەکەیان هاتنە پێش، چ بڵێم کە بێ هیچ هۆیەک قیامەتێکیان ساز کرد کە دوای یەک سەعاتیش ئەم خەڵکە تێک ڕژا بوون و نەیاندەزانی لەگەڵ کێ شەڕ دەکەن منیش کە لە چایخانەدا بە هیچ جۆرێک نەهاتمە دەرێ و سەیری نەزانی و کەرێتیم دەکرد. وردە وردە دوای بڕێک، ئاگری شەڕ کوژایەوە و ئاشت بوونەوە و خەڵک ڕۆیشتن، ئێمەش چایمان بەکەریم خان و سەرهەنگ دا و سێسەد تمەن قەرزی ئەوان کە لە لامان بوو و دووسەد تمەن حاجی ئەمینوززەربمان دایەوە و یەک سەد تمەنی تاجری ئوسکوویش درایەوە و پازدە تمەنیش بۆ خزمەت دامان بە ئاردالەکان و ڕۆیشتن، ئەگەر ئەم کارەیان دوێنێ یان پێرێ دەکرد، ئەم شەڕ و کێشەیەش ساز نەدەبوو، جەنابی کاک شوجاعوددەولە گلەیی دەکرد کە ئێوە بۆ لە هۆدەکە نەهاتنەدەرێ؟

گوتم: بە بۆنەی ئەوەیکە حەزم لە لێدان نەبوو و لەگەڵ کەسێکیش دوژمنایەتیم نیە و لە دنیا دا لەگەڵ کەس شەڕم نەکردووە ئەو دڵی لێم ئێشا بوو کە بۆچی دووسێ دار لە من نەدراوە بە دلگیرییەوە ڕۆیشت بۆ ماڵی جەنابی کاک سەید عەلی قومی چۆن لە ئاخری شەڕەکەدا کاک زیاخاقان داواکار هاتبوو،منیش لەگەڵ ئەو چووم بۆ ماڵیان و خاتوون لە ماڵ نەبوو، نزیک بەیەک سەعات لە لای حەوزەکە دانیشتم و سیگارم کێشا، وردە وردە ڕۆژ ئاوا بوو و خاتوون هاتەوە. دوای هەواڵپرسی گوتم: لە کوێ بووی؟ گوتیان: لە ماڵی شوجاعوددەولە کە کەریم و

---

٤٥- داکۆکی دەکاتە سەر شێعرێکی عوبەید زاکانی.

دووکوڕەکەی لەگەڵ دووسێ کەس ئاردالّ هاتنە مالّێ و کە دووسێ قووچانی بەفەرمانی شوجاعوددەولە لێیانیان داوە، نایبوسەڵتەنە لەشار نەبوو. تەلەفۆنیان کردبۆکامرانیەو ولامیان داوە چەند کەس بڕۆن و لەو باسە بکۆڵنەوە، حاجی موقەوێم لەو نێوەدا هات بۆ مالّی خاتوون بۆلای من، دانیشتبوین کە کەریم خان لەگەڵ بیست کەس ئاردالّدا گوتیان: کاک زیاد دەبێ لەگەڵ ئێمە بێت، چۆن ئەو قووچانیانە دەناسێ، من و حاجی موقەوێم بە هەر جۆرێک بوو ئەوانمان رازی کرد کە جارێ سەعاتێک لەشەو تێپەڕیوە، ئەگەر بڕۆین دەبێتە شەڕێکی قورس و بڕێکیش دەکوژرێن، چاکتر ئەوەیە ئەو شەو بڕۆن و سبەینێ ئەگەر دیسان فەرمان ئەوە بوو، یەک دوو کەس دەچین و کاک شوجاعوددەولە دێنین. پوول وچاییمان دا بە ئاردالەکان و ڕۆیشتن.[٤٦]

## بێبایەخی کاروباری شوجاعوددەوڵە

یەک شەممە ٢٣ سەفەر ١٣٢٥ بەرامبەری ١٧ی خاکەلێوەی ١٢٨٦: لە مالّی خاتوون هاتمە دەرێ و چوومە مالّی کاک شوجاعوددەولە دیم زۆر دلگیرە و لەگەڵ من قسە ناکات، منیش ڕاوەستام و ویستم لەگەڵی ئاشت بکەمەوە و لە خزمەتیدا دانیشتم و وردە وردە قسەمان کرد. گوتم لەو پانسەد تمەنەی کە برووسکەکەی من هێنام چوار مانگ تێدەپەڕێت و هیچمان بە هیچ نەکرد، داخوازیتان لێ دەکەم ئەو قەرزەی وا بۆ ئێوە کرد بووم بیدەنەوە، چۆن تفەنگ کاپی زێوم بەبارمتە داناوە، گوتی: بۆ ئەو قەرزەی وا کردووتە نابێ هیچ لەمن وەربگری.

گوتم: سی تمەن دەبێ بدەی و حەفتا تمەنی پارەی خۆیە و من ناتوانم بیدەم، ناڕەحەت بوو و گوتی: من پارەم نیە و تفەنگ و کاپم ناوێت. گوتم: تفەنگ وکاپی ئێوەیان ناوناوە شەست تمەن بە پەنجا تمەن دەیکرن ومن سەعاتێکی زێڕ و

٤٦- ئەلبەت کاری ئەو ئاردالانە هەر ئەوەبوو کە ئاگری شەڕگەشتر بکەن تا شتی زۆرتر دەستیان کەوێت. کاری ئەوان لە تاران هەر ئەوەیە و لەو ڕێگایەوە شت بەدەست دێنن، قاجارەکان بەوانە پوولێکی وانادەن.

ئەنگوستیلەیەکی فیرووزەم لە خاتوو تەلعەتوسەڵتەنە بە جێگای تفەنگ و کاپ وەرگرتووە و شەست تمەنم وەرگرتووە و دەتمەنیشی بۆ خۆم داومە و ئێستا بووەتە سەدتمەن و بەڵام خاوەنی ئەنگوستیلەو سەعاتەکە، شتەکانی خۆی دەوێت و سەرافیش پارەکەی دەوێت و منیش خەتام نیە کە پارەی قەرزم هێناوە بۆ تۆ. فەرموویان نەپارەم هەیەو نە تفەنگ و کاپم دەوێت.

ئەوەبوو کە من ڕۆیشتم و تفەنگم بە پەنجا تمەن و کاپیشم بەدەتمەن فرۆشت و دام بە کابرا و بۆسی چل تمەنی دیکە ئەنگوستیلەو سەعاتم دانا. بە کورتی بڵێم بە ماوەی سێ ساڵ واتا هەرمانگێک بەرانبەربەساڵێک بە ناخۆشترین شێوە ڕامانبواردووە، ڕەخنە لەشوجاعوددەولە ناگیردرێ بەڵکوو تاوانبار منم کە تاوانیشم داوە.

بەهەر جۆرێک بوو سی تمەنی دا و بە برووسکەی ناردم کە لە قووچان بیدەن بەماڵێ، ئێستا ڕوون بوەتەوە کە بە دزیەوە برووسکەیان ناردووە کە نەیدەن[٤٧] بە منداڵەکانم. جەنابی شوجاعوددەوڵە لە نەبوونی مندا ئەو تارەی بە جەلالی دیوان داوە کە بەم زوانە لە قووچانەوە هاتووە و داوێتی، لە حاڵێکدا کاک جەلال لەگەڵ من دۆستە و هیچ شتێک لەمن ناشارێتەوە و ئەگەر ئەو تارە لە زێڕیش بێت و من بمهەوێت پێمی دەدات. بەڵام مەبەستم لەبارودۆخی جەنابی شوجاعوددەولەیە.

ئەمڕۆ و ئەمشەوم بە تەواوی بە پەرێشانی بردەسەر،بە تایبەت ئەمشەو لەپەرێشان حاڵی و ناڕەحەتی ڕۆحی تا خۆرهەڵاتن خەوم پیا نەکەوتووە و زۆر ناخۆش بەسەر چووە.

## هاتنی هوژەبردیوان و مودیردیوان قووچانی بۆ تاران و حەکایەتی ئاغاعەلی

ڕۆژ چوارشەممە ٢٤ ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ١٣٢٥بەرانبەر بە مانگی گوڵانی ساڵی ١٢٨٦: جەنابی مودیردیوان، هوژەبردیوان و جەلالدیوان قووچانی کە دووسێ

٤٧- ئەوە پیسی عەبدوڕڕەزا دەگەیێنێ و کەسایەتی ئەو دەردەخات کە ڕوون دەبێتەوە پیاوی وا چۆن دەکرێ ئیلخانی کورد بێت.

ساڵ بەر لە ئێستا لەگەڵ جەماعەتێکدا چوو بوون بۆ تەلگەرافخانەی قووچان و بە هاندانی خەڵک بەرانبەر بە عەبدورڕەزاخان بوو بە هۆی لابردنی شوجاعوددەولە بەو هیوایە کە خۆیان بچنە سەر تەختی حکوومەتی قووچان، کوڕی جەنابی ئاسەفوددەولە والی خوراسان کە ئاغا ئەمیر حسەین خان - شەوکەتوسسەڵتەنەی ئێستا- لەمەشهەدەوە کرایەوە دەسەلاتداری قووچان، ئەمە بوو بە هۆی دیل بوون و فرۆشتنی کچە کوردە قووچانیەکان بە تورکمەنەکان کە پێشتر وتمان بە بۆنەی نەبوونی شوجاعوددەولە لەو جێگە ئەو کارە ڕووی دابوو.

ئەوەی کە جەنابی شوجاعوددەولە دوای لاچوونی جەنابی ئاسەفوددەولە لەحکوومەتی قووچان بە بۆنەی دیل بوونی کچە قووچانیەکان کە هەستیان ئەکرد دەوڵەت و خەڵکیش ئەوان ئەنێرن تەلگەراف لە لایەن موشیروددەولەوە بۆ حەزرەت ڕوکنوددەولەی والی خوراسان نێر دراوە کە ئەم سێ کەسە لە قووچانەوە هاتن بۆ مەشهەدو ماتڵی هاتنی ڕوکنوددەولە بوون ئەوانیش لە قووچانەوە کەوتبوونە ڕێ و لە ڕێگەی عێشق ئاباد- ڕووسیە- مازندەران حەسانەوە،لەبەر ئەوەی چەند ڕۆژ زووتر گەیشتبوونە تاران، بەڕاستی ئەم ناوبراوانە لە قووچاندا زۆر جێگەی ڕێزن، جەنابی شوجاعوددەولە ئاوایە کە هەر کەسێک لەهەر جێیەک تازە بچێتە ئەوێ، چ دۆس، چ دوژمن زۆر خۆشی ئەویست و مێوانیش هەر خێرا ئەبوو بە فەرمانبەرداری.

ئەمڕۆ هاین لە خزمەتی جەنابی شوجاعوددەولە، ڕێزی زۆرمانی گرت، چەند کەڕەت گوتراوە: ئەو شتانەی کە ئەنووسرێن شکات نیە و حەکایەتە، مەبەست ئەوەیە کە خاس و خراپ و خیانەت و ناشیرین و جوان بۆ ئەم لاوە هیچ فەرقێک ناکات.

ئەمانەی کە ئەڵێم درۆ نیە و تاقیم کردووتەوە و سەرۆکیش بۆ ئەم وتەیەم شایەتی ئەدەن؛ بەڵام یەکێ لە وانەی ئەوەیە کە ئەینووسم:

عەلی کە خشت ماڵیشیان پێ ئەوت لە قووچان کرێکاری ئەکرد و ماوەیەکیش غولامڕەزاخان کردبووی بە خزمەتکاری تایبەتی خۆیان و حوکمی کردبوو کە پێی بێژن ئاغاعەلیخان، دوای ماوەیەک عەلی ئاغا منداڵێکی تارانی هاورد بوو بۆ

مزگـەوت و گـورزی زۆری لێـدابوو کـە غەڵـتان خـوێنی کردبـوو و لـە لایـەن شوجاعوددەولـەوە هـیچ جۆرەسـەختگیری و تۆڵـەکردنەوەیەک یـان ئاڵـۆگۆڕێک سەبارەت بە ئاغا عەلی خان ڕووی نەدا تەنیا چەند ڕۆژێک لەگەڵـیا قـسەی نـەکرد و پاشان هەمیسان دەبوای هەمووی کەسێ فەرمانبـەرداری ئاغا عـەلی خـائین بـن و هەموان خوڵتەیان پێی دەکرد کە نەوەک لە لای شوجاعوددەولەوە خراپەیان بڵێ.

عەلی ئاغا خزمەتێکی کە ئەکرد ئەوەبوو بەجەنابی شوجاعوددەولەی ئـەوت: لـە حەزرەت عەبدولعەزیم ژن فلانوددەولەی بینیوە و تامەزرۆ بووە، کەسـێکی نـارد بـوو بـۆلای مـن، شوجاعوددەولـەی لـەمن گـەرەک بـوو و داوای کـردووە تـا ئیـزنی چاوپێکەوتنی ئێوەی پێی بدەم، بەڵێ دوای چەند ڕۆژ کە هەواڵـە درۆکـانی لـەکچی مەوهەمووددەولەوە نەبوو، کابرا فرەزانی دەکرد و بۆ هـەر ژنێـک بیـست تمـەنی لـە شوجاعوددەولە وەردەگرت، ئەو کاتە ژنێک دەستێک جلـی ڕازاوەی لەبـەر ئـەکرد و بڕێک وتاری فێرئەکرد و لەگەڵ دوو کلفەت ئەیهانیە ماڵەوە. ئەمەش بـوو بـە هـۆی بەدناوی شوجاعوددەولەوە.

ئاغای عەلی خان بە هـۆی ئـەم خزمەتانـەوە وردە وردە بـوو بـە خۆشەویـستی بارەگا، هەوڵی دەدا تا پلەو پایەی میر پەنجەیی وەدەست بهێنێ، ئاغا عەلی بـوو بـە هەمەکارەو ئێمەش سەرمان بێ کڵاو مابۆوە.

ئاماژە کراوە کە ئاغا عەلی چووە و لە ماڵ یەکێ لە ژنەکان شووشەیەک ئـارەقی ئەخوارد و لەوێشەوە ئەچوو بۆ قەحبەخانە کەسەد تمـەن ئیمپریـاڵ بگـرێ و چـوار پینج ئیمپریاڵ خەرج بکا و بیدا بە قـەرز و بلیتێکـیش بـۆ قـەزوین بگـرێ و ڕوو بـە دەروازەی قەزوین بچێت، ئاغای عەلی خان مەستە و لـە کاروانـسەرا لـە سـووچێک خەوتووە و دووسێ کەسیان نارد بەشوێنیا.

وا ڕێکـەوت غوڵامحـسەین قووچـانیش یەکڕاسـت بـۆ ئـەو کاروانـسەرا ئـەچوو ئەویشیان گرت و نەیان ویست شەلاخی بدەن، مەبەست ئەوەیە کـە هـیچ فـەرقێک ناکات عەلی خان بە بۆنەی دزی تا پینج شەش ڕۆژ ڕێـی لێـی ناگیردرێـت و بـەس، دواییش ئەبوو بە عەلی خانەکەی پێشوو و لەگەڵ ئەوانیتر هیچ فەرقێکی نیە. بـەڵام

بە بۆنەی ئەو کارە ناشیرینەیەوە شانازی پێوە دەکرا.

لە خزمەت جەنابی شوجاعوددەولە دوای خواردنی نانی ئێوارە خەوتین

ڕۆژ پێنج شەممە ٢٥مانگی ڕەبیعەلئەوەڵ ١٣٢٥ ئەمڕۆ...

جێ و شوێنی شوجاعوددەولە دوورخراوەتەوە و باوردۆخی تاران لە لاپەڕەکانیتر لە ڕاپۆرتی لوتفعەلی خان دەرەگەزی سەبارەت بە ئاخری ڕەبیعوسسانی ١٣٢٥ئەواهاتووە:بەو جۆرە کە وتراوە ئەمڕۆ ڕۆژی سێ شەممە ٢٨ مانگی ڕەبیعوسانیە...

دواییش خۆی ئەیژێت چونکە بیرو هۆشێکی ڕێکوپێکم نیە چاوپۆشی لە نوقسانە ڕابردووەکانم بکەن، بەو بۆنەوە سێ سەعاتی بۆخۆرئاوا مابوو، جەنابی هوژەبردیوان و مودیردیوان و جەلال دیوان و ئاغا موحەممەد خان ڕۆیشتوون و لەشەقامی لالەزار دابەزین و هاتن بۆ ماڵ شوجاعوددەولە کە تەشریفیان لەماڵ نەبوو، هەر چەندە بۆ چایی و قلیان هاواریان کرد کەسێ وەلامی نەداوە، وتیان کە لە چل کەسێک کە لە قووچان لەگەڵ ئەم کەسانە چوونەتە دەرەوە یەکەیەکە گشتیان لە پارەیی مانەوە. تەنانەت کەربەلایی میرئاخوڕ و غولامحسەین شیروانی -کە لە منالیەوە خزمەتکار بووە و خزمایەتی لەگەڵ ئەوان بووە- دوو ڕۆژە بە ناچار لە دەستی قەرزار باریان کردووە و لە کردەوە و ڕەوشتی جەنابی شوجاعوددەولە یاس بوون و ڕۆیشتن و دووسێ کەسێک ماونەتەوە و ئەوانیش لەگەڵیان چوون بۆ بازاڕ.

نۆکەر مودیر دیوان چووە و لەقاوەخانەیێک چایی هاوردووە. نەختێ نانی ڕووسی خاسیشیان سەندبوو و بە چاییەکەوە خواردمان و ئەویشمان چاوپێکەوت، خواحافیزیمان کرد هاتین بۆ ماڵ ئاغای زیاخاقان، دیم کە غەیری تەلعەتوسەڵتەنە کەسێکتر نیە.

ڕۆژ چوارشەممە ٢٩ ڕەبیعوسانی ١٣٢٥، ئەمڕۆیش لوتفعەلی خان بە خۆشی و بەخواردنی کنیاک ڕایبواردووە، بەڵام لە ئاکامدا کارەکەرەکە شووشەی کیناکی شکاندووە، خاتوونیش بۆ تولەکردنەوەی بە دارێکەوە ئەکەوێتە شوێنی و لوتفعەلی خان ناوجێ ئەکرد کە شووشەی عەینەکەکەی ئەو جۆرە کە خۆی ئەڵێ کوترا بە

دەموچاوی خاتوون و خەتی تێ کەوت، بەم شێوە ئەو کچەی ڕزگار کرد و بەڵام بـوو بە هۆی تریق بوونەوەیێک کە ڕادەی نـەبوو؛ چونکـە ئـەبێ بـۆچی دەموچـاوێ کـە ناسکتر لەبەرگی گوڵ بڕووخێت.

لوتفعەلی لەسەر باسی ڕووداوەکانی ئـەو ڕۆژە ئەنووسـێت کـە: دووسـەعات بـۆ خۆرئاوای مـابوو کەسـێ چوارکـەس لەخاتوونـە بـەڕێزەکان... هـاتن بـۆلای خـاتوو تەلعەتوسەڵتەنە، خاتوون کەبابی دروست دەکرد و شووشەی ئارەقیش لە پیالەی پـڕ سەهوڵ ئامادەیە.

سوپاس بۆ خوا زۆر خۆش ڕابورد و شوکر خوامان کرد لـە لوتفـەکانی خـانمیش سپاسمان کرد، ئەو کاتەم بە دەرفەتێکی باش زانی بیرکردنەوە و خەفەت خواردنم نا لاوە و تارم هاورد و لێم دا: کاتێکمان بە خۆشی و ئاسوودەیی ڕابـوارد و شـەو دوایـی هات.

ڕوژ پینج شەممە هەوەڵی مـانگی جەمادیولئـەوەڵ ١٣٢٥: لـەڕووداوەکانی ئـەو ڕۆژە لوتفعەلی ئەڵێ: خاتوونێکی جوان و بەڕێز کـە زمـان توانـای تـاریفی جـوانی و خۆش زمـانی ئـەوی نیـە، هـاتن بـۆ لای خـاتوون و بـڕیاریان دا کـە بـۆ حـەزرەت عەبدولعەزیم بچن و منیش بە خۆمم وت کە ئەوەی کە ئەبینم خوایە بە خەبەرم یان خەوە.

ڕۆژی هەینی دووی جەمادی ئەوەڵ: ئەمڕۆیش لوتفعەلی لە ماڵ خاتوون بـوو و شەویشی لەویا ڕابوارد.

ڕۆژی شەممە سێ جەمادیئەوەڵ: ئەمڕۆیش لـەم مـاڵا بـووم و بـۆ هـیچ کـوێ نـەچووم، چونکـە بـڕیارە ئەمـشەو جـەناب ئاغـای ئەجلالەلمولـک کـە سـەرۆکی کالسکەخانەی شایی بوو و سەرۆکایەتیان داوە بە بەنان کوڕی خاتوون، بۆیە هاتن بـۆ دیتنی بەنان دیوان.

لەگەڵ ئەوەی کە خاتوون زۆر لەسەری چوو کە لوتفعەلی شەو لەوێ بمێنێـت و ئەجلالەلمولک حەزی کردووە کە حەتمەن بیبینێـت؛ بـەڵام لوتفعـەلی خـان بـە بیانوویێک لە ژێری دەرئەچێت و ئەچێت بـۆ ماڵـی شوجاعوددەولـە و ئـەبینێت کـە

ئەویش نەخۆشە و لەسەرجێگە کەوتووە و یاو دایگرتووە، جەنابانی دیوانەکانی قووچانی لە لاین، ئەویش شەو لەوێ ئەمێنێتەوەو ...

ڕۆژی یەکشەممە چواری جەمادیولئەوڵی ١٣٢٥ بەرانبەر بە جۆزەردانی ١٢٨٦: ڕۆژم لە ماڵ شوجاعوددەولە بەسەد ئێشەوە ڕابوارد و لەگەڵ جەنابی شوجاعوددەولە شەویش چوین بۆ ماڵی ئەوان کە لە دەروازەی قەزوین بوو. سوپاس بۆ خوا شەو بە خۆشی ڕابوارد.

ڕۆژی دووشەممە ٥جەمادیو لئەوڵ: ئەمڕۆ نامەیەک لە لایەن وەزیری ماڵیەوە هات و لەو نامەیەدا هوژەبردیوان واژۆی کردبوو و منیش بەشەمەندەفەر بۆ ماڵ زیاخاقان هاتم، ڕوانیم خاتوو تەلعەتوسسەڵتەنە سفرەیەکی جوانی لە گەڵ شووشەی کنیاک ئامادە کردبوو و چێشتێکی ئورووپایی کە بە سۆپەی ئورووپایی کولاندبوو و بە تەنیا دانیشتبوو، وتیان زۆر بەکاتی خۆی هاتین، وتم زۆر خوش شانس بووم کە لە کاتێکی ئاوا گەیشتم بە حوزووری موبارەکی ئێوە، کاتی ئاوا زۆر بەنرخە...

عەسر بۆپیاسە کردن هاتم بۆ گۆڕەپانی تۆپخانە، موحەممەد عەلی شای قاجارمان کە لە دۆشان تەپەوە هاتبوو زیارەت کرد.

کەسێکیش سەییدی گلەیی بوو ئەو پاشای عادڵە سەییدی بانگ کردووە بۆلای خۆی و سەعاتێک گوێ بە گلەییەکانی داوە و بە تەواوی مێهرەبانی و موحەببەتەوە وەڵامی دانەوە.

کاتی ئێوارە چووم بۆ ماڵی زیاخاقان

ڕۆژی سێ شەممە ٦ی مانگی جەمادیولئەوڵ: یەی سەعات بۆ خۆر ئاوای مابوو کە لە خاتوون خواحافیزیمان کرد و بۆ ماڵ هاتینەوە.

دوای بە خزمەت گەیشتن، خێرا گوتیان و منیش گوێچکەم دا و تامڵم کرد چونکە دوو ساڵە پێکەوە هاتوین بۆ تاران، منیش بەم قسە ناشیرینانە ڕاهاتبووم و لە ترس ئابڕۆی خۆم بێ دەنگ مابووم، ئێستاش قسەیەکی وام پێ نیە چونکە لەم دەم و لێوە شتێک غەیری خراپەم نەبیستووە، هیچێکم نەوت وردە وردە بە بیانوویەک لە ماڵ هاتمە دەرو بەشەمەندەفەرهاتم بۆ دەروازەی قەزوین و هاتم بۆ ماڵ هوژەبر

ئەوەندە پەرێشان و بێ تاقەت بووم دانیشتوان بەم دڵگیریەمیان زانی و لێمیان پرسی منیش بەوردی باسم کرد، بەڵام تەنیا خوای گەورە دەیزانی چی بەسەر مندا هاتووە

## پیرەمێرێک قووچانی کە مەنێک ڕۆنی خوارد و ئەو کوردە سەرحەدیە کە ئاگری خوارد

**ڕۆژی چوارشەممە ٧:** بەیانی زوو جەنابی هوژەبردیوان و مودیردیوان بۆ قۆچان نامە ئەنووسن و منیش ڕۆژنامەم ئەنووسی و ئاغای جەلال دیوان قسەیێک سەیری کرد، دوو ساڵ بەر لە ئێستا لە قووچانا پیرمێردێکی قووچانی باخەوان کە هەشتاد ساڵی تەمەنی بوو لە گەڵ شوجاعوددەولە و سەد کەسی تر گرەوی کردبوو کەمەنێک ڕۆن بە خاڵی بخوات، شوجاعوددەولەیش ئەمری کردبوو کە نەختێک زیاتر لەمەنێک ڕۆن ئامادە بکەن، مەنێک و چواردە سیر ڕۆنیان هاورد، کاتی هەوای گەرمی هاوین بوو، وتیان ڕۆنەکە تواوەتەوە، پڕتەشتێک بوو، ئەو پیاوە لە ماوەی نیوسەعات تەواوی ڕۆنەکەی خوارد کە نزیک مەن و نیوێک بوو، منیش کە بە قسەی جەلال دیوان بڕوام نەکردبوو و دوایش جەنابی هوژەبردیوان و مودیردیوان شایەتیان دا وتیان کە ئێمە لەو کۆمەلابوین کە ئەم کارەساتە ڕووی دا و جەنابی مودیر دیوان خەریک باسێکی تر بوو و گوتوویە کە من لە سەفەری سەرحەدی قووچان لە لای خوالێخۆشبوو موحەممەد ناسرخان شوجاعوددەولە بووم کەیەکێ لەخەڵکی سەرحەدی قووچان گوتوویە کە ئاگر ئەخوات و ئاگرێکی زۆریان ئامادە کرد و نۆکەرێکیش ئاورە بەتینەکەی بەمەقاش هەڵئەگرت و لە دوای یەک ئەیخستە دەم ئەو کەسە و ئەویش ئەیخوارد.

لەبێ‌لەشی و پەرێشان‌حاڵی خۆم چەند پەرداخ شەراوم خوارد و نەختێک خەریکی تار و تەختە بووم و دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ نەختێک خەوتم و سێ سەعاتی بۆ خۆر ئاوا ما بوو، بەتوول خانم کە لە تاران ناو بانگی بۆ گۆرانی وتن زۆرە تەشریفیان هانی، لە هاتنیان هەموومان دڵخۆش بوین، پیاڵەیەک چاییم خوارد و

وردە وردە خەریکی گوێچکەدان بە گۆرانی بەتوول خانم بووین.

بەڕاستی دەنگێکی زۆر بەرزو ساناى بوو و زۆر ئیشی لەسەر کردووە و لەگەڵ مۆسیقارە بە ناو بانگەکان گۆرانی گوتووە، بە بارودۆخی تاران جوان شارەزایە.

سەعاتێکی بۆ خۆرئاوا مابوو کە بەتوول خانم ڕۆیشت و بڕیاری دا کە ئەمشەو بۆ ئەوێ بچێت، ئێمەیش لەگەڵ ئەواندا چووینە دەر و سوار شەمەندەفەر بوین و گەیینە شەقامی لالەزار و دابەزین و چوینە ماڵی شوجاعوددەولە.

ناوبراوان گەرەکیان بوو هەواڵی بپرسن و هەرچەند وتیان بەمن کە لە گەڵیان بچم قەبووڵم نەکرد و لە دووکانی تەلا فرۆشی دانیشتم تا ئەوان چوون. شوجاعوددەولەیش ئاغا موحەممەدی ناردبوو بە شوێنما کەمنیش بچمە خزمەتیان، وتم وەختی چوون بۆ خزمەتیانم نیە و ئێستایش تاقەتی گوێگرتن بەقسەکانیانم نیە، جەنابی هوژەبردیوان و مودیر دیوان و جەنابی ئاسەفوددەولە بانگی کردبوون و ئەوانیش لە لای شوجاعوددەولە هاتنە دەر و چوون، منیش لەگەڵ جەلال دیوان و محەممەد خان سوار شەمەندەفەر بوین و هاتینەوە بۆ ماڵ، بەتوول خانمیش هات و ناوبراوان لە خزمەت جەنابی ئاسەفوددەولە هاتنەوە، وردە وردە بەزم و ڕەزم ئامادەبوو بەتوول‌خانمیش گۆراینە جوانەکەی وت و سوپاس بۆ خوا خۆش ڕامانبوارد و لە شەش سەعاتی شەودا هەر کەسێک لە جێگەیەی خەوت و بەتوول‌خانمیش قسەی خۆشی کرد و خەوتین.

ڕۆژی پێنج شەممە ٨ جەمادی ئەوەڵ ١٣٢٥: یەک سەعات لە نیوەڕۆ گوزەرا بوو هەڵساین و چاییمان خوارد و بەتوول خانمیش وردە وردە گۆرانی ئەوت و لەم کاتەدا تەلگەرافێک لە قووچان گەیشتە دەستی ئەوان و تا ڕادەیەیێک دڵیان ڕاحەت بوو.

## ئەنجومەنی یەکیەتی خوراسانیەکانی تاران

ڕۆژی هەینی ٩ جەمادی ئەوەڵی ١٣٢٥: لوتفعەلی خان لە باسی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە ئەنووسێت:

چونکە ماوەیەکە پارلەمانی یەکیەتی خوراسانیەکان لە تاران پێکهاتووە و دوا

بەدوای ئیش و فەرمانی سەبارەت بەمەشرووتەخوازی تێکۆشانیان دەستی پێ کردووە.

ئەمڕۆ لەسەر دەعوەتێک کە کردبوویان وتووێژیان کرد و هەر کەسێک سەبارەت بە بارودۆخی خۆی قسەی ئەکرد و نامیلکەی کورتی لەسەر یاسای ئەو دانیشتنە نووسیبوو، هەموویان تەماشا کردووە و بە ڕاستیان زانیوە و مۆریان کردووە و سوێندیان خواردووە کە لەو کاتەوە بە دوا لەهەر جێگەیەک کە بن ئەو یاسا بەڕێوەبەن.

«هەر خێروباشەمان بۆ یەکتر گەرەک بێت»

بڕێک وتووێژیان کرد و لەوێوە ڕێکەوتن بۆ ماڵ، نانی نیوەڕۆیان خوارد و دەمێک حەسانەوە و عەسر ڕێکەوتن بۆ دەروازەی قەزوین.

**ڕۆژی شەممە و یەک شەممەی جەمادی ئەوەڵ ١٣٢٥:** لە ماڵەوە بووین و بۆ هیچ شوێنێ نەچوین هەر چوین بۆ حومام و گەڕاینەوە.

**ڕۆژ دووشەممە ١٢:** بەیانی زوو شوکر خوامان بەجێ هاورد و دووسێ خاتوون هاتنە ناو و دانەیەکیان زۆر جوان بوو دەنگیشی زۆر خۆش بوو ئەگەرچی ئەم ڕۆژگارە لەهەر سووچێک دڵی من بە هەزار جۆر بەزم و گۆرانی ئەچڕێ، لەگەڵ ئەوەشدا بە گۆرانی و قسەی ئەم خاتوونە کە لە ڕۆژگار و خەفەتی ڕۆژگار بێخەبەر بووین و نانی نیوەڕۆم خوارد و هەر کەسێک لەسووچێکدا بە خەیاڵی خۆی ئەحەساوە و منیش خەم و خەفەت کە دوو هاوڕێمن و نزیک عەسر خاتوونەکان تەشریفیان برد و ئێمەیش لەگەڵ جەنابی هوژەبردیوان و مودیردیوان چوین بۆ بازاڕ و نەختێک گەڕاین و شەو گەڕاینەوە بۆ ماڵ و سوپاس بۆ خودا شەومان بە خۆشی ڕابوارد.

**ڕۆژ سێ شەممە ١٣:** ڕووداوێک تازەنەبوو

**ڕۆژ چوارشەممە ١٤:** بەیانی زوو ڕێکەوتین شوکر خوامان بەجێ هاورد، هەر چی بیرم کردەوە کە بە بۆنەی خەم و خەفەتێک کە دووسێ ڕۆژە تووشم بووە بچم بۆلای دوکتۆر. زانیم تاقەت ئەم هەمووەڕێگەمە نیە، لەماڵەوە لەگەڵ ناوبراوان دانیشتبووین کە نەسرەت خاتوون هاتەماڵەوە ئەم خاتوونە -کە تازە شووی کردبوو-

قسە خۆشەکانی ماندوویی لەبیر بردینەوە.

لە ماڵ بوین تاشەو و هەرچیمان گەرەک بوو ئەم خاتوونە لە لامان دانیشێت بە بۆنەی شووەکەیەوە نەیتوانی دانیشێت و تەشریفی برد.

وتم قوربان پیاوی ئاوابم کە ژنەکەی بۆ خەلک بەش کردووە، ڕۆژ بۆ هەموویە و شەویش خوا ئەزانێ سەعاتێک بە شووەکەی ڕابگات یا نە.

## ٢٥- ناو ئەو کەسانەی کە لەگەڵ شوجاعوددەولە بۆ تاران دوور خرابوونەوە. ١٣٢٢ مانگی

بە پێی نووسراوەکانی لوتفعەلی خان لە ماوەی سێ ساڵ دوور خستنەوەی عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولە بۆ تاران ٤٠ کەس لە گەڵیا بوون، بەڵام ماوەی ئەم دوورخستنەوە کە لە ساڵی ١٣٢٣مانگی تا١٣٢٥ درێژەی بوو وردە وردە ئەوکەسانەی وا بێ وەفاتر بوون. تاقەتی سەختیەکانیان نەبوو و جێمیان هێشت، لە لایەکیشە شوجاعوددەولە بە هۆی فەقیری و پەرۆشی خۆی نەیتوانی خەرجییان بدات، بڕێکیان لە تاران بە ڕۆژا ئەگەڕان، بە دوای کرێکاری و بەدبەختیەوە بوون.

بارودۆخی شوجاعوددەولە و لوتفعەلی خان گەیشتە ئەو جێگەی کە ڕۆژێک بە هیوای قەرز کردن چوونە بەردەرگای ماڵ سەید عەلی قومی کە لە مامۆستا بە ناو بانگەکانی تاران بوو لە دوای ماوەیەک خوشکی شوجاعوددەولە بوو بە ژنی و تا شەو لای سەید عەلی ملیان لار کرد و ئاخریشی بە کۆڵێک جوێن و قسەی ناشیرین توانیان یەک تمەنی لێ وەربگرن و نانی شەوی ماڵی پێ ئامادە کەن.

دنیا دەوران دەورانە ڕۆژیک های لە سەر و ڕۆژێک لە خوارەوەی بە هەر شێوەیەک ئەو کەسانەی تا ئاخر لەگەڵ شوجاعوددەولە مانەوە و بەدبەختی زۆریان تووش بوو ئەمانەن کە لە خوارەوەو ناویان ئەبەین:

١- لوتفعەلی خانی دەگەزی کوڕی ئەڵاهیار خان کەنووسەری بیرەوەریەکانە.

٢- لوتفعەلی خان خزمەتکاری شوجاعوددەولە کە جاران بە «عەلی بەنا» ناوی دەرکردبوو و نۆکەری میرزا غولامڕەزاخان ناوێک بووە.

٣- غولامحسەین خان خزمەتکاری شوجاعوددەولە.

٤- ئاغا میرزا سەید ئەسەدوللا.

٥- میرزا غولامڕەزاخانی قووچانی نووسەری شوجاعوددەولە.

٦- یاخشی خان لە نۆکەرەکانی شوجاعوددەولە

٧- حاجیخان

٨- ئاغا عەلی بەگ کە هەمیشە ئیددەعای سۆفیەتی و دەرۆیشی ئەکرد.

٩- کەربەلایی ئەکبەر فەڕاش

١٠- کەربەلایی فەقی سیرئاخۆڕ کە لە نەورۆزی سالی ١٣٢٥ هێشتا لە لای شوجاعوددەولە بوو.

١١- محەممەد خان بەگ دلخۆش

١٢- غولامحسەین خانی شروانی کە لە خزمە نزیکەکانی شوجاعوددەولە بوو.

١٣- سوبحان ویردی خان برای جەنابی دوکتۆر زەبەردەست خان کە لە کرماشانەوە هاتبوو و هەمیشە لە گەل شوجاعوددەولە بوو.

١٤- شێخ محەممەدی قووچانی کە تا ئاخری دوورخستنەوەکە تا سالی ١٣٢٥ لەگەل شوجاعوددەولە مابوو.[١]

٥- ئاغا محەممەدی خزمەتکاری شوجاعوددەولە

١٦- شوکروللا خان کە پالتاوێکی بە ئەو خەلات کرد.

١٧- میرزا محەممەد ڕەزا چایچی شوجاعوددەولە

١٨- کەربەلایی حەسەن

١٩- کەربەلایی عەلی

٢٠- میرزا محەممەد حەسەن خانی قووچانی

٢١- نایب حەسەن فەڕاش

٢٢- مەشهەدی حسەین قاپووچی

## لێکۆڵینەوە لەسەر شکاتی دووبارەی کوردەکانی باشکانلوو لە پارلەمانی نەتەوایەتی

کوردەکانی باشکانلوو دوای هەوڵی زۆر و شکات کردن و وتنی ئەم باسە لە زۆربەی وتوویژەکانی پارلەمان چونکە بە ئاکامێک نەگەیشتن ولاینگرانی ئاسفوددەولە و سالار موفەخخەم لە پارلەمان و بارەگا لە ناو سەردار و یاخیەکانی وڵات لە بەڕێوە چوونی حوکمی داد بەرگری کرد و ئەیانویست سالار موفەخخەم لەبەندیخانە ڕزگار کەن.

باشکانلووەکان لەم بابەتەدا شکاتیان بۆ ئەنجومەنی ناوەندی لە تاران نارد کە ئەنجومەنیش شکاتەکەی ئەوانی بۆ ڕاگەیشتنی زۆرتر بۆپارلەمانی نەتەوایەتی نارد.

**ڕۆژی یەک شەممە ٢٧ی شەعبانی ١٣٢٥:**

شکاتەکە خوێندرایەوە بەم ناوەڕۆکەوە:

بە خزمەتی ئەگەیەنم: ماوەی دووساڵە کوێخاعەلی و یۆسف ساحیب، بەندکراوەکانی قووچان لەگەڵ شەست و دوو کەس بەندکراو و ماڵەتاڵان کراوەکان لە تاران ماونەتەوە و ماتڵ بوین. بڕێک گەرەکیانە سالار موفەخخەم ڕزگار کەن کە مافی ئێمە لە ژێر پێی بنرێ، هەرکاتێکیش نائومید ئەبین ناچارین ڕووبکەینە وڵاتی هەندەران، چونکە پێکهێنانی ئەنجومەنیەکان بۆسەندنەوەی مافی زوڵم لێکراوەکان، ئەوان بە خوا سوێند ئەدەین تا ئەو کەسانە وا ئاماژەیان پێکراوە ڕزگار بکرێن و سزا نەدرێن و مافی بەند کراوەکان بدەنەوە دەستیان.

ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: ئەم شکاتە بۆ ئەنجومەنی وەزیران نووسرا بوو نە بۆ پارلەمان. وتیان ئێستا ئەنجومەن وەڵامی دەوێ.

ئاغا میرزا مەحموود کتیب، فرۆش: چەند ڕۆژ بەر لە ئێستا لەم بوارەدا وتوویژکراو و بڕیار درا لە لایەن پارلەمانەوە بۆ وەزارتی ناوخۆ بنووسرێت کە تا ئاخری مانگی ڕەمەزان بەند کراوەکان هەڵگەڕێنەوە، ئێستا لە لایەن پارلەمانەوە هەنگاو هەڵێنراو یان نە؟ ئەگەر هەڵێنراوە کە ئەبێ ئەوان ماتڵ بن تا کاتی خۆی بگەیێت.

سەرۆک! هێشتا لە لایەن پارلەمانەوە هەنگاوێک هەڵنەگیراوە لەم ڕۆژە ڕەشەدا وەک تەواوی ڕۆژەکانی تر قسەو باسی دووپاتکراوی نۆینەرەکان کە تەواوی کاتی پارلەمانی پڕ کردبوو بێ ئاکام مایەوە، هەر چەند کە سەرۆک پارلەمان لە سەرەتاوە وتی: تا ئەمڕۆ بە ئاکام نەگەیشتین لە پارلەمان ناچینەدەر؛بەڵام لەگەڵ ئەوا کە ٧٣کەس لە نۆینەرەکان کە بڕێکیان وەکوو تەقی زادە و میرزا مەحموود سەرۆک چەند کەڕەت قسەکەیان دووپاتکردەوە خەریکی باس و وتووێژ بوون و بە ئاکامێک نەگەیشتن، ئێمەیش لە گوتنی ئەم قسەو باسە درێژە کە خۆینەران وەڕەز دەکا و ئەبێ بە هۆی ئەوەی کە ئینسان لە خۆی قینی هەڵسێت پارێز ئەکەین، دووپایی ئەکەینەوە کە لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ١٨ مانگی ڕەمەزانی ئەم ساڵە ئاسفوددەولە لە کابینەی ناسرەلمولک بە ناو وەزیری ناوخۆ بە پارلەمانی نەتەوایەتی ناسرا، ئێستا کە ئەبێ بە مافی بەند کراوەکان لە ڕێگەی وەزارەتی ناوخووە ڕابگەن، وەزیری ناوخۆیش کە خۆی بەند کراوەکانی فرۆشتووە، بارودۆخی دەوڵەت و پارلەمان وکردەوەیان دژ بە ڕەعیەتی زوڵم لێکراو بەتەواوی ڕوون و ئاشکرایە کە خۆی دەوڵەتی مەشرووتەیە و پارلەمانی مەشرووتەیش بەگەیشتن بە ئەم پلەو پایە شانازی ئەکرد.

پارلەمانیش ڕێگەی تری بۆ نەما بوو چون کە نە پارەی هەبوو نە هێزی بەڕێوە بردن، هێز کە وا لە ژێر دەست پادشادا و و پادشاش بۆ خۆی وێنەی زوڵم و زۆرە.

چەند ڕۆژێک پاش بڕیاری وەزارەت، ئاسەفوددەولە سیاسەتی ڕەشی ئاشکرا بوو، تەلگرافێک لە شاهرووەوە گەیشتبوو و ڕۆژی ٢٣ ڕەمەزان سەرۆکی پارلەمان خویندبوویەوە:

سوارەکانی تورکەمەنی هاتن لە قەزوین سێ هەزار مەڕیان برد و پەنجا کەسیان کوشت و چەند کەسی دیکەیشیان بەندکرد، ئەگەر چارەسەرێک نەبێت ئەبێ بچین لە تورکەمەنەکان فەرمانبەری کەین تەلگرافێک نزیک بەم ناوەڕۆکەوە گەیشت و خوێندرایەوە.

سەرۆک: چالاکییەکان لەم بابەتەوە کراوە.

ئەدیبوتوججار: کە ئەمەچالاکیەکانیە!

سەرۆک: سوارکارە خوراسانیەکان قیتاوقیت و هێزی شاهروود و بەستامیش کۆئەبنەوە و هێزی مازندەرانیش هەروەها بە دوو ڕۆژ کۆ دەبنەوە.

ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: ئەبێ متمانەپەیدا کەین کە سپەهداد ئێستا یا بۆ ئەستەرئاباد ئەچێت یا بۆ تونێکابۆن.

سەرۆک: ئەچن بۆ ڕەشت و لەوێوە ئەچن بۆ بەندەری گەز.

ئێستا کێ ئەبێ بەم ئاکارە ڕابگات، بەڕاستی کەسێک جگە لە ئاسەفوددەوڵە کە وەزیری وڵاتە، نیە. ڕوون و ئاشکرایە کە ئاسەفوددەوڵە خۆی لەم ڕووداوە دەست و هاندانێکی هەبووە تا ڕزگاریی سالار موفەخخەم پێک بهێنێت و باسی خۆی و دیلە قووچانیەکانی لەبیر بچێتەوە، تا لە تەواوی وڵات شەڕو ئاژاوە بێتە پێشێ، نەوەک لەمەشرووتە ڕق هەڵبگرن و دووبارە حکومەتی زڵم و زۆر بێتە سەر دەور تا ئاسەفەکان و سەردارەکان و سالارەکان بە ئاواتی خۆیان بگەن.

لە کۆبوونەوەی یەک شەممە ٢٧ ڕەمەزان وەزیری دەرەوەی وڵات سەبارەت بە ئەستەرئاباد، وەڵامی نوێنەرانی پارلەمانی ئاوا دایەوە.

هەنگاوە پێویستەکان هەڵگیراوە و هەنگاوی تەواو ئەوەیە کە ئێمە دەبێ بچین بە کارێکی تردا ڕابگەین، دەبێ سالار موفەخخەم بڕوات.

لاپەڕەیەک کە لە لایەن نەسرەتوسەڵتەنەوە گەیشتبوو خوێندرایەوە: دەمەوێ بچم بۆ ئەستەر ئاباد، دەست درێژی تورکەمانەکان لە سەر ڕێگە لائەبەم، ئەم ئاکارەئەگەڕێتەوە بۆ بڕێک لەو هەنگاوانەی کە پارلەمان هەڵیئەگرێت. وەکوو ئەوەی کە ئێستا لە ناو تورکمەنەکان جیاوازی مەزهەب بووە بە هۆی ئاژاوە، کەسێک کە ئەتوانێ تورکمەنەکان لەسەر ڕێگە لابات سوارە کوردە بجنووردیە شادلووەکانە، بیرو بڕوای من ئەوەیە کە سالار موفەخخەم پارلەمان ڕزگاری بکات تا لەگەڵ من دا بێت کە بەند کراوەکان بگەڕێنێتەوە و نەتەوەکەی لە خەتاکەی خۆش بن.

ئاغا میرزا مەحموود: لە ڕاستیدا ئەبێ زۆر لە سپەهدار سوپاسگوزار بن کە وڵاتی لە لەناوچوون پاراست، باشتر ئەوەیە بە هۆی ڕەحیم خان چەلیبانلوو قەراجەداغی ڕاسپێردراویەییکی پەیدا کردووە.

حەسەنعەلی خان: نەخشەی ئەم وڵاتە خراپ کێشراوە، پێنج مانگ لە دەست کەسێک -ئاسەفوددەولە- هاوار بکەیت تا ئەوەی ئەو لە وڵاتی خوراسان لابەن، دواییش بیکەن بە وەزیری ناوخۆ،شەش مانگە لە دەست کەسێکی تر هاوار ئەکەن تا ئاخری زەنجیر ئەخەنە ملی و دواییش بە پاڕانەوەی کەسێکی تر بەری ئەدەن، من ئیشم بەوە نیە... هەر ئەوەندە ئەڵێم ئێستا کەسزا لە ناوانیە لانی کەم مەهێڵن خراپە پەرەبەسێنێت.

سەیدولحوکەما: بەم شێوە کە سپەهدار نووسیویەتی خراپ نیە،سزای خراپکاری ئەو، پارەیەکە کە فەرامانفەرما لە کاتی وەزارەتی دا دابینی کردووە.

ئاغا سەید مێهری: ئەگەر سپەهدار بێپێشەکی ئەیگوت کە سالار موفەخخەم بدەن بە من بیبەم، چاکترە لەوەی کە پێشەکی دابمەزرێنن.

ئاغا میرزا تاهێر: ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە کە هەمووی ئەو چالاکیانە لە لایەن سالار موفەخخەم و ئەکرەمولمولک و مەفاخێرلمولک ئەستەر ئابادیەوە کە ئەم فرمانانە ئەکەن کە ئەو ڕزگار کەن.

ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە: ئەگەر تەنیا باس باسی ئەستەرئابادە چونکە گرینگە باس بکرێت زەرەرێکی نیە ئەگینا باشتر ئەوەیە پارلەمان نەختێک خۆی ڕاگرێ، بیهێننەوە بیریان کە ئاغایانی نوێنەر ئەو حوکمە ئاخرەی وا پارلەمان دای تا ئاخری ڕەمەزان ئەگەر نەسڕایەوە ئەبێ سالار موفەخخەم سزا بدرێت. لە نوێنەرانی بە ناو بانگی پارلەمانی نەتەوایەتی ئاغا سەید عەبدوڵلا بێهبەهانی بوو کە لەم دواییانا لە بەر بڕێ شت زۆر دڵی بۆ سالار موفەخخەم ئەسووتا بەشێوەهایەکی جیاواز لە ڕزگاری ئەو باسی ئەکرد.

هەروەها کە لە کۆ بوونەوەی شەممە ٢ی زیقەعدە ئەیگوت: حەفتەی پێشوو دوو کەڕەت زانیارانی خوراسان ئێمەیان بانگ کردووە بۆ تەلەگرافخانە و ئێمەش لەبەر ڕێزگرتن لەوان ڕۆیشتین و گوتیان هەمووی پیاو ماقوڵانی خوراسان و زانیاران تەلەگرافیان ناردبوو گوتبوویان بە هۆی ئەوەی کە تورکمەن هیرشیان کردووەتەناوچەی سەبزەوار بۆیە ترسا بوون و داوای تفەنگ و چەک و گوللەیان کردووە.

دوای ئەوە کە ئەم بابەتە لە نێوان نوێنەراندا نرایە دەنگدان دووبارە ئاغـای سـەید عەبدوڵڵای بێهبەهانی نەختێک وتووێژی سـەبارەت بـە شـەهیدانی کەربـەلا کـردو پەڕینـە سەرباسـی سـالار مەفەخخـەم و لـە نـاو قـسەکانیا گـوتی: لـەو باسـە کـە خوشکەکانی ئێمەیان دیل کردووە ئاسفوددەولە بە هۆی ئـەم کـارە لـە حکوومـەتی خوراسان لابـرا و وەزارەتی ناوخۆیـان پێـدا و ئەودەسـتەکەی تریـان ئامـادە کـرد و نەیانزانی چی بوو کە لە دادگا کە خەتاکەیان خـستە ئەسـتۆی سـالار موفەخخـەم و ئێستاش حەوت مانگە کە دیل کراوە. پێش‌تریش شکاتی نووسیبوو، منیش ئەم‌گوت و ئەزانم بڕێک لە قسەکانی من لە نێوان من و ئـەودا لـە دەرەوە ئەکرێتـەوە و بۆیـە نابێت ببیسرێت؛ بەڵام بە هۆی ئەو قسانەی کە گوتم: ئـەبێ ببێـژرێ، ئـەو کەسـەی دووبارە نامەی نووسیوە کە بوونی من لە بەندیخانە کەڵکی نیە و زەمان ئەدەم و پارە ئەدەم، ماڵ خۆم دادەنێم لەبەر ئەوەی کە بڕۆم بەندکراوەکان بهێنمەوە و ئەگـەر وام نەکرد گوندەکانم ببەن بۆ خۆتان.

ئەگەر قسەکانی ئەو ڕاستە ئیتر چۆن ژیر ئەبێت و ئەوشتەی دەستی ئەکەوێ لە دەستی بدات.

نا،ئەبێ خۆمان پارە بدەین و بەند کراوەکان ئامادە کەین.

ئاغا سەید حسەین برووجردی: لەسـەرەتای قـسەکەوە چەنـد ڕۆژ لەسـەر ئـەم بابەتە باس کرا واتا دەبێ زامن بهێنێ کە ڕزگار بکرێت، قەبووڵیان نەکرد.

ئاغا سەید عەبدوڵڵا موجتەهێد: لەبەرچی قەبووڵیان نەکرد؟

حاجی عەلی ئاغا: هۆکارەکە ئەڵێم، پێـشتر گەڕانـەوەی حـەفتاد و دوو دیلیـان ئەویست ئێستا بووەتە حەوسەدکەس، لەگـەڵ بەنـد کراوەکـانی ئەسـتەرئابادی کـە تورکمەنەکان بە هاندانی سالار موفەخخەم براون.

ئاغا سەید حسەین: ئێستا کە لە بەندایە، بووەتە حەوسەد کـەس کاتێـک ڕزگـار بکرێت ئەبێت بە حەفتا هەزار کەس لێرەدا دووکـەس لـە نوێنـەران یـەک لـە دوای یەک وتیان ئێمە بە ڕۆیشتنی سالار موفەخخەم متمانەمان نیە کەبڕوات، چـون ئیتـر دەستمان ناکەوێتـەوە، باشـتر وایـە کـە پـارە بـە کەسـانی تـر بـدات ئـەوان بـڕۆن

بەندکراوەکان ڕزگار کەن.

ئاغا سەید عەبدوڵلا موجتەهید بێهبەهانی: مانای زامن چییە مانای زامن ئەوەیە کە ئەگەر ئەو چوو و ئەو ئیشەی نەکرد ئەو بدەنە دەست ئێوەوە.

ئاغا میرزا مەحموود خانساری: کاتێ کە پارلەمان ونەتەوە لەم بابەتـە متمانـەیان هەیە چ پێویستێکی هەیە بە زامنەوە؛ بەڵام ئەگەر ئەو شێرە لەبەند دەرچوو ئیتر کێ ئەتوانێ دووبارە بیخڵەتێنێ و دیلی کات؟

تاقمێکی زۆر لە نوێنەرەکان و ئایەتوڵلا بێهبەهانی باسیان لەسەر کردووە کە بـە شێوازێک سالار موفەخخەم ڕزگار بکرێت، بەڵام سەید حەسەن تـەقی زادە خەیاڵـی هەموانی ڕاحەت کـردو گـوتی: ئـەوە باشـترە کـە سـالار موفەخخـەم لەبەندیخانـە بپتورکێت و بمرێت و هەر کاتێک ئەم ئاکارە وەبیرم دێ لەسەر خۆم دەچـم، خوزگـا سالار موفەخخەم لە بەندا ئەمرد. بیر کەرەوە ئەوکەسانەی ئـەیان‌ویـست بـەزەییان بێت بە بەند کـراوە و بەدبەختەکانـدا یـان خـاون بەنـدکراوەکان هـەموویان وێـڵ و ئاوارەی شەقامەکانی تاران و زۆربەی ڕۆژەکان لێرەدا ئامادە بوون لە کۆڵان و بازار بەر ئێمەیان ئەگرت ئەناڵێنن و ئەڵێن ڕەحم کـەن، بـڕیار وایـە مـانگی شـەواڵ -مـانگی پاش- ئەگەر سالار موفەخخەم دیلەکانی نـەداوە دەبـێ سـزا بـدرێ، بـەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە لە بیرمان چووەتەوە ئیتر،ئەویش ئێستا لە پارلـەمان ڕای خـۆی بـەڕێوە نەبرد و هەروا لە بیرمان ئەچێتەوە بۆیـە باشـتر وایـە کـارێ بکـەین تـا زۆرتـر لـەوە شەرمەزارمانی نەکردووە هەر بەو شێوە لەبەند بمێنێت تا بمرێت.

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی سێ شەممە چواری زیقەعدەش ئەم باسـەکرایەوە و بـڕیار درا سالار هەروەها لەبەند بمێنێت هەتا بەندکراوەکان ڕزگار بن، لە کۆ بوونەوەی سێ شەممە ۲۵ زیقەعـدەی ۱۳۲۵ کـۆ بوونـەوەی نەتەوایـەتی، تـەلگرافیک لەسـپەهدار تونکابونی لە ئەستەر ئابادەوە هاتبوو کە لە پارلەمان خوێندرایەوە، بەو ناوە ڕۆکەوە:

بۆ دەربڕینی خزمەت ئیلخـانیم نـاردووە بـۆ گـۆگلان و هەڕەشـە پێویـستەکانم کردووە، لە سێ ڕۆژی پێشوودا ۲۰ دیلیان هێنا و ئیمڕۆ هەواڵنێر هـات و ۱۰ کـەس ئافرەت و مناڵی دیلیان هێنا و نووسیبوویان ئەوانی دیکەش ئەدەینە دەستتان ئەگەر

هێـزە نیزامیـەکان بـێن و تـەواوی دیلـە پێـشووەکان و ماڵـەتاڵانکراوەکان پێیـان ئەدرێتەوە مووچەی ئەم لاوازانە کە هەن بدرێتە دەستی ئەنجوومەنی ئەستەر ئاباد تا پێیان بدەن.

سەرۆک: لەڕاستیدا خزمەتی زۆریان کردووە.

لە دانیشتنی ڕۆژی شەممە ٢٩ زیقەعدە، سـەرۆک تـەلگرافێک کـە لـە لایـەن سپەهدار بۆ وەزارەتی وڵات نێردراوە، خوێندیەوە و دوێنی دووشەممە غولام شـاخان لە لایەن ئیلخانیەوە هاتووە بیست و یەک دیلـی هێنـاوە و خـاوەن دیلـەکان لـەویٚ بوون لە نێو شین و گریانی هەر دوولا دیلەکان درانـە دەسـتی خزمـەکانیان، چـەن کەسی تریش ئەهێنن کە هێشتا لە نێوان ڕێگەدان، ئەگەر یارمـەتی نـەبێت نـاتوانین بیانگەڕێنینەوە و هان لە دوایی ترین شوێنی خـاکی یـەمووت و ئەوپـەڕی سـنووری ئێران، مەبەست لەم تەلگرافە ئەمەیە کە تا پارلەمان بە باشـی لـە ئیلخـانی وبراکـەی ئاوڕبداتـەوە و هـەروەک خـەرجی‌یـەک بـۆ بەنـدکراوەکان دابـین بکرێـت، مـاتڵ و چاوەڕوانی وەڵامم.

لـە وتووێژەکـانی ڕۆژی شـەممەی ٦ زیحەججـەی ١٣٢٥ وێنـە ڕاپـۆرتی ئەنجومەنی هەرێمی ئەستەرئاباد گەیشتبوو کە سپەهدار لەگەڵ ئێکرامولمەلێکدا ٣٧ کەس لە دیلەکانی گەڕاندوەتەوە و داوای ئەو پێداویستیانەی کردووە.

لە وتووێژەکانی ڕۆژی شەممە ١١ زیحەججە وەزیری نـاوخۆ داوای لەپارلـەمانی نەتەوەیی کردبوو کە لە باتی خزمەتی.

میرزا حاجی سەید باقر: داواکاریەکانی حوجەتولئیسلام بەڕێوە ئەچێت و بە ئـەو تەورە کە فەرمووتان کۆتایی پارلەمان دروستە.

لە کۆ بوونەوەی سێ شەممەی ٢٢ موحەڕەمی ١٣٢٦ سـەرۆک پارلـەمان وتی: هەواڵێک لـە کومیـسونی داد خوێندرایـەوە کـە سـەردار موعـەزەز بوگەڕاندنـەوەی دیلەکانی قووچان هاتووە و گوتوویە: کە هەزار سوار خوراسـانی بـەتانک و تۆپـەوە و بەدەهەزار تمەن بـۆ خـەرجی سـێ مانگـەی کەوتووەتـە ڕێ و مووچـە و خـەرجی هەرکەس لە کاتی شەڕدا لە مانگدا ٣٣ ڕیاڵ دابین کراوە کە دیلەکان بگەڕێنێتـەوە و

سالار موفەخخەم لە ژێر چاودێری دا بێت تا دیلەکان ئەگەڕێتەوە و دوای ئەوە کاربەدەستان بە قازانج داری ئەزانن بەڕێوەی ببەن.

لە کۆ بوونەوەی سێ شەممە ۲۹ موحەڕڕەم ۱۳۲۹ سەرۆک پارلەمان تەلەگرافی سەرداری سەبارەت بە شەڕ لەگەڵ تورکمانەکانی یەمووت لە خۆرهەڵاتی گورگان خوێندەوە کە لە نزدیکی تەپۆلکەی بەلغی خەریکی خۆ ئامادە کردن بوون و ئیلی نەعلی ئامادەی گەمارۆدانی ئەوان بوون و گوتبوویان کە بەرەو کەتوول و گۆگلان ناچن و ناپیاوی خۆیان زۆرتر کردەوە، بۆیە ئەمرۆ ئوردووەکە وەستا و سەربازەکان هێرشیان کرد ومنیش لەگەڵ ئەواندا هێرشم کرد و پاشان سەرکەوتین و لە دەوری ۲۰ کەسمان شەهید بوون و ئەسپی زۆریش لەناوچوون و دەستدارەکان هەوڵی زۆریان دا.

لەدەوری چل ڕۆژ لە تەلگرافی یەکەمی سپەهدار ڕابواردبوو کە تەلگرافێکی بۆ پارلەمان ناردبوو و بڕێک لەدیلەکانی لە تورکمانەکان وەرگیرانەوە و تەلگراف لە کۆبوونەوەی پێنجەمی ڕەبیعولئەوەڵ کە سەرۆک خوێندیەوە کە بریتنی بوو لە گەڕانەوەی چوار دیل لە تورکمانەزاڵمەکان و تێکیشکانی ئەوان و گەڕانەوەی دەکەس لە دیلە قووچانیەکان کە فرۆشرابوون.

سەرۆک: مزگێنیەکی گەورەبوو بۆ نەتەوە.

ئەحسەنوددەوڵە: باشتر وایە کە بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت بنووسرێ کەبەردە فرۆشی قەدەغە بکرێت.

سەرۆک: ئەبێ لەم بابەتەوە لایەحە بنووسرێ تا لە پارلەماندا بخوێندرێتەوە.

دواهەمین کۆبوونەوەی پارلەمانی نەتەوایەتی لە بەرواری ۲۳ جمادی ئەوەڵی ۱۳۲٦ دا بوو. دوای ئەمە پارلەمان بە ئەمری موحەممەدی عەلیشا درایە بەر تۆپ و مەشرووتیەت هەڵپێچرا و نوێنەرەکانی نەتەوە بڕێکیان کوژران و بڕێکیان ڕایان کرد و بڕێکیان ئاوارەو دەربەدەر بوون و سالار موفەخخەمی بجنووردی ڕزگار بوو و بە ئەوپەڕی گەورەیی و ڕێز بۆ بجنوورد گەڕایەوە، عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەوڵەیش بۆ قۆچان گەڕایەوە، ئاسەفوددەوڵە هەر وەکوو جاران لەوەزارەت و پلەو پایە

باشەکاندا مایەوە و دیلەکانیش هەروەها لە نێو چارەڕەشی و چەرمەسەری ڕۆژگاریان بردە سەر تا لە دنیا دەرئەچوون.

## یەکەمین پارێزگاری دادگوستەری ئێران بۆ دیلەکانی کورمانج باشکانلوو

لەیەکەمین خولی سەردەمی مەشرووتیەت کە سەرۆکی ڕۆژنامەی موحاکـەمات ئـەوەی بـە یەکـەمین دادگـای یاسـایی نـاو نـاوە و پێـشنیاری کـردووە کـە ڕۆژی پێکهێنـانی وەک جـەژنی نەتەوایـەتی بناسـرێ، یەکـەمین وەکیـلی داد هاتنـە گۆڕەپانەوە، میرزا ئەحمەد خانی حەیدەری لەم دادگایی کردنەوە بە نـاوی وەکیـلی سالار موفەخخەم ئەناسرێت و ئەم ڕۆژنامە نووسـیویەتی: لەبـەر ئـەوە ئـەم دادگاییـە یەکەمین دادگایی یاسایی بوو ئەبێ تا ئاخر یاسایی بێ و میرزا ئەحمەد خان کـە لـە کەسایەتیەیاساییەکانی وڵاتە، لە لایەن سالار موفەخخەمەوە بوو بـە پـارێزەری و لـە پارلەمانی پیاچوونەوەدا لە ئەو دیفاعی کرد، میرزا ئەحمەد خان بـە گـرتنی سـالار – ئەوکەسەی کە ئەم وەکیلیەتی ناڕەزایەتی- دەربڕیوە و بەیاننامەی ناڕەزایەتی خـۆی بە ناوی شازادە فەرانفەرماوە –یەکەمین وەزیری دادی ئێران- ناردوە کـە یەکـەمین بەند کراوی یاسایی گرتبوو، حەیدەری بەڵگەیەکی لـە بەیاننامەکەیـدا نووسـی و لـە ڕۆژنامەدا بە مەجدولئیسلام کە سەرۆکی ڕۆژنامەی موحاکەمات بوو و لە ژمـارەی ١١ لە ڕێکەوتی ١٢ جمادی سانی ١٣٢٥ لە چاپ دراو حەیـدەری لـە لایحـەی خـۆیدا ئەڵێت: مەبەستی من لە وەرگـرتنی ئـەم وەکالـەتە پـشتیوانی لەکەسـایەتی سـالار موفەخخەمە کە لەم ڕووداوەدا بە تاوانبار ناسراوە هیوا دارم زانست و ئینـساف و دادی ئێوە –فەرمانفەرما- ئەوکەسایەتیەکانی تریش دان بەو ڕاسـتیەدا بنـێن، کـە ئـەرکی وەکیل لە پێش دادوەری پرۆسە، ڕوون کردنەوەی ڕاستی ڕووداوە و پاراستنی مافـە؛ بەڵام لێکدانەوە و ناسینی ماف و جیا کردنەوەی تـاوان لـە ئەسـتۆی وەکـیل دانیـە؛ بەڵکوو بەهەستە دروونیەکانی دادوەر پێوەندی هەیە.

بەڵێ میرزا ئەحمـەد خـان یەکـەمین وەکیـلی داد ناڕەزایـەتی تیرۆتەسـەل و درێژی خۆی دژ بەڕاگرتنی سالار ئامادە کرد و پێشکەشی وەزیری دادکرا.

ئەمە جێگەی سەرنجە کە ئەم دادگایی کردنە زۆر بەربڵاو بوو ئەم چالاکیانە کـە لەم دادگاییەدابوو لەسەر بنەمایەکی عەوامانە بوو و بەپێی دان پێدانانی وەکیل نـەبوو و نیازی بەدرکاندنی ڕاسـتی و ناڕاسـتیەکان نیـە و هـەموو شـتێک ئەگەڕێتـەوە بـۆ زانیاری و ئەزموونی ڕێکخەرەکان و لەم نێوا نەدا هەیە کە مافەتازەکانمان سەر هـەڵ دەگرێت و هەروەها کە زۆر کەڕەت گوتمان و ئەیڵێلنەوە: ئەمانە بەشێکە لە ژێرپـێ کردن و پێ شێل کـردنی مـافی خەڵـکی ئاسـایی حەیـدەری لـە لایحـەی خۆیـدا ئەڵێت بە پێ یاسا ئەتوانین کەسێک بەندکەین کـە تاوانبـارە و تـاوانی لـە دادگـایی وڵاتدا پەسند بکرێت، بەم بۆنەوە بەر لە دەرکردنی حوکم ئەبێ ئەم جۆرەکەسایەتیانە بە ناوی تۆمەتبارنبناسرێن، دەعوەت کردنی تورکمانەکان بۆ تـالان کـردنی خەڵـکی ئەم ناوچەیە کە ئەگەر ڕاستیی ئەم شتە دەرکەوێت -بۆ ئێمە دیار و ڕوون نیە- دەی سزای یاسایی تاوانی ئەوان و ئاوا کەسێک کە حاکمە لە وڵاتماندا چییە؟ سـەرچاوە و ڕێگە و ڕەوشتی ئەو یاسایە کە حوکم بەسزا ئەکات لە کوێدایە یاسای ئیمـڕۆ ناتوانـێ بۆ شتێک کە لە مەوپێش ڕووی دا حوکم کات ئیتر چۆن داد ئەتوانێ کەسایەتییەکی بەڕێز کە لە سەرسنوورە پڕبایەخەکان بووە و چەنـدەها سالـە باووباپیریـان خزمـەتی ئـەم دەوڵـەتە ئەکـەن، خـاوەنی شـەرەف و حورمـەت و ئابـڕوون ئیـستا نـاکرێ کەلەبچەبکرێت و بخرێتە بەندیخانە جگە لەوە کـە ئـەم کەلەبچەکردنـە پێچەوانـەی ئینساف و داد و یاسایی تەواوی دنیا دەزانرێت بە تایبـەت ئـەم بـێ حورمەتییـە، بـێ حورمەتییە بە زاتی پیرۆزی پادشا کە خاون پلەیەک نیزامییە، بـەر لـەوەی حـوکمی ڕاستەقینە بگرن ئەگەر حوکمی وا نەگۆڕدرێت ئەبی خەڵک بەگشتی لە لایەن مـافی مرۆڤی و شەرەف و حورمەتێ کە خۆیان لە ژێـر سـێبەری موبـارەکی زاتی پـیرۆزی پادشادا کە ناسراوە بە دادگەر، دڵ ساردونائومێد بکرێن.

بە بۆنەی ئەو هۆکارانەی کە گوترا گـرتنی مـەحامی لـە وەزیـری داد بـە هەڵـە ئەزانم و داواکارم ئەمـە بکرێـت و بـڕیار بـدرێت کـە حـوکمی گـرتنی ئامـاژەپێکراو کەبەپێچەوانەی یاسا دراوە هەڵبوەشـێتەوە بەزمانـەت لـە گـرتن ڕزگـاری کـەن تـا حوکمی ڕاستەقینەی بۆ دابین بکرێت، وەکیلی سـالار موفەخخـەم مـیرزا ئەحمـەد

لەبەرواری ٦ی جمادی ساڵی ١٣٢٥ ئاغای دامغـانی وەکیلـی داد لـەژێر ئـەم وتـارە هێناویـەتی، ئـەم دادگـایی کردنـە چ لـەبواری ڕواڵـەت و چ لـەبواری ناوەڕۆکـەوە لەژێرچەتری خاڵە سیاسیەکانی ئـەودەم بـووەو ئـەم ڕووداوانـە لەڕێکخـستنی و لـە دەنگـی زۆر پڕبایـەخ بـووە، مەشـرووتە خـوازان تێکۆشـاون کـە ئاسەفوددەوڵـە و سەرۆکانی سەردەمی زڵم بەگشتی بە ناوی نۆینەرایەتی حکوومەتی تاوانبـار بکـەن و خزمەکانی حکوومـەتی تێکۆشـاون ئـەوان لـەم داوە ڕزگـار بکـەن، لەڕاسـتیدا ئـەم دادگایی کردنە بەربەرکانییە کە لە نێوان زوڵـم و مەشـرووتەدا و هـەروەها سـەبارەت بەم دادگایی کردنە کەسرەوی و کەسانی دیکە نووسیوویانە کە: فەرامانفەرما وەزیری داد هەوڵی داوە کە ببێتە هۆی ئاسوودەیی ئاسەفوددەوڵە و موحەممەد عەلیـشاوە و هەروەها نووسەرانی ڕووداوەکانی مەشرووتە هەوڵیان داوە کە ئاکامی دادگـا کـە لـە لایەن پارلەمان و پارلەمانتارەکان کەڵکی خراپی وەرگرت ئەوانی زۆر تووڕەکرد بوو.

حسەین سەعادەت نووری لەو بارەدا ئەڵێ موحەممەد عەلیشا لـەم ڕووداوە زۆر ناڕازی و تووڕە بوو؛ تەنانـەت حەزیـشی ئـەکرد ئاسەفوددەوڵـە بـە شـاهێدی دان و سوێند خواردن و ڕاڤەی زۆر بۆ دادگا بیهێنن.

عەبدولحوسەین میرزا وەزیری داد بە ئاماژەی لە ئاسەفوددەوڵە پشتیوانی کرد و تێکوشا کە ئەو لە تاوانەکانی بەری کات، بەم هۆیەوەیە کە تەقی زادە لە پارلەمان لـە وەزیری داد ناڕەزایەتی پیشان دا، بەڵام ڕێکخراوەی داد لەوکاتەدا لـەو ڕادەیانیـە کـە بتوانـێ دەنگـی بـەرزی سـەبارەت بـە تۆمـەت بارەکـان بـەڕێوە بـەن، بـەم بۆنـەوە ئاسەفوددەوڵە وەک تاوانبار ئەبینین کە لـە کابینـەی ناسرولمولـک قـەراگوزلوو کـە ڕۆژی ١٨ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٥ بەپارلەمان ناسرا، بەڵگەی وەزارەتی نـاوخۆ دانـرا، هیچ کام لە نوێنەرانی پارلەمانیش بە بۆنەی ڕێزیەوە شتێک ناڵـێن، تـەنیا ڕۆژنامـەی ئادەمیـەت بەسـەر کردایـەتی مـیرزا عەبدوللـەتیف وتـارێکی تونـدوتیژی بـۆ ئاسەفوددەوڵە نووسی و تاوانەکانی ئەوی تێـداهێنا مـسترمارلینگ وەزیـر موختـاری ئینگلیس لە تاران لە ڕاپۆرتێکدا ئـەم ڕووداوانیـە کـە بـۆ وەزیـری دەرەوەی بریتانیـا «سرادواردکری» بۆ لەندەن نارد. هەروەها کە گوتمان هـیچ هـەنگاوێکی گرنـگ بـۆ

ڕزگار کردنی دیله‌کان هه‌ڵنه‌گیرا، ئێمه‌ش ئه‌م قسه‌یه لێره‌دا ئه‌بڕینه‌وه‌، سه‌رنجی ئێوه ڕائه‌کێشین بۆ چۆنیه‌تی وه‌رگرتنیماڵیه که بووه به هۆی فرۆشتنی کچه‌کان.

## بیره‌وه‌ری چه‌ندکه‌سێک له‌و دیلانه:

## بیره‌وه‌ریه‌کانی ژنه دیلیه کرمانجێ

له‌گه‌ڵ به‌توپ به‌ستنی پارله‌مانی یه‌که‌م ده‌رباز بوونی نۆینه‌ران و ده‌سپێکردنی زلمی دووباره و دواهه‌مین هیواکانی خزم و که‌س و کاره‌کانی دیله‌کانی له ناو بردو هه‌موان زۆرتر له کاتی پێشوو چوونه ناو گێژاوی خه‌م و خه‌فه‌ت که ده‌ست که‌وتی ڕزگاری خوازه‌کان بوو بۆ ژیانی خه‌ڵکی سته‌م لێ کراوه‌، ئیتر ئه‌وان نه‌ئه‌یانتوانی بانگه‌وازی ڕزگاری خوازی و داد و کۆمه‌لایه‌تی له‌به‌رانبه‌رشا و ئاسه‌فودده‌وله‌کان و سالاره‌کان هه‌ڵده‌ن، نه له مافی له ده‌س چووی خۆیان قسه بکه‌ن.

باسی ڕاگه‌یشتن به زلم و زۆره‌کان له‌بیر چووه و زۆربه‌ی ژنان و کچان و منالان له تورکمان سه‌حرا به‌دیلی مابوون که پیره ژنێک له کوردان له ناوچه‌ی مراوه‌تپه زیندوو بوون و نووسه‌ر چه‌ن که‌ڕه‌ت ویستی که‌بچێ بۆ چاوپێکه‌وتنی؛ به‌لام به بۆنه‌ی نه‌بوونی ئامێری ڕا گوێزان ئاواته‌که‌ی بۆی به‌دی نه‌هات تا دوایی ترین که‌س له دیله‌کانیش له دنیا چوو. ئاغای مه‌له‌ک موحه‌ممه‌د و خێزانی زه‌ینه‌ب ده‌ودانلوو که زۆربه‌ی ته‌مه‌نی خۆیان له‌شوانی و چادرنشینی ڕابواردووه بۆ تورکمه‌ن سه‌حرا هاتووچوویان ده‌کرد ده‌یانگووت ئه‌و پیره ژنه گوتوویه:حه‌وت هه‌شت ساڵ بوو که به‌دیلی تورکمانه‌کان ده‌رهاتم، ناڕه‌حه‌تی و خه‌فه‌ت و تاڵی زۆرم چه‌شت و چاره‌ڕه‌شی زۆرم له‌غه‌ریبی و دیلیدا بینی ده‌ردی دووری و جیایی له‌دایک و باوک و خوشک و براو خزم و و که‌س و کارم به‌فرمێسکی چاو ئه‌سڕی، چه‌ن که‌ڕه‌ت ویستم ڕاکه‌مه‌وه و خۆم بکوژم که‌سه‌رنه‌که‌وتم تا ئه‌وه‌که ورده ورده به‌و ژیانه ڕاهاتم و منیان بۆ یه‌کێ له‌ لاوه تورکمانه‌کان ماره کرد.ئه‌م ژیانه هاوبه‌شییه وه‌کوو بیره‌وریێکی تاڵ بوو که ئه‌نجام و ئاکامی نه‌بوو و بیری دایک و باوک و ئازیزه‌کانم هه‌موو کات منی عه‌زیه‌ت ئه‌کرد، فرمێسک له چاوانم ئه‌هاته خواره‌وه هه‌نگاوم

وەکوو مێلۆرە هەڵئەگرت، لاوازو داماوی کرد بووم شەو تا بەیانی وەکوو مارپێچم دەخوارد، ڕێگەی ڕزگارییێک نەبوو، ئەبوای بێ هیچ هاوارو دادێ ژیانم بکردبایا ساڵەکانی خەم ئەهاتن و ئەچوون و من خاوەنی مناڵ بوو بووم. لەیەکێ لە ڕۆژەکانا لە ئاسۆی خۆرهەڵاتی دووری سارادا چەن تەپۆڵکەی ڕەشم بینی کە لە مەوپێش نەبوون. دڵم لەدیتنی ئەو تەپۆڵکانە داکەوت، ئەژنۆکانم بی هێز بوون و لەرزم لێ هات، بیرەوەریە ڕەشەکانی ڕابردوو لەبەر چاوم ئەهاتن و ئەچوون، فرمێسک لە چاوانم دا ئەڕژا، نەم ئەزانی بۆ وام لێ هاتووە تازە لەوبەری سنووری ئێرانەوە گەڕا بووینەوە بۆ مراوەتەبە، تورکمانەکان خەریک بوون چادرەکانیان هەڵ ئەکرد؛ بەڵام من تا شەو بۆ ئەو تەپۆڵکە ڕەشانە ئەمڕوانی، ئەو شەوەم هەر جۆر بوو تەواو کرد بەیانی ئەوکاتە پیاوەکانی هۆز چوون بە دوای ئیشە ڕۆژانەکەی خۆیاندا من خۆم خستە ناو ڕۆخانە تا تورکمانەکان من نەبینن و بەپەلە بۆ لای تەپۆڵکە ڕەشەکان ڕام کرد لە نێوان ڕێگەدا چاوم کەوت بە وشتر و مەڕەکان کە لەو نزیکییەوە خەریکی لەوەڕین بوون، ئەمە چوونمی بەهێزتر کرد کە ئەو تەپۆڵکە ڕەشانە چادرەکانی کوردن و ئیتر لە ڕۆخانە دەرچووم، کەڕەتێکیتر ڕوانیم بۆ ئەو تەپۆڵکانە، بەڵام چیم دی دڵم لەدەر هاتن دا بوو، لەبەر ئەوە ئەوشتە ئەمدی باوڕم پێی نەئەکرد، ئەو تەپۆڵکە ڕەشانە چادرە ڕەشەکانی کورمانجیەکان بوو لە تەنیشت یەکەوە لەدووڕیز دابوون. بە پەلە بۆ لای ئەو دووکەڵەی کە لە ناو ڕۆخانە هەڵ کرابوو ڕام کرد و ئافرەتان و کچە کوردەکانم بینی کە لەوێ ئاگریان کردبووەوە، لەسەر خۆم چووم، دوای سەعاتێک خۆمم لە ناو ژنان و کچە کورمانجیەکان کە جلوبەرگی جوانیان لەبەردا بوو و سەرمیان لەسەر ئەژنۆیان نابوو، ئاویان ئەکرد بەدەممەوە، چاوم کردەوە دەستم کرد بە گریان پاش سەعاتێک دڵخۆشی دانەوە بارودۆخم تۆزێ باشتر بوو، زمانی کوردیم لەبیر چوو بوو و زۆر بە ناڕەحەتی وشەکان ئاهاتە سەرزمانم، ئەوان چاوەڕوان بوون کە تێ بگەن من ژن تورکمەنێک بم، ئەڵبەت ئەوان دەیانگوت: بۆچی بۆلای ئەوان ڕام کردووە و فرمێسکی خوێنین ئەڕێژم، ژنێک کە ئەگریجە و قژ و زولفەکانی سپی بوو و خەمی ڕوژگار لەپای خستبوو، زۆرتر لەوان بە من دا

بەزەیی ئەهاتەوەو فرمێسکی دا ئەڕژاند و هۆکاری ڕووداوەی لەمن پرسی، من بە هەنسکەوە گوتم: دایە ئێوە دانیشتووی کام چادرن و ئەم چادرە خاوەنی کێیە؟ ئەو وتی: خاوەن ئەم چادرانە ئەخزە.

وتم: تا ئێستا تووشی هێرشی تورکمانەکان بوون؟

وتی: بەڵێ ڕۆڵەکەم زولفە سپیەکانم و باڵاچەماوەکەم پیشان دەری ئەو ڕۆژە ڕەشانەیە.

گوتم: لەهۆزی ئێوە کەسێک بووە کە کچی بەدیلی ببەن، هاوارێکی کرد و ڕوومەتی ڕنی، گوتی: کچە حەوت ساڵەکەمیان دزی و مناڵەلاوەکەمیان کوشت.

وتم: دایکە ناوی کچەکەتان چی بوو؟

گوتی: ئەو ئازیزەم کە نازانم چی بە سەرهات ناوی گوڵبوتە بوو، من خێرا خۆمم فڕی دا باوەشی و بانگم کرد: دایە دایە! فرەیەک گریام، هەمووی ژن و پیاوەکان کە لەو کۆبوونەوەدا بوون ئەگریان و لە نێوان شین و گریانی ئەوان دا وتم: منم دایکە! من گوڵبوتەی کچی تۆم، دایکم لەبیستنی ئەم هەواڵە لە هۆش چوو و کەوتە سەرزەوی.

دوای ساڵەکانی دیلی و خەفەت و ئاوارەیی و دەربەدەری دایک و باوک و خزمەکانم دۆزیبووەوە؛ بەڵام ئیتر درەنگ بوو بوو دووهێزی جیاواز لە دووناوەندی دژ بەیەک منیان بۆ لای خۆیان ڕا ئەکێشا، من هەستم ئەکرد لەم کێشاو کێشەدا خەریکم ورد و خام ئەبم لەیەک لاوە دایک و باوکم و ئازیزانم و ڕەگەزم، لە لایەکی دیکەشەوە مناڵەکانم لەو ڕۆژە ڕەشەدا وەکوو تەنافێک دەس و پێمیان بستبووەوە و منیان بەتورکمانەکانەوە لکاندبوو.

لەم ژنە چوار کوڕی تورکمەن بەجێما کەئێستا لە کوردان و لە باکووری مراوەتەپە-هاوینە هەواری کوردەکانی زەعفەرانلوو- نیشتەجێن و لەگەڵ خەزمەکانی دایکیاندا هاتووچوویان هەیە. بەداخەوە بەو شێوە کە پێشتر باسمان کرد نووسەر بە بۆنەی ڕاگوێزانەوە نەمتوانیوە بڕۆمە ئەو شوێنەو ئەمە دواهەمین ژنی زوڵم لێ کراوە کە سەردانی لێ کەم، لە خاکە لیوەی ٦٤ هەتاوی کە ڕۆیشتم بۆ

ئەوێ ئەو داماوەکۆچی دوایی کردبوو و لە ژیان ڕزگاری بوو و ڕۆحی شاد بێ.

ئەمەش نامەیەک لەژنێکی دیلی کە ئێستا دوای هەفتا ساڵ لە تورکمەنستان نووسیویەتی کە باوکی، ئەو و خوشکەکەی بەهەشت کیلۆ جۆ فرۆشتبوویانی، گران فرۆشتوویانی یان هەرزان نازانم لەبەر ئەوە کاتێک بە سەدر ئەعزەمی ئێران -عەلی ئەسغەر ئەمینوسسوڵتان- نارەزایەتی پیشان دا کە خەڵکی ئێرانیان بە ئینگلیس هەرزان فرۆشتووە، گوتی: کە زۆر گرانیش فروشتوومە، لەبەر ئەوە هەر کچێک لە نیوقەران زیاتر ناشی، هەشت کیلۆ جۆ لەو کاتەدا قران و نیوێک بوو، ناوی ئەم ژنە ئەلیفەیە کە ئێستا ٨٠ ساڵیەتی، خوشکەکەشی زەریفەی ناو بووە. باوەپیارەی موحەممەد عەلی بەیگ کاتێ چووبۆ کەلات ئەو دوانەی بردووە بۆ سنووری چنگان تا بە تورکمانەکانی بفرۆشێ، ئەلیفەیان لە ئەو بەرسنوورەوە تورکمانەکان بەهەشت کیلۆ جۆ سەندوویانە و بردوویانە؛ بەڵام کوردەکانی ڕەشوانلوو و چادرنشینەکانی کەلات زەریفەیان کڕیوە کە نازانین چەی بەسەر هاتووە. نامەکەی پێش نەورۆزی ١٣٧٢ هاتووە و تەلەفۆنی ماڵیشی ٢١١٤٦٥ لە عێشق ئابادەوە نێردراوە و نامەکە برامان ئاغای غولامحوسەین ئەفسەری هێنای بۆمان، بەڵگەی کوردەکانی جافاکانلوو وڕانلوو، بەروارەکەشی ١٣٢٤ە،کەبە هۆی ئەمیر قولیخان سەرهەنگ دانلو گیراوە، میرزا ئەبولقاسم خان لە تاران ڕاسپێردراویەتی و هاتبوو بۆ قووچان، لەبەر ئەوەی کە کوردەکان شکاتیان کرد کە دەوڵەت ماڵیاتی زۆر لە ئێمە ئەگرن و خەڵک ناچار بوون منداڵەکانیان بفرۆشن و ماڵیاتی یەکێک وەکوو ئاسەفوددەوڵە -کەکچە قووچانیەکان بە دیلی ئەبا- پێک بێنن ئەم باسە لەپارلەماندا دەنگ و باسی گەورەی دروست کرد و لەبەر ئەوە میرزا ئەبولقاسم خانیان بۆ وەرگرتنی ماڵیە بۆ قووچان و ئەسفەراییین نارد، ئەو بەیارمەتی هوژەبر دیوان و کەسانی تر بەلایەکی وەهایان هێنایە سەر خەڵک کە ڕێگەی دەرچوونێک نەبوو لەم کارەدا دەتمەن لەم دوو هۆزە گیراوە. بەڵگەی ئاغای بلووریان

## چالاکی ڕێکخراوەی جاسووسی ڕووس لە قووچان

گوتراوە لەبەر ئەوەی ئەوکاتە ڕووسەکان ئەیانویست تەواوی ناوچەی باکووری ئێران لەمەهاباد تا توربەت جام درگیر کەن دوای گرێبەندی ئاخاڵ ۱۲۹۹ و داگیر کردنی باکوور چوونە پێشەوە و دەست درێژی زۆرتر بۆ ناوخاکی ئێران کرا کە هەواڵەکان و بەڵگەکانیان چووە دەرەوە، ئینگلیزیەکان پیانیان زانی، ئاکامی ئەمەش هاتنی لورد کەرزەن بۆ قووچان بوو تا بۆچوون و بیروڕای ئەمیر حسێن شوجاعوددەولە و هێزی بەرگری ئەو وەک لەمپەرێک ڕووسەکان تاقی بکاتەوە، لەوێدا بوو کە ئەمیر حوسێن خان ئەو ڕستە ناسراوەی خۆی وت کە ئێمە دۆ نین ڕووسەکان بمانخۆنەوە و ڕووسەکان ئەیانزانی ئەمیرحسێنخان نیسکێکی نالەبارە کە قووت دانی ئەو قوڕگیان ئەبڕێ، لەبەر ئەمە لەڕێگەی جاسووسیەوە چوونە بەرەوە، بە تایبەت دوای بوومەلەرزە لە دوای یەکەکان و مردنی ئەمیر حسێن خانیش هەلێکی باشی ڕەخساند، ئەوانیش خۆیان بە مەبەستی گەیاندنی یارمەتیەوە گەیاندە قووچان و خانی جوانی کورد نزیکیان بووەوە و بە بۆنەی گوێ نەدانی دەوڵەتی قاجاڕ بەکێشەی خەڵکی بۆمەلەرزە لێدراوی قووچانەوە لەم بوارەدا تاڕادەیەک بۆ بە دست هێنانی دڵەبریندار وشکاو و ڕووخاوەکانی قووچانیەکان سەر کەوتن، بڕێک کاروانسەرایان لە ڕێگەی قووچان دامەزراندو بەکڕینی کشمیش و فرۆشتنی قەن و چایی و نەوت خەریک بوون، لەبەر ئەوەی کە کاروانسەراکان جێگەی هاتوو چووی بازرگانەکان بوو، هەموو هەواڵی سیاسی و ئابووریان ئەتوانی بەباشترین شێوە لەوێ وەدەست بهێنن، بەم شێوازە سەرکەوتنێکی سەرسووڕهێنەریان بەدەس هێنا، بێ ئەوەی کە موحەممەد خان یا خەڵکی قووچان یا دەوڵەتی ئێران بەمەبەستە پیسەکانیان بزانن، ئەم جاسووسە ڕووسیانەزۆرتر لە ئەرمەنیەکان و بڕێک لە تورکەکانی دانیشتووی ڕووسیە بوون کەبە ناو کۆچەر هاتبوون بۆ ئێران و لەشارەکانی باکووری خوراسان نیشتەجێ بوون و لەهەموو شەوێنێ دا ئەبینران هەروەها بەقسەی شاکری ئەمان لەڕووداوی خەرمانان بە نوقڵ

کردن بەسەر سەربازە داگیرکەرکانی ڕووس لە قووچان و وتنی بژی لنین و بژی ئستالین دەروونی شاراوەی خۆیان دەرخست، ڕووس نەتەنیا لە قووچان بەڵکوو لەتەواوی ئێران تا سمنان و دامغان لەم کاروانسەرایانەی دامەزراندبوو و لە ئەفغانستان و هندوستانیش دا بەم ئیشە درێژەی دا.

باشتر وایە لێرە دا ئاماژە بکەینەسەر نووسراوەی بکۆف کە خۆی سەرۆکایەتی ڕێکخراوەی جاسووسی سۆڤیەتی لە خوراسان لە ئەستۆ گرتبوو، ئەو ئاکارە سەرهەنگ هووفمەن لە بیرجەند ڕوونی ئەکاتەوە کەبە ناوی نۆینەری ڕێکخراوەی تاجرانی پەشم بە ناوی دووەمی پان خەریکی چالاکی جاسووسی بوو و ڕاپۆرتەکانی بە ڕێکوپێکی لە ناوچەی بیرجەند و بلووچستان و سیستان بەو ئەدا ڕاسپێردراوێکی تری ژنرال ساموولوف لە دزئابی زاهیدان بووە کە تەواوی هەڵس‌وکەوتە سیاسییەکانی لە ناوچەکانی نێوان سیستان و بلووچستان تا پاکستان و کەراچی لە ژێر چاوەدێریدا بووە و هەر ئەو بوو کە سەفەری ئەمیر ئەمانۆڵلا خانی پادشای ئەفغانستانی بۆ شەورەوی سازکرد و تەواوی هەڵس‌وکەوت و ئیشەکانی پاشای ئەفغانی بەڕووسیە ئەگەیاند، بکۆف ئەڵێ :ئیمەش یەک کەس ڕاسپێردراومان وەکوو پردی پێوەندی بوو کە ناوی «بلچین» بووکە لە ڕووسە سپیە کۆچەرەکان بوو. ئەم کەسە کاروباری ماشینی دزئاب و مەشهەد لە ژێر دەستیا بوو و ڕاپۆرتەکانی هومخن ساموئیلوفی لەمەشهەد بەئێمە ئەگەیاند، سەرۆکەکانی دەوڵەت لەخەودابوون، ڕاسپیردراوی ئێمە لە قووچان کەسێک بوو بە ناوی« میش گانیف» کە نوینەرایەتی سەندیکای نەتەوایەتی شەورەوی لە ئەستۆدابوو ساڵەهای ساڵ لەو شارەدا ژیابوو، ئەویش زانیاری بەربلاوی لە ناوچەی خۆی بە ئێمە ئەگەیاند کە بە تایبەت لە بواری جێگە وشوێنی کوردەکانی قووچان کە بۆ ئێمە گرینگ بوو، گانیف لەوێ چالاکیەکانی یەکێک لە ڕاسپێردراوە نهێنیەکانی ئینگلستان بە ناوی« ئارامائیش» کە لە قووچانەوە ئیشە جاسووسیەکانی لە سنوورەکانی شەورەوی سەرپەرەشتی ئەکرد، لە ژێر چاوەدێریدا بوو. یەکێک لە پەنابەرانی ڕووسمان بەناوی «کروکلف» بۆ ناوچەی بیرجەند ناردبوو کە تەنیا چالاکیەکانی تورکمانەکانی لەبەر

چاوبگرێ، دەوڵەتی شەورەوی بڕیاری دا کە ئەگەر خزمەتەکانی جێگەی ڕەزامەندی بوو لێی ببوورن وئیزنی نیشتە جێ بوونی پێ بدەن، من ئیتر بە پێویستی نازانم کە سەبارەت بە ڕاسپێردراوەکانمان بەگشتی قسەبکەم؛ بەڵام هەر ئەوەندە ئەبێ بزانرێ کە تەنیا لەهەرێمی خوراسان نزیکەی ٥٠ ڕاسپێردراوی نهێنیمان بوو کە ئەوەندە بەسەر بارودۆخدا ڕاهاتبووین کە تەنانەت نامەیەکی ئاسایی دەوڵەت تا گرنگترین بەڵگە سیاسیەکانی نۆینەرایەتی ئینگلیز لە بەر چاومان نەئەشاردرایەوە.

دوایی نکۆف ئاماژە ئەکاتە جاسووسی مودیری ڕۆژنامەی ئازاد- کە لەمەشهەد بڵاو ئەکرایەوە- بە ناوی عەبدولقادر ئازادی کە بەیارمەتی سوڵتانوسەڵتەنەی باخزری سەرۆکی عەشیرەتی هەزارە دەری دەکرد و ئەڵێ:

ئەو کاتە کە حێزبی موحافەزەکار لە ئینگلستان دەسەڵاتیان گرتە دەس نێوانی دەڵەتی شەورەوی و ئینگلستان ڕووبە خراپی ڕۆیشت، بە شوێن ئەوەدا هەر نامەیەک کە ئەگەییە دەستمان داکۆکی ئەکردە سەر ئەوە کە ئەبێ زووتر ڕێکخراوەکانی جاسووسی لە نێو خاکی هێندووستان دابمەزرێت و ڕێگە بە پێکهاتنی شۆڕش لەسنوورەکانی هیند بگرێ و تەنانەت لە ناو ڕۆژهەڵاتدا ئەگەر پێویست بوو دژ بە شەورەوی بوەستن، ئامادەبن.

بۆ ئەم ئیشە پێویستە کە لە ڕێگەی پارەدان بەسەرۆکە عەشایرە سنووریەکان و پێک هێنانی خەزانەی نهێنی چەک و تەقەمەنی و چەکدار کردنی خەڵکی کاربکەن ودەبێ بەپەلەهەنگاو هەڵ گیرێ.

لەسەرەتای ئەم ئاکارانەدا من بە هۆی تاجرێک بە ناوی موحەممەد لەگەڵ سوولەتوسسەڵتەنەی حاکمی شاری باخزر لە باشووری خۆرهەلاتی مەشهەد و نزیکی سنووری ئەفغانستان ناسراویمان داخست، جگە لە حکوومەتی شار سەرۆکایەتی ئیلی هەزارەیشی لە ئەستۆبوو، لەسنووردا بوو، سوولەتوسسەڵتەنە کە هێشتا لەتەمەنی لاوەتیدا بوو بە بۆنەی خۆش ڕابواردنی، زۆربەی ماڵی خۆی بە بادا و زۆر قەرزداربوو.

من دوایی توانیم لەگەڵ سوولەتوسسەڵتەنە ڕێک کەوین و ئەو بڕیاری دا کە

چەک و کەسەکانمان هەر چەنێک بن لەسنوور بپەڕێنێتەوە هەروەها بڕێک ڕفیق و هاوڕێ بەمن بناسێنێ تا بتوانین بە یارمەتی ئەوان کەسەکانمان و چەکەکانمان تا قەندەهار و لەوێوە بۆ بلووچستان و ئینگلستان بنێرم.

لە باسەکەمان دوورنەکەوینەوە بەکەرستەی جاسووسی سۆڤیەت لە قووچان و ناوچە سنووریەکانی خوراسان کۆتایی بێنین. یەکێک لە ئەرمەنیەکان لە ئووغاز باخێکی گەورە و کاروانسەرایەکی گەورەی پێک هێناوە و مسافرەکانی قووچان و باجگیران و عیشق ئابادی ئەگرتە خۆ،هەواڵ و بەڵگەکانی بۆ ڕووسیە ئەنارد لە ئەنجامدا ئووغاز بە دەستی موحەممەدحسێن گیرا وئەرمەنیەکە بەناشرین‌ترین شێوە کوژرا و کاروانسەرا خراپ بوو و باخەکەی داگیر کرا. دەروازەی باخەکە هێشتا لەحەوشی موحەممەد حوسێن‌خاندا بوو.

عەبدورڕەزاخان شوجاعوددەولە حاکمی ئەو سەردەمەی قووچانش لەوشەوەدا لە ئۆغاز بوو، باخی ئەرمەنی لە ئۆغازیش هێشتا هەیە و ئیستا گۆڕی ئەرمەنیش لە ناوەڕاستی باخەکەدایە.

هەر لەم کاتەدا دووکەس لە تورکەکانی کۆنە ئۆغاز پەنابەریەتی ڕووسیان قەبوول کردووە، بە شوێنی ناوی خۆیاندا«ئوف» یان هێناوە و پێناسەی ڕووسیان وەرگرتریا، ئەم ئامادە کاریانە لەناوچەسنووریەکان لە لایەن جاسووسە ڕووسییەکانەوە بەڕێوە چووە.

ئەم دووکەسە کۆنە ئوغازیە کە حەسەن خانوف وعەلی‌خانوف بوون،موحەممەد حوسێن‌خان قوبادی سەرۆک ئیلی سیوکانلوو کە هاندەری جەجوو بوو و ئەبووتالب بەیگ ـخۆی بە ئەرمەنی کاروانسەرادار ناساند ـکەوتنە بەر پەلاماری ڕووسەکان وڕووسەکان بۆ گرتنی موحەممەدحوسێن‌خان چوونە ناو ئۆغاز و موحەممەد حوسێن خان بۆکەژوکێو ڕای کرد.

دوای چوونی ڕووسەکان، موحەممەد حوسێن بۆ ئۆغاز گەڕایەوە، حەسەن خان لە ترسا بۆ ئەسفەجیە ڕای کرد، بەڵام عەلی خان کەوتە دەس موحەممەد حوسێن خان و بەردار و شەلاخ کەوت. عەلی گوتی: من لە هێزی ڕووسم وتۆ مافی ئەوەت

نیه لەگەڵ شوێن کەوتووی ڕەوس ئاوابکەی، موحەممەد حوسێن خان بینی وایە گوتی: من ئێشم بەقنگتە. موحەممەد حوسێن خان گوتی: ئەبێ ئەوەندە دارت لێ بدرێ تا سووکایەتی مل نان بەشوێن کەوتووی ئەجنبەییەکان بەشیاو نەزانیت، بەم جۆرە موحەممەد حوسێن خان ئەوەندەی دارهاویشتە پشتی تا گیانی دەرچوو، ئەمە یەکێک بوو لە هاندانی ڕووسەکان لە ناوچە سنووریەکانی خوراسان، ئاغای شاکری نوسیوویە کە: هێشتا لە حکوومەتی عەبدورڕەزاخانی شوجاعوددەولە ماوەیەک نەڕۆیشتبوو کە هێزەکانی ڕووس چوونە ناو قووچانەوە، عەبدورڕەزا کەبەرگری لە هاتنە ناوەی ڕووسەکان بۆ سەر سنووری ئێران کرد بوو ڕووداوەکەی بۆ تاران تەلگراف کرد وەڵام درایەوە بەرگری مەکەن، ڕووسەکان بە بۆنەی دوژمنی دەروونیان کە لەگەڵ عەبدورڕەزاخان بوو و دوای ئەوەش بە بۆنەی پەنادانی جەجوو خان کە لەگەڵ ڕووسەکاندا لە دەرەگەز شەڕی کردبوو، لەم کاتەدا بۆ قووچان پاشەکشەی کردبوو، ڕووسەکان بە شوێنیەوە بوون و ڕژانە ناو خانووی جێگرەکەی عەبدورڕەزخان و ئەویان بردو دوایی ڕوون کرایەوە کە بۆ تارانیان بردووە.

لە نەبوونی عەبدورڕەزاخان، ڕوکنوودەولەی قاجار والی خوراسان، کوڕەکەی ـڕەزاقولی میرزای ئەعدەلودەولەی ـبە حکوومەتی قووچان دانا و دوای سێ مانگ هاوکات لەگەڵ بەتوپ بەستنی پارلەمانی نەتەوەیی بڕێک لە خەڵکی قووچان چوونە تەلگرافخانە و عەبدورڕزاخانیان لە تاران بانگ کرد و بە بۆنەی داواکاریەکەی خەڵکەکە عەبدورڕەزاخان ڕۆیشتە ناو قووچان و تا کاتی حکوومەتی قەواموسسەڵتەنەی مەشهەد حاکمی قووچان بوو.

لەوانەیە ئەتوانین بڵێین لە تەواوی ماوەی سەرۆکایەتی عەبدورڕەزاخان دا، باکووری خوراسان بە تایبەت قووچان لە ژێرڕکێفی ڕووسەکاندا بوو و ڕووسەکان کە چالاکی جاسووسەکانیان لە سەردەمی موحەممەد ناسرخان لەشاری نوێ قووچان دەستی پێ کردبوو لەسەردەمی عەبدورڕەزاخان دا داگیر کراوە. پاشان نوێنەرایەتی ئینگلیزیش هێزدە گرێ ولەگەڵ ئەم بارودۆخەدا ناتوانین بە هیچ شێوەیەک لاوازی و لێ نەهاتووی و باج دانی عەبدورڕزاخان بەدەولەتی قاجارو زوڵم و زۆری لە خەڵک

بە هۆی گرتنیماڵیاتە قورسەکان لە بە رچاوەنەگرین و هێزە پێشمەرگەکانی خەڵک و هەستە نەتەوایەتیەکانی خەڵک لەبەرانبەر هاتنە ناوەوەی بێگانەکان کە لە ناوچەی قووچان پێکهات لەهەبوونی جەجووخانەکان و ناسرلەشکرەکان و وەلیخانەکان خەدووسەردارەکان و فەرهادەکان و... خۆی دەرخست و لە ئەم بەشە لە مێژووی کوردەکانی خوراسان مەگەر لە کاتی نادردا شتی وەها بینرابێ، ئەبێ بە ناوی بەهێزترین و پربایەخ ترین خاڵی سەرکەوتووی ئیلی زەعفەرانلوو کەڵک وەرگیردرێ کە جاریکی‌ترجێگەی سستی خۆی لە میژوودا پتەو کرد، بەلام بە بۆنەی ئەوەی کە زۆربەی تەمەنی عەبدوڕڕەزا بە تریاک کێشان ڕابوارد، مرۆڤە چەور زمانەکان و بێ عەقڵەکان لە دەوریا بوون ونەیتوانی لەم هێزە تێکۆشەرانە کە وەک ئەوان لەکەمتر شوێنێک لەملاولەولای ولاتدا ئەدۆزاوە و بەقازانجی خۆی و نیشتمان کەڵک وەرگرێ تا ئەو شەوە کە خۆی وزۆربەی ئەم هێزانە دڵسارد و نائومید بوون و بێ دەسەلات کەوتن و دەسەلاتی ئیلی زەعفەرانلوو هەلپێچرا، قەواموسسەڵتەنە لەگەڵ چەن ژاندارمی گەورەدا سەرۆکی ئیلەکەیان لە ناوەرۆکی ئیلەوە گرتووە و لەبەندیخانە کوشتوویانە.

## شکایەتی خەڵکی قووچان لەکوڕەکەی ڕوکنوددەوڵە لە لای سوورئیسرافیلەوە

وەک گوترا پاش لابردنی عەبدوڕزاخان، چەند کەس بە تایبەت ئەعدەلوددەوڵە برازای ناسرەدین شا دەسەلاتی قووچانیان لە ئەستۆ بووە و هەرکامە بە جۆرێک ئەم شارەیان ڕووت کردووتەوە کەبە واتای لوتفعەلی خان دەبێ عەبدوڕڕەزاخان لە تاراندا ٥ هەزار تمەن بدات بە ڕوکنوددەوڵە تا هاوڕێ خۆی بیهێنێتەوە خوراسان، بەلام نەیتوانی ئەم پارەیەش جۆربکات. ڕوکنوددەولەش لە خودایە کە ناوبراو نەیەت، بۆیە پاش گەیشتنی بە خوراسان کوڕەکەی خۆی کردە دەسەلاتداری قووچان و بە واتای قووچانیەکان:

– جەنابی ڕوکنوددەوڵە پاش چوونی بۆ بنکەی سەرکردایەتی خۆی، ناوچەی خوراسانی لە نێوان کوڕوبراکانیدا دابەش کرد و ئێمەش ئاوارە و بێچارە بوین و چوینە

ژێردەسەڵاتی حێشمەتوسسوڵتان و هەر ڕۆژێ بـە شـێوەیەک زلـم و زۆرمـان لێـی دەکرا.

هەروەک ئەوەی کە کـوردە لادێ نـشین و کـۆچ نیـشنەکان لـە جیـاتی هـەر بەرخێکـەوە کـە دەیانهـانی تمـەنێکی لەخەڵـکی وەردەگـرت و ئیتـر بـەرخی هەڵنەدەگرت[٤٨]،بەڵام چی بکەین پاش فرۆشتنی کچەکانمان دڵـمان بـەوان خـۆش کردبوو، بەڵام بەداخەوە ئـەویش بـە دادمـان ڕانەگەیـشت و ئـەو ئەنجومەنـەی کـە ڕێکەوتبوو بۆ ڕاگەیشتنی بەدادی خەڵک لەیەکەمی موحەڕڕەمـەوە داخـرا و عـەلی ئەسغەری قـەزوینی کـەوەزیری نـاوبراوە و جەعفـەرئاوای داگـیر کـردو ئەوەنـدەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کوشت کە هەموویان ئاوارەی خوراسان بوون.

نوێنەری پارلەمانەکەشمان نە خاس و نە خراپ لەپارلەماندا هیچی نەگوتووە.

لە گۆڤاری خورشیدیش کە باسی خۆمانمان نووسی هیچ کاریگەرییەکی نـەبوو و لە نێوان نوێنەرانیشدا تا ئێستا کەس نەیپرسیوە کە قووچـان چ کـەس حاکمیـەتی؟ بۆچی مندالێک سەرۆکی حکوومەت بێت؟

دەبێ ڕابگەیەنین کە ئەگەر بە خێرایی بە فریاماندا ڕانەگـەن هـەموومان ڕوو لـە وڵاتانی دیکە دەکەین.

ئەدەبولعولەما، تەقی عەبدولحوسەین مووسەوی[٤٩]

## شکایەتی خەڵکی سەبزەوار لە براکانی ڕوکنود دەوڵەی والی خوراسان

... هەمیسان لەسەبزەوارەوە لەوسەردەمانەی کە تورکمانەکان بۆ جەردەگـەری ئەم ناوچەیە دەهاتن ئەوەندەمان تەلگەراف نووسی تا بێن و ڕابگەن بەفریاماندا، بـەڵام

٤٨- ئەمە یەکێ لەڕێ وڕەوشەکانی خەڵکی کوردی خوراسان بوو کە کاتێ دەچوانـە چاوپێکـەوتنی سەرکردەکانیانەوە پاش هەواڵپرسی بەرخ و کەرەیان ئاراستە یان دەکـرد، بـەڵام لـە کـاتی چـوونی هێزەنیزامیەکان بۆ ئەو شوێنە ئەم حەقەیان لەسەرکردە کوردەکان وەرگرتـەوە و کـەچی نـاوبراو بـۆ هەربەرخێک یەک تمەنی وەرگرتووە

٤٩- ڕۆژنامەی ... ساڵی ١ ژمارە ٢٧٥- چوارشەممە ٢٧ی ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٢٦.

کـەس نـەهات و نـەبینرا تـا ئـەوەی شـوجاعولمەلێک بجنـووردی تورکمانـەکانی تێکشکاند[٥٠].

پاش خەوف و ڕەجایەکی زۆر ٢٠٠ سەربازی سـوارەی تـەیمووری‌و خـەوافی و چەند سەربازی پیادە و دەزگایەک تۆپ هاتنە سـەبزەوارەوە. ڕەفعەتوددەولـە بـرای نەواب ڕوکنوددەولەی والی خوراسان برازای ناسرەدین شا ئەوانی هـاوڕێ خـۆی بـۆ وەرگرتنی ماڵیە برد، خەڵـکی بێچـارەی ئـەوێ کاتـێ ئاگـاداری تـۆپ و سـوارەکان بوونەوە لە ترسدا لەم قەڵاوە بۆ ئەوقەڵا دەرباز دەبـوون و سـوارەکانیش هەرکەسـیان کە دەگرت شەلاخیان دەدا و جورمیان دەکردن، تەنانەت ئەوانـەش کـە لـە قەناتـدا خۆیان شاردبووەوە درگای قەناتەکانیان گڕدەدا و ئەوانیش لە ترسـی گیانیانـدا خێـرا دەرئەهاتن و بە فەرمانی نـەواب هـەردووگوێیانیان دەبـڕی و دەخرانـە بەندیخانـە و ماڵیەیان لێی وەردەگیردرا.

خەڵکی زۆرئاوای جوەین بە گـشتی لەبـەر دەروازەی شـاردا کۆبوونـەوە تـا لـە هاتنی ڕەفعەتوددەولـە بـۆ ئـەوێ بـەرگری بکـەن، شـازادەش لەتەلگەرافێکـدا بـە ڕوکنوددەولەی ڕاگەیاند کە ئەو تاقمە شۆڕشـیان کـردووە و ئـەویش فـەرمانی دا تـا هێرشیان بەسەربکرێ، بەهەموو جۆرە چـەک و تەقەمەنیێکـەوە. نـاوبراویش قـەڵای زۆرئاوای یەک شەوە دابەر گولەو تـۆپ و لەوشـەوەیدا هـەمووی مەڕوماڵەکەشـیانی دزی و بەرەو جوەین چوو و چەند کەس لەخەڵکی جوەین هـاتن و گوتیـان ئەگـەر خۆتان نەگەیەنن ئاگری شەڕ بەرپا دەبێ و بۆیە ئێمەش چەند کەس خێرا ڕۆیـشتین کە من بووم و میرزا عەلی موحەممەدی سەرۆکی ئەنجومەن و چەند کەسی دیکە و

---

٥٠- لەم سەردەمەدا سالار موفەخخەم لەزیندان بوو، تۆمەتباری هاوکاری تورکمانەکان و فرۆشـتنی کچە کوردەکان بەوان بوو. تورکمانەکان هێرشیان دەهێنا و سەبزەوارو مەیامی لەژێر ڕکێفیاندا بـوو، مەیامیان بە تەواوی خاپوورکردبوو کەس نەبوو کەبەدادیان ڕابگات لەبەر ئەوەی تەنیا هێزی بەقووەت لەوێ دا کوردەکانی شادیلوو لەبجنۆرد و زەعفەرانلووەکان لەقووچان بوون و لەبەر ئـەوەی سـەرۆکی ئەو عەشیرەتانە بێدەسەلات کرابوون هیمچیان پێ نەدەکرا و چەند سوار لە عەشیرەتی تـەیمووریش کە ئامادە بوون هیچ چەک وتەقەمەنیێکیان نەبوو، لەڕۆژنامەی خورشیدی ئەو سـەردەمەدا ڕاڤـەکەی نووسراوە.

گەیشتینە ئەوێ، شازادە و خەڵکمان ئاشت داوە، بەڵام شازادە هەرچێکی کە ویست وەری گرت، ماڵیەی جوەین ١٥٠٠ تمەنە و خەڵکی ئەوێ بۆ ئەوەی بزانن ماڵیەیان چەندە، ڕوویان کردووتە خوراسان، ڕوکنوددەولە و نەجدوسسەڵتەنە بڕیاریان دا کە دەبێ سێزدە هەزاروپانسەد تمەنیتریش بدەن تا ببێ بە پانزدە هەزار تمەن و بەڵام ڕەفعەتوددەولە لە وڵامدا گوتی: ڕوکنوددەولە بۆ منی وا نووسیوە کە ئێوە بەزۆر ئەو پارەتان لەوان وەرگرتووە. ناوبراو بەبێ ئەوەی لەکەس بترسێ و دوو هەزار تمەن ماڵیە و دەهەزار تمەن جورمی لێیان وەرگرتووە.

## باردۆخی کۆمەڵایەتی شیروان لەسەرەتای مەشرووتەدا

... ئەمن بە پێویستم زانی چەند دێڕێک بنێرمەسەر بەرپرسی ڕۆژنامەکانەدا تا بینووسنەوە، بەڵکوو دەسەڵاتداران لە تاران و نوێنەرانی پارلەمانی چاویان پێ بکەوێ و بەزەیەکیان بە حاڵی ئێمەدا بێتەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە تاڕادەیەکی زۆر گرفتاری دەردی ئیعتیادن، تاڕادەیەک لەسەد کەس پێنج کەسی ساغ نیە و ئەژماریشیان لەزیاد بووندایە.

هەرکاتێ دەوڵەت توانیوویەتی بەرگری لە ئیعتیاد بکات توانیوویە سەربازگەلێکی بەهێز بۆ سپاکەی خۆی پێک بهێنێ، یەکێکی تر لەگرفتەکانمان نەبوونی پزیشکە، ئێستا کەزستانە، لە ڕۆژدا چەند کەس بە هۆی نەبوونی دەرمان و پزیشکەوە گیانیان دەدەن، زۆر کەسان بە هۆی ناخۆشییێکی سادەوە گیانی لەدەست داوە، ئێستا بزانن کاتی گەرمای هاوین چەند کەس دەمرێ.

چاک وایە دەوڵەت پزیشکێ ڕەوانەی ئەم دەڤەرە بکات، بۆ وێنە پاییزی ڕابردوو لەدەوری ٧٠٠ کەس تووشی ناخۆشی یاولەرزبوون و مردوون[٥١].

شیروانی قووچان: لەسەردەمێکەوە دەسەڵاتداری شیروان- فەرجوڵڵا- بەرکنار کرا و پیاوەکانی ئەویش لە ناوچەکەدا خەڵکیان هان دەدا تا دژ بە دەسەڵاتی تازە

---

٥١- شاری پێشووی شیروان کەسەرەتا لە سەردەمی شاعەبباس یەکەمەوە بە دەستی کوردەکانیان

بوەستن و جاروبار ئەم ئاگرە دەکوژێتەوە و کەچی دوێنێ شەو  بڕێ کار لە مزگەوتی شاردا ڕووی داوە و چەندکۆبوونەوەش لە ماڵـی مـیرزا فەرەجولـڵای دەسـەڵاتداری پێشوو بەڕێوە چووە .[زوارم] کە ئەم شوێنە یەکێکە لەقـەڵاکانی شـیروان و مـەکۆی پیاوانی فەرەجوڵلا خانە، ڕۆژی دوێنێ  هاتبوونە تەلگەرافخانەوە و چەنـد سـەربازیان کوتەک دابوو و لەڕێ قووچاندا بیست مەتر سیمی تەلگەرافیان خراپ کردبوو و چەند تیریان شکاندبوو خەڵکی زوارم زۆر تر لەتورکە قارشی قووزییەکانن کـە لەسـەردەمی نادردا گۆزراونەتەوە.

ئەو بەڵگانەی کە سەبارەت بە دەرگەزو خانەکانی دەبینرێ:

١- ئەو بەڵگانەی کە سەبارەت  بە ئاڵو گۆڕکردنی وڵاتـە سـنووریەکانی ئێرانـە، هەر لە فیرووزەوە هەتا  لوتف ئاوای  دەرەگەز کە هاوکات ناوچەکانی‌تـری بـاکووری خوراسان لە ئێران جیادەکاتەوە، لەبەرگەکانی‌تردا« ١و٢و٣ »بەسەرهاتە نالـەبارەکانی ڕۆژگاری قاجاڕ و ئاسەوارە نالەبارەکانی لەسەر خەڵکی ئێران و بە تایبەت ناوچـەکانی باکووری خوراسان‌دا گوتمان بە پێی ئەم گرێبەندە یـەک لایەنـە غـەیری‌قانووینـەی ئاخاڵ  لەلایەن ڕووسیەی خوێنمژەوە، ناوچەکانی نێوان ڕۆخانەی جـەیحـوون هـەتا ماوەرای نەهر لە ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی هەتاوی لە ئێران جیا کرانەوە و لـەم نێوانـەدا شارەکانی خیوە، بۆ خارا، خوارەزم و عیشق ئاوا ونـسای لەبـەر دەگـرت، پاشـان کـە ڕووسەکان تێگەیشتن دەبێ فیروزەش لە ئێران جیا بکرێتەوە، ناسرەدین شایان نایـە ژێری گوشارێکی زۆر و ئەوێیشیان لێی وەرگرتـەوە و قـەڵای کـۆنی لوتـف ئـاوا کـە پێشتر بردبوویان دایانەوە و فیروزەیان داگیرد کـرد، لەبـەر ئـەوەی فیرووزەوڵاتێکـی ئاوەدان و خاوەنی زەوینی باش بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوو. بەبـێ بەڵـێنی قـەڵای حەساریش هەرچەندە زەوینی باش و لەباری بوو بردیان و داگیریان کردەوە.

٢- بەڵگەیەکە، واتا ڕاپۆرتێکە سەبارەت بە ئاوی دەرگەز کە ڕووسیەکان بە هۆی گرێبەندی یەک لایەنەی خۆیانەوە لە ناوچەی دەرەگـەزولایین و کـەلات، هاوکـات ئاوی چاوکەکانیان لە ناوەوەی ئێرانەوە گوێزایەوە بۆ ئەوبەری سنوورەکان و کەسیش حەقی هیچ قسەیەکی نەبوو و بەوتەی ناسـرئەلمەلێکی حـاکمی دەرگـەز ئەمنیـەت

زۆره و هەموان سپاسی موزەفەرەدین پاشا دەکەن.

ڕاپۆرتی دەرەجەز- ئەمنیەت ئاساییە و هەموان سپاسی بەڕێزت دەکەن، موحەممەد حوسێن میرزا وموهەندیس ئەکرەتی ڕووسی بۆ دابەش کردنی ئاو بەرەو قەڵای میر بەڕێ کەوتن، لەبەر ئەوەی بەرپرسی ڕووسی لەقەڵای میردا زۆر مابووەوە، سێ دەزگا ئالاچیقیان بۆ کارەکانیان هێنابوو

گەنم خەرواری حەفت تمەن و جۆ خەرواری سێ تمەن ونیو.

بەرواری ۱۳ی سەفەری ۱۳۱۵[٥٢]

## فەرمانی ناسرەدین شا سەبارەت بە مووچەی غولامحوسەین خان دەرەگەزی

غولامحوسێن خانی سەرتیپ کوڕی موحەممەد عەلی مەنسوورولمەلیک بیگلەربەیگی دەرەگەز بوو کە بەپێی فەرمانی ژێرەوە لە لایەن ناسرەدین‌شاوە نووسراوە.

مۆری ناسرەدین شا لەسەرەوەی بەڵگەوە

واژۆی ناسرەدین شا لە نێوان هێڵی یەکەم و دووەم

مەبەست: توغرایی

هەرچەندە مووچەکە بڕێتی بووە لە پانسەد تمەن و دراوە بە موحەممەد عەلیخانی بیگلەربەیگی دەرەجەز بۆ بەڕێوە بردنی حکوومەتی دەرەجەز هەر ئەوەندەش ئەبڕینەوە بۆ کوڕەکەی واتا غولامحوسێن خان سەرتیپ و بەڵام بە پێی داوای خۆی لە ئەم بەرواره بە دواوە مووچەکەی جارێک دەگۆڕدرێ ودەکرێ بەشەشسەدوبیست و پێنج تمەن، ئەم فەرمانەدەبێ لە لایەن نووسەرانی حکوومەتیەوە زەوت بکرێ.

لە مانگی ڕەبیعوسسانی ساڵی ۱۳۱۱ی کۆچی‌دا نووسراوە:

لە سووچی ڕاستی بەڵگەکەوە ڕوکنوددەولەی برای ناسرەدین شای والی خوراسان بۆ وەزیری خوراسانی نووسیوە:

---

٥٢- خاتراتی وەحید، خاکەلێوەی ۱۳٥۱ژمارەی ٥، ل ٥۳۸.

وەزیری دەفتەر، لە ناو پەرتووکەکـەدا بینووسـەوە و بـە ئـەم نـاوەوە بـە نـاوی مووچەی غولامحوسێن خانەوە دایبنە.

لەسووچێکی ترەوە وەزیری دەفتەر نووسیوویەتی:

بەپێی فەرمانی گەورەم ئەم بڕیارە لە ناو دەستووری ئەمساڵ دا ــیوونت ئـی- دا نووسرا

لە پشتی بەڵگەکەوە تـاقمێکی زۆر مـۆر و واژۆ هەیـە کـە مـۆری سـەدرئەعزەم وەزیر دەفتەر و موعانولمەلێک لەو تاقمەیە[٥٣].

## فـەرمانی موزەفـەرەدین شـا سـەبارەت بـە حێـشمەتوڵلا خـانی کـوڕی مەنسوورولمەلیک دەرەگەزی

ئەم فەرمانە وادیارە کاتێ درابێ کە حێشمەتوڵلاخان منداڵ بووبێ

حوکم نووسرا، لەبەر ئـەوەی چاکـەرانی ئێمـە زۆر بـە باشـی خزمـەتگوزاریمان دەکەن و بە هۆی ئەو هەموو پیاوەتیەوە ئێمەش دەبێ بەپێی ئـەو ئایەتـە قورئانیـەوە «الـسابقون الـسابقون اولئـک المقربـون »پاداشـتیان بدەینـەوە، و بـەم پێیـە بـەڕێز خوالێخۆش بوو سلێمان خان و بیگلەرخان و ئەڵلا یارخانی دەرەگەز و ئەتەک بـوون کە لە سەرەتای ئەم حکوومەتەوە ناوبراوان خزمـەتگوزاریان کـردووە وسـنوورەکانیان بـە باشـترین شـێوە پاراسـتووە و بۆیـە ئێمـەش پـاش ئـەو هـەموو پیاوەتیـەیان حێشمەتولمەلیکی سەرتیپی کوڕی ناوبراو بکەینە سەرۆکی حکوومـەتی دەرەگـەز و ئەتەک هەر لە ئێستەوە توانا و هێزی دەسەلاتداری تێیدا ڕەچاوە دەکرێ و دەبینرێ و هەر لە ئەم ساڵەوە ناوبراو سەرباشقەی عەشیرەتەو پاشان دەکـرێ بەپێـشخزمەتی خۆمان، هەر ئێستا تۆپێکی سـەرداری تورمـەی کـشمیری پێـی دەبەخـشرێ، ئـەم هەموو بەخشندەییەمان بـە هـۆی چاکـەری باشـی ئەوانەوەیـە، بـەو هیوایـەی کـە هەمووی پیاوانی دەوڵەتی وەکوو ئەوان بن، دەبێ نووسەرانی دەرباری لە پـەرتووکی موبارەکدا بینووسنەوە.

مانگی زیقەعدەی ١٣١٨

---

٥٣- بەڵگە لە ئاغەی هووشەنگ پێمبوودی لە بنەماڵەی مەنسوورولمەلیکەوە گەیشتە دەستمان.

وەک گوترا لەسەردەمی مەنسوورەلمەلیکدا بارودۆخی دەرەگەز زۆر نالەبار بووە. زلم و جەوری ئاسەفوددەولەی خوراسان و ئەمیرحوسێنی کوڕی و پیاوانی تری دەولەتی ئازارەکانی زۆرتر کولاندووتەوە ڕۆژنامەی حەبلولمەتین بە جوانی ئاماژەی بەم کارەی دەرەگەز کردووە.

موحەممەد بەیگ حەساری کە خەڵکی دەرەگەز بوو دەیگوت: نایبولحکوومەی ئەتەکی ئێران واتا مەنسوورئەلمەلیک حەوت کچی فرۆشتۆتە ڕووسیە و زۆر کەسیشی لە شوێنگەلی‌ترەوە بوو کە من نایانناسم و هاوکات لەدەرەگەز ۲۰ هەزار تمەن لە لایەن مەنسوورئەلمەلیکەوە وەرگیردراوە، سالی پێشووـ ۱۳۲٤ی کۆچی‌ـ تاقمێک شکاتیان کردبوو، لە لایەن عەینوددەولەی سەدرئەعزەمەوەحوکمی لەکار دوورخستنەوەی حاکمی دەرەگەزدرا، ئاسەفوددەولە یەکێ لە میرزاکانی ـعەینوددەولەی‌ـ بۆ ڕاگەیشتن بەم کارانە ڕاسپێری دەرجەز کرد و هاوکات گەیاندی کە مەبەستی من ڕاگەیشتن بە شکایەتی خەڵک نیە، بەڵکوو بۆ قازانجی ئێوەیە، هەرچەندە دەبێ بزانی، بڕیارەودەبێ لە ژێرفەرمانی مەنسوورئەلمەلێکدا بمێنی.

بۆ مەنسوورمەلیکی نووسی: تا دەتوانی بەڕووی خۆشەوە لێی ببووری. هەروا بوو، ناوبراو ۱۵۰۰ تمەن پارە و دووقاترودووئەسپی دا بە بەرپرسی ڕاگەیشتن و بێ سووچ و گوناحی خۆی سەلماند و ئەو خەڵکەش کە شکاتیان کردبوو هەر لە سالی پارەوە لە شار نەگەڕابوونەوە و هەر لە تەقلەودەودا بوون.

ئاسفەفوددەولە، مەنسوورولمەلیک لە حکوومەتی دەرەگەز لانابا؛ بەڵکوو بۆ زەماوەندی هاوشیرەی عەبدورڕەزاخانی حاکمی قووچان کە شووی کردبووە مەسعوود خانی کوڕی ناسرئەلمەلیک پانسەد لیرەی عوسمانی و شاڵ و ئەڵماس و پێشکەشی زۆری ڕەوانە کرد. ئەمیر حوسێن خانی کوڕی ئاسەفوددەولە کە سالی پێش پاش بێ دەسەلاتکردنی شوجاعوددەولەی زەعفەرانلوو بوو بە دەسەلاتداری قووچان و هاوکات بە مەکروپیلانی مامۆستایانی قووچانەوە کچە دەزوورانەکەی مەسعوود خان پەشیمان کرایەوە و دایان بە ئەمیر حوسێن‌خان و پێنج هەزار تمەن

دارایی مەنسوورمەلیک خورا و بۆیە ئاسەفوددەوڵە مەنسووری وەک حاکمی دەرەگەز دانا و قودرەتی لێ وەرنەگرتەوە تا لە کوڕەکەی شکایەت نەکات.

سەید عەلی خان عارز نووسیوویەتی:

... ئاسەفوددەوڵە کوڕەکەی ئەمیرحوسێن خان و جافر خان بە شێوەیەک کە لەم ڕۆژنامەی حەبلولمەتینەدا هاتووە زوڵم و زۆریان زۆری گرت و پەرەی سەند و لە کەناری ڕیش و تەسبێح و مەزهەبدا بەڵای زۆریان هێنایە سەر خەڵکدا کە هەموان لە ماڵ و گیانی خۆیان شەکەت بووبوون و ئاوارەی کێو ودەر و دەشت بووبوون و بە چراموشیەوە دەگەڕانە شوێنی شوجاعوددەوڵە، ئەمیر حوسێن‌خان لە قووچان ئەوەندە زوڵمی لەخەڵکی کرد کە خەڵکی لەڕێ ناچارییەوە چوونە تەلگەرافخانەکان و شکایەتی زۆریان بەرەو تاران ڕەوانە کرد، تاکوو میرزا ئەبولقاسم کەسەدبەرابەر لەکوڕەکەی ئاسەفوددەوڵە دزتر بوو هات و بوو بە بەرپرسی وەرگرتنی ماڵیە و هەمیسان جارێکی تر و لەوکاتەدا کە کچە قووچانیەکان درانە دەستی تورکمانەکانەوە، ئاسەفوددەوڵە لەڕێ ناچارییەوە حکوومەتی قووچانی لە کوڕەکەی خۆی وەرگرتەوە و هەمیسان دایە دەستی میرزا ئەبولقاسمەوە تا بتوانێ بەر شکایەتی خەڵکی بگرێ و لە هاتنیان بۆ تاران بەرگری بکات. حەبلولمەتین نووسیوویە: میرزا ئەبولقاسم لە بەرپرسایەتی وەرگرتنی ماڵیەی قووچان لابراوە و کراوەتە سەرۆکی حکوومەتی ئەو شارە و لەگەڵ شێخ حسێن شێخورڕەیس و میرزا گەورەی ئیمام جومعەی قووچان و مودیر دیوان و هوژەبردیوان کە لە ئەو کەسانەیە وا دژی عەبدورڕەزاخان بووە بوونەتە یەکێ و ماڵی خەڵک خراپ دەکەن و پێخۆریان کە خەرواری ٥ تمەنە بە ١٢ تمەن دەیدا پێیان.[٥٤] پاش ئەوەی ئاسەفوددەوڵە حەزی نەدەکرد حکوومەتی دەرەگەز لە مەنسوورولمەلیک وەربگرێتەوە، خەڵکی لە تاران شکاتیان کرد و هاوکات خەڵک کۆیان بەستە دەوری جەجووخان و جەجوو پاش شەڕێک مەنسووری دەستگیر کرد و خستیە بەندیخانەوە و پاشان لە دەرەگەز کردیە دەرەوە، ئاسەفوددەوڵەش بە هۆی شکاتی کوردەکانی باشکانلوو کە ژنەکانیان

---

٥٤- حەبلولمەتین، ژمارە ٤١، ل ١٦.

لە لایەن تورکەمەنەکانەوە لە قووچاندا دزرا بوون لە لایەن پارلەمانەوە لە حکوومەتی خوراسان دوورخرایەوە کە لەبەرگی سێهەم دا باسمان کرد. حکوومەتی نوێ بۆ ڕازی کردنی خەڵکی دەرەگەز، سەید عەلی خانی برای‌تری مەنسووری کردە سەرۆک حکوومەتی دەرەگەز زۆری نەخایاند کەسەید عەلی خانی حاکمی دەرەگەز لە لایەن سپاسالار بانگهێشت کرا تا بڕوات بۆ مەشهەد، خێرا موعاوەنوتوججار لە زمانی ئاسەفوددەولەوە پێنج نامەی بەڕێ کرد بۆی کەنەیەت بۆ مەشهەد تا ڕۆژی پێنجشەممە کە سپاسالار و هەڤالانی دەچنەوە بۆ تاران و تۆ دەتوانی ڕۆژێ پاش ئەوان بیتە مەشهەدەوە، سەید عەلی خانیش خێرا بەقسەیانی کرد و پاش ڕۆژی پێنج شەممە هاتە مەشهەد و ئاسەفوددەولە و هاوڕێکانی خێرا بە ئەو بیانوەی کە بۆچی قسەی سپاسالاری داوەتە عەرزا گرتیان و خستیانە بەندیخانەوە سی و چوار ئەسپی ئەویان برد و هاوکات هەرشەوە بۆ هەر سەرەئەسپێ یەک قەران و نیو پارەیان لێ وەردەگرت و وەعدیان پێ دەدا کاتێ لە زیندان ڕزگاری بوو ئەسپەکانی پێ دەدەنەوە پاش ڕزگار بوونی ٤٠٠ تمەن پارەی ئالفی ئەسپی دابوو بەڵام تەنانەت ئەسپێکیشیان پێی نەدایەوە و دوو جاریش جورم کرا کە جاری یەکەم ١٥٠٠ تمەن و جاری دووەم ١٢٠٠ تمەنیان لێ وەرگرت.

ئەمیر حوسەین خانی کوڕی ئاسەفوددەولە کە باوکی دیوانبەیگی بوو. زۆر ئازاری سەید عەلی دەکرد هەموو ڕۆژە جگە لە شەلاخدانی ١٠٠تا٢٠٠تمەن پارەی لێی وەردەگرت و سەید عەلیش لە ڕووی ناچاریەوە ویستی پەنابباتە بارەگای ئیمام ڕەزا لەمەشهەد کە چرولەوێش لە ئاسایشدانەبوو بەهەموو جۆرەزلمی لێی دەکرا و جارێکی ڕژانەنێومالەکەی و ٤٠٠ تمەن پارەیان لێی بەزۆرگرت و هەمووی فەرشەکانی ماڵەکەشیان بەیەکجارە تالان کرد. ئەوکەسەش کەناردبوویان ماڵ و منداڵەکەی لەدەرەگەزەوە بهێنێتە مەشهەد دەیگوت: ئەمیر حوسێن خان منی کرد بووە بەرپرسی تاکوو ماڵەکەی تالان کەم و هەرشتێکی سەید عەلی کە لە شانی ئەمیر حوسێن خاندابێت وەری بگرم و بیبەم و بەم شێوەیە لە ماڵ و داراییەکەی سەید عەلی بە ئەندازەی ٦ هەزار تمەنم دزی و هاوکات هەمووی زێڕو قالیەکانیشی زەوت کران.

ماڵیەی جوەین ١٨ هەزار تمەن بوو، سپاسالار بەم زوانە ٤ هەزار تمەنی کەم کردبووەوە موعەزیز ولمەلیک ٨٠ هەزار تمەن ماڵیەی وەرگرت ئاسەفوددەولە ١٢٠ هەزار تمەنی وەک پێشکەشی قووچان لە میرزا ئەبولقاسم وەرگرت کە ٨٠ هەزار تمەن پێش ئەوەی دەسەلاتی لێ وەربگرنەوە ساڵی ١٣٢٤ دا بە ئاسەفوددەولە و چل هەزار تمەنی دوایشی دوایی لێ وەرگرت تاقمێک لە ئەوکەسانەی کە مووچەخۆری دەوڵەت بوون حەزیان لێ بوو بچنە قووچان، لەبەر ئەوەی لەوێ دا لە پرسینەوە و بازو خواست گرێیان لینچ بوو و کەس نەیدەگوت ئەوەچی دەکەن و دەسەلاتی قووچانیش کارهەندی زۆری دەویست ئەم کارمەندانە کەل و پەلیان بەخەرورا بەسێ قران دەکڕی و ئەم بۆ ئەوان زۆر بوو. حکوومەت خۆی خەرواری بە چواردە قران دەیکڕی و زۆر لەخەڵکی دەچوو پیاوێکی باش کەپارەی لە لای دەسەلاتدارێکی قووچانیەوە بوو و بۆ وەرگرتنەوەی ڕەوانەی ئەوێ دەبێ و خۆی دەڵێ چوومە ماڵی یەکێ لە نزدیکەکانی عەبدورڕەزخان وادیارە مودیری دیوانی ئەفشار بوو بێ کە لە هەمووشتی عەبدورڕەزا ئاگادار بوو و لە نهێنی دا بە دوای تاقمێ بەڵگەوە بوو تا عەبدورڕەزاخان بێدەسەلات بکا و لەوڵ زانیم کە ٤٦٤ هەزار تمەن لە من زڵم کراوە. ماڵیە بگیری ترشیزی ١٥ هەزار تمەنی دزی بوو.

مووچەی سوارە نیزامی خەواف دراوەتە دەستی ئەمیر بەهادورەوە و ئەمە بەشێکی کورت بوو[55] لەو زڵم و زۆرە ماڵیانە.

## کاریگەری تریاک لەسەر دەسەلاتدارانی قووچان و دەرەگەز

یەکێ لە ئامانجە نا لەبارەکانی ئینگلیزیەکان لە ئێران موعتاد کردنی عەشیرەتەکان و خەڵکی خوراسان بوو، دەیانزانی کە ئەگەر بیانەوێ دوو نۆکەری خۆیان واتا ئەفغانستان و هیندوستان بپارێزن دەبێ دەستی ئێرانیەکان کورت بکەن و بۆیە باشترین ڕێگەیان موعتاد کردنی خەڵکی ناوچەکە بوو، تا بەو شێوەیە هەر بە خۆیانەوە خەریک بن.

---

٥٥- حەبلولمەتین ساڵی ١٣٢٥ کۆچی، ژمارە ٤١، ل ١٧.

ئینگلیزیەکان زۆرتر لە هێزی سەربازی کوردەکانی خوراسـان دەترسـان و بۆیـە لەسەر ئەم خەڵکە زۆرتر کاریان دەکـرد و تەنانـەت توانیـان ئـەمیر حوسـێن خـانی شوجاعوددەولەش موعتاد بکەن و باشـترین شـەراو و تـەریاکیان بـۆی حـازردەکرد، ئەمیر خۆی زۆر بەهەیبەت بوو و تا خۆی بوو هەیبەتی کورد هـەرمابوو، بـەڵام پـاش کۆچی دوایی ئەو جێنشینەکانی زۆر نالایـەق بـوون و بـە گوتـەی خوالێخـۆش بـوو بامداد ئاسەوارێ لەوسەروەریە نەمایەوە، فەرمانڕەواکانی دەرەگەزیش هەر بەم دەردە دوچاربوون. وەک سەید عەلی خانی دەرەگەزی لەشێعرێکدا دەڵێ:

لە چاوم شەوڕۆژ بە تاو دەتکێ خوێن
لە دەستی ئەم بەختە گولەوە
بێگانە لەدەستی عەقڵی دوستانمەوە شێت بوون
ئەم چەرخە بێ وەفایە
دەزانی ئێمە بۆچی لە ناو چوین و نەماین
و لەسەفحەی ڕۆژگارپاک بووینەوە
تریاک، تریاک، تریاک
هەمدیسان تریاک[56]

وایە تریاک ماڵوێرانکەرە، عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولـەی کـوڕەزای ئـەمیر حسێن خان لەسەرەتای لاوەتیدا موعتاد بوو، لـە نووسـراوەیەکدا لـە حەبلولمـەتین سەبارەت بە وێرانی خوراسان و موعتاد بـوونی خەڵـکەکەی وەهـا نووسـراوە: هـۆی وێرانە بوونی شارەکانی بجنوورد و دەرەگەز و قووچان وشـیروان و دەوروبـەری ئـەو ناوچە ئەوەیە کە هەمووی دانیشتوانی موعتـادی تریـاکن، خەڵـکی ئـەم ناوچـە وای لێهاتووە کە دەسەڵاتی هیچیان نەماوە و لەسەد کەس چوارکەسی سالم نیـە. ئـەم خەڵکە هەر ئەوانەی بوون کە نادرشای ئەفشاریان پەروەردە کرد و ناردیانـە مەیـدانی شەڕانخیزەوە و هیندیان بۆی گرت .ئەم خەڵکە لەبنەماڵەی ئەو سامخانە ئیلخانیـەن کە توانی هەرات بگرێ، بەڵام ئێستا ئەگەر یـەک کـەس وەک جـەردە ڕوویـان تـێ

---

٥٦- ڕجال ئێران، بامداد، ب ٦، ل ١٢٣.

بکات، هەموویان ڕووت دەکاتەوە وکەسیان هێزی هەستانەوەی تێیدا نەماوە ئەوەندەیان تریاک کێشاوە.

لەهەمووی خراپ تر خودی دەسەلاتدارەکانی ئەو دەڤەرەش موعتادن. جارێکیان ڕێگەم کەوتە شاری قووچان و ڕووم کردە ماڵی حاکمی ئەوشارە کە چوومە ژوورەکەی خەریکی تریاک بوو وەک قلیان دەیکێشا و ئیزنم لێ گرت تا بچمە ژوورەکەوە و بەسەرواوڵامی داوە کەدەتگوت لە حاڵی خەودایە، ئاماژەیەکی پێم کردواتا فەرموو،نۆکەرێکی لەبەر دەستی دابوو، نەیدەوێرا چی بڵێ، زوو زوو نووچی دەدا، لەم کاتەدا کەسێکی‌تریش تەقەی دا لە قاپی ژوورەکە و هاتە ماڵەوە و خان ئاماژەی پێی دا تا لە گەڵی تریاک بکێشێ و هەر بە زۆر دایناتا تریاکی لەگەڵدا بکێشێ کەچی دوای ماوەیەک بیستم ئەویشی فێرەتریاک کردووە و موعتادبووە وەک خۆی خەڵکی ئەو دهڤەرەش کە زۆر هەژار و هیچ نەدار بوون هەر خەریکی ڕەنج و تەقە لابوون کەهەموو مانگێ دەسەلاتداران دەچوان پارەیێکی زۆریان وەک ماڵیە لێیان وەردەگرت و هەموو شتانیان دەدزی و ئەوانیش لەڕێ ناچارییەوە کارێگەری ڕووسیەیان گرتە باوەش و پەنایان بردە ئەوێ.[٥٧]

هەروایە ئەوە بارودۆخی سەرکدەیی وەک عەبدوڕڕەزاخانی ئیلخانی زافەرانلووبێ دەبێ حاڵی خەڵکەکەی چی بێ...«الناس علی دین ملوکهم»

## بەڵگەو ئەو حوکمانەی کە لە بارەی دەسەلاتدارەکان و خەڵکی کەلاتی نادریەوە لە دەستدایە

دەسەلاتدارانی کەلاتی نادری لەسەردەمی دەسەلاتگرتنی نادرشاوە ناو بانگیان دەرکرد کە بە ناو بانگ‌ترینیان تەهماسبقولی خانی جەلایری سەرداری بە ئەمەکی نادرشا، یەلەنگ تووش خان جەلایرن.

یەلەنگ تووش خان وەک لەبەرگی سێ دا گوتمان لە پیاوە سیاسیەکانی سەردەمی قاجاڕ بوو و لە کاتی ئاژاوەکەی سالار لەمەشهەد لە ساڵێ ١٢٦٥ی کۆچی

---

٥٧- ڕۆژنامەی حەبلولمەتین ساڵی چوارەم، موحەڕڕەم ١٣٢٥ (١١ مارس١٩٠٧) ژمارە ٢٩، ل ٨.

کوژراوە و پاش خۆی بیهبوود خانی کوڕی دەسەڵاتی وەئەستۆ گرت.

عەشیرەتی تورکی جەلایر کە لە دەوری ٤٠٠ بنەماڵەدابوون لەسەردەمی سەفەویەکاندا هاوبکات لەگەڵ کوردەکاندا ڕەوانەی خوراسان کران. خەڵکی کەلات تێکەڵاویکن لە تورک و کورد و عەرەب و فارس کە هیوادارم لە کتێبەکەی نادردا زۆرتر لەسەری باس بکەم.

ئێستاش تاقمێک لەبەڵگەکانی بنەماڵەی جەلایر و خەڵکی کەلات کە عەباس خان جەلایر و لە بنەماڵەی تەهماسبقولی و هەروەها کوڕەکەی ئەندازیار عەبدوڵلا جەلایر لەمەشهەد دایانەدەستمەوە.

## فەرمانی بەخشینی پلەی خانی لە لایەنی ناسرەدین شاوە بۆ بێهبوودخان جەلایری حاکمی کەلات

لە بەرگی سێهەم دا سەبارەت بە کوژرانی یەلەنگ تووشی خانی جەلایری حاکمی کەلات بە فەرمانی سالار باسی زۆرمان کرد و بەڵگەیەک کە لە بێهبوود خانی کوڕیەوە جێ مابوو و گەیشتە دەستمان باسی لێوە کرا، لەو بەڵگەیەدا ناوبراو داوای کردبوو تا ئەو پلەی باوکی بدەن بە خۆیشی و لەم بارەوە نامەیەک سەبارەت بە چۆنیەتی کوژرانی باوکی کە واژۆی سەر کردە نیزامیەکانی پێوەیە دۆزرایەوە.

ناسرەدین شا لە نامەیەک دا وڵامی بێهبوودخانی داوەتەوە کە پاش ڕاوێژ لەگەڵ حەمزە میرزای حاکمی خوراسان نووسرابوو:

مۆری ناسرەدین شا لە لای ژووری فەرمانەکەوەیە:

بە ناوی خوا

فەرمانی پاشایەتی لەبەر ئەوەی خوالێخۆش بوو یەلەنگ تووش خان کۆچی دوایی کرد و هەر لە مێژە خزمەتگوزاری ئێمە بووە و لە کاتی هاتنی پاشا بۆ ئەو ناوچەیە هەموو کات لە خزمەتیدابووە، بۆیە ئێمەش بێهبوود ئاغا خانی کوڕی ڕێز دەگرین و نازناوی خانی پێی دەبەخشین و لەم ساڵەدا کە ساڵی مامرە بڕیارە هەموو ساڵە ٣٠٠ تمەن پارە و ٢٠ خەروار کەلوپەلی پێویست بۆ ماڵ، بە ئەو بدرێ کە

دەبێ هەموو ساڵە لەماڵیەی خوراسان دابین بکرێ. هاوکات پاشا فەرمانی دا تا ئەسعەدی کامکاری مامۆی خەبەردار بکەن کە کاری وامان کردووە بڕیارەکەش دەبێ لە ناو بەڵگە مێژووییە دەربازیەکاندا بنووسرێت

مانگی شەعبان ١٢٦٥

[ئەم بڕیارە لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیردا نووسراوە.]

## ڕێز گرتن لە سەرتیپ بێهبوود خانی جەلایر دەسەڵاتداری کەلات، لە لایەن ڕوکنوددەولەوە

فەرمانی دەربڕینی مەقامی سەرتیپی بێهبوود خان لەبەردەستمدا نییە و نازانم لەچ کاتێک و بەپێشنیاری چ کەسێک بووەتە سەرتیپ. دەڵێن کە نێزاموددەولە حاکمی وڵاتی خوراسان لەگەڵ ئەودا بەبنیایەتی خۆشی بووە، دوای نێزاموددەولە موحەممەد ناسر خانی زەهیروددەولەی قاجار لە ساڵی ١٢٩٢ تا ١٢٩٣ حاکمی وڵاتی خوراسان بوو کە لەم ساڵەدا فەوتی کرد و موحەممەدتەقی میرزای ڕوکنوددەولە برای ناسرئەدین‌شا دەبێتە دەسەڵاتداری خوراسان و تا ساڵی ١٩٢٨ هەر بەردەوام دەمێنێ.

بێگومان بە داخوازی ڕوکنوددەولە، ناسرئەدین شا بێهبوودخانی تا ڕادەی سەرتیپی گەیاندووە.

ئێستا نامەیەک دەخوێنن کە ڕوکنوددەولە بۆ بێهبود خانی جەلایر لە ساڵی ١٢٩٧دا ناردبووی:

ڕاپۆرت و باسی سێ سەری بڕاوی تورکەمەنەکانی تالانکەر و قراخان سەرداری تورکمان کە دیل کراوە و بۆ مەشهەد ناردراون دەکات. مۆری ڕوکنوددەولە لە ژێر دێڕی هەوەڵدا بیندراوە.

«هوو ئەڵڵاهوتەعالا»

مۆری ڕوکنوددەولە لە لای ڕاستی بە لگە

موقەرێبولخاقان بێهبوودخان سەرتیپی دەسەڵاتداری کەلاتی موعەزێز بزانێ نووسراوەی موقەرێبولخاقان بیندرا[٥٨]. خزمەت و گەورەیی ئێوە کەناردنی قراخان سەرداری تورکمان و سێ سەری بەنێزەکراوەوە، بوو حاکمی زۆر خۆشحال کرد. زۆر لە وشیاری موقەریبولخاقان لەسەر حەددی کەلات خۆشحال ورازیم؛ چوونکە لە خزمەت و زەحمەت هیچ کەمتەرخەمێان نەکردووە. قراخانیش بە جەزای خۆی گەیشت و ڕەعیەتەکان و دانیشتوانی سەرحەد ئاسوودە بوون. بڕینەوە[٥٩] و گەیاندنی مواجۆی هێزو سەربازەکانیش بڕاوە. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کاروبارانەی کە داوای کردبوو، هاتبوو بۆ ئەرزی ئەقدەس، هەرچی زووتر بگەڕێتەوە.

غەڕرەی جەمادیئەووەڵ

ڕوکنوددەولە دوای بینینی ئەم نامە کە بەردەستەکەی نووسیبووی لە نێوان دێڕی هەوەڵ و دووهەمدا دەنووسێ[٦٠]:

بێهبوودخان، دوای هاتنی زەینولعابدین بۆ مەشهەد و دوای ئەوەی کە مووچە و پووڵ بە سەربازان درا و ڕێکوپێک کران و لەبابەت سەرحەدداتی کەلات و قەڕاوڵخانە بێخەم بووی، دەبێ هەرچی زووتر بێی بۆ ئەرزی ئەقدەس کاروبارەکان جێبەجێ کەیت و بگەڕێتەوە[٦١].

«فەرمانی نەیروددەوەڵە والی خوراسان بۆ دەسەڵاتداری کەلات سەبارەت بە لەوەڕیمەڕەکان لە خاکی ڕووسیە»

دوای ئەوە کە ڕووسییە باکووری خوراسانی لە ساڵی ١٢٩٩ی مانگی بە زۆر داگیر کرد و لە ئێرانی جیا کردەوە مەڕدارەکان و خێڵەکییەکانی کوردی خوراسان مەجبوور بوون مەڕەکانیان بوەن بۆ خاکی رووسییە و پارەکەشی بەدەولەتی ئەوان بدەن.

---

٥٨- دەڵێن بێهبوودخان داوای کردبوو کەبچێتە لای ڕوکنوددەولە ویستەکانی پێی بڵێ.

٥٩- چەند وشەیێک نەخوێندراوەتەوە.

٦٠- نووسراوەکە زۆر ورد و خراپ نووسرابوو، ئەگەر دروستم خۆیندبێ، شاکارم کردووە.

٦١- بەڵگەیئاغای عەباس خانی جەلایرە.

شازادە سولّتان‌حوسێن میرزا نەیرووددەولّە کە گەورەیەکی زالّم بوو و لە سالّی ١٣١٨ی مانگی دا، پاش مردنی ڕوکنوددەولّە ببوە گەورەی خوراسان و تا سالّی ١٣٢٣ هەر بەردەوام بوو. لەم سالّەدا خەلّک کەبەئەستۆ هاتبوون لایان‌برد.[٦٢] عەلی نەقی میرزا ڕوکنوددەولّە کوڕی میرزا تەقی لە جێگای ئەو دانیشت.

لەم دەستوورە دا دەردەکەوێ کە بنە مالّەی جەلایر تا سالّی ١٣٢٠ی مانگی دەسەلاتدار نەبوون و فەتحعەلی خان واتە فەتحولمەلێکی دوایی کوڕی بێهبوود خانی نایبولحکوومە و موحەممەدڕەزاخانی‌شوجاعولمەلێکی هەزارەیی باوکی سەولەتولسەلّتەنەی دوایی کە لە بەرگی شەشەم باسی لێدەکرێ، دەسەلاتداری کەلات بووە، ئەمەیش نامەکە:

هو

(لە سووچی ڕاستەوە مۆری نەیرووددەولّە دەبیندرێ)

ئەمیرولئومەرا موحەممەد ڕەزاخانی شوجاعولمەلێک دەسەلاتداری کەلات بە پێی بڕیارنامەی تازە کە بە دایرەی گومرک گەیشتووە، هەرکەس مەڕەکانی بۆ لەوەڕ بۆ خاکی ڕووسییە بەرێت لەبۆ هەر مەڕێک دەبێ قرانێک لە لای پیاوی گومرک دابنێ کە دوای گەڕانەوە وەریدەگرێتەوە؛ بەلام پیاوی گومرک لە خاکستەرەوە[٦٣] ڕایگەیاندووە کە دەولّەت هاوڕێیی نەکردوین. جا بۆیە بەم جۆرە لە لایەن ئەمیرولئومەراوە دەنووسین کە تا دەتوانن هاوکاریمان بکەن و هەرکەس مەڕێکی لەسەرحەددی خاکستەرەوە بۆ خاکی ڕووس برد، پوولی دیاری‌کراو بدات. ئەگەر نەیتوانی پوولەکە بدات شتێکی‌تر بە بارمتە دادەنێ، هەتا حەیوانەکان دەگەڕێنێتەوە کە ئەگەر نەیگەڕاندەوە بەرپرسە.[٦٤] کەوابوو موقەڕێبولخاقانی

---

٦٢- تاریخ رجال ایران، مهدی بامداد. ب٢، ل٨٧

٦٣- خاکستەر دێهاتێکی ئاوەدان و قەرەباخی نێوان کەلات و لایینە. خەلّکەکەی زیاتر لە کوردەکانی شادلوون ، جاران مالوتیجارەی ئێران بۆ ڕووسیە لەوێوە دەڕویشت، گومرک و کاروانسەرای زۆری بوو کە ئەمڕۆکە وێران بووە.

٦٤- نرخی مەڕو مالات لە ڕووسییە گرانتر بوو.جا بۆیە مەڕەکانیان لەوێ دەفرۆشت و لە گەڕانەوەدا لە کاتی بەهار دەیانوت کە مەڕەکانیان مردوون یان گورگ خواردوونی. بۆ بەرگری کردن لەم

فەتحعەلی خـان نایبولحکوومـەی کـەلات [وشـەیەک نەخوێندراوەتـەوە] حـوکمی گەورە بەڕێوە دەبات. (زیقەعدەی ١٣٢٠)

## ئەسپە پێشکەشیەکانی ئەمیرەکانی خوراسان بۆ دەرباری تاران[٦٥]

ئەو جۆرەی کە ببوە عـادەت، ئـەمیرەکان دەبوایـە خۆیـان ئەسـپ بکـڕن یـان تەنخواکەی عەینەددەولە بدەن تا لەوێ ئامادەبکرێ.

کەوابوو دوو سەر حەیوان نرخی دووسەر ئەسپ ڕوومییە ودوو ئەسپ نرخی دوو دەست جلوبەرگە.

ئەوەی ماوەتەوە:

ئەسەدوولڵا بەگ نایبی گەوڕ چووەتە دەر.

دەرەجەز دووسـەرحەیوان، بجنووردسـێ سـەر حـەیوان، قووچـان سـێ سـەر حەیوان. ( لەپەڕاوێزی بەڵگەدا نووسراوە. )

جەنابی موستەشارولسەڵتەنە، هەرواکە عادەت و ڕەسمە بۆ هـەر قـەبزێ ئاڵـفی ئەسپەکانی گەوڕ بدات...

## ڕیزی ناوی سوارەکانی کەلات کە سانیان داوە

نوورموحەممەد بەگ کوڕی خانموحەممەد بەگ ئەسپی تێزێلی هەشت ساڵـە، حەسـەن بـەگ کـوڕی ئیـسماعیل بـەگ ئەسـپی قـەڕەی قـاوەیی هەشـت ساڵ، عەلیئەکبەر کوڕی حـاجی موحەممەدحەسـەن ئەسـپی قـزڵ سـوور چـوار ساڵـە، بەدەڵبەگ کوڕی میرزا خان بەگ ئەسپی قزڵ سوور سـێ ساڵـە، تـەمرخان کـوڕی

---

کارەساتە دەوڵەت خۆی تێکەڵی کرد؛ بەڵام ئەویش بەکەڵک نەهات، تەنانەت ڕێگایەک بووکە پیاوی گومرک پوولیان وەدەست دەکەوت هەرکەسێک ئەوەی کە پێویست بوو، دەی دا و هەر جۆرەکارێک کەپێی خۆش بوو، بەڕێوەی دەبرد.

٦٥- بەڵگەی ئاغای عەبباس خانی جەلایرە. کاتی بەڵگە دیار نییە، ڕەنگە هی سەردەمی سـەدارەتی عەینوددەولە و پێش لە مەشرووتییەت وکاتی موزە ففەرەدین شا و ساڵی ١٣٢٤ی مانگی بێت.

سالار بەگ ئەسپی قزڵسوور شەش ساڵە، جان موحەممەد کوڕی موحەممەد قولی ئەسپی بێ تەمەن و ڕەنگ، ئیسماعیل بەگ کوڕی ئیبراهیم بەگ ئەسپی قزڵ سوور حەوت ساڵە، حەجی موحەممەد بەگ کوڕی نوورموحەممەدبەگ ئەسپی کەرەند سێ ساڵە، ئیسماعیل خان کوڕی ئیبراهیم خان ئەسپی قاوەیی شەش ساڵە، خان موحەممەد کوڕی موحەممەد قولی ئەسپی قزڵسوور سێ ساڵە،

## تیرەی کۆسانلووی کوردی ناوکەلات

مێهراب بەگ کوڕی حەیدەرقولی بەگ ئەسپی قاوەیی شەش ساڵە، حەیدەر قولی بەگ کوڕی مێهراب بەگ باوکی مێهراب بەگی پێشوو ئەسپی بێ تەمەن و ڕەنگ،جەعفەر بەگ کوڕی حاجی موحەممەد قولی ئەسپی قزڵسوور حەوت ساڵە، سەعادەتعەلی بەگ کوڕی حاجی مورشێد ئەسپی قاوەیی سێ ساڵە، نەجەفقولی بەگ کوڕی حاجی ئیسماعیل ئەسپی قاوەیی دووپێ سپی پێنج ساڵە

**کەبوود گونبەد:** عەبباس بەگ کوڕی[هیچی تر نەنووسراوە]، میرزا موحەممەد عەلی کوڕی مەلاجەعفەر ئەسپی سەمەند سێ ساڵە، ڕەزاقولی بەگ کوڕی ئیمان بەگ ئەسپی قاوەیی شەش ساڵ، ئەحمەد کوڕی کەربەلایی حوسێن خان ئەسپی قاوەیی هەشت ساڵ، کەربەلایی ڕەحمانقولی کوڕی کوڕەکەی زەینەلی دووهەم ئەسپی قاوەیی دووپێ‌سپی پێنج ساڵە، سولەیمان بەگ کوڕی نییەتی

**گەرۆ:** عاشوور قولی بەگ کوڕی کەربەلایی عەبباس ئەسپی قاوەیی شەش ساڵە، بێهبوود کوڕی موحەممەد حەسەن بەگ ئەسپی قاوەیی حەوت ساڵە.

**تیرەی کوردی ئەردەڵان:** ئیبراهیم بەگ کوڕی حوسێنقولیبەگ ئەسپی سەمەند چوار ساڵە، حوسێنخانبەگ کوڕی تەمرخان ئەسپی قزڵسوور هەشت ساڵە، بەرات کوڕی موحەممەد عەلی ئەسپی قزڵسوور حەوت ساڵە، غولامڕەزا کوڕی عەوەز عەلی ئەسپی کۆرەند سێ ساڵە.

**تیرەی جات قەلەزوو:** غولامعەلی بەگ کوڕی کەربەلایی بە دەڵ ئەسپی کۆرەند سێ ساڵ کەرەڵایی ڕەمەزان کوڕی کەربەلایی ئیسماعیل ئەسپی قرەکەهەر

هەشت ساڵ جەعفەر بەگ کوڕی کەربەلایی موحەممەد ئەسپی کۆرەند سێ ساڵە.

**تیرەی یەنگی جەقەلەزوو:** حوسێنقولی کوڕی حەزرەتقولی ئەسپی نییە،وەلیخان کوڕی نادرخان ئەسپی قاوەیی پینج ساڵە.

**یەنگی ئاقداش:** وەلیخان بەگ کوڕی چەقوربەهادور ئەسپی قاوەیی هەشت ساڵە. موڕادخان بەگ کوڕی ئاغا عەلی کەیخوا ئەسپی قزڵ شەش ساڵە،ئەڵلانەزەر کوڕی تەهماسب کەیخوا ئەسپی قزڵ شەش ساڵە،موحەممەد بەهادور کوڕی ڕەمەزان بەهادور ئەسپی کۆرەند حەوت ساڵە.

**ئاقداش:** دۆڵخان کوڕی وەلیخان ئەسپی سەمەند پێنج ساڵە، ئیبراهیم کوڕی خانگەڵدی ئەسپی قاوەیی شەش ساڵە.

**تەفتە:** حاجی بەگ دوردی بەگ کوڕی بەهادور ئەسپی قزڵ پێنج ساڵە.

## دەرەوەی کەلات:

**لایین:** ئەحمەد خان بەگ کوڕی حاجی ئەکبەر خان بەگ سۆفیانلوو نایبی لایین ئەسپی قزڵ هەشت ساڵە، ڕەحمەتوللابەگ کوڕی حاجی ئاغا گولی بەگ سۆفیانلوو ئەسپی ملە چوار ساڵە،حاجی دەمەرخان کوڕی موحەممەد خان ئەسپی قاوەیی چوار ساڵە، سولەیمان بەگ کوڕی باقری کەیخوا ئەسپی کۆرەند هەشت ساڵە، حوسێنقولی کوڕی عەسکەری کەیخوا ئەسپی کۆرەند هەشت ساڵە.

**سەرکان:** ئاغا جان بەگ کوڕی ئیسماعیل بەکی سەرکانی ئەسپی قاوەیی چوار ساڵە، حەیدەر بەگ کوڕی بابا خان بەگ ئەسپی قرەکهر سێ ساڵە، ئایدینە قولی کوڕی حاجی عیسا خان ئەسپی مەلە سێ ساڵە.

**ئیگدەلیگ(ئیدەلوو):** عیساکوڕی کەربەلایی حەیدەر ئەسپی کەرەند پێنج ساڵە، موحەممەد حەسەن مەرگان کوڕی قوربانعەلی کەیخوا ئەسپی قاوەیی چوار ساڵە، موحەممەد تاهیرکوڕی کەربەلایی ئیسماعیل ئەسپی مەلەچوار ساڵە.

**ئەرچەنگان:** بیگلەر کوڕی موحەممەد ئیبراهیم بەگ ئەسپی قەرەکەهەر شەش ساڵ، عەباسقولی بەگی کوڕی موحەممەد باقر ئەسپی قەرەکەهەر سێ ساڵە.

**کوردەکانی سیناتی:**

غوڵامڕەزا کوڕی موحەممەد خان ئەسپی قزڵ سوور چوار ساڵە، قوربانعەلی کوڕی سارخان مەرگان ئەسپی کۆرەند پێنج ساڵە، ڕەحیم کوڕی خانگەڵدی ئەسپی قاوەیی سێ ساڵە، حوسێن کوڕی ئیسماعیل کەیخوا ئەسپی مەلە چوار ساڵە، موحەممەد خان کوڕی موراد خان ئەسپی قزڵ سوور چوار ساڵە.

**چەرەم (کوردەکانی بادلانلوو):** عەلی کوڕی کەرەبەلایی ڕەمەزان ئەسپی مەلە حەوت ساڵە، کەرەم کەیخوا کوڕی کەربەلایی قوربان ئەسپی قزڵ حەوت ساڵە، کەربەلایی ئەسغەر کوڕی کەربەلایی ڕەمەزان ئەسپی قاوەیی سێ ساڵە، بەرات کەیخوا کوڕی عەزیز خان ئەسپی قاوەیی پێنج ساڵە.

**جێرف(ژێرف):** عەباس کوڕی موحەممەد عەلی کەیخوا ئەسپی قزڵ پێنج ساڵە،

**ردە:** موحەممەد بەگ کوڕی حاجی دروستعەلی ئەسپی قاوەیی چوار ساڵە، کەربەلایی عەبدولکەریم کوڕی ئیسماعیل کەیخوا ئەسپی قزڵ سێ ساڵە،ڕەحمان کوڕی مووسا ئەسپی قزڵ سوور هەشت ساڵە.

**قەلعەنوێ (کوردەکانی شێخوانلوو):** موحەممەد کەیخوا کوڕی حاجی مۆئمن ئەسپی کۆرەند سێ ساڵە، سەلیم خان کوڕی موحەممەد عەلی ئەسپی قزڵ سوور پێنج ساڵە، ڕەمەزان کوڕی حەزرەتقولی ئەسپی قاوەیی هەشت ساڵ، موحەممەد سادق کوڕی حاجی تەمرخان ئەسپی مەلە چوار ساڵ.

**سەرڕوود:** موحەممەد عەلی کوڕی کەربەلایی حوسێن ئەسپی مەلە چوار ساڵە

**قراتیکان:** کەربەلایی غوڵامعەلی کوڕی ئاغا موحەممەد بەگ ئەسپی قاوەیی هەشت ساڵە، عەبدوڕڕەحمان بەگ کوڕی سوڵتانعەلی ئەسپی قزڵ سوور حەوت ساڵە، حەسەن بەگ کوڕی ئیبراهیم بەگ ئەسپی قزڵ سوور چوار ساڵە، پۆلا بەگ کوڕی سالار ئەسپی قاوەیی چوار ساڵە.

**زووی خواروو:** خودا وێردی بەگ کوڕی ئاغا حەسەنعەلی ئەسپی قزڵ سوور چوار ساڵە، سوڵتان موحەممەد کوڕی ئیمام ویردی بەگ ئەسپی مەلە چوار ساڵە،

حەسەن کوڕی عەلی ئەحمەد بەگ ئەسپی قاوەیی حەوت ساڵە، نادرحوسێن بەگ کوڕی ئاغا حەسەنعەلی ئەسپی مەلەحەوت ساڵە.

**زووی ژووروو:** ئیسحاق کویخا کوڕی کەربەلایی ئیسماعیل ئەسپی قزڵ شەش ساڵە، ئاتا کویخا کوڕی حەسەن خان ئەسپی قاوەیی پێنج ساڵە،

**چنار هیزانلوو(کوردی هیزولانلو):** موحەممەد عەلی یووزباشی کوڕی ئەحمەد خانی یووزباشی ئەسپی قزڵ شەشە ساڵە.

**خەروو:** غولامڕەزا ئاغا کوڕی ئاغا چووپان ئەسپی قاوەیی، ڕەمەزان کوڕی نەورۆز عەلی ئەسپی قاوەیی، حەسەن کوڕی کازم بەگ ئەسپی قاوەیی، فەزڵولا کوڕی حەسەن خان ئەسپی کەهەر پێنج ساڵە، ڕەمەزان کوڕی قوربانعەلی ئەسپی کرەی قاوەیی، غولامحوسێن کوڕی غولامعەباس ئەسپی مەلە سێ ساڵە، قاسمعەلی بەگ کوڕی نییەتی موحەممەد ڕەزاخان قزڵ حەوت ساڵە، مەلیک کوڕی غولامڕەزا کەرەند سێ ساڵە، کەربەلایی غولامعەلی کوڕی زێنەڵ ئەسپی قاوەیی هەشت ساڵە،

## بەڵگەکانی خەڵکی بجنوورد و بارودۆخی بجنوورد لە ڕۆژنامەکانی هەوەڵی مەشرووتە

بەداخەوە خەڵکی بجنوورد هێشتا وەکوو بێنجسەد ساڵ لەمەوبەر دەژین و لەدەستە ی یاغییەکانن، ئەگەرچی خەڵکی هەموو دێهاتێکی ئێران بە مەشرووتییەت خۆشحاڵن و هاتن ئەنجومەنی نەتەوەییان درووست کردووە و دەیانهەوێ کاروبارەکانیان بەرنە پێش.خەڵکی بجنوورد هەر خۆیان دەبینن و شتی‌تریان پێ هەڵەیە. لە دوای ئەم هەمووە هەراوهووریا ئێستە تازە دەیانهەوێ ئەنجومەنێک درووست بکەن و نوێنەر دەنێرن بۆپارلەمان. جا بۆیە دوو ڕۆژ لەمەوپێش کۆبوونەوەیەکیان بوو تا چەند کەس لە نێوانی خۆیان هەڵبژێرن.

شێخ موحەممەد عەلی مودیری ڕۆژنامەی بەشارەت ل٤ ژمارە ٢٧ ساڵی ١٣٢٥ لە درێژەی باسی بجنوورد دەڵێن :«تاقمێکیش گوتوویانە کە ئەبێ ئێمە هەڵبژێرن بۆ وێنە حاجی‌جەعفەرقولی عەتتار کۆبوونەوەیێکی لە ماڵی خۆیدا

ڕێکخستبوو و جەماعەتێکی داوەت کردبوو کە ئەو هەڵبژێرن.

لەهەوە ڵدا میوانەکان لەسەر ئەوەی کە لەسەرەوە دانیشتن یا لە خوارەوە، دەمەتەقەیان بوو ولەدواییدا کەربەلایی‌عەلی‌ئەکبەری نامی وتی: ئێوە وەختێ هەڵدەبژێردرێن کەزۆربەی دەنگ بێنن. کۆبوونەوەکە بەشڵەژایی گوزەرا .سبەینیەکەی هەمووی خەڵک هاتبوون دووکانەکانیان بەست و لە مزگەوتی حاجی میرزا بابا ــکە مامۆستاییکی بەڵەدبوو ــکۆبوونەوە، دوای قسە و باسێکی زۆر جەنابی ئاغایان لە لایەن مامۆستاکان و فەقێکانەوە هەڵبژارد و حاجی عەلی‌ئەکبەر جاجووری و حاجی مەهدی لە لایەن سەوداگەران و کەربەلایی مورتەزا لە لایەن کاسبکارەکان و ئاغا حەبیب و حاجی موحەممەد لە لایەن زەوینداەکان و جووتیارەکانەوە هەڵبژێردران؛ بەلام لەبەر ئەوەی کەهەمووی خەڵکی بجنوورد تووشی خۆبایی‌بوون ببوون دانانی ئەنجوومەن کۆسپی زۆری تێدایە، چوونکە دوو نەفەری هاودڵ و هاوڕێ نابیندرێ و بەم جۆرە و لە بۆدوژمنایەتی کردن لەگەڵ یەک بەتوورکەمەنەکان دەڵێن: وەرن ئەڵئەمانی بکەن.

لەم چەند ڕۆژەدا پەرتەوازەیی و دوولایەنی خەڵک بوو بەهۆی کوژرانی شەش کەس لەدیهاتیەکانی موحەممەد ئاوا و ڕاز کەچوار فرسەخ لێک دوورن. بەدەستی سی سواری تورکمەن لە ڕۆژی ڕووناکدا و هیچ کەسێک لەسوارەکانی قەلعە دوورونزیکەکان بەشوێن ئەم سوارانەدا نەچوون .نازانم ئەم شەجەرەپیسەی دوژمنی و دوولایەنیە کەی لە ناو دڵی ئێمەدا دەپسێ ؟تاکەی دەبێ تورکەمەنەکان بۆ ڕشتنی خۆینی برای دینی و بەدیل گرتنی ژنان داوەت بکەین و لەدواییشدا بڵێن خەتای دەوڵەتە. خاک بەسەری ئەم خەڵکە بێ‌غیرەتە کە لەبەر دوژمنایەتی نێو خۆ، ناموسی خۆیان بە دەست بێگانە دەدەن و ئەوجار ئەڵێن دەوڵەت بێدەسەلا تە.

دوورنەچین، دوای تەواو بوونی کۆ بوونەوە، حاجی جەعفەری‌قولی کە ناومان برد، کاتێ کە ناوی خۆی لە نێو هەڵبژێردراوەکاندا نەدی، ڕقی لە کەربەلایی‌عەلی‌ئەکبەر هەڵگرت و لەگەڵ خزم وتیرەی خۆی کەوتنە گیانی و وتیان بۆ چی دوێنی وتت کە هەڵبژاردنی تۆ بە زۆربەی دەنگ دەکرێ؟

دەبینن! ئا بەم بارودۆخەوە دەمانەوێ پێش کەوین. هەیهات، هەیهات!!! حەیف!! هەزار حەیف. ئیمزا مەحفووز(نەهێنی)»[٦٦]

مەکتووبی بجنوورد-

.... ئیستا کە سەردەمی عاشوورا و پرسەی حەزرەتی حسێنە، دەوڵەتیش هەلی بۆ هەڵکەوتبوو ومەجلیسی ڕەوزە خۆێندنی دانابوو، گەرچی جاران وای‌نەئەکرد، نان و چێشتیان دەدا، شتیان دەبەخشی وکۆمەکیان بە فەقیر ونەدار دەکرد و هەمووشەوێ چایی وشەربەت ویەک قران پوولیان بە فەقیرەکان دەدا وجلوبەرگیان بە ڕەوزە خوێنەکان دەدا ولە ڕۆژی عاشوورایش دیاری وپوولیان بە تیخزەنەکان دەدا.

چەند ساڵ بووکە دەوڵەت بەم جۆرە لە بجنوورد پرسە ی‌نەدەگرت. هەروەها ئاکاری دەوڵەت سەبارەت بەخەڵک بە تەواوەتی گۆڕابوو. زۆر بە نەرمی و مێهرەبانییەوە لەگەڵ خەڵک دەجووڵانەوە.[٦٧]

## نامەی موحەممەد عەلی شای دەرکراو لەبارەی شوجاعوددەوڵەی زەعفەرانلوو

موحەممەد عەلی شای قاجار کە لە ٢٧ی جەمادیوسسانی ١٣٢٧ی مانگی تاج و تەختی لێ‌سەندراوە و هەڵات بۆ رووسیە، دوای ماوەیێک بۆ وەدەست هێنانی دووبارەی تاج و تەخت لە ڕێگەی مازندەران هاتە نێو ئێران و تورکەمەنەکانی غەراوی قەرابی و راسائی کە لەو تیرە هەرە گرینگانە بوون کە یارمەتی موحەممەدعەلی شایان دا. موحەممەد عەلی شا لە یەکێک لە نامە نەهێنییەکاندا بۆ لایەنگرێکی خۆی دەنووسێ:

بە پێویستم زانی کە ئەم دووباسە خێرا بنووسم .هەوەڵ دیارە کە ڕاسائیەکان لە تیرەکانی تورکەمەن بە یارمەتی دۆستی بەڕێزی ئێمە کە لە گونبەدە لەگەڵ

---

٦٦- ڕۆژنامەی بەشارەت ، لاپەڕەی ٤ ژمارەی٢٨ دەورەی هەوەڵ، ساڵی١٣٢٥ی مانگی.

٦٧- ڕۆژنامە خورشید ، لاپەڕەی ٧ نومرەی ٢ ساڵی ١٣٢٥ی مانگی.

تورکەمەنەکانی حەسەنخانی غەرایی[٦٨] لەبەیندابووە و کارەکەی ڕێکوپێک کردووە و خۆیشی سبەینی دەگاتە بەرەوە،ئەگەر ئاوابێ نێعمەتی خودایيە چوونکە کاری ئێمە لە شاهروود باشتر دەچێتە پێشەوە تا ئەوکاتەی کەحەسەنخان دەگاتەبەرەوە، ئەم باسە هەروا نەهێنی بمێنێت.

دووهەم ئینگلیزیەکان لەجووڵانەوەی ئەو داوای لێبوردنیان کردووە. سێهەم ئیستا برووسکەی شێخ ئیسماعیل[٦٩] بە دەست گەیشت شوجاعوددەولەی قووچانی قووچان و دەرەجەزی گرتووە .

واژۆی کورتی موحەممەد عەلی شا[٧٠]

بێگومان نامەی سەرەوە بۆ ترساندنی هێزی بەرهەڵست وە بەدەست هێنانی دڵی لایەنگران بۆ دەسەڵاتدارێک نووسراوە و تەنیا بۆ خۆ هەڵکیشان بووە، چونکە شوجاعوددەولە و کوردەکانی زەعفەرانلوو بەرانبەر بە هاتنی ڕووسەکان بۆ ئێران ڕاوەستابوون و کاتی بۆمباران کردنی حەرەم جەجووخان و هاوڕێکانی تا ئاخرین کات لە ناو حەرەمدا شەڕیان کرد. بۆمبارانی ڕووسەکان لەمەشهەد و بێحورمەتی بە بارگای ئیمامی هەشتوم نە تەنیا خەڵکی قووچان بەڵکوو هەموو خەڵکی خوراسان و ئێرانی لە ڕامیاری ڕووس و ئینگلیس بێزار کرد. جا بۆیە لەوە نەئەچوو کە خەڵکی خوراسان یارمەتی بدەن. لە لایەکی دیکەوە شوجاعوددەولە لە هیچ کاتێکدا بۆ داگیر کردنی دەرەگەز هەوڵی نەدابوو.

شالیاری موختاری ئینگلیس لە ئێرانەوە برووسکەیێکی بۆ لەندەن نارد کە تێدا نووسراوە موحەممەد عەلیشا بۆ نێو تورکەمەنەکان گەڕاوەتەوە و بۆ ڕابەرانی خێڵاتی کورد و تورکەمەن نامەی نووسیووە و داوای پشتیوانی لێکردوون. بۆ وێنە بۆ سەردار موعەزیزی ئیلخانی بجنوورد کە لەبەندیخانەی مەشرووتەخوازان رزگار ببوو

---

٦٨- حەسەنخان لە تورکەمەنەکانی غەرایی کە بە قەرابی و غەروایش ناوبانگیان هەیە، لقێک لە یەموون.

٦٩- لە مەلاکانی قووچان.

٧٠- نامە مێژووییەکانی سەردەمی قاجارییە، ئیبراهیمی سەفایی، ل ١٤٢.

و گەڕابوومەوە بۆ بجنوورد. ئەمەیش برووسکەکە: لە تاران بۆ لەندەن ٢٨ ژوئییە ١٩١١ بەرامبەر بە سێی پووشپەڕی ١٢٩٠

## لە سێر بارکێلییەوە بۆ سێرئێدوارد گێری

موحەممەد عەلی شا بۆ ئێران گەڕاوەتەوە و بەچوارسەد کەسەوە شاهروودی گرتووە، بەرەو تاران و گەورەی خوراسان و هەروەها گەورەی بجنوورد ـ سەردار موعەزیزی شادلووـ برووسکەی ناردووە و هەڵەکانی پێشووی ئەوانی پێیان بەخشیوە، وادەی داوە کە مەجلیس بەڕێوە بەرێت.[71]

لە بروسکەی نومرەی ٣٠٦ بەرانبەری ٢٥ی ئووتی ١٩١١ خەبەری بە لەندەن داوە کە: خێڵاتی تورکەمەن تا ٢٥ میلی ئارادان[72] لەڕێی مەشهەدەوە چوونەتە پێش .هەڵبەتە ناردنی ئەم برووسکانە و کارەساتەکانی موحەممەدعەلی شا لە نێوان مەلاکانی مەشهەد جیاوازی درووست کرد و بڕێک لەوان وەکوو تالیبولحەق لایەنی موحەممەد عەلی شایان گرت ؛بەڵام لە نێوان کوردەکانی خوراسان کەسێک بەڵێنی بە موحەممەد عەلیشا نەدا و دژ بە مەشرووتە نەوەستان لەبەر ئەوەی کە سەردار موعەزیزی ئیلخانی بجنوورد و هەروەها شوجاعوددەولەی ئیلخانی قووچان کەچەند ساڵ لە تاران لە بەندیخانە دا بوون و لە ژێر چاوەدێری مەشرووتەخوازاندا، پشتیوانی ئینگلسیەکانیان لەمەشرووتەخوازان بەچاو دیبوو و دەیانزانی کە لایەنگرانی ڕووس لەم کایە ڕامیاریەدا ئەیدۆڕێنن.

بەڵگەکانی خەڵکی قووچان لەهەوڵی مەشرووتەوە کە میرزا ئەبولقاسم خان بە دوای لابردنی ئەمیرحوسێن خان کوڕی ئاسەفوددەولە بە حکوومەت گەیشت و چەند بەرابەر مالیەی لەخەلک وەردەگرت و زولمی زۆری کرد.

---

٧١- کتێبی ئاوی ٣٩٠، ل ٦٨٤.

٧٢- ڕەنگە ڕادکان بووبێ.

## ڕیزیماڵیەی قووچان

| | |
|---|---|
| کەلاتە زمۆ | ٥تمەن |
| بەگ نەزەر | ٧تمەن |
| لەعل ئاباد | ١٧تمەن |
| شۆرجە | ٢٤تمەن |
| یساقی | ٦تمەن و دوو ڕیاڵ و نیو |
| خەلانلوو | ٥تمەن |
| جافکانلوو | ١٥٠تمەن |
| مەشکانلوو | ٢٠٠تمەن |
| وێرانلوو | ٢٠٠تمەن |
| ...؟ | ١٥تمەن |
| دۆغایی | ١٥تمەن |
| هەوەدانلوو( هیوەدانلوو) | ؟ |
| کەلاتەدولو (هۆدانلوو) | ١٤تمەن |
| نەورۆزی | ٣٠تمەن |

بەدەست موحەممەد عەزیم خان گەیشت ١٥٠ تمەن و... لە پشت لاپەڕەکە چەند جۆر ڕەقەم و تەحویل و تەحەول نووسراوە .ڕەقەمە دراوەکان بە دەست خەتی سیاتە، و خوالێخۆشبوو غولامحوسێن ڕەحیمیان هەڵبژاردەی پێشووی قووچان خوێندیەوە.

| ریزی دراوه كانی نێوان وڵایەت | | | |
|---|---|---|---|
| ئەركەند | ٦تمەن | جەعفەر ئاوا | ١٩تمەن |
| دوین | ٢٠تمەن | باشكانلووی تەكمەران | ١٥تمەن |
| باشكانلووی حەسار | ٧تمەن | یام تێكانلوو | ١٥تمەن |
| بۆرزێل ئاوا | ٦تمەن | نەجەف ئاوا | ٤تمەن و ٥قران |
| موحەممەد ئاوا فارووج | ٣تمەن | فارووج | ٢٥تمەن |
| قەلعە سەفدەر | ٠٠٠؟ | شێرەژن با ئینچە | ٠٠٠؟ |
| سوككەلاّئاوا | ٢٦تمەن | یۆسف ئاوا | ٦تمەن |
| فیلاب | ٣ قران | شورك حاجی | ١٢قران و نیو |
| فرخانەكان | ٠٠٠؟ | ئوتر ئاوا | |
| قەلعەی حاجی تەقی | ٧تمەن | | |

## حوكمێك لە لایەن شوجاعوددەولەوە بۆ موحەممەد ئیبراهیم حاكمی سەرحەدداتی قووچان و شیروان

برای مێهرەبان موحەممەد ئیبراهیم خانی نایبولحكوومە هەمووی سەرحەددات و تیرەكانی كەبنیكلو[٧٣] و میلانلوو[٧٤] دەنووسێت. تیرەكانی سەرحەد دات: میلانلوو و... قۆشخانە، بیچرانلوو، سیوكانلوو، میرانلوو[٧٥] كخبنیكلوو، بلووكی جلیان[٧٦] و پەهلوانلوو، كەمكیلانلوو، گیفائی خواروو... جریستان، دێهاتی رۆبات. دەمێكە كاروباری رایەتەكانی سەرحەدداتی قووچان بەرێوە ناچێت وكارمەندەكانیش تەنیا لە بیری خۆیان دان و ناتوانن خزمەت بكەن، بۆیە هەر رایەتێكیش بە ویستی خۆی

---

٧٣- كوهبنیكلوو، یان قۆخیبنیكلوو كە ئەسپەچیر ناوەندی بووە. ئەم بەڵگەیە هەر ئاوا لە لاپەرەی ٤٧٦ بەرگی سێهەمدا هاتووە.

٧٤- مەبەست میلانلووی ئەسفەراینە.

٧٥- مەبەست میلانلووی سەرحەددە.

٧٦- گلیان ناوەندی دوایی خەدوسەردارە.

کاردەکات و نەزم و داموتەرتیب نەماوە کە واتە لەسەر داخوازی موبارەکی گەورەکانی دەوڵەتی لە کاتی وادا پێویستە نەزم و ڕێکوپێکی لەسەرحەدداتا پێک بێنم.[٧٧] جا بۆیە ئێستا کە ساڵی مەیموونە «پیچی ئیل»[٧٨] بە چاکی دەزانین لە لایەن دەوڵەتەوە ئیزنمان داوە کەهەر کام لەکارمەندەکان ئەگەر سەربەخۆجووڵانەوە، لابیردرێن و کەسی تر بە جێگەیان دانیشێ، چل کەس قەزاقیشمان[٧٩] داناوە کەدێن بۆسەرحەددات، هەروەها کارمەند و بەگزادەکان نابێ لەقسەی موحەممەد ئیبراهیم خان دەرچن. (موحەڕڕەمی ١٣٢٧[٨٠])

دوابەدوای ئەوەی کە ئیبراهیم خانی ڕۆشەنی لەنەزم و ڕێکوپێکی سەرحەددات، کارزانی لە خۆی نیشاندا. عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو قەبزەیێک شمشێری بۆ ڕێزگرتنی نارد. عەبدوڕەزاخان بە دەست نووسی خۆی لەم بارەوە نووسیوویەتی: موحەممەد ئیبراهیم خان نایبۆلحکوومەی سەرحەددات و ناوچەسێیانیەکان بەویستی حەق لە کارزانی و یەکڕەنگی ئێوەکەئێوە لەهەموو بابەتێکەوە کارزان و لێهاتوو بوون و یەکڕەنگیم تێتانداڕەچاوکردووە. جا بۆیە بۆ دەبڕینی خۆشەویستی و هەستی خۆم لەم کاتەدا کەهەموو سەرحەددات و نایبولحکوومەتیم بە ئێوە داوە، بۆدەربڕینی هەستم، یەک قەبزە شمشێری پامیلەنگی تەلا بە موعتەمێدوسوڵتان شوجاع نیزامدا بۆتانم ناردووە کە هەروا بەردەوام و ئۆمێدوار بە خزمەتە بێڕیاکان شانازی دەکەم.

موحەڕڕەمی ١٣٢٧ لە پشتی بەڵگەکەوە، مۆری بەیزی شوجاعوددەولەهەیە.

نامەیێکە لە شوجاعوددەولەوە بۆ موحەممەد ئیبراهیم خان حاکمی سەرحەدداتی سەلاسەی قووچان کە نیشان دەدا پیتاکی بە باسی وەرگرتووە ولامی

٧٧- لەمەبەدواوە، لەوەدەچێ کە دەست خەتتی عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولە بێ.

٧٨- پیچی ئیل= ساڵی مەیموون.

٧٩- هێزە دەوڵەتییەکان کە لەسەردەمی ڕەزاخاندا بوون بەئەرتەش .

٨٠- موحەڕڕمی ساڵی ١٣٢٧ .پشتی بەڵگە مۆری پێوەیە.« ئەمیرعەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولە ١٣٢١ »یانێ مۆر لە ساڵی ١٣٢١ی مانگی درووست بووەکە ساڵی دەست پێکردنی حکوومەتی عەبدوڕڕەزاخان بوو.

سەردار موفەخخەمی بجنوورد وسەردار موعەزەزی زۆر بە باشی داوەتەوە. تیبینی یەکی بەرچاو لەم بەلگەدا ئەوەیەکە جریستان لەوکاتەدا جێگەیسیقە وخاوەنی گومریک بووە. ئێستا لەناو نامەکەی ئەودا ـجەنابی موحەممەد ئیبراهیم خان جێگری حکوومەتی سنوورەکان_ بەقەد هەزار تمەن کەهەشتسەد تمەنی بە بۆنەی مالیات و دووسەدتمەنیشی بە بۆنەی پاشماوەی پارەکە کە بە جەلالەدیواندا ناردبووتان گەییشت؛[81] بەلام ئەشێ تا دەتوانن تەقالابکەن بۆ وەرگرتن و ناردنی سەرانە و خزمەت بکەن و ئەو نامەیە کەنووسیبووتان بۆ جەنابیسەرداری بەرێز، زۆرم پێخۆش بوو.

لە راستیدا مەسەلەکە هەر ئەوە بوو کە نووسیبووتان. سەرەڕای ئەوەی کە تاکوو ئێستە بۆ بەدیهێنانی ئاسایش و هێمنایەتی لە ناو رەعیەتەکاندا دەگەڕان وبە سەرۆکی گومرێک پانزدە تفەنگچی دەدەن کە کاروباری گومرێکیان بەڕێوە ببات ولێیان نەپرسێتەوە و ئەمانوللا بەیگ تفەنگچیم لەگەڵ دووکەس تفەنگچی دیکە کە هاتبوون ناردم بۆ لاتان.

سەفەری ١٣٢٧ مۆری شجاعوددەولە لەپشتی حوکمەکەدایە.

لەنێو ناوەرۆکی دەقەکەدا کرداری پێخۆشبوونی شوجاعوددەولە بەو بۆنەوە بوو کە محەممەد ئیبراهیم خان ولامێکی دەمقووچێنەری بە سەردار موفەخەمی شادلووی ئیلخانی و حاکمی بجنوورد دابووەوە، چونکە سەردار موفەخەم دایم تێدەکۆشا گوندەکانی زەعفەرانلوو کەهاوسنووربوو لەگەڵ شادیلوودا بخاتە سەر

81- وەرگرتن و ناردنی یەک هەزار تمەن مالیات لە جریستانەوە لەکەمترین ماوەدا ئیشێکی ساکار نەبووە وەئەوەدەگەیەنێ کە مەبەستی ئەسلی حاکمەکانی ئەوسەردەمە گرتنی مالیات لەخەلکی بەقازانجی دەولەت بووە؛ نەک بەرقەراری ڕێک و پێکی هێمنانەتر لەو هەرێمەدا هەروەها خەلکی جەریستانیش بەهۆی هاوسنوور بوون لەگەڵ شەورەویدا بارودۆخێکی مالی باشیان بوو. غولامحسێن رەحیمیان بۆ نووسەر گێڕاندیەوە کەخان و بەگەکاتی جریستان لە نێو تەواوی پیاوەگەورەکان و خانەکانی قووچان و سەرسنووردا بەرچاو بوون .ئەوان پالتاوە ماهووتیە ئوتوکێشراوەکانیان لەبەرە و کلاوی پێستی بوخارایی لەسەریانا وچەکمەی مل درێژیان لە پێ بوو و کاتێکیش دەهاتنە نێو باجگیرانەوە، سەرنجی هەموانیان بۆ خۆیان ڕادەکێشا.

خاکی خۆی، بەو بۆنەوە زۆربەی کات سوارەکانی خۆی کە لە ناوچـەکانی کێخـان و قووشـخانە و گونـدەکانی رۆژئـاوای شـیرواندا بـوون مـەجبووردەکرد بـەتالانکردن و غارەت.حاجی دەوڵەتی نامانلوو بۆ نووسەر [تەوەحودی]زۆرشتی گێڕاوەتـەوە کـە بـۆ ئەوەی کەگوتارەکەمان زۆر درێژەی نەبێت باسی ناکەین .هەروەها کە لەو بەڵـگانەی کە پێوەندی بە خەدوویش هاتووە، سەردار موفەخەم لەگەڵ دەوڵەتدا مەرجی کـرد کە ئەگەر حکوومەتی شیروان بخەنە ژێر دەستی ئیلی شادلوو خـەدوو دەسـتگیر و کەلەبچـە دەکـرێ. لەبابـەتی وەرگـرتنی مالـیاتی خێـلی سـیوکانلوو لـە موحەممەدحـسێن خـانی ئووغـازی سـەرۆکخێـلی سـیووکانلوو مالـیاتی بـە شوجاعوددەولە نەیەدا و لەسـەر ئـەو بـڕوا بووکـە چونکـە سـنووری ئێـران و رووس بەسـراوەو ڕادەی گـشتی هاتووەتـە خـوارەوە و ناوچـەی ئووغـازیش کوێـستانییە و بۆکشت و کاڵ نالویێ، خەلکی توانایی هەدانیمالیاتیان نیە. ئەگـەر لـەدانی مالـیاتی خەلکی ئووغاز لەگەڵ خەلکی جلگەی چناران یـا جـلگەی شـیروان و ئەسـفەرایەن وەک ئەوان، جیاوازییەک نـەبێت و لـە دانی مالـیات ڕزگـار نـەکرێن. ناعەدالـەتی و زولمێکە دەرحەق بە ئووغازییەکان دەکرێ. بەو بۆنەوە چەنـدەهـا جـار بـەرپرسـانی وەرگرتنی مالیات لە ئووغاز هیوابڕاو گەڕانەوە دواوە، چونکە موحەممەدحسەین خـان شاخە ڕووت و بەرزەکانی ناوچەی سیووکانلوویان پێان نیشان ئـەدا و دەیگـوت کـە بڕۆن لەم شاخانە مالیات وەربگرن.

خەلکی جگە لەم کێوە ڕووتانە شتێکیتریان نیە کە بەجێی مالیات بیـدەن بـە ئێوە. بەم بۆنـەوە چـەن جـار موحەممەدحـسەینخانیـان دەسـتگیرکرد و لـە ژێـر چاوەدێریدا بردیان بۆ قووچان؛ بـەلام چونکـە ئـەو پیـاوێکی ڕۆشـنبیرو زمـانتیژ و قسەزان و خوشگوفتار بوو، دەسـتی بەقـسە کـردن دەکـرد شوجاعوددەولـەی ڕازی دەکرد. بەو بۆنەوە هەرکات هێزەکانی بانگ دەکرد بۆ قووچان وبەسوارەکانی خـۆیی دەگوت کە لە پشتی منـەوە بـێن بەڕێـدا نەوەکووسـوارەکانی شوجاعوددەولـە مـن بکوژن و نەیەلن لەگەڵ شوجاعوددەولەدا ڕووبەڕووببمەوە.چونکە هەرکات لەگەڵـیدا ڕووبـەڕوو بم دلـنیام کـە ڕزگـار دەبم وهـەروەهایش بـوو. بەوبۆنـەوە بـەو نازنـاوی

«شەیخولخەوانین» یان دابوو.

لە ئاکامدا عەبدورڕەزاخان لەم تەفرە چوونەی موحەممەدحسەین خان عاسی بوو و لەگەڵ خانەکانی قووچاندا بەرەو قووچان ڕۆیشتن و بەجێگەی ئەوەی کە بچن بۆ مەنزلی موحەممەد حسەین خان رۆیشتن بۆ مەنزلی یەکێک لە رەعیەتەکان بەناو کەربەلایی حەبیبەڵلا موحەممەددووست و دەستووری دا کە موحەممەد حسەین خان بگرن‌وبیبەسن بە کۆڵەکەی حەوشەوە و بە لێدانی دار بە حەسابی بگەن و هۆشیان ببێ کە بەر لە بەداربەستنی لەگەڵ ئەودا ڕووبەڕووی نەکەن. چونکە هەروەک جاران بەزمان‌لووسی خۆی ئەو ڕەزا دەکات. هەروەهایان کرد ولە پاش ئەوەی کە لێدوانێکی باشیان کرد، مەجبوورکرا بە دانی دووهەزار تمەن و سەرۆکایەتی‌خێڵی سیووکانلووی لێ وەرگیردرایەوە ونیعمەتووڵلا بەگ یەکێ لەقەومەکانی تری کرایە جێگری ئەو. هەر لەوسەردەمەی نیعمەتوڵلابەگ بوو کە بەرپرسەکانی بەبۆنەی وەرگرتنی دووهەزار تمەن لە قەومەکانی ژنەکەی (تووبی پوولی) وەرگیرا و بوون بە هۆی دووبەرەکایەتی خەڵکی ئووغاز و ئابڕووچوونی خەلک و دەستەیەکیش گیانیان لە دەست دا وەکوو: یووسفی خالۆم (نووسەر) کەلە بەندیخانەدا گیانی دا .بیگلەر و عیسوویش لە کوژراوەکانی ئەم ڕووداوە بوون.

ئیستە کە زانیمان بەم ڕووداوەی وەرگرتنی ماڵیات و ئاکام و ئاسەوارەکەی، سەرنج بدەینە ئەم بەڵگەی شوجاعوددەولە و موحەممەدحسەین خان:

ماوەتەوە بیست و چوار تمەن لە... هەشت تمەن

لەئەلاشلوودا... لە شاهگدی‌یەکان[٨٢] لەبوانلوو ماوەتەوە لە بوانلوو دووسەد و سی و چوار تمەن.

هەرکاتێ قسەیەکتان بوو بەڵگەکانی ئێوەی هەڵگرتووە و هاتووە ڕوون ببێتەوە، ئەگینا بەڵگەیان نیە بۆ ئەمانەی ماوەتەوە[٨٣].

...نووسراوێکە بە دەست و خەتی عەبدورڕەزاخان شوجاعوددەولە بۆ

---

٨٢- خێلێک لە سیوکانلووەکانی ئووغازی تازە .شاگلدی

٨٣- جێگەی خالەکان مەعلووم نیە.

موحەممـەد ئیـبراهیم خـانی ڕۆشـنی نایبولحکوومـەی شـیروان. نایبولحکوومـەی شیروان لەم ڕێککەوتەوە کاریزەکانیم دا بە ئێـوە کـە ئـاوەدانی بکەنـەوە .ئاوەکـەی بەقەد پانزدە جووت هەڵبگۆزن، دوای ئاوەدان بوونەوە کە فەرەجیش لەگەڵـتانە لـەو کەتـەدا نیـوەی مـڵکەکە هـینی ئێوەیـە ونیـوەی هـینی مـن دەبێـت. (نۆزدەی جەمادیولئەوەڵی سالی ١٣٣٠ شوجاعوددەولە.)

## بەڵگە کانی بلوک گردشی شوجاعوددەوڵە لە ناوچە سنوورییەکانی بیچرانلوو و جریستان و قووشخانە

ئەمیر عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو و حاکمی قووچان لەو سەردانەی بۆ ئیلەکان و کۆچەرەکان و گوندە سنوورییەکانی سـەرووی قووچـان لە ڕەشەمەی سالی ١٣٣٠ی مانگیدا بووی لە نامەیەکدا کە لە ناوچـەی قووشـخانەوە هەناردبووی بۆ موحەممـەد ئیـبراهیم خـانی ڕەوشـەنی نایبولحکوومـەتی شـیروان نووسیویەتی: نارەزایەتی ودڵڕەنجاوی خۆی لەخانەکانی بیچرانلـوو ئـا بـەم چەشـنە دەربڕیووە:

سەبارەت بە نەفامی و بێ عەقلی و نەزانی حەسەن خان[٨٤] کـوڕی خوالێخۆشـبوو حەیدەرخان خودا دەزانێت بەڕادەیەک نەفام و بێ تەربیەت و بێ عەقڵ و نەزانی کـە خزمەتەکەت نایەتە نووسین .بۆ وێنە ئێستە بەیەک وشە بە درۆ بەئێوەیان گوتـووە و دەستبەجێ هەڵخلەتاون وبەلێن بێت کە ڕێویبازی و فریووکاری منداڵـەکانی ئـەوان بۆ خۆیشتان ڕوون دەبێتەوە ئیستە سەرەڕای ئەمانە من بە لەبەرچاوگرتنی نامەکـەی ئێوە لەهەڵەو کۆتاییەکەی ئەوان خۆش دەبم. بەڵام بە گیانی ئێوە دەوڵەت ویستن

٨٤- حەسـەن خـان کـە بـە دەسـتی ڕووسـتوو کـوژرا و پاشـان خـەدوو سـەردار بـە دەسـتووری شوجاعوددەولـە کـەوتـە شـوێنی ڕوسـتوو و قـەلای سـیفکانلووی نێـوان دەوربـادام و حـەمزکانلوو سەربەناوچەی ئووغار کە ڕوستوو لەوێدا نیشتەجێ بووبوو دەوری گرت وئەوێ وێران کـرد. لـە دوای حەسەن خان، کەریم خان بوو بە حاکمی بیچرانلوو کە ئەویش بە دەستی عەلی کوڕی حەسەن خان کوژرا و عەلیش بە دەستی عەلیخان بەگ برای کەریم خان لە سالی ١٣٠١ی هەتاویدا کوژرا.

ئەوەیە کە ئێوە یەک تۆزقاڵیش بەبێ ویستی من هەڵسوکەوت نەکەن. ویستی من ئەوەیە کە ڕەعیەت لە چنگی ئەم گورگە برسییانە یانێ منداڵەکانی ئاغاجانبەیگ ڕزگار بکەم. ئێوەش هەمیسان خێڵەکە بە ئەوان دەسپێرن. (بەڵێ دڵۆڤانی لەگەڵ پڵنگی تێر ستەمێکەو زوڵمێک لەسەر مەڕەکان )

دوای گوتارەکە ڕوو بەڕوو بە خۆتانی دەڵێم کەمن لە توولەسەگی خودادادی شەیتان سفەت چ شتانێک لە دڵمایە .با زۆڵێکی وەکوو ئەو جارێکی تر لە سەر سنووردا بەسەر نەبات.

ڕیزی سیورساتیشمان هەنارد لەسەر ئەم بڕیارە ئەبێ ئامادەبن شوجاعوددەولە ڕەزاخانیش لە نەبوونی ئێوەدا لە کاتی هاتنی من بۆ شیروان لە ١٨ڕۆژ لەمەوپێش یانێ لە دەهومی ڕەشەمەدا مێوانداریيەکی باشی بەجێ هاورد .بەڕاستی کە کوڕی باوکیەتی مەنزڵەکەی منیش کە لە تەنیشتی مەنزڵی کاک یۆسفە.

## نامەی شوجاعوددەوڵە لە ناوچەی سنووری قووشخانەوە بۆ موحەممەد ئیبراهیم خان حوکمی شیروان

زۆربەی سەرۆکە گەورەکان

نامەیەک کە بۆ جەنابی مودیردیوان پێشکار نووسیبووتتان باش لێی تێنەگەیشتم. ئەگەر خودا بیەوێت لەگەڕاندنەوەکەمان بەرەو شیروان بەڵێنی هەموو ئیشەکانی ئێوە ئەدەین. هەرچیەکم هەیە هینی ئێوەیە. بەڕۆحی خوالێخۆشبوو[85] کە لە بابەتی ئێوەوە ئەگەر لەملکی دنیادا غەدرێکم کردبێت نامەردیم کردووە وئەگەر ئێوە ش خەیاڵێک بکەن نائینسانیتان کردووە.

بەڵێ بە پەلە هاتین بۆ ئەم سەفەرە، بڕێک شتی پیویستیان لەبیرچووە. هاوڕێکان بەو بۆنەوە و بەپێی ئەو ڕیزەی کە لەدڵیان دایە کەل و پەلی پێویست

---

85- نازانم مەبەستی خوالێخۆشبوو ئەمیر حسەین خانی ئیلخانی یا خوالێخۆشبوو موحەممەد ناسرخانی ئیلخانی بووبێ.

ئامادەبکەن و بەسوارەکانی بدەن تاکوو دەستبەجێ لەقەلای قازیدا[٨٦] بیگەیەنن بە ئێمە هەر بابەتێک نوێ بێت لەقووچان و شوێنەکانی دیکەوە ڕایبگەیەنن.

شەوی ١٧ی مانگی ڕەبیعەلئەوەڵ لەسەنجەدی[٨٧] خوارەوەوە نووسراوە.

دوێنێ هەواڵ گەیی کەچەند کەس سواری تورک بۆ تالان و کوشتن و بڕین هاتوون. دەستبەجێ شەوانە لەوکاتەدا کەبەفر وەکوو کارەبا لە بێژنگی ئاسمانەوە دەڕژاو بەلام لەسایەی خواوەوە زانیبوویان ئێمەلەوێین دەستبەجێ بەبێ ئەوەی بەمەبەست گەیشتبێتن هەڵهاتبوون. چەند کەسمان بەشوێنیاندا هەناردبوو کە هێشتا نەگەڕاونەتەوە.

لەبابەتی براکەت برادەر قوربان[٨٨] و باوکیەوە دوای هاتنم بۆ شیروان دەنێرم بیانهێنن و لەبەرانبەری خۆتانەوە مەبەستی خۆیان بهێننەوە بۆ هەڵەکەیان و بۆ خۆیشتان ڕوون ببێتەوە جاخۆمان دێین بۆ شیروان .خودا دەزانێ مودیری دیوانیش زیاتر لە ئێوە بۆ رزگاری ئەوان‌تێدەکۆشێ .بەیانی دەچین بۆ قەلای قازی دووشەو لە وێدا دەمێنیەوە و ئەگەر خودا بیەوێت لە ئەوێوە دەچێن بۆ گیخان دووشەویش لە گیخان دەمێنینەوە و بەتەواوەتی سنوورەکان ڕێک‌وپێک دەکەین و قەرەوڵ لەسەر هەموو شوێنی دادەنین و دەگەڕینەوە بۆ شیروان. شەویک میوانی ئێوەین و ئەگەر خودا مەیلی لەسەر بێت بۆ شەوی جەژن لە قووچان دەبین. زۆر سەرتان نەیشێنم. شوجاعوددەولە

---

٨٦- قەلای قازی هالەسەر ڕێگای قرق بە قتلیش و ڕێگای گیفان لەسەرووی بونجووردەوە کەلەو سەردەمدا بەشێک لە خاکی زەعفەرانلوو بون ئەمە جگە لە قەلای قازییەکە لە قەراخی جادەی بونجورد نزیکی قووش قەلایە

٨٧- درووستر لەو سنجقە سنجق یا سنجاق لە زومرەی ناوەکانی دابەشکردن لە ولاتی عوسمانیدایە بەهەر ناوچەیەک یەک سنجق گوتراوە کوردەکانی ئێمە کە لەوێوە بەرەو خوراسان کۆچیان کردووە ئەم ناوانەیان لە دلدا بەکار بردووە نووسەر لە خاکەلێوەی سالی ١٣٤١دا یەک شەو میوانی خەلکی باش و میوانداری سنجق بووم جل و بەرگی ئەوان کوردییە بەلام خۆیان زۆرتریە تورکی وت وێژ دەکەن تا بە کوردی یانێ تورکی بووە بە زمانی یەکەمی ئەوان

٨٨- برات کە نەناسراو

له سواره‌کانی بیچرانلوو ٤٥ کەس نەهاتوون ئەمە ئاکامی ئەو دلۆڤـایەتیەیـە کـە بەحەسەن و رەمەزان کردوومانە کە بـە هـۆی عـورزەو شـەهامتی ئەوانـەوە نیـوەی سـوارەکان نـەهاتوون. ئەگـەر خـودا بیـەوێت دەگـەین بـە خزمـەتیان. خـودی جەعفەرخان لەگەڵ رەمەزانیش هێشتا نەهاتوون.

نامەیەکی تره لە عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەولە بۆ موحەممەد ئیبراهیم خانی رۆشنی لە بابەتی چاوپێکەوتن لەگەڵ سەردار موعزەز شادلووی ئیلخانی بوجنوورد لە سنووری نێوان دووئیالەتی قووچان و بوجنوورد :

لەگەڵ تەلگرافێکی ئاڵمان کەبە راستی موژدەی‌دەویست، گەیشت.

زۆر زۆر پیم خۆش بوو ئەوە مەبەستی منیشە کە ئێوە خۆتان نووسیبووتان بەڵام هـەمووی ڕاسـت و بـەجێگـە نیـە. ئیـشەڵلا ئەمـڕۆ کـە جومعەیـە دەچـین بـۆ گیخان[٨٩] دەمێنینەوە ولە ئەوێوە دێین بۆ شیروان. یەک شەو میوانی ئێوە دەبین. چاوەڕوانیی مـن لەقـەڵای قازیـدا[٩٠] بـە هـۆی تەشـریف هـاوردنی جـەنابی سـەردار موعەزەزە[٩١] کەبڕیاری داوە بۆ چاوپێکەوتن و وتووێژ لە بابەتی نیزامی سـنوورەکانەوە کۆ بوونەوەیەکان ببێت و وەها ئەم کارە ڕێک بخەین کە ئیشەڵلا تێکچوونێک پـێش نەیەتەوە. ئەم چاوپێکەوتنـە قـازانجێکی گـشتی بـۆ تـەواوی میللـەت و خێـڵەکانی

---

٨٩- گیخان لە گوندەکانی باکووری ڕۆژئاوای خاکی زەعفەرانلووی قووچانە کـە لکـاوە بـە سـنووری خاکی شادلووی بوجنوردەوە کەلەگەڵ شەورەویش هاوسنوورە و ئیستەش بەشێک لەبجنووردە.

٩٠- سالاری بەڕێزی ئیلخانی بوجنوورد لە پاش ئـەوەی کـە لـە بەندیخانـەی مـەشـرووتە خـوازی لەبەسەر هاتی دیلکرانی کچەکانی باشکانلوو بە دەستووری موحەممەد عەلیشا ئازاد کرا، گەییشت بە ناز ناوی سەردار موعەزەز و گەڕایەوە بۆ بوجنوورد ئەوەیش کە عـەلی ئـازەری لـە کتـێبی کولونێـل موحەممەد تەقیخانی پسیان نووسیوویەتی کە ئـەم نازنـاوەی قەواموسەڵـتەنە بـە بۆنـەی کوشـتنی کولونێل بە ئەوی داوە. قسەیەک لاژگانە و بێ جێیە .سەرەڕای ئەم بەڵگە ناوبراوە قەواڵەیەکی‌تریش کە هینی یساولباشییە لە دەستدایە کە لەوێدایش پێش لەڕووداوی کوشتنی کولونێل بووە. سـەردار بجنووردی ناز ناوی سەردار موعەزەزی بوو.

٩١- با وەکوو حەوت ساڵ لەمەوپێش لێنـە بێـت کـە تورکـەکان بـێن و ژن و کچەکوردەکان لـەو ناوچەوە بە دیلی ببەن.

زەعفەرانلوو وشادلوودەبێت .

سەدوبیست ساڵ لەگەڵ یەکدا خۆش بین[٩٢]

مەبەست لە زەحمەت ئەوەیە کە ئەمڕۆ بۆ عەلی بەگم[٩٣] نووسیبوو ئەم نامەیەی ئێوە کەگەیی ئەمڕۆی تێکدا. ئەسەدوڵلا بەگی پێشەنگمان نارد قەدەغەی بکەن لە وێ بمێنن وقەد نەجوولێن[٩٤] [لەخودی شیرواندا بمێننەوە]منیش بەیانی دێم بۆ شیروان.

شتێکی تر ئەوەکە سەرەڕای ئەوەی کە خستبوومە ئەستۆیان کە ژێری ئاوی حەوزەکە بکاتەوە تا ئاوەکە بڕوات وبگۆڕدرێت، لە دوای خۆشۆردن بینیم کە ئاویان نەگۆڕیبوو. ڕووبەڕووی ئێوە شتێکم نەگوت ئەوەتە کە ئێستە ئەڵبەت وەکوو ئەو جارە خۆشۆردنە بە درۆنەڵێن ئاوی حەوزەکەمان گۆڕی و نەیگۆڕن. ئێوە خۆتان بنێرن تا ببینن تەواوی ئاویان بگۆڕن و ئاوەکە خاوێن بکەن کە ئیشەڵلا ببێ بە هۆی دەرچوونی ماندوویەتی بیست ڕۆژەی سەفەرەکە.[٩٥]بۆ ئاگاداری ئێوە دەنووسم کە دووشەو میوانی ئێوەم. یەک شەویش میوانی گلیان.[٩٦]لەوێیشەوە بۆئەڵلا ئاوا[٩٧]لەوێوە بە یارمەتی خودا بەبێ‌وەی دەڕۆین بۆ شار[٩٨]

---

٩٢- بە داخەوە تەنیا ڕۆژێ دەوامی بوو هەروەها کەلە بەڵگەی داهاتوودا دەبینرێت و ١١ مانگ دوای ئەمە بۆ وەلیخانی قومانلوو نووسیویەتی کەئەبێ موحەممەد ئیبراهیم خانی سپڵەی سفرە دڕ لەگەڵ خێڵ و تایەفە و لایەنگرەکانی سەرکوت بکەن.

٩٣- لەوانەیە هەر ئەو عەلی ئاغا یا هەر ئەو عەلی تارانیە بێت.

٩٤- مەبەست لە حەرە مسەراکەی شوجاعودەڵەیە کە لە گەڵ ئەودا هاتبوون بۆ شیروان.

٩٥- لە دەقی نامەکەی شوجاعوددەولەدا دەردەکەوێت کە لە دەوری دەهۆمی ڕەشەمەی ساڵی ١٢٩٠ی‌هەتاویدا لە شیروانەوە بۆ ناوچەی سنووری بیچرانلووی‌جیرستان و سنوورەکانی قۆشخانە ڕۆیشتووە و لەو کاتەدا ئەم ناوچە کوێستانیە ساردانەی بۆچی هەڵبژرادووە. ئاخۆ هۆیەکی بووە کە ئێمە لێی بێ ئاگاین؟ چونکوو پیاوی ژیر لەزستان‌دا بەرەو ئەم ناوچانە سەفەر ناکا.

٩٦- گلیان هەر ئەو گوندەیە کەلە باشووری ڕۆژاوای شیرواندایەو لەدواییدا بوو بە پێگەی خەدوو سەردار.

٩٧- ئەڵلائاوا لە سەرووی ڕێگای شیروان بۆ قووچان لە داوێنی خوارووی کێوی کاردایە کە بە دەستی ئەڵلاوێردی خان برای ئەمیرحەسەن خانی شوجاعوددەولە -باوەگەورەی ئەم

شەوی شەممە ٢٦ مانگی ڕەبیعولئەوەڵ، نیشانی شێرو هەتاو
قووچـان، ١٥ی مـانگی سـەفەری ١٣٣١نامـەیـەک بۆحـەزرەت وەلیخـان دەنووسرێت:

گوتەکەی ئێوەم لەگەڵ گوتـەی ڕەعیەتـەکانی[99] میلانلـوو بـینی، دوێنـێ کـە ١٤ی‌مانگی سەفەر بوو، بیست کەس تفەنگچی هەڵبژاردە بەسـەرۆکایەتی پایـەبـەرز مەجیدەت لەگەڵ حەسەن خان نـارد[100](م)ئەڵـبەت بـوون بـە هـاوڕێی ئێـوە. ٤٠ سواری‌ترمان لە جیرستان و بیچرانلوودا ناردووە کە ئەوانیش دەستبەجێ هـاتوون تـا بە ئێوە بگەن تا ئێستا یا هاتوون یا دێن. بێ خەیاڵ بـن کـاتی خزمـەتی ئێوەیـە تـا گەورەییتان مەعلووم بێت. دەستوورەپێویـستەکانیش نێـردراوە بـۆ خێـڵی میلانلـوو، ناردم کـە ئەگـەر لـە قـسەی ئێـوە لایـان دا[101] بـەرەو بوجنـوورد یـان بـەرەو لای موحەممەد ئیبراهیم خانی سفرەدڕی سپـڵە بـڕۆن و تـەواوی ماڵـەکەیان بکـوتن و بیسووتێنن. ڕەمەزان بەگم لەگەڵ نوسرەتوڵلابەگدا هەنارد.

مۆری هیلکەیی ڕەنگی شوجاعوددەولە[102]

هەروەها کە گوترا، موحەممەد ئیبراهیم خانی ڕۆشنی کە تا ئێستا هەمـەکارە و ئازیز ونووری چاوی شوجاعوددەولە بوو ئێستا گیرووەدەی تووڕەیی ئەو بـووەو بووەبـە

---

شوجاعوددەولە- دروست کرا.

٩٨- ئەو سەردەمە بە قووچان شار دەگوترا.

٩٩- مەبەست لە ڕەعیەتەکانی میلانلوو، خەڵکی ئەسفەرایەنە کە کوردەکانی میلانلوون و لەمەوپێش لە ژێر چاوەدێری ئیبراهیم خاندا بوون.

١٠٠- لەوانەیە حەسەنخانی شارکی بێت.

١٠١- گۆیا خەڵکی میلانلوو کە هەر ئەو ئەسفەراینیانە بن لەگەڵ سەردار موعەزەزی ئیلخانی شادلوو و حاکمی بوجنوورد بڕیاری دۆستانەیان دابووکە لە قووچـان جودابنـەوە و بلکـێن بـە بجنـووردەوە. چونکوو عەبدوڕەزاخان مەجبوور بوو سەرانەیەک زۆرتر لەخەڵکی بسێنێت و لەباتی قەرزەکانی خۆی بیداتەوە بە دەوڵەتیەکانی قاجاڕ، بۆ ئەوەی کە خۆی لە حکوومەتی قووچاندا بهێـڵێتەوە. ژیـانی لـە خەڵکی تاڵ کردبوو و ئەوانیش لێیان تاڵ‌تربوون.

١٠٢- ئەم بەڵـگەیەش لەسـەر بەڵـگەکانی ئەرشیـڤی خوالێخۆشـبوو موحەممـەد ئیـبراهیم خـانی ڕۆشنییە.

سفرەدرپوسپڵە. هەر بەو بۆنەوە وەلیخانی بۆ سەرۆکایەتی سوپای خێڵی زەعفەرانلوو ڕاسپارد و موحەممەد ئیبراهیم خانی لەهەموو شت بێ بەش کردووە. وەلیخانی بۆشەڕدژی ئەو نارد بۆ ئەسفەرایەن کەلە شوێنی خۆیدا دەگوترێت.

هەروەها دەستنووسێکی تریش هەیە بەڕێکەوتی ڕەبیعولئەوەڵی ١٣٣٦لە شوجاعوددەولەوە بۆ وەلیخان کە دەقی ئەم بەڵگەیە لەبەرگی سێهەمدا چاپ کراوە.

## حکوومەت و موحەممەد ئیبراهیم خان لە شیرواندا

لە دوای ئەوەی کە کێشەو ناکۆکییەکانی نێوان شوجاعوددەولە و ئیبراهیم خان بەشەڕو هەڵشاخان کێشرا. کوردەکانی زەعفەرانلوو لە قووچاندا شۆڕشیان کرد کە ناوەندی ئەم شۆڕشانە ئەسفەرایەن لە خوارووی ئووغاروە بوو و تا جیابوونەوەی خاکی زەعفەرانلوو و لکاندنی بە شادلوو چووە پێشەوە. بەو بۆنەوە دەوڵەت جارێکیتر شوجاعوددەولەی بێکار کرد و بانگی کرد بۆ تاران. جارێکی تر شوجاعوددەولە لە دوای ماوەیەک دەربەدەری ناعیلاج لە ڕێگای ئەسفەرایەن و دەستگرتن بە ئیبراهیم خانەوە گەڕایەوە بۆ قووچان و بە یارمەتی موحەممەد ئیبراهیم خان دووبارە دەسەڵاتی گرت. کەبە لەبەرچاو گرتنی یامەتییەکانی موحەممەد ئیبراهیم خان جارێکی تر حکوومەتی شیروانی دا بە دە ستیەوە کە دەیبینین.

نیشانی شێر و هەتاو..............

خوراسان و سیستان.ناوچەی قووچان. ژمارە ٣٢٩ ڕێکەوتی ١٧ی موحەڕەمی ١٣٣٤

زانایان، سەییدەکان، تاجیران، کاسبکاران و تەواوی خەڵکی شیروان و لای خوارووی ناوچە بزانن کەوەکوو هەمیشە ئاسایش و هێمنایەتی تەواوی خەڵکی زەعفەرانلوو بە تایبەت لاخوارووی ئەوناوچەیە لە پێش چاو بووە و مەبەستێک بێجگە هێمنایەتی و پشوو و ئاسودەیی ئێوەمان نیە. بۆیە دە بێ سەرۆکێکی خۆش ڕەفتار و ڕووخۆش بۆ شیروان هەڵبژێرین، بەو بۆنەوە موحەممەد ئیبراهیم خان کە هەمە

جۆرە تاقیکردنەوەی خۆی لە خۆشڕوویی لەگەڵ ڕەعیەت پیشان داوە. باش وایە ئەو بێ بە سەرۆکتان ئەبێ ناوبراو لە ڕاوێژی ئێوە نەچووبێتە دەرەوە و لە هەر بابەتێکەوە بە تەواوەتی ئاسوودە و ڕاحەت بن.

عەبدوڕڕەزای زەعفەرانلوو ئیمزاو مۆری کردووە

شوجاعوددەولە[١٠٣] شیروانی بەدەستەوە بووە. سەڕەرای ئەوە حکوومەتی سنوورەکانی قووچان بە تایبەت کووخ و بنیکلوو و میلانلووی ئەسفەراینیش ساڵەها بە ئەستۆی ئەوەوە بووە. [ئەو حوکمانەی کە بە نێوی ئەوەوە نووسراوە لە بەردەستی نووسەردایە.]

**تەلیگرافێکە لە شوجاعوددەولەوە بۆ موحەممەد ئیبراهیم خان حاکمی شیروان**

لەم کاتەدا کە تەشریف دێنن پێوستە خۆم بۆ پێشوازی تا سەبزەوار بڕۆم. لەنەبوونی مندا ئەوکەسەی کە متمانەی هەیە تۆیت ؛کە ئەبێ بە پەلە بکەویتە ڕێ و بێیت بۆ قووچان. هێمنایەتی ئەم ناوچانەم سپارد بەتۆ و خۆم دەستبەجێ دەکەومە ڕێ. هەر بۆ ئەم وتووێژە خۆم ئێستا لە تەلگرافخانەدام چاوەڕێی وەڵامی ئێوەم کە بیروڕای خۆتان بیژن تا بڕیاری ڕاستە قینەمان بۆ حاسڵ بێت. خۆتان بەیانی زوو بە پەلە بێن. (شوجاعوددەولە)

**بێدەسەڵاتکردنی شوجاعوددەولە بۆ چەندمین جار**

هەروا کە ئەزانین عەبدوڕەزاخان کە پیاوێکی بێدەسەڵات بوو، لە ساڵەکانی ١٣٢٠تا ١٣٣٨ کۆچی مانگی پاش ڕشوەیێکی زۆرکە دای حاکمی قووچان بوو.

لوتف عەلی خانی دەرەگەزی لە ڕۆژنامەی بیرەوەری خۆی دا لە شاری مەشهەد لە ساڵی ١٣٣٤ کۆچی مانگی دەنووسێ: ٠٠٠٠ شەوی ڕابردوو لە ماڵی محەممەد مێهدی خان برای فەتحولمەلێک جەلایر بە خۆشی تێپەڕمان کرد... ئەمشەو کە شەوی شەشەمی مانگی زیقەعدەیە بۆ دیتنی شوجاعوددەولە کە لە قووچان بێدەسەلات کراو و ئێستا هاتبوو و ڕۆیشتین بۆ دیداری. لەوەی کە لە

١٠٣- موحەممەد ئیبراهیم خانی ڕۆشنی لە ماوەی ١٤ ساڵ لەقۆناغەکانی جیاوازلەیەک حکوومەتی ئابەم چەشنەبووە.

ماوەی حکوومەتی لە قووچان بۆ بینینمان نەهاتبوو داوای لێبووردنی کرد. وتم لە لێقەومانیش دا دەتوانرێ قەرەبووی ڕابردوو بکەی. بەسەرنج بەوەی کە لوتف عەلی خان لەم ڕۆژانەدا وەکوو جاران لە ئەو پەڕی نەداری و سەختی و بێ پووڵی ژیان دەباتە سەرو ئەو تۆزە پارەیە کە لە دایرەی عەدلیە دەیگرێ بەشی هیچی ناکات. شەو لە خزمەتیان بووم و دوای شام ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ.

لەشوێنێکی دیکە بە دوای چەند ڕۆژێک چۆن کاتی دەقیقی بێدەسەلاتکردنی شوجاعوددەولەی لەبیرنەمابوو دووپاتی دەکاتەوە و دەنووسێ لەدەوروبەری حەوت و هەشتی مانگی زیقەعدە ی ساڵی ١٣٣٤ شوجاعوددەولە ئەمیرعەبدوڕەزاخان لە قووچان بێدەسەلات و بۆ مەشهەد هاتبوو و لە ماڵی تازەی مودیر لەشکەر کە لە پاڵی باخی کۆمەلایەتی بوو جێگر بوون.[١٠٤]

ئەوەندە بە دڵ خۆشم دەوێ کە لە دە ساڵی پێش لە قووچان و مەشهەد و سەفەرە درێژەکەی تاران لە ساڵی ١٣٢٣تا ١٣٣٦ کە لەگەڵ یەکدا بووین و چ ڕۆژگارێکمان بە چاو بینیوە، لە ڕۆژنامەکانی خۆم دا لە خۆم خواردۆتەوە و نووسیوومە ئێستاش دەنووسم کە ئەمساڵ لەسەردەمی حکوومەتی شاهزادە نەیرودەولە[١٠٥] ڕۆیشت.

ساڵی ١٣٣٢ بوو منیش ڕەفێقی ڕۆژانی بێدەسەلاتی شەو و ڕۆژ لەگەڵیا بووم جارێکی کە هەمیسان بە حکوومەتی قووچان گەیشت و بە دەست خەتی خۆی نووسی:

---

١٠٤- ئەم مودیرلەشکەرە لەو گەورە بێ لەشکەر و بێ سەربازانەبووە، چۆن لەو کاتەدا لە خوراسان هیچ لەشکەرێ نەبووە تا پێویستی بە مودیرلەشکەربێت.

١٠٥- شاهزادە سولتان حوسەین میرزا نەیرودەولەی قاجار سێ جار بە حکوومەتی خوراسان گەیشیت و زلم و ستەمێکی زۆری کرد و زەوین و باخاتی نەیشابووری بە زۆر بۆ خۆی لەخەلک وەرگرت لە باسی حەجووخان لەبەرگی سێهەم دا وتمان کەلە بۆنی هەر ئەو ناپیاویانەوە خەلکی نەیشابوور بۆ بەرگیری لەزۆلم و زۆرە لەجەجوو داوای یارمەتیان کرد. جەجوو بۆ نیشابوور هات و نەیرودەولەی موجازات کرد و لە خوراسان دەری کرد ئاخرجاریش لە ساڵی ١٣٣٠تا ١٣٣٤ کۆچی مانگی حکوومەتی کرد و لە ساڵی ١٣٣٤ بوو کە بێدەسەلاتیان کرد و ناسرەدین میرزای قاجار کوڕی مۆزەفەردین شا کە لاوێک بوو بە حکوومەتی خوراسان گەیشت.

دوای ڕۆیشتنم بۆ قووچان هەرمانگ لە لوتف عەلی خان سەر ئەدەم. بەیانی ئەو ڕۆژە تەشریفی برد بۆ قووچان و لەو ماوەدا تەنیا شتێ کە وا لەبیری نەما لوتف عەلی خان بوو. دووبار کاغەزم بۆ نووسی؛ بەلام وەلامی نەداوە، تا ئەوەی کە شاهزادە نەیرودەولە بێ دەسەلات کرا و شاهزادە ناسرەدین میرزا بوو بەجێگری موشاروسسەلتەنە و شوجاعوددەولە[١٠٦] وەکوو هەمیشە بۆ پێشوازی بۆ سەبزەوار ڕۆیشت[١٠٧] و چۆن هەرگێز یەک نەفەر ڕەفێق وەزیری ژیروکارزانی نەبوو پارەیێکی زۆری پێشکەش شاهزادە کرد و دووبارە حکوومەتی قووچانی وەئەستۆگرت.[١٠٨] بەلام پاش دوومانگ دەولەتی ناوەندی کەوتە بیری بێدەسەلاتکردنی ئەعدەلوددەولەی‌برای ڕوکنوددەولە.[١٠٩] دەسەلاتی قووچانی وەبەرکەوت و شوجاعوددەولە لەگەڵ تاقمێک ژن و پیاو دەرباری خۆی بۆ مەشهەد ڕۆیی و من لە خزمەتیان دا بووم.

مەبەست ئەوەیە کە دوای چەند ڕۆژ دووبارە شوجاعوددەولە لەئەرگ زیندان کرا و کەس نەیزانی لەبەرچی دوای ماوەیەک ڕزگار بوو. لەم حاڵ و ئەحواڵەدا ناسرەدین میرزا کە ماوەیێکی کەم دەسەلاتی خوراسانی لە ئەستۆ بوو لە لایەن دەسەلاتی ناوەندییەوە بێدەسەلات کرا واتا بەرواری[١١٠] بێدەسەلات بوونی. ئەگەرچی وتراوە سوالکەر و سولتانی پێکەوە نابن؛ بەلام وادیارە شاهزادە وەزیرێکی زانا و کارزانی

---

١٠٦- پێم وایە موستەشاروسەلتەنە بێت.

١٠٧- لەبەلگەی پێش بە موحەممەد ئیبراهیم خان ئاماژە نەکرابوو.

١٠٨- ئیلخانەکانی پێشووی کورد بە هێزی شمشێر دەسەلاتیان دەگرت و بەلام ئەمجارە ئەمیان ئەبێ هەمووڕۆژ پارە بدات تا چەند ڕۆژێک حکوومەت بکات.

١٠٩- ئەعدەولودەولە برای عەلی‌نەقی میرزای ڕۆکنودەولە و کوڕی موحەممەد تەقی میرزای ڕوکنوددەولە برای ناسرەدین شای قاجاڕبوو.خوراسانیش ماوەیێکی زۆرە کە بووە بە جێگەی لەوەڕی ئەم ڕوکنوددەولانە و نەیرووددەولە و ئاسفودەولانە، لەبەر هەبوونی ئەم دەعبایانە زەرەرێکی زۆری دیوە.

١١٠- لوتفعەلی‌خان کاتی بێدەست کردنی ناسرەددین میرزای لەبیر چوو بوو و جێگاکەی هەروا خالی هێشت. واتا سالی ١٣٣٥ی کۆچی مانگی.

نەبووە و خۆشی یەکەم حکوومەتی بووە و کەسی لە خوراساندا نەئەناسی. بۆیە وردوردە ولاتەکەی شێوا و لە تارانەوە برووسکەیەک سەبارەت بەرۆیشتنی ئەو و هاتنی نایبوسەڵتەنە ـئەمیر کەبیری ـ[111] پێ گەیشت لەهەر شوێنێ لەم جیهانەدا هەر کەسێک لە حکوومەتی ناوەندی و دەسەلاتی ورددا ئەگەر لەگەڵ پیاوێکی کارزان و عاقل ڕاوێژبکات کارەکانی پێش ئەکەوێ.

## وەلامی شکایەتی مامۆستایانی شیروان لە لایەن والی خوراسانەوە

نیشانی شێروخۆر دایرەی برووسکەی دەوڵەتی بەرزی ئێران

لەمەشهەد بۆ شیروان ژمارەی بەڵگە ٨١- ژمارەی برووسکە ٣٤.وەلام مامۆستایانی شیروان. کاتی گەیشتن بەیانی ١٧ی حەمەڵ ـخاکەلێوەی ـ سالی ١٣٣٦مانگی. گیرەندەی برووسکە ئێتلاعولمەلک

مامۆستایان و خەلکی شیروان. گەورەی مامۆستایان موحەممەد ئیبراهیم خان حاکمی شیروان![112] برووسکەی شکایەتی ئێوە سەبارەت بە ئەوەی کە شوجاعوددەولە موحەممەد ئیبراهیم خانی بێدەسەلات کرد و تاج محەممەد خانی بۆ حکوومەتی ئەوێ هەڵبژرادووە گەیشت. چۆن ئەم کارە پێش هاتنی حاکمی خوراسان و سیستان و بێ ئیزنی دەوڵەتی گەورە دراوە بەم بۆنەیە برووسکەیەکمان بۆ حکوومەتی قووچان نارد تا گەیشتنی حکوومەتی گەورە[113] موحەممەد ئیبراهیم

---

١١١- مەبەست کامران میرزا نایبوسەڵتەنەی کوڕی سێهەمی ناسرەدین شایە کە ماوەیێک وەزیری شەڕ، ماوەیێک ئەمیر کەبیرو ماوەیێک حاکمی تاران بووە. لە ئاخری سالی ١٣٣٥ی مانگی بەرانبەر ١٢٩٤ی هەتاوی بە جێ ناسرەدین میرزا بە حکوومەتی خوراسان گەیشت و لەسەرەتای سالی ١٣٣٧دا بێدەسەلات کرا و بۆ تاران بانگیان کرد کە لە سەرەتای سالی ١٣٣٨ی مانگی بە جێگەی ئەو قەواموسەڵتەنە حکوومەتی خوراسانی وەئەستۆ گرت تا بە توانا و سیاسەتی تایبەتی خۆی حکوومەت بگرێتە دەست. لەم جێبەجێ کردنانەدا نزدیک بە یەکساڵ خوراسان بێ حاکم بوو. (وەقایعی مێژوویی خاوەران، سەیید عەلی میرنیا، ل ١٩٦)

١١٢- چۆن عەبدوڕەزاخان شوجاعوددەولە جارێکی تر بە حکوومەتی قووچان گەیشت

١١٣- مەبەست لە ئیالەتی گەورە، ئەحمەد قەواموسەڵتەنەیە.

خان خۆی حاکم بزانێ. ١٧ی حەمەل ژمارەی ٢١٦ مۆزەفەری مۆری گەیشتن برووسکەخانەی شیروان لە محەممەد ئیبراهیم خان ترسی بوو کەنەوەک لە لایەن والی خوراسانەوە ببێ بە ئیلخلانی عەشیرەتی زافەرانلوو بۆیە حکوومەتی شیروانی لێ ئەستاند. لاینگرانی موحەممەد ئیبراهیم خان شکایەتگەلێکیان بۆ والی خوراسان ناردبوو  کە موحەممەد ئیبراهیم خان لەحکوومەتی شیروان بمێنێتەوە و لە هاتنی تاج موحەممەدخانی بادلوو حاکمی تازە کە لە لایەن شوجاعوددەولەوە بۆ حکوومەتی شیروان هەڵبژێردرابوو بەرگیری بکات. لاینگرانی تاج موحەممەد خان و هێزەکانی شوجاعوددەولەیش لە شیروان برووسکەیەکیان بۆ تاران و مەشهەد نووسی و داوای بەرکناری موحەممەد ئیبراهیم خان و جێگربوونی تاج محەممەد خانیان کرد. بەڵام خوداوێردی سەردار کە سەرۆکی سوارانی پێشووی موحەممەد ئیبراهیم خان لە شیروان بوو و زۆریان خۆش دەویست و بۆیە لە هاتنی تاج محەممەد خان بەرگیری کرد. نەسروڵلاخانی برای فەرەجوڵلاخانی شیروانی شووی خۆشکی تاج موحەممەدخان دژ بە دووسەردار هەڵسا و بارودۆخی شیروان ڕۆژلەگەڵ ڕوژ خراپ تربوو.

## دایرەی برووسکە چاندنی دەوڵەتی مەزنی ئێران

لەمەشهەد بۆ شیروان ژمارەی بەڵگە ٩٣ .ژمارەی برووسکە ٤٠.ڕادەی وشەکان ١٠٠.کاتی ناردن ١٨ حەمەڵ.

وەڵامی خەڵکی شیروان: کاتی گەیشتن ١٨ حەمەڵ ساڵی ١٣٣٦ .ناوی وەرگیری برووسکە :مامۆستایانی شیروان.

برووسکەجۆراوجۆرەکانی ئێوە هەرگیز دەوڵەتی لە کاری خۆی پەشیمان نەکردەوە. لەم حاڵەدا نابێ ئێوەیش بێدەسەڵات بن و واژۆی خۆتان بە قازانج یان زەرەری عەمر وزەید لە رووی بێدەرتانیەوە بدەن ئەگەر برووسکەیەک بنێرن و دەوڵەت بزانێ لەڕێ ناچارییەوە بووە ڕەدی ئەکاتەوە. ئێستا کە موحەممەد ئیبراهیم خان جێگری حکوومەتی و تا هاتنی سەرۆکی برووسکەخانە لەسەر پەرەشتی

شیروانە. دوای هاتنی قەواموسەڵتەنەی حاکمی خوراسان و سیستان بارودۆخی ئەو ناوچەیە چاک دەبێت. (ش- حەمەل- ژمارەی ٢٤٤ ی موزەفەری. مۆری گەیشتن بە برووسکەخانەی شیروان[١١٤])

**مانەوەی موحەممەد ئیبراهیم خان لە حکوومەتی شیروان**

لەمەشهەد بۆ شیروان. ژمارەی بەڵگە ٢٦٢ .ژمارەی برووسکە ٥. ڕادەی وشەکان ١٤٠.کاتی ناردن ١٨ ی‌حەمەڵ. کاتی گەیشتن ١٩ ی‌حەمەل. گیرەندە ئیتلاعولمەلێک سەرۆکی برووسکەخانی شیروان.

برووسکەکانی مامۆستایان جێگەی سەر سووڕمانە. ئەگەر مامۆستایان بە زۆر ئەتوانن واژۆ بدەن دەربڕینی ناڕەزایەتی یان ڕەزای خۆیان لەکەسێک. دەوڵەت لە کوێ بزانێ زۆر کردن لە لایەن شوجاعوددەولەو حکوومەتی قووچانە یان لە لایەن موحەممەد ئیبراهیم خان جێگری حکوومەتە یان لە لایەن کەسێکی دیکەوە. هەر بەو بۆنەوە کە دەوڵەت بە واژۆی ئێوە بایەخ نادات و چۆن حکوومەتی قووچان سەربەخۆیە، موحەممەد ئیبراهیم خانیان لابردووە. دەوڵەت بەم کارە ناڕازییە. موحەممەد ئیبراهیم خان دەسەڵاتداری شیروانە ؛تا هاتنی حاکم هەرچێ ئەڵێ ئەبێ بەڕێوە بچێت.

لە کاتی نەبوونی محەممەد ئیبراهیم خان‌دا ئێوە بەرێوەبەری کارەکان بن؛ تا خۆی دێتەوە تاج موحەممەد خان یان نەسرولڵاخانیش ئەگەربیانئەوێ دژایەتی بکەن بەرپرسی ئاژاوەکە خۆیان دەبن. خۆتان ئەم برووسکەیە بنێرن بۆ حکوومەتی قووچان. ١٨حەمەل ــخاکەلێوەــ ژمارە ٢٦٥موزەفەری[١١٥].

---

١١٤- بەڵگەکان لەئەرشیفی موحەممەد ئیبراهیم خان گیراوە.

١١٥- بەڵگەی ئەرشیفی موحەممەد ئیبراهیم.

## برووسکەی مامۆستایان و تاجرەکانی شیروان کە پشتیوانی تاج محەممەدخان بوون بۆ وەزارەتی ناوخۆ

برووسکە لە مامۆستایان و تاجرانی شیروان کە بە پشتیوانی لە تاج موحەممەد خان و دژایەتی لەگەڵ موحەممەد ئیبراهیم خان بۆ وەزارەتی ناوخۆنووسیان و داواکاری ئەوەن کە تاج موحەممەد خان لە حکوومەتی شیروان بمێنێتەوە. ئەڵبەت نەبۆڕەزای خوا و خزمەت بە خەڵکی بێدەسەلات؛ بەڵکوو بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆیان. چۆن لەوەی کە موحەممەد ئیبراهیمخان پیاوێکی خواناس و ڕێکوپێک بووە جێ متمانەیە. لەم کاتەدا بڕێک لە خەڵکی کۆچەر لە خوراساندا مانەوە و بوون بە خاوەنی ماڵ و پارە و مەقام و لە ساویلکەیی کوردان بۆگەیشتن بە ئامانجی خۆیان کەڵکیان وەرگرت و خانەکانیان دا بە گژی یەکدا تا ئەوان خۆیان بە دەستی خۆیان لاواز بن و لە ناوبچن. تاج موحەممەدخانیان کردە دوژمن موحەممەد ئیبراهیم خان و وەلیخانیان کردە دوژمەنی حبیبوڵلاخان ناسرلەشکەر. خانەکانی بیچرانلوو لە بەرانبەر خانەکانی سیوکانلوو و عەشیرەتی شادلوو لە بەرانبەر عەشیرەتی زەعفەرانلوووە ستانە وە. ئەم کایە لە سەردەمی موحەممەد ناسرخان شوجاعوددەولە -دامەرزێنەری قووچان- دەستی پێ کرد کە لە بەرگی سێهەم و چوارەمدا باسی کراوە کە ئێستاش باسی دەکەین بە تایبەت لەسەردەمی دەسەڵاتی ڕەزاشا، بەکرێ گیراوەکانی ئینگلیس ئەم کارەیانە درێژەدا و لە ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکانی ئەو ڕۆژانە پیشان درا و خانە کوردەکانیان دابەگژی یەکدا تا گەیشتنە ئامانجەکەیان و کوردەکان یان بە دەستی خۆیان لەناو چوون یان دەسەڵات لە داریانی دا یا لە زینداناا کوژراون. ئێستا کە لاوانی کورد فێری خوێندەواری بوون و مێژوو چۆنیەتی پێشل کردنی مافی خەڵکی کورد دەهێنێتە بیریان، زەمان وەڵامدەری ئەوانە.

## برووسکەی تالتمێ لەخەڵکی شیروان بۆ تاران

خەڵکی شیروان ئەم سەردەمە لەبەر پرووپاگەندەی پشتیوانانی موحەممەد ئیبراهیم خان و خەدووسەردار لەیەک لاوە و هەروەها پشتیوانانی تاج موحەممەد خان و شوجاعوددەوڵە لە لاییکی دیکەوە بڕێک برووسکەی نالەبار و نارێکیان نووسی و ئیعتباری خۆیان کەم کردەوە ئەم برووسکەیە ئەمەیە:

نیشانی شێروخۆر

دایرەی برووسکەی دەوڵەتی بەرزی ئێران

لە شیروان بۆ تاران. ژمارەی برووسکە ٧ .ژمارەی وشەکان ٣٨٩. کاتی گەیشتن ٢٤ ی حەمەڵ خاکەلێوە ی ساڵی ١٣٣٥[116]

وەزیری پایەبەرزی ناوخۆ

چەند مانگێکە کە حکوومەتی شیروان لە لایەن شوجاعوددەولەوە گەیشتوە بە دەستی موحەممەدئیبراهیم خان و لەم کاتەدا خەدوو بوو بە نایبولحوکوومەی موحەممەد ئیبراهیم خان و لە هیچ زڵم و زۆر و بێناموووسییێک دژ بە خەلک و دزی پووڵ و پارەی ژێردەستەی ڕەش و ڕووت کۆتایی کردووە. سوێند بە هەموو گەوران و شێخان تەنانەت یەک کەس نییە کە لە دەست ئەم هەموو زوڵم و زۆرە پێداویستی بە نانی شەوی نەبێت.[117] ئەگەر موفەتشێک بنێرن ڕوون دەبێتەوە کە زوڵم کردن بەڕەعیەت چەند زۆرە و ئێستا لەچ حالێکدان.

تا ئەوەی کە شوجاعوددەولە بە چاکی بارودۆخی ئەم خەلکە دەزانێ و موحەممەد ئیبراهیم خانی لابرد و تاج موحەممەد خان کوڕیخوالێخۆش بووی وەلیخانی میرپەنچە کە یەکێ لە خانەکانی بەڕێز و لە بنەماڵەیێکی بەنرخ دەسەلاتی

---

١١٦- ساڵی ١٣٣٦دروستترە. کاتێ ١٣٣٥ لەسەر نامەکانی ئەم ساڵە بە چاپ گەیشتووە و بۆ ساڵانی داهاتوویش کەلکیان لێ وەرگرتووە.

١١٧- وادیارە کە خەدوو یا موحەممەد ئیبراهیم خان بووبە هۆی چارەرەشی خەلک و ئێستا تاجموحەممەد خان و پشتیوانەکانی دەیانهەوێ خەلکی خۆش بەخت بکەن .ئەم قسانە زۆرتر وەکوو پرووپاگەندەی بێ دەسەلاتی نوێنەرانی پارلەمانە.

پێی درا. پێش لە هاتنی ئەو، خەدوو بە پەنجا شەست کەس لە سوارەکانی کە لە شیروان بوون یەک دوودانە برووسکەی بە زۆر لە لایەن ئاقاڵی وەک نوێنەری خوراسان و حکوومەتی قووچان ڕەوانە کرا. حکوومەتی پایەبەرز چۆنکێ لەم کارانە خەبەرێکی نەبوو و وەلامی نەداوە بەلام نوێنەر کە هەواڵی لەم کارانە نەبوو برووسکەیێکی نارد بەو شێوەی کە تا هاتنی حاکم حکوومەتی شیروان بە دەستی موحەممەد ئیبراهیم خانەوە بێت. بۆیە تکاتان لێ دەکەین ئەگەر تاج موحەممەد خان لە شیروانە. بکەوێتە ڕێ وئەگەر دووبارە حکوومەت بە دەستی موحەممەد ئیبراهیم‌خانەوە بێت، ئیتر نابینە خاوەنی گیان و ناموسی خۆمان و ئەبێ دەست لە وڵاتمان هەڵبگرین و بەرەو شوێنێکی دیکە بڕۆین. لەبەر ڕەزای خوا و ئەم خەڵکە چارەڕەشانە و بێدەسەلاتانە کە بە هەزار جۆر لە دەست خەدیوو ڕزگاریمان بوو هەمیسان خەدوو مەکەن بەتووشمانەوە.

حاجی میرزا موحەممەد موجتەهێد، حاجی قەواموسادات، شێخ عەبدولغەفوور موجتەهێد، حاج عەبدولغەفوور موجتەهێد، حاج عەبدوڕڕەسووڵ بەرنوێژیکەر، وەکیلوڕوعایا، حاج موختار، حاج قەنبەر، حاج عەلی ڕەزا، حاج موحەممەد، حاج حوسەین عەلی، سادق، کاک سلێمان تاجر، حاج حوسەین عەلی، عەلی دەربان، حاج گوڵ موحەممەد، ڕەجەب عەلی، کاک عەلی تاجر، کاک تەقی ئەسکەندەر، حاجی موحەممەد ئیسماعیل، حاج ئیبراهیم، حاجی مەهدی، حاجی عەلی، موحەممەد حەبیب عەتار.[١١٨]

**برووسکەی وەزیری ناوخۆ بۆ شوجاعوددەولە سەبارەت بە مانەوەی موحەممەد ئیبراهیم خان لە حکوومەتی شیروان**

دەوڵەتی بەرزی ئێران نیشانی شێروخۆر وەزارەتی ناوخۆ!

برووسکە لە تاران بۆ قووچان. ٢ ی ڕەجەب ٢٤ حەمەل ١٣٣٦ ژمارەی ٤ ژمارەی نووسراوە٢٧٥.

بەڕێز شوجاعوددەولە حاکمی قووچان!

١١٨- بەڵگەکانی ناوەندی بەڵگەی ئێران.

برووسکە بە ڕەمزی ژمارەی ٣ەوە گەیشت هەروا دوو وشـەی نـەخوێنراوە. ئـەم برووسکەیە پیشاندەری گەورەیتیانە کەچەند ڕۆژە ڕێ کـەوتووە و بـەم زوانـە ئەگاتـە خوراسان. پێویستە بچنە لای خـۆی .هـەر جـۆرێ بـە چـاکی بزانـێ کـار دەکـات. واژۆی وەزیری ناوخۆ[119]

**برووسکەی وەزیری ناوخۆ لە وەلامی خەڵکی شیروان و هاتنی قەوامسەڵتەنە بۆ خوراسان**

دەوڵەتی پایەبەرزی ئێران نیشانی شێروخۆر

برووسکە لە وەزارەتی نـاوخۆ تـاران بـۆ شـیروان، ٢٧ی‌حەمـەل ـخاکـەلێوەـ ٥ی‌ڕەجەب ١٣٣٦.ژمارەی نووسراوە ٢٨١-١٥٥٦کارتین ٦ دۆسیە وەلامی ژمارە٧

برووسکەی ئێوە گەیشت و ئەوڕاقەیە کەسەبارەت بە دەسەڵاتداری شـیروان‌بـوو نووسیتان. ئاگادار بوینەوە بەرێز قەوام سەڵتەنەی حاکمی خوراسان بـەم زوانـە دێتـە سەبزەوار. پێویستە ئەم هەواڵەی پێ بدەن، خۆی کاری خـۆی بـە چـاکی دەزانـێ. واژۆی وەزیری ناوخۆ[120]

برووسکەی گەورەپیاوی بجنوورد عەزیزوڵلاخانی شادلووی ئیلخـانی و حـاکمی بجنوورد بۆ وەزارەتی ناوخۆ سەبارەت بە گێچەڵی سنووری لەگەڵ شوجاعوددەولەی ئیلخانی قووچان.

نشانەی شێروخۆر

دایـرەی برووسـکەی دەولـەتی بـەرزی ئێـران .٤ ی‌جـۆزردان ١٢٩٦هـەتاوی برووسکە لە بجنوورد بۆ تاران. ژمـارەی بەڵـگە٤٣. ژمـارەی برووسـکە ٤ ئـەژمارەی وشــەکان ١٨٤.کــاتی نــاردنی برووســکەخانەی بجنــوورد شــەوی ٤ جــەوزا. ناوی گیرەندە غولامڕەزا.

سەرۆکی پایەبەرزی وەزارەتی ناخۆ: سـەبارەت بـە کـوژرانی کەربـەلایی عـەلی

١١٩- بەڵگەی ناوەندی بەڵگەکانی نەتەوەیی ئێران

١٢٠- بەڵگەکانی ناوەندی بەڵگەکانی نەتەوەی ئێران.

موحەممەد بەیگ سەرۆکی سوارەی کەیکانلوو سەربڕینی...... وشەیێک نەخوێنراوە. دەکەس لە سواران لەگەڵ ناوبراو ـخەڵکی کەلاتەـ لە ژمارەی ٨١ و ژمارەی ٢٠٢کە بە سەرۆکایەتی کەریم خان نوێنەری قووشخانە لە کاتی سەیرانی شوجاعوددەولەدا ڕووی دا ئەو وەزارەتخانەمان ئاگادار کرد چۆن لە شەڕاشۆیی ئەوان بەرگیریان نەکردووە و بێ ترس خەریکی دزی و تالانی قەلاکانی بجنووردن. هەر ئەوکەریم خانە ناسراو بە عەلی بەیگ کوڕی حەیدەرخان سەرۆکی عەشیرەتی بیچرانلوو قەلاکانی سنووری خەتاب و سەردار ئاوایان بە تەواوی تالان کرد و نزیک بە دوو هەزار مەڕ لەخەتاب و چوارشوێنی وەلاتانی دیکەیشیان تالان کردووە. ئەم هەواڵەمان گەیاندە گوێ حکوومەت تا مافی ئەم خەڵکە هەژار و بەش خوراوە لە ناو نەچێ. (ژمارەی ٣٧ عەزیزوڵلا)

## وەڵامی وەزیری ناو خۆ بە شکایەتی ئیلخانی شادلوو

دەوڵەتی بەرزی ئێران .نیشانی شێروخۆر .وەزارەتی ناوخۆ برووسکە لە تاران بۆمەشهەد .کات ٩ ی جۆزەدان ١٩٠ ی شەعبان ١٣٣٦ مانگی بەرانبەر بە ١٢٩٦هەتاوی. ئەیالەتی خوراسان و سیستان ماوەیەک لەمەوپێش کەربەلایی عەلی موحەممەدی[١٢١] شادلوو بۆ شکایەت بۆ تاران ڕۆیشت. کاتی بۆ سەیران ڕۆیشتنی شوجاعوددەولە، باوکی ناوبراو کە لە لایەن سەردار موعەزەزەوە سەرۆکی دەکەس بوو لەگەڵ سوارەکان خۆی بۆ پاراستنی ڕێ بۆ کەلاتەی قتلیش ڕۆیشت بوو، لە گەڕانەوەی کەریم خان[١٢٢] لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی و هەروەها شوجاعوددەولە بەرەو ئەوان لە کەلاتەی قتلیش[١٢٣] و بێ ئەوەی کەس بزانێ تیریان تەقاند و باوکیان کوشتوە و ٨ سەر ئەسب وده تفەنگ و دانەی پێنج تیرو چوار دانە ورندلی بەرزی

١٢١- عەلی موحەممەد کەیکانلوو کە لە عەشیرەتی زەعفەرانلوو بووچووە دەستەی شادلووەکان.

١٢٢- کەریم خان سەرۆکی عەشیرەتی ڕەشوانلوو لە قووشخانە.

١٢٣- قتلیش لە دێهاتەکانی زەعفەرانلوو هاوسنوورەلەگەڵ شادلوو. سەرداری گەورەی ئیلخانی شادلوو دەیەویست بیکا بە خاکی بجنوورد و هەر بەم بۆنەوە شەڕوئاژاوە پێش هات.

سوارەکانیان بردووە و ماڵ و دارایی خەڵکی کەلاتەیان تالان کرد. بۆیە داوا کرا لە شوجاعوددەولە تا کوو کەریمخان ڕەوانەی مەشهەد بکات ولە دادگادا دادگایی بکرێت.

ڕاڤەیەکیش لە نامەی ژمارە ٥١٠١ سەرۆک حکوومەتی خوراسان نووسراوە. .......چەند وشەی ناخوێنراوە کە دوای هاتنی هەر دوولا بۆ دادگایان بنێرن. ئێستاش برووسکەیەک لەسەرداری گەورە کە دەقەکەی پێشکەس کرا و چەند وشەی نەخوێنراوە سەرەتا سەبارەت بە کوژران. هەر واکە ئێستا کەریم خان بۆدادگا نەهاتووە فەرمان بدەن لەمەشهەد زوو لەگەڵ بنەماڵەی عەلی موحەممەبەیگ بێت بۆ دادگاه و لەوێ هەر حوکمێ درا بەڕێوە بچێ. پاشان سەبارەت بە دزی و تالانێ کە سەردار موعەزەز ئەڵێ تازە رووی داوە و ئەگەر پێش هاتووە ماڵە دزییەکان هەڵگرێت و بیباتەوە بۆ خاوەنەکانیان و ئاکامی کارەکە ڕابگەیەنن بە وزارەتی ناوخۆ واژۆی وەزیری ناوخۆ لە ژێرەوەی نووسراوەکانی سەرەوە کە وادیارە بەختەتی وەزیری ناوخۆ نووسراوە وئەوە دەسەلمێنێ مەبەست ئاگادار کردنەوەی قەواموسەڵتەنەیە. ئەم نووسراوانە لە لایەن وەزیری ناوخۆ و بە زمانێکی زۆر چاک و بە ڕێز و حورمەتەوە و هەروەها بایەخ بە خۆنەدانی وەزیری ناوخۆ بۆ والی خوراسان نووسراوە و پیشاندەری پلەو پایە و هێز و قودرەتی قەواموسەڵتەنەیە کە پێش تر خۆی وەزیری ناوخۆ بووە.

## دروست کردنی یەکەمین نانەوایی لە قووچان بە فەرمانی شوجاعوددەولە لە بەروشکە سالی لە ١٣٣٦دا

سالی ١٣٢٠دەبێ بۆ خەڵکی خوراسان چاوان پڕ لە گریان بن. لەسەردەمی حکوومەتی قاجارەکان لە ئێراندا کەلەبەر نالایەقی پاشا و دەرباریەکان هەموو کات خەڵکی لە ئەو پەڕی چارەڕەشی دا ئەژین، بێجگەئەوەش لەبەر نەبارینی باران کولە و وشکە سالی ناوچەی وەبەرگرت و زۆربەی خەڵکی لەبرسان مردن. کەلەو وشکە سالیانە دەتوانین ئاماژە بکەین بە سالی ١٣٨٨ مانگی و ١٣٢٠مانگی و ١٣٢٦و ١٣٣٨

مانگی. دەڵێن لە وشکەساڵیەدواییەکەدا گـەنم دانـەی قـەرانێ کـە ئـەزانین یـەک قەرانی ئەو سـەردەمە هەزارتمـەنی ئێـستا بـووە. خەڵـک لەبـەر ئـەم وشکەساڵـیە شێعرێکیان وتووە:

ئەی ساڵ یاخوا نەیتەوە تا سەد ساڵیتر

پیاوت لە پیاوەتی خست و ژنەکاند شڵەژاند

ئەی ساڵ یا خوانەیتەوە

....................

لەگەڵ هاتنی قەواموسەڵتەنە بۆ خوراسان وشکەساڵـیێکی قاقڕ ئـەم وەڵاتـەی داگیر کردبوو بە جۆرێ کە لە قووچان وخوراسـان نـان بـۆ هـەمووی خەڵـک دەس نەئەکەوت و هەژاران و ئەوانەی کە فەلانەبوون لەسـەختی و بـێچارەییدا ئـەژیان. ئەوکاتە هەرکەس کە هەژار نەبوو لەسەر خەرمان دا گەنم و جـۆی پێویـستی خـۆی جۆردەکرد. لەهەمووی ماڵەکاندا تەنوورێک بوو تا ژنـەکان لـە ماڵـەوە نـان درۆسـت کەن و بەو بۆنەوە وشکە ساڵی زۆری بۆیان نەئـەهانی. بـەڵام زۆربـەی خەڵـکی بـێ دەسەڵات و کەم دەس نەیانئەتوانی شتێ ساز کەن هەر بەم بۆنەوە عەبـدوڕڕەزاخان شوجاعوددەوڵە کەوتە بیروراوێژ و فەرمانی دا تا نانواخانەیێک لەقووچاندا درۆست کرا و هەرچێ ڕۆژە نانی بۆ خەڵـک درۆسـت دەکـرد و دەفرۆشـرا. شوجاعوددەوڵـە بـۆ وەدەست هێنانی گەنم و ئاردی نانواخانە خۆی ئەڕۆشتە دێهاتـەکان و ئەوانـەی کـە گەنمی زۆرتریان لە ماڵەوە بوو مەجبووریانی ئـەکرد کـە گەنمـە زیادییـەکانیان بـە خەڵک بفرۆشن. بەم جۆرە ئاردوگەنمی بۆ قووچان ئەنارد و توانی جـەماوەرێکی زۆر لەمەرگ ڕزگار بکات .شوجاعوددەوڵـە هـەر بـەم بۆنـەوە لـە ناوچـەکانی بـیرک و باشمەحەلەبوو کە برووسکەیەک لەقەواموسەڵتەنەی والی نوێ شاهروود گەیشت کە لـە شوجاعوددەوڵـە داخـوازی کردبـوو بـۆ پێـشوازی بڕواتـە سـەبزەوار؛ بـەڵام شوجاعوددەوڵە خەریکی بەدەس هێنانی نان و خواردەمەنی بـۆ خەڵـک بـوو لەبـەر ئەوەی نەیئەتوانی بۆ پێشوازی بڕوات و برووسکەکەی قەوامی وەڵام دایەوە و گـوتی لەبەر ئەم گرفتانە ناتوانم بێم بۆ سەبزەوار و لە مەشهەد دەگەمە خزمەتتان. هەر ئـەم

برووسکەیە بەهانەی دا بەدەس ڕییسوتوججارەوە تا دژ بە شوجاعوددەوڵە بووەستێ تا قەوام لێ تووڕە بێت و ببێ بە هۆی لە ناوچوونی شوجاعوددەولە.[سەبارەت بە دژایەتی ماڵی ڕەئیسوتوجار و شوجاعوددەوڵە پێشتر باسی کرا.] بەڵگەیەک هەیە لە عەبدوررزەاخانی شوجاعوددەوڵە بۆ وەلی قەهرەمانلوو کە لەم سەردەمەدا تەنیا کەسێک بوو کە شوجاعوددەوڵە متمانەی پێی بوو.[ سەبارەت بە وەلی خان لە بەرگی داهاتوودا زۆرتر باسی لەسەر ئەکرێت کە پیاوێکی دلێری سەردەمی خۆی بوو].

هۆ[124]

ئێوە ڕۆیشتن پەنجا تمەن بنێرن هەمووی بڕیارەکانی ئێوە بەم جۆرەیە نازانم بۆچی خەڵکی سەرحەد[125] وەهان. بەڵگە بەپارە نازانن، بڕیار ئەدەن و لە بڕیاردا بێ وەفایی ئەکەن. بێ هیچ بەهانەیەک پەنجا تمەنمان بۆ بنێرن ئەبێ بدرێتەوە.

٢٩ ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٣٦ عەبدورڕەزای زەعفەرانلوو

---

١٢٤- لەسەردەمی موحەممەد ناسرخان شوجاعوددەوڵە مەسلەکی دەروێشانی زەهیر سولتانی لە نێوان کوردەکانی قووچان باو بووە و هەر بەم بۆنەوە لەسەر هەمووی نامەکانی و حوکمی خانەکانی قووچان وشەی« هۆ» دەبینرێ.

١٢٥- نازانم بۆچی وەلیغانیان بەسەر حەدی زانیوە لە حالێکدا کە ناوچەی وەلیخان کۆساری شاهیجان و کێوە باکوورییەکانی ئەوێیە کەلە بەشی ناوەندی قووچانە ئەگەر پێمان وابێ کە حکوومەتی وەلیغان تا خومارتاش ڕۆیشتووە، هەمیسان ناتوانین پێ بڵێن سەرحەدی ناوچەی قووچان لەباکوورەوە تاباشوور سێ بەشە شاهبهانی جولگەیی سەرحەدی شاهبهانی قەرامانلوو بوون، جولگەلووکان فەقیر و هەژار بوون کە قودرەتێکی ڕەزمیان بووە ئاژەڵداریش نەبوون و تۆزێ کشت و کاڵیان بووە هەژارانەیان بەڵام سەرحەدیەکان واتا عەشیرەی کەیکانلوو کەسەرانسەر ناوچە سنووریەکانی قووچان و خوارەزمی ڕووسییەی ئێستای داگیر کردبوو و لە دلێرترین و بەهێزترین کوردانی خوراسان بوون کە هەربەم بۆنەوە لەسنووردا جێگربوون و بەسەرحەدی ناوبانگیان دەرکردووە.

## ئەو برووسکانەی کە لە سەر بەسەرهاتی سنووری باجگیران گەیشتە دەستی سوڵتان بەگ

ساڵی ١٣٣٦ ی مانگی بەرانبەر بە١٢٩٦ و١٢٩٧ ی هەتاوی لەگەڵ هاتنی قەواموسەڵتەنە بۆ خوراسان ساڵێکی زۆر سەخت بوو بۆ شوجاعوددەولە و سوڵتان بەگ. ڕووسەکانیش لە باجگیران شۆڕشیان دەکرد. سوڵتان بەگ بێ گومان پیاوێکی دلێرو وەتەن پەرەستی کرمانجە کە لە دژایەتی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان و شاموحەممەدی نوێنەردا بە جوانی خۆی پیشاندا. ڕێز و سوپاسی شوجاعوددەولە و قەواموسەڵتەنەی سەرۆک وەزیری ئەوکاتە و بەرپرسانی تر لە ئەو پیشاندەری دلێری و توانایی ئەوە. بە وتەی موحەممەد ئیبراهیمخان ڕەوشەنی موزەفەروسەڵتەنە لەشەڕی کوردەکانی قووچان لەگەڵ کلۆنێل موحەممەد تەقی پسیان دا ئەگەر خودی سوڵتان بەگ نەبوایێ بێ شک کوردەکان شکەستیان ئەخوارد. تەنانەت لە دوایین چرکەکاندا وەلیخانی قەرامانلوو کە لە دلێری و بێ باکیدا ناوێکی بەرزی بوو ویستی پاشەکشێ بکات [لە بەرگی پێنجەم دا باسی دەکرێت] ئێستا بڕێک لەو برووسکانە کە لە بەسەرهاتی باجگیران لە ساڵی ١٢٩٦و١٢٩٧ هەتاوی واتا کاتێ کە ڕووسەکان لەباجیگرانەوە هێرشیان هێنابوو و شاموحەممەد یان کردبووە بەردی بەرپەڵ و هەروەها کارەساتێکی دیکەی ناوچەکە بۆ خوێنەرانی بەڕێز باسی ئەکرێت.

## پشتگیری سوڵتان بەگ کەیکانلوو لە هەتیوان و بێ دەسەلاتان

هەروا کەسوڵتان بەگ کەیکانلوو لەشەڕدا سەربازێکی تووڕە و دلێرە هەربەو ڕادەیە لەگەڵ هەتیوان و بێدەسەلاتانیشدا بەڕەحم و بەزە بوو. هەمووی ئەوکەسانە کە سوڵتان بەگیان بینیوە بەچاکی ناویان بردووە لەو ساڵانە کە وشکە ساڵی زۆربەی خەڵکی تا دەمی مەرگ بردبوو سوڵتان بەگ لەباجگیراندا یەکێ لەماڵەکانی وەقفی خەڵکی برسی و هەژار بوو. هەر لە نێوان هەژارەکاندا کێبەرکێ ڕێ ئەخست وەکوو زۆران و ڕاکردن و پەڕین وهەروەها هەڵپەڕکێ و گۆرانی و مۆسیقا. هەموو کەسیش

لەپیرو جوان وشـەل و کـوێر دەبـوای بەشـداری بکردبـای و هەرکـەس دەیـبردەوە جلوبەرگ و خواردەمەنی پێ ئەدرا. سولّتان بەگ جومعە دەچوو بۆ قورئان خوێندن و دوعـا و ڕۆژەکانیـشی بەهەڵـپەرکێ و فەرتەنـەو گـۆرانی و زۆران تێپـەر ئـەکرد. دەوڵەمەندانی باجگیری کۆ ئەکردەوە و بـۆ پـشتیوانی لـە هـەژاران داوای یارمـەتی لێیان ئەکرد. سولّتان بەیگ هەم لە ناو خەڵکی بێدەسەلات و هەژار و هـەم لـە نـاو دەوڵەمەندەکاندا خۆشەویست بـوو. هەمیـشە دەسـەلاتدارەکانی بـۆ پـشتیوانی لـە هەژاران هان ئەدا و درگای ماڵی بۆ هەمووی خەڵک ئـاوەلا بـوو. بـەدوای دەسـتگیر بوونی شوجاعوددەولە خۆشەویستی سولّتان بەیگ لەناو خەڵک، دەوڵەتی ترسـاند و هەر لەبەر ئەوە داوایان لێ کرد تـاکوو هێـرش نەباتـە سـەر ئـەنبارەکانی دەوڵـەت و گومرۆکی باجگیران و بە جێگای ئەو دەولەت بڕیاری دا کـە هـەر سـاڵ ١٢ خـەروار گەنم و تاج موحەممەد خان بەرپرسی دەسەلاتی قووچان ٧ خەروار گـەنم بـۆ ئـەو چێشتخانەیە بنێرن. سولّتان بـەیگ دواتـر بـۆ قووچـان هـات و لـەوێ نانەواخانـەی درۆسـت کـرد و لـە هـەژاران سەرپەرەسـتی ئـەکرد و تـا دوا هەناسـەی لەگـەڵ فەرمانداری و شارەوانی و شێروخۆری ئەو سـەردەمەدا ئـەم کـارە چاکەیـە درێـژەدا بەجێیە ئەگەر شارەوانی قووچان لەبەر ڕێزو حورمەت بۆ ئەو هـەموو کـارە چاکـە لـە سولّتان بەیگ ناوی ئەو نانەواخانەیە کە سولّتان بەگ بنیاتی نابوو بـە نـاوی سولّـتان بەگەوە بێت.

### لە قووچان بۆ باجگیران

ژمـارەی ١٢- ژمـارەی وشـەکان ٨٥ کـات ١٣ی مـانگی حەمـەل[١٢٦] (خاکەلێوە)یونت ئیل سالی ١٣٣٨ موعتەمێدولحەزرەت سولّتان بەیگ.

سوارەکانی تاج موحەممەد خان بەهادوری دوورن و بـەم زوانـە دەس ناکـەون. برووسکەمان نارد بۆ موحەممەد حوسێن خـان[١٢٧] و ئەلـلانەزەروداراب خـان و عـەلی

---

١٢٦- خاکەلێوەی ١٢٩٦

١٢٧- موحەممەد حوسێن خانی ئووغـازی و ئەلـلانەزەری جریـستانی و دوونەفـەری دیکـەش کـە

خان تا لەگەڵ سوارەکانیان بێن و دژ بە تورکمانەکان بووەستن[١٢٨] وشۆڕشیەکان ٥٠٠تیری ئەنباری و عوسمانیان بۆتان ناردووە تا بە ئەو پەڕی هێزەوە دژی شۆڕشیەکان ببنەوە و ئاگاداری دایرەکان بن و هەروەها ئەو تورکمانانەی کە گرتووتانە خێرا ڕەوانەی قووچانیان بکەن حەمل ژمارەی ١٧ شوجاعوددەولە

*********

ژمارەی ٨ی دەولەتی ١٣٣وشە بورجی حەمەلی[١٢٩] یونت ئیلی ١٣٣٦

سولتان موحەممەد بەیگ نایبولحوکوومەی باجگیران

بە ئەو و هەواڵەی کە گەیشتووتە دەستمان شاموحەممەد[١٣٠] و تاقمێک لە تورکەکانی قەرەداخ لە ناکاو هاتوونەتە باجگیران و لەگەڵ ئێوە وسوارەکانتان خەریکی شەڕکردنن و ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە ئێوە و سوارەکانتان بە ئەو پەڕی پاڵەوانی و گورج و گۆڵیەوە وەدووی شەڕاشۆکان کەوتوون و بوونە هۆی هەلاتنی ئەوان.برووسکەمان هەنارد بۆ حکوومەت تاخێرایارمەتیتان بکەن ؛بە تایبەت ئەوا دەنووسم کەهەنگاوەکانتان زۆر جێگای ڕێزگرتن و پیرۆز بایی هەیە و بە ئەو پەڕی هێزەوە شەڕاشۆکانتان هەلکەندووە و دڵنیابن و بزانن کە خزمەتەکانتان لە لای ناوچەوە پۆشراونیە ودەگەیندرێتە گوێ کاربە دەستانی گەورەی دەولەت و خزمەتەکانی ئێوە لەبیر نابەن بەداکۆکیەوە بەرهەمی کارەکانی خۆتانیش بەبێ وەستان بۆمان بنێرن.

*********

١٣ی حەمەل –ژمارەی ١٢٨– موزەففەری.[١٣١]

---

خەلکی جریستانن.

١٢٨– تورکمانەکان لە قووشخانە و جریستانەوە هێرشیان ئەکردە باجگیران.

١٢٩– بەرانبەر بە نەورۆزی ١٢٩٨سالی ئەسپ یان بەرانبەر بە خاکەلێوەی ١٢٩٨ سالی ئەسپ.

١٣٠– مەبەست هەر ئەو شاموحەممەدەی کوڕی کەربەلایی تەیموورەیە کە ناسراو بەشامۆ.

١٣١– موزەففەری سەرپەلی لەشکەری خوراسان بوو. هەرچەن کەلەم لەشکەرە لە ئەم ناوچەدا ناوونیشانێک نەبوو. بەلام سەرپەلێکی بوو کە برووسکەکان و فەرمانەکان بەر لە هاتنی قەواموسەلتەنە بۆ خوراسان بە ئیمزای ئەو دەگەیشت.

لەمەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران

حوزووریە ١٥ی بورجی حەمەلی یونت ئیلی ساڵی ١٣٣٦[١٣٢] (١٣٣٨درۆسە)

باجگیران: مۆعتەمێدوسوڵتان، سوڵتان بەیگی نایبولحوکوومەی باجگیران.

لە پیاوەتی و پاڵەوانی ئێوە هەموومان شادین. ئافەرین بۆ ئێوە بەڕاستی کە دەوڵەت بە پاڵەوانەکانی وەکوو ئێوە شانازی دەکات. خزمەتەکانی ئێوە بە گەورەکانی دەوڵەت گەیشتووە و دەگەیندرێت. چاوەڕوانم کەبە ئەوپەڕی هێزەوە شاموحەمەدیش لە ناوببەن. ئاغەی کاربەڕێوەبەریش تەشریفی هاوردووە. وشەیەک نەماوە پێویست بۆ بەرگری لە تورکەکان هەنگاو هەڵگرن. گەورەکانی ناوچەکان لە تاقمێک لەبرووسکەکاندا باس لە زەرەرەکانی گومرۆک دەکەن؛ بەڵام شوکر بۆ خوا لە برووسکەی ئێوەدا نەبوو زۆر دڵوەدوام. بە تەواوی ئاگاداریان کەن.

چاوەڕوانم بەهەر چەشنێک بەم ڕووداوانە دوایی بێنن. شوکر بۆ خوا عێشقئاوایش نزیکە. ئاغەی کاربەڕێوەبەریش لە دەوڵەتخواهیدا زۆر بە ناوبانگە. هەموو جۆرەکارێک بۆ بەرگری لە هاوڕێی تورکەکان دەکات. لەگەڵ ئاغەی شوجاعوددەولەیش بە یەک گەیشتنی تەواومان بوو. هەموو جۆرێک لە گەڵتان هاوکاری دەکات. سەبارەت بە تۆپ کە ویستبووتان بەڕاستی نازانم پێویست هەیە یان نە، ئاواتەخوازم تا ئەم ڕادە پێویستی نەبێ.

مۆری وەرگرتن بروسکەخانەی باجگیران

*********

لەمەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران

١٦ی بورجی حەمەلی[١٣٣] یونت ئیل، ساڵی ١٣٣٦ (١٣٣٨درۆسە)

نایبولحکوومە دووپاتی دەکاتەوە. کارەکانی ئێوە هۆی ڕێزلێنانن. داکۆکی دەکەم بیپارێزن. تەواوی زەرەرەکان قەرەبووی دەکرێت و ڕێزی لێدەگرێت. ئەو پێشنیارانەی کە پێویست بوو بە پەلە بە دارودەستەی دەوڵەت گەیشت. هەر بە

---

١٣٢- بەرانبەر بە ١٥ی خاکەلێوەی ١٢٩٨ساڵی ئەسپ.

١٣٣- بەرانبەر بە ١٦ی خاکەلێوەی ١٢٩٨ساڵی ئەسپ.

گەیشتنی ولامەکە کار دەس پێ دەکرێت. بۆ ئێوە پێوەندیتان لەگەڵ بەڕێوەبەر نەبڕن و هەمووکات ئەو ئاگادارکەن. ئێستا چۆن کات درەنگە لە گەڵتان ماڵئاوایی دەکەم و چاوەڕێی پاراستنی زۆر زۆرم. هەر ئەوە بزانن کەلەئەم بەرنگارییەدادا سەربەرزیەکی گەورەتان وەدەس هێناوە.

موزەففەری

*********

**لەمەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ١٢ دەوڵەتیە ٩٠وشە ١٨ی بورجی حەمەلی یونت ئیلی ساڵی ١٣٣٦ (١٣٣٨)

موعتەمێدولحەزرەتی سولتانی نایبولحوکوومە

برووسکەی هەواڵدانی ئێوە سەبارەت بە کوشتنی ڕۆسەم[١٣٤] و دەرچوونی شەڕاشۆکان و بەدواکەوتنی سووارەکەتان ئەوپەڕی ڕەزامەندیە.ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لە چارەسەرکردن و لەبن دەرهاوردنی ناکۆکیدا ئەوپەڕی هێزو تێکۆشانتان بە کار دێنن. ئاشکرایە تێکۆشان و خزمەتەکانی بەهێزی ئێوە بەرچاو دەبێ و لە بەرچاوی ئیالەتدا ون نابێ و بۆقەرەبووی خزمەتەکانی ئێوە پلەوپایە یەک بەدەس دێنن.[١٣٥]

*********

**١٦ی حەمەڵ موزەففەری (مۆری وەرگرتن) برووسکە خانەی باجگیران**

**لە مەشهەدی موقەددەسەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ١٤ی دەوڵەتی ١٥٥وشە ٢٠ی بورجی حەمەل[١٣٦]

موعتەمێدی حەزرەتی سولتانی نایبولحوکوومە

هەواڵی برووسکەی ئێوەمان دی هیچ کات گەورەکانی دەوڵەت لەتێکۆشان و گیانبازی ئێوە و ڕاسپاردەکانی سنوور کەمتەرخەمی ناکەن و بە تایبەت پلەو پایەی

---

١٣٤- ڕۆسەم سفکانلوویی کەبەدەس خەدوو کوژرا.

١٣٥-وا دیارە لە ئەم بەشەدا وشە یان ڕستەیەک ون بوویێت.

١٣٦- ٢٠ی خاکەلێوەی ١٢٩٨

گیـان فیـدایی و خزمەتـەکانی فەرمانـڕەوای قووچـانم ـشوجاعوددەولـە عەبدولڕەزاخان ـ بەدەولەت گەیاندووە. بە ئیدارەی مالیشی ڕاگەیاندرا کـە هـەرچی زووترە مووچـەبگـەیێنن تـاکوو بـدرێ بـە مووچـەخـواران. سەرخۆشـی لەتـەواوی بنەماڵەی کوژراوەکان دەکەم و بە ئەوان پیرۆزبایی بڵێن کەسـەربەرزیی مێژوویتـان بۆ خۆتان داناوە.[١٣٧] لەڕێگای پاراستنی وەتەن و خاکدا کەمتەرەخـەمیتان نـەکردووە. لە لایـەن منـەوە هەواڵپرسـی برینـدارەکان بکـەن. بـە ئومێـدی خـودا بـەم زوانـە برینەکانیان چاک بێتەوە و دوای ئەمەش بەسەربەرزیەوە بەوەتەنی خۆتـان خزمـەت دەکەن. دەبێ بەچەشنێک دەس دڕێژەکان شکـست بـدەن. بـە دڵـنیاییەوە بـزانن تاکوو یەک کەس لە ئێوە مابێ ئەوان ناتوانن ئاوی باجگیران بخۆنەوە.

*********

**٢٠ی حەمەل ژمارەی ٢٩١موزەففەر(مۆری وەرگرتن)برووسکەخانەی باجگیران**

**لە مەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران**

وەڵامی حوزووری ٢٥ی بورجی حەمەلی[١٣٨] یونت ئیلی سالی ١٣٣٦ی (مانگی) قسەکانی هەموو گەورەکان بێ هەڵەیە و بڕوام پێیە و تـا ئێـستا کەمتەرخـەمی نەکراوە. هەروەها کە دەزانن بۆ ئەم ئەرکانە مەخارێجی دەوێ و دەبێ زووتر دەولەت قوبوولی کردبێت. هەر بەم بۆنەوە بۆ پەلـەیی کارەکـە چاوەڕێی ولام نـەبووگم ولـە سەرئەرکی خۆم بە ئەندازەی دوو هـەزار تمـەنم داوە. بەپەلـە هەواڵـەکە لـە لایـەن کاربەدەسـتی مالـیەوە نێـردرا. کـە بـۆ گـشت ژێردەسـتانی سولـتان بـەگ و سەرکەردەکانی مووچەبنێرن.

---

١٣٧- ئاشکرانیە کە دەوڵەتەکان و حوکوومەتەکانی ئێران چ کاتـێ ڕێـزی ئـەم گیـان فیدایانـەیان گرتووە و گیـان فیـدایی کوردەکـان خوراسـان لـە ڕێ سـەربەخـۆیی ئێـران چـەن بـەرچاو بـووە. دەوڵەتەکان تا ئەو کاتەی کەجگە لە کوردەکان یارمەتیـدەرێکیان نـەبووە بەقـسەی خـاو ئەوانـەیان دەکرد بە ئامرازی دەستی خۆیان. و ئەو کاتەی کە دەرفەتی ستەم بە ئەوانیان بـە دەس دەهێنـا لـە هیچ جەنایەتێک لەدەرحەق ئەوان کۆتاییان نـەکردووە کەبـە تایبـەت وێنـەی ئەمـەی بـە تـەواوی لەسەردەمی حکوومەتی رەزا شادا ئاشکرایە.

١٣٨- ٢٥ی خاکەلێوەی ١٢٩٨سالی ئەسپ. بەرانبەر بە ١٣٣٨ی کۆچی درۆسە.

زۆر مەمنوونین بۆ تێکۆشان و خزمەتەکانی و خۆنیشان دانی سولتان بەگ و هەمووتان ولە ڕاستی دا حەقی گەورەتان بەسەر ئیدارەکانی دەولەتی و خەلکی باجگیرانەوە هەیە. ئافەرین بۆ پالەوانی و پیاوەتی ئەم ئینسانە ئازایە. هەر چاوەڕێین کە دواتر کاری خۆت ـوشەیەک نەخوێندرایەوە، زۆر لە پێشتر دەولەتتان لە خۆتان ڕەزامەندتر کردووە. سەبارەت بە کەلوپەلیش وایە کە کاربەدەستی مالی بەپەلە لە شیروان پرسیارکات. ئەگەر کەل و پەل بێت هەربەزوویی حەوالەدەکەین هەر ئەوە بزانن کە لە لایەن دەولەتەوە کەمتەرخەمی ناکرێت. هۆی درەنگ بوونی ئەم چەند ڕۆژە خراپ بوونی سیمی تاران بوو. ئاشکرایە دوای وەرگرتنی ئەندازەی ئەم ئێعتبارە باس لەسەر بەش بە بەش مەخاریجەکە بەرێک وپێکی دەکرێت و قوبوول و حەوالە دەکرێت. چاوەڕێین موعتەمێدوسولتان ـسولتان بەگ ـلە وەلامی ئەوانەی وا لە بروسکەخانەدان دلنیایی بدات تا هەموومان دلنیابین و هەنگاو هەلگرین.

**موزەففەری سەرۆکی لەشکەر، خولاموحەسین کار بە دەستی مالی لە لایەن کار بە دەست خولامرەزا خەبیر خان یان موعتەمێدولوزەرا، دلگەرد مورتەزا سەرۆکی گۆمرۆک و مۆرێ وەرگرتن**

*********

**لە قووچانەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ٣٢ ڕەقەمی وشەکان ٦٦بە بەرواری ٣٠ی بورجی حەمەلی[١٣٩] یونت ئیلی سالی ١٣٣٨ کۆچی

موعتەمێدولخاقانی سولتان بەگ

١٣٩- بەرانبەر بە ٣٠ی خاکەلێوەی ١٢٩٨ بەرواری ئەم بررووسکەیە ١٣٣٨ی کۆچیە . بە بێ شەک ئەم تاریخە لەسەرناوی لاپەڕەکانی دەولەتی کەلەم سالە لە چاپ دراون وتاچەن سالێکیدواییش بە کار هێنراوە، دادەنرا. بۆ ئەوەی کە لەبەر لوئی ئیل یانێ سالی گاماسی و لەبەر ئیلان ئیلیشی یانێ سالی مار و نویت ئیلیش یانێ سالی ئەسپ، ڕەقەمی ١٣٣٦لە چاپ دراوە و ئەم ڕەقەمەش بۆ هەرسێ سال بەکار هاتووە. دوایی ئەگەر ١٣٣٨ بۆ گاماسی و ٣٧ بۆمارو ٣٨ بۆ ئەسپ بە کار بێنن بێ هەلەیە. تەرتیبی سالەکانی تورکی ئاوا بووە: مشک، گا، پەلەنگ، کەروێشک، گاماسی، مار، ئەسپ و پەز، مامر، سەگ، خووک و کەر.

ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ ٥٠ سواری ئازا لەگەڵ ٤٠٠دانە گوللەم بۆتان نارد ئاواتـە خـوازم بە ئومێدی خودا تا خۆرئاوا ئێوە بە ئەوپەڕی دڵنیای و هێزەوە خەریکی پاراستن بـن و هەواڵی ڕووداوەکانیش بدەن. ئاواتەخوازم تێکۆشینەکانتان بەرهەمی باشـی بۆتـان بووبێت و ببێتە هۆی سەرکەوتنی داهاتووی ئێوە.

**شوجاعوددەولە مۆر برووسکەی باجگیران.**

*********

**لە تارانەوە بۆ باجگیران**

ژمـارەی ١ی دەولـەتی ٢٦وشـە بـە بـەرواری ١٢ی بـورجی سـەوری[١٤٠] لـوئی ئیل١٣٣٦ کۆچی .ئاغەکان وگەورەکانی ئیداراتی دەولـەتی برووسـکەکە گەیـشت و سەبارەت بەگوللە، بروسکەیەک بۆ نایبولئەیالەیخوراساننێردرا.

**٩ی ڕەجەب ژمارەی ١٤٤ وەزارەتی ناوخۆ مۆری وەرگرتن**

*********

**برووسکەخانەی باجگیران**

لەمەشهەدی موقەددەسەوە بۆ باجگیران

ژمارەی ٢ی دەوڵەتی، ٤٥وشە ٣ی بورجی سەوری[١٤١] لوئی ئیلی ١٣٣٦.

نایبولحکوومە. برووسکە سەبارەت بـە پێویـستی گوللەوگـەنم گەیـشت. باسـی گوللە بۆ ئیدارەی لەشکەری و باسی گەنم بۆ ئیدارەی ماڵی نووسرا. ئاکامی بـە ئێـوە ڕادەگەیندرێت. ژمارەی ٥٢٣ی موحەققێقوددەولە.

(مۆری وەرگرتن) برووسکەخانەی باجگیران

لەمەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران، ئیدارەی برووسکەی دەوڵەتی ئێران

ژمارەی ٣ی دەوڵەتی ٦٣وشە بەبـەرواری ٣ی بـورجی سـەوری[١٤٢] لـوئی ئیلـی ١٣٣٦(کۆچی)

نایبۆلحوکوومەی باجگیران بۆجێبەجێ کردنی دووخەروارچـەک وکـەلوپـەلی

---

١٤٠- ٢ی گولانی ١٢٩٦.

١٤١- ٣ی گولانی ١٢٩٧ساڵی گاماسی.

١٤٢- ٣ی گولانی ١٢٩٧ساڵی گاماسی.

شەڕهەوڵ بدە. بە گورج و گۆڵـی کاربکرێـت. بـە حوکوومـەتی قووچـان ڕابگـەینن سوارە بۆ یارمەتی ئێوە بنێرێت. ئەیوەیش تاقمێک هاوڕێیان بکـەن تـا بـە یارمـەتی سوارەکانی قووچان بگەینە مەبەست.

٢ی سەور ژمارەی٥٥٥موحەقڤێقوددەولە[١٤٣]

نایبولحوکوومـەی خوراسـان و سیـستان لەقووچانـەوە بـۆ بـاجگیران. ژمـارەی ١١٧٢٣/٢ڕەقەمی وشەکان ٤٣ ڕۆژی ٤ی سەرەتای ساڵی[١٤٤] ١٣٣٦ کۆچی

موقەڕێبولخاقانی سوڵتان بەیگ موباشێری باجگیران

ئاغەی ئێسپنلا بەیانی لە قووچانەوە دەڕوات بۆ باجگیران، پێنج سوار بنێـرن بـۆ ئیمام قولی تاکوو لەگەڵ ئەوبن. سەبارەت بە مووچە ی قەڕاسوورانیش[١٤٥]لەگەڵ ئەو وتوویژبکەن و پێتان دەڵێت.

١٤ی ڕەمەزانی ١٣٣٣هوزەبرولمەلێک[١٤٦] قلیجی

*********

**لە شیروانەوە بۆ باجگیران**

ژمـــارەی ٦٥١/٢.ڕەقـــەمی وشـــەکان ٣١.ڕۆژی ١٧ی ســـەرەتان ساڵی1336[147]کۆچی

نایبولحوکوومە

جافرخان برازاگی داراب[١٤٨]دوێنێ‌شـەو دەرچـوو، داراب ڕابگـرن وریـابن ئەگـەر

---

١٤٣- برووسکەی ناوبراو دیارە سەبارەت بە شوێنە گرینگەکانی ڕێگەی نێوان مەشـهەد -قووچـان و قووچان- باجگیرانە کە دەبێ سوارەکان بیپارێزن. یەکێ ئەم شوێنانەدا بوو کە دوایی خەدوو سەردار شەش هەزار تمەنی ڕفاند.

١٤٤-١٤ی پووشپەڕی ١٢٩٧.

١٤٥- قەڕاسووران پۆلیسی ڕێگای نێوان باجگیران و قووچان کە بە ئەسـتۆی حەبیبولـلاخانی ناسر لەشکر هیوەدانلوو بوو.

١٤٦- هوز برولمەلێک مونشی و هەمووکارەی شوجاعوددەولە بوو.

١٤٧- ١٧ پووشپەڕی١٢٩٧.

١٤٨- نەناسران

جافریش هات بۆ ئەو دەوروبەرە بیگرن. (تاج موحەممەد[149])

*********

**لە قووچانەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ٢٨ ڕەقەمی وشەکان ٣٠.بە بەرواری ٢٨ی بورجی دەلووئیان ئیلی ساڵی مار٣٨ی ڕێبەندانی ١٢٩٧ی هەتاوی .ساڵی ١٣٣٦ کە ١٣٣٧ کۆچی درۆستە.

موعتەمێدوحەزرەتی سوڵتان بەگ موباشێری باجگیران

ئەگەر شاموحەممەد[150]بگرن خزمەتی گەورەتان بەمن و دەوڵەت کردووە. سوارە ش بۆ یارمەتی ئێوە نێردرا. (شوجاعوددەولە مۆری برووسکەخانەی باجگیران)

*********

**لەمەشهەدی موقەددەسەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ٣٦ ڕەقەمی وشەکان٣٤.یەکەمی حووتی ئیلان ئیلی ساڵی ١٣٣٦ (حووتی١٣٣٧درۆستە)

موعتەمیدولحەزرەتی سوڵتان بەگی موباشێری باجگیران

زۆر بۆ پاراستنی ئیداراتی دەوڵەتی بە تایبەت ماڵی وریابن ئەگەر زەرەرێک یان تاڵان کردنێک لەهەر کام لە ناوچەکان ڕووبدات، ئێوە بەرپرسن. ٣٠[151]ی دەلوو ژمارەی ٣١٧٨

*********

لە قووچانەوە بۆ باجگیران

---

١٤٩- تاج موحەممەدخانی بادلانلوو، کە ئەم ڕۆژانە حاکمی شیروان بوو.

١٥٠- هۆی مەترسی شوجاعوددەولە و دەوڵەتی ئێران لەشاموحەممەد ئەوە بوو کە ئەوان لە دەسەلاتێ کە لەوڵاتی کومونیستی ڕووسیە ساڵێ لەمەوبەر ١٩١٧ بە سەرۆکایەتی لنین هاتبووە سەرکار دەترسان. بۆ ئەوەی کە ئەگەر شاموحەممەد دەیتوانی لە لایەن ژێردەسەکانی سنوورنشینی کە هەموویان کورد بوون خۆشەویستی بە دەس بهێنێ گیروگرفتی زۆرتر لە ناوچە درۆست دەبوو. هەروا کە دووساڵی دواتر ئەم باسە لە ڕاپەڕینی کومونیستی خەدوسەردار بەدی هات.

١٥١- شوجاعوددەولە برووسکەکەی ڕۆژی ٣٠ی ڕێبەندانی ئیمزا کردووە و ڕۆژی دوایی یانێ یەکەمی ڕەشەمە هەزار دراوە.

ژمارەی ٣٧ ڕەقەمی وشەکان ٨٨ .یەکەمی بورجی حووتی[١٥٢] ئیلان ئیلی سالی مار سالی ١٣٣٦بەرانبەر بە ١٢٩٧/١٢/١ی هەتاوی.

موعتەمێدولحەزرەتی سولتان بەگ موباشێری باجگیران

سوارم بۆ یارمەتی ئێوە هەنارد، بۆ حەسەن خانی بەیگیشم شارەکیم نووسی کە ئەمشەو لە شارەک [گوندێکەلە نێوان باجگیران و قووچان] بە سوارەکانیەوە بێت بۆ یارمەتی ئێوە. شاموحەممەدیشم لەڕۆستەم ویستووە[١٥٣] و هەنگاوی باشی بۆ گرتنی ئەو هەلگرتووە. ئێوەش هەنگاوی قورسی خۆتان هەلگرن بەلکوو ئەم دڕکە لە چاوی موسەلمانەکان دەربێت. هەرکەستان بتوانێ بە ئەسیر یان کوژراوبیهێنێ پانسەد تمەن نەقدی پێ دەدرێت و[١٥٤] هەموو جۆرێک ڕیزی لێ دەگیردرێت.

ژمارەی ٣١٧٤.شوجاعوددەولە، ٣٠ی دەلوو، ڕێبەندانی ١٢٩٧ی هەتاوی.

*********

## لەقووچانەوە بۆ باجگیران

ژمارەی ٨ ڕەقەمی وشەکان ١١٣بەرواری بورجی حووتی ئیلان ئیلی سالی ١٣٣٦، سێهەمی ڕەشەمەی ١٣٣٧ سالی مار، بەرانبەر بە ١٢٩٧/١٢/٣

موعتەمێدولحەزرەتی سولتان بەگ ئاغەی مەشهەدی عەلی ئەسغەری ئۆف لە لایەن کومیتەی قەفقازییەی عێشق ئاواوە هاتووتە باجگیران و داوای شایی[١٥٥] کردووە. ولام دراوە، بەڕاستی دەیبینن و بە ئێوەش ڕادەگەیندرێ چەن

---

١٥٢- یەکەمی ڕەشەمە، وەرگرتنی برووسکە لەباجگیران.

١٥٣- ڕۆسەمی سفکانلوو

١٥٤- لە ئەم برووسکەی عەبدورەزاخانی شوجاعوددەولەی حاکمی قووچان بۆ سولتان بەگ دەرئەکەوێ کە شاموحەممەد بە ڕاستی بۆ خەلکی سنوور و دەزگای دەولەتی کێشەی گەورەی خولقاندووە کە بۆ ئەو پانسەد تمەن خەلات دابین کراوە کە نرخی زۆرتر بووە لە هەزار سەر.

١٥٥- وشەی موحەممەد بە شوێنیدا داکەوتووە، مەبەست شاموحەممەدە کە کومونیستەکان بۆ ڕزگاربوونی لە زیندانی سولتان کەوتوونەتە جوولان. ڕوون نیە سولتان چلۆن ئەوانی گرتووە و هەروەها ئاشکرانیە شوجاعوددەولە بۆئەیگوت بۆ کوژرانی و یان ئەسیرکردنی ئەو پانسەد تمەن دەدەم. ئێستە بۆچی بێدەنگ بووە و هیچ نالێ؟ وادیارە چێشتی ڕووسەکان زۆر چەورتر بووە.

کەس لە دارو دەستەی شاموحەممەد کە گرتووتانە بەزمانەتی عەلی ئەسغەر خۆی ئازادیان کەن یان ئەوان بنێرن بۆ قووچان کە لێرە ئازاد بکرێن. چەن ڕۆژێکیش بە شاموحەممەد دەرفەت بدەن تاکوو موحەممەد ئۆف دڵنیا بکات و بیهێنێ بۆ قووچان کەببێتە هۆی هێمن بوونی باجگیران و ئەگەر نەهات و ملە پێچکێ کرد تاوانەکەی بڵێن بە موحەممەد کە هاتووە بۆ باجگیران. (٢ی حووت ژمارەی ٣١٩٣شوجاعوددەولە.)

*********

**لە مەشهەدی موقەددەسەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ١٥ ڕەقەمی وشەکان ٦٩بەرواری ٤ی بورجی حووتی ئیلان ئیلی ساڵی ١٣٣٦. ٤ ی ڕەشەمەی ١٣٣٧ساڵی مار.[ ١٢٩٧/١٢/٤دڕۆستە]

نایبولحوکوومەی باجگیران ـسوڵتان بەگ ـ

پێرەشەو مادی ناوێک کوڕی کەربەلایی جەوادی چەرم فرۆش سەری حەبیب ناوێکی بڕیوە و هەزار مەنات هەزار مەناتی ڕووسی، [ئەگەر هەزار مەناتی دووهەم دووپات نەکرابێت یەک میلیون مەنات] پارەی ئەوی بردووە و چووە بۆ بوخارا بەناو نیشانەی ئەوەی کەلاوێکی ١٨ ساڵەی چاوبرۆ ڕەشە و ڕیشی نیە. مێزەرەی قاوەیی کەمکۆڵی هەیە. بلێن ئەگەر لە ئەو سنوورەوە تێپەڕی، بیگرن .

ئیوارەی ئیالەتی ٣ی حووت، ژمارەی ٩٧٨٤موزەففەری مۆری وەرگرتن برووسکەخانەی باجگیران.

وادیارە کە ئەم برووسکەیەی بە تەواوی گەورەکان و سنوورەکان ڕاگەیاندووە کە لە دەرچوونی ئەم دزە لە ئێران بەرگری کەن و بۆ گرتنی ئەو هەنگاو هەڵێنن .جێگای ڕوودانی ئەم تاوانباریە مەشهەد بووە.

*********

**لە قووچانەوە بۆ باجگیران**

وەلامی ژمارەی ١٣ ڕەقەمی وشەکان ٦٥ بە بەرواری٧ی بورجی حووتی ئیلان ئیلی ساڵی ١٣٣٦ حەوتەمی ڕەشەمەی ١٣٣٧ی کۆچی بەرانبەر بە ١٢٩٧/١٢/٧ی هەتاوی دڕۆستە.

وەڵام لە لایەن ئاغەی حاجی یەحیا وە بە تاریخی ٧ی ١٣٣٦.
موعتەمێدولحەزرەتی سوڵتان بەگ موباشێری باجگیران!
هەر بە گرتنی ئەم برووسکە سێ کەس سواری بەهێز هاوڕێ لەگەڵ ئاغەی نازرو بنەماڵەکانیان بنێرن بۆ قووچان. لەڕێگا ئەوپەڕی پاراستن بە کار بێنن. ڕوسەیش[156]ها لە شەمخاڵ. زوو وەڕێ کەون و بڕۆن کاری تەواو کەن.
*********

**لە مەشهەدی موقەدەسەوە بۆ باجگیران**

ژمارەی ٤٨ی دەوڵەتی ٥٧وشە١٢ی بورجی حووتی ئیلان ئیلی ١٣٣٧ی

---

١٥٦- لەبرووسکەی یەکەمی ڕەشەمە کە تێپەڕی شوجاعوددەولە برووسکەی کردبوو بۆ سوڵتان بەگ کەبەم بۆنە ڕۆستەمی کردبوو بە بەرپرسی گرتنی شاموحەممەد بەلام ڕۆستەم کە سەرۆکایەتی ڕەگەزی سێفکانلووی بە ئەستۆ گرتبوو ئەو کارەی نەکرد. دوایی لە برووسکەی ١٦ی خاکەلێوە موزەففەری سەرپەلی لەشکەر لەمەشهەدەوە پیرۆزبایی کوشتنی ڕۆستەمی بۆ سوڵتان بەگ هەنارد بوو.
هەر بەم بۆنەوە جاری دیکە شوجاعوددەولە برووسکەی هەنارد بوو بۆ سوڵتان بەگ کە بڕوات و کاری ڕۆستەمی نالەبار تەواو بکات یانێ ئەو بکوژێت. بۆ ئەوەی کە ڕۆستەم دەبێ بە تاوانی خوێنی حەسەن خان بکوژرایە. وادیارە سوڵتان بەگ ئەم کارەناکات و بڕوای وایە هەواڵێک دەنێرێ بۆ ڕۆستەم لە شەمخاڵ کە دولێکە لە باجگیراندا و جێگای قشلاخی کوردەکان بوو، تا بڕوات بۆ جێگایەک لە گوندی سیفکانلوو نێوان گوندەکانی شەیخکانلوو و حەمزەکانلوو لەسێ فەرسەخی خاوەری ئووغاز و دوایی هەروەها کە دێت خەدووسەردار دەبێتە بەرپرسی سەرکوتکردنی ڕۆستەم. خەدوو لە گلیان دێت و دەڕوات بۆ ئووغاز کە لەوێشەوە دەڕوات بۆ سیفکانلوو. سەعادەتقولی خان کوڕی موحەممەد حوسەین خانی ئووغازی ئەم کاتە لەگەڵ سوارەکانی سیوکانلوو بە دەستووری شوجاعوددەولە بۆ سەرکوت کردنی موحەممەد زوشکی ڕێگری بە ناو بانگ ڕۆیشتبوو. موحەممەدی زوشکی لە نزیکی مەشهەدەوە ڕێبوارەکان و ئەوانەی کە دەچوون بۆ زیارەت یان دەیانیکوشت یان تالانیانی دەکرد. خەدوو ئەو کاتەی کە گەیشتە ئووغاز موحەممەد حوسەین خان نەیهێشت بێ بۆ ناو قەلا و خۆی لەگەڵ چەن نەوکەرێکدا چوونە بان قەلاکە و ئامادەی خۆپاراستن بوون بۆ ئەوەی کە مەترسی ئەوەیان بوو کە خەدوو بیری خراپی بۆیان بێت. خەدوو کە ئەمەی دی لە ڕێگای ترەوە چوو بۆ ئووغاز کۆنە و لەوێشەوە چوو بۆ حەمزەکانلوو ڕۆژی دوایی قەلای سیفکانلوو وێران بوو و ڕۆستەمیش کوژرا. کەلاوەکانی ئەم گوندە هێشتا ماوە. پاشماوەی سیفکانلووەکان بە دەوروبەردا بلاویان کرد و تاقمێکیان لە ئووغاز نیشتەجێ بوون کە بنەماڵەی قەیخا بیگلەر لەو ڕەگەزەن.

کۆچی، بەرانبەر بە ١٢٩٧/١٢/٤ی هەتاوی.

نایبولحوکوومەی باجگیران بە هەواڵێکی برووسکە دەڵێت شامحەممەد[157] و ڕۆستەم کە دەرچووگن سەری ڕێگایان گرتووە و دوو ئەسپی تاج موحەممەد خانی بەهادوری و هەژدە بار ئاردی باجگیرانیەکان دەبەن. وریا بن کە ڕووداوی خراپ یان دزی ڕوونەدات و ئاکامی ئەم کارە و بەرانبەر بوونی سوارەکانی حوکوومەت لەگەڵ شەڕاوشووەکان ڕابگەینن.ژمارەی ٩٣٧٨موزەففەری

*********

## له قووچانەوە بۆ باجگیران

ژمارە ٣٣ ڕەقەمی وشەکان ٨٩ بەرواری١٤ی حووتی ئیلان ئیلی ساڵی مار ساڵی ١٣٣٦ کۆچی بەرانبەر بە ١٢٩٧/١٢/١٤دڕۆستە موعتەمێدولحەزرەتی سولتان بەیگ

بررووسکەکە گەیشت بەڵام خوداویردی ـخەدوو سەردارـ بررووسکەی هەناردووە کە ئێوە کاتی هاتنی ئەو بۆ باجگیران بەرگریتان کردووە و پێشوازی ئەوتان نەکردووە. دەزانن کە زۆربەی ئەم کارانەیدژ بە ئێوەئەکرێت شاموحەممەدە دەیکات. لەمە بە دواوە دەبێ هەموو چەشنە یارمەتییێکی هێزەکانی بکەن و کاتی دواکەوتنی شەڕاوشووەکان ئێوەش سواری ئازا بنێرن. بۆ کەم وکۆڕی کە بوو بررووسکە کرا. خوداوێردی سەردار لە باجگیرانەوە کەوتووەتە ڕێ. بڕۆن بۆ شەمخاڵە ئێوە زۆر پارێزەری هێمنی وئیدارەکان بپارێزن. ١٤ی حووت، ژمارەی٣٢٧٦ شوجاعوددەولە.[158]

*********

١٥٧- وادیارە کە دوای ئەوەی شاموحەممەد بە داخوازی عەلی ئەسغەری موحەممەد ئۆف نوێنەری کومیتەی کومونیستی قەفقاز لە زیندانی سولتان بەگ ئازاد کراوە تاکوو بیبەن بۆ قووچان ڕووسەکان بە جێ ئەوەی کە بیبەن بۆ قووچان دەیبەن بۆ ڕووسیە و وابلاوی دەکەنەوە کە دەرچووە.

١٥٨- شوجاعوددەولە داخوازی گرتنی ڕوستەمی لەئەبووتالیبی کەلاتە کرد؛ بەلام ئەو بە خۆڕاگرتن بەرانبەر بە لێدانی هەزار شەلاق و زیندان و ئەشکەنجە ئامادە نەبوو کە بڕیاری شوجاعوددەولە بەڕێوە ببات کە دوایی خەدوو بووە بەرپرسی کوشتنی ڕۆستەم.

## له مەشهەدی موقەددەسەوە بۆ باجگیران

ژمارەی ٦٩ی دەوڵەتی ٥٩وشه ٣١ی بـورجی[١٥٩] حـووتی ئـیلان ئیلـی (ساڵـی مار١٢٩٧ی هەتاوی) ١٣٣٦کۆچی. سوڵتان بەیگ برووسکەی ئێوه بینرا به تایبەت بۆ دۆلیجەز دەرگەز به داکۆکیەوه برووسکه کرا کـه هـەرکات ڕۆسـتەم و هاوڕێیـەکانی بیانەوێ بچنه ناو ئەو خاکه، حوکوومـەت بیـان گـرێ.[١٦٠] سـەبارەت بەکـەم و کـۆڕی مەخارج، سواری نێـردراوە بـۆ حکوومـەتی قووچـان و بـه پێویـست ڕاگەیێنـدرا کـه چاوەدێری ئاسایشی حاڵتان بن. ١٤ی حووت ژمارەی ٩٤٥٨مو زەففەری.[١٦١]

## گرتنی شوجاعوددەوڵە به دەستووری قەواموسەڵتەنە

هەروەها که وترا عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعوددەوڵه تا ساڵی ١٢٩٨ی هـەتاوی لـه قووچان به شێوەیەکی نالەبار و بەهەڵە حوکوومەتی دەکـرد ئـەو جگـه لـەوەی کـه ئازایی و لێهاتوویی باوک و باپیرانی خۆی نەبوو لەبابەتی کاری سیاسی و ئابووریشەوە بۆ ڕێبەری و سەرۆکایەتی ناوچەی ژێر دەسـتی خـۆی لێهـاتوویی پێویـستی نـەبوو. لەدەوروبەریدا خەڵکێکی خوڵتەکەر و هەروەها خۆبەزل زان و ملهوڕ بوون که لەسـەر ئەوە بوون بۆ دەسەڵاتی خۆیان شوجاعوددەوڵه له کارەکانی سیاسی دوور کەنـەوە و

---

١٥٩- بەبڕوام دەبێ ١٣ی بورجی حووت دروست بێت نه٣١ی حووت بۆ ئەوەی که تاریخی ئیمـزای موزەففەری ١٤ی حووته یانێ ١٤ی ڕەشەمەی ١٢٩٧ی هەتاوی.

١٦٠- ڕۆستەم بەجێ ئەوەی کەله شەمخاڵەوە له نێوان باجگیران و دەرەگەز بڕوات بۆ دەرگەز یانـێ هەروەها کەوترا گەڕاوە بۆ نیشتمانی خۆی یانێ بۆقەڵای سیفکانلوو و دوایی خەدوو گەمارۆی دا.

١٦١- به سوپاسەوە له ئاغای سوڵتانی ڕۆڵەزای سوڵتانبەگ که ئەم برووسکانەی ناوەته بەر دەسـت نووسەر، به داخەوە یەکێ لەم بەڵـگانه کـه بـه خـەتی قەواموسوڵـتەنه سـەرۆکی ئـەو کاتـه لـه نـاو لاپەڕەیەکی چاپاری چکۆله له سێ خەتدا بۆ سوڵتانبەگ نوسرابوو لەم نێوانەدا ون بـووە. مـن ئـەم بەڵگەمه کاتی وەرگرتنی دی و خوێندمەوە؛ بەلام ئاغەی سوڵتانی به منی نەدا، ئێستا دەڵێ کـه بـه منی داوە و من له بیرم نایێ که ئەو بەڵگەمە وەرگرتووە به هەر جۆرێ بێت ئێـستا ئـەم بەڵـگه لـەم نێوانەدا ون بووە و ئاواتەخوازم بدۆزرێتەوە و ئێمە قەرەبووی کەین. ئەم بەڵـگه بـه خـەت و ئیمـزای قەواموسسەڵتەنه بوو که دوای پارێزگاری خوراسان له ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی بوو به سەرۆک وەزیر، ئەو لەم بەڵگەدا بۆ سوڵتان بەگی نوسیبوو ئاگای له والی خوراسان بێ.

ئەو بەکارەکانی دیکە خەریک کەن. عەبدورڕەزاخان کە لەسەردەمی لاویەتیەوە بەسەرۆکایەتی گەیشت، پێویست بە ئەوە بوو کە کاربەڕێوەبەران و کەسانی لێهاتوو بۆ چارەسەر کردنی چەڵەمەکان ئەویان ڕێنموونی و ڕێبەرایەتی کردایە ؛بەڵام نەبوونی وەها کەسانێکی باش بووە هۆی ئەوەی کە کەسانێک بەم دەرفەتە بتوانن بە شێوەکانی جۆراوجۆر بیروڕای ئەو بۆ خۆیان ڕابکێشن و ئەویان لە ئەوکارانەی کە دەبوایە بیکردایە دووربخەنەوە هەروەها کە لە کەڵک وەرگرتنی لەبارودۆخی زەمان لەفەزای سیاسی ئێران وەدوورکەوت.

لە کەندوکۆسپەکانی دەورانی حوکوومەتی شوجاعوددەوڵە دەتوانین ئاخەرین ڕاپەڕینی کوردەکانی فیرووزە و عێشق ئاوا بەرانبەر بە ڕژیمی دوولایەنەی ڕووسیەو خۆڕاگرتنی بەرانبەری بڕیارنامەی‌داسەپێندراو و یەک لایەنەی ڕووسیە سەبارەت بە فیرووزە وداگیر کردنی قووچان لە لایەن ئەو وڵاتەوە و کوژرانی جەجووخانی دەرەگەزی و هێرشی شەوانەی تورکمانەکان بەسەر هۆزی کوردی باشکانلوو و ڕاپەڕینی خەدووسەردار و دامەزراندنی چریکەکانی خۆماڵی لە لایەن ئینگلیزەوە و دەسەڵاتی سیاسی دووهێزی گەورەی ئیستێعمارگەری دونیا ناوبەین. قەواموسسەڵتەنە[١٦٢] کاتی هاتنی خۆی بۆ خوراسان لەشارووددەوە لە ساڵی ١٢٩٧ی هەتاوی بە برووسکە دەستووری دا کە گەورەکان و حاکمەکانی خوراسان لە سەبزەوار پێشوازی ئەوبکەن کەببووە پارێزگاری خوراسان. بۆ بەڕێوە بردنی ئەم دەستوورە کە لە ڕووی خۆ بە زل زانینەوە بوو تەواوی گەورەکان و حاکمەکانی خوراسان جگە لەشوجاعوددەوڵە کە لەجێگای دیاری کراودا لە ئەوپێشوازی و ڕێزگرتن و کڕنۆش کردنیان کرد، شوجاعوددەوڵە کە لە فیزو ملهوڕی قەوام زۆر

---

١٦٢- ئەحمەدی قەواموسسەڵتەنە برای وسووقوددەوڵە کوڕی میرزا ئیبراهیمی موعتەمێدوسسەڵتەنە و ڕۆڵەزای میرزا موحەممەدی قەوامودەوڵە هۆی سەرکەوتنی لەشکەریەکانی خوراسان بەرانبەری تورکمانەکانی سەروە کە ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی سەر شۆڕییەکی لەمێژووی ئێرانداخولقاند، با پیران و بنەماڵەی قەواموسەڵتەنە و خۆشی هۆی بەڕێوە بەری ئیستیماری ئینگلیس لە ئێران بوون و خزمەتی زۆریان بە گەورەکانی خۆیان کرد.

تووڕە بوو و ئەوکارەی ئەوی بە سووکایە تی‌بەخۆی و خەڵکی خوراسان دەزانی و لەچوون بۆ پێشوازی قەوام دووری گرت. دەوروبەری ئەو بە برووسکە وەڵامی قەوامیان دا کەبە هۆی نەبوون ئارامشەوە نەڕۆیشتنی شوجاعوددەولە لە قووچانەوە پێویستە. قەوام کە دەیەویست بە ڕووخاندنی گرینگ ترین کەسی خوراسان هێزی خۆی بەخەڵکی ناهێمنی ئەو دەڤەرەڕابگەینێ .بە برووسکەیەکی دیکە دەستووری دا کە شوجاعوددەولە لەمەشهەدەوە بێ بۆ پێشوازی ئەو. شوجاعوددەولە کە قەوامی بە نوێنەری ئینگلیسیەکان دەزانی، دیتنی ئەم برووسکە بووە هۆی تووڕە بوونی زۆرتر و دوو دڵی ئەو بەرانبەر بە قەوام و لەچوون بۆ پێشوازی ئەو خۆی دزیەوە، ئاغەی سەفاپوور سەرهەنگی خانوونشین و گرووبان سێهەمی ئەوڕۆ کەیەکێ لەسێ بە ڕپرسانی پاراستنی قەوام و تەماشاکەری ئەم ڕووداوە بوون لەم بابەتەوە وای گەیاند:

ئێمە سێ نەفەر ئەفسەر و گرووبان و ژاندارم بووین کە قواموسەڵتنەمان لە تارانەوە بۆ خوراسان دەپاراست. قەوام ویستی لەسەرەتاییترین ڕۆژی هاتنی خۆی خوراسانیەکانی نائارام بترسێنێت. هەربەم بۆنەوە بروسکەی زۆری لەشاڕوودەوە بۆ گەورەکانی خوراسان هەنارد و ئەوانی بۆ پێشوازی لە خۆی بانگ کرد تا بە هەراو هووریا و سەربەرزی تایبەتەوە بێتە ناو مەشهەد. گەورەکان و حاکمەکان جگە لە شوجاعوددەولە لەسەبزەوار بەیەک گەیشتن و ئەوانەی کەبەهەر هۆیەکەوە نەیانتوانی بێن و لەوێ بەخزمەتی بگەن دووپات بە برووسکە دەستوور درا کە لەنزیکی مەشهەدەوە پێشوازی لێ بکەن. لە گوندی تۆروق گەورەکانی دیکەی خوراسان بۆ پێشوازی هاتبوون؛ بەڵام ئەو کەچاوەڕێی دیتنی عەبدورڕەزاخانی شوجاعوددەولە کە لە گەورەترین حاکمەکانی خوراسان و حاکمی قووچان بوو، جێگەی ئەوی خاڵی بینی.

نەبوونی شوجاعوددەولە کە گەورەترین سووکایە تی بۆ قەوام بوو ئەوی زۆر تووڕە کردو هاواری کرد: ئەوە شوجاعوددەولە کە کۆیە؟ مەهدەوی ڕەئیسوتوججاری مەشهەدی کە دیار بوو لەگەڵ شوجاعوددەولە ناکۆکی پێشتریان هەبووە چووە پێشەوە و خەریکی خراپە وتنی بووە و شوجاعوددەولەی ملهوڕو سەرپێچی کەر

ناساندووە و هەستی قەرەبوو کردنی قەوامی بەرانبەر بە ئەو داگیرساند. دوایی گەیشتن بە مەشهەد قەوام ویستی شوجاعوددەولە بگرێت و سەرکوتی کات؛ بەڵام بۆ بەڕێوە بردنی ئەم کارە شەڕ جێگای نەبوو و ئەو فێڵەیەکی بەکار هێناو ستوان شەیبانی[١٦٣] و ئاسپیران[١٦٤] یەحیا خان و منی کە گرووبان سێهەم بووم لەگەڵ سێ نەفەر ژاندارما نێونەری بەڕێوە بردنی ئەم کارەکران و دەستوورگەلێکیشی بۆ گەورەکانی ناوچەکە هەنارد. ئێمە بە ناوی هاوکاری لەگەڵ گەورەی ماڵی دارایی قووچان بۆ وەرگرتنی ماڵیاتەکانی دواکەوتوو و تایبەتمەندی کردنی سنووری تریاک وەکوو سازمانی دووخانیاتی ئێستا چوین بۆ ئەوشارەولە کاروانسەرایەک لەشەقامی عێشق ئاوا بەرانبەر بەباخی نەتەوەیی ئێستە جێگر بوین. دوای بیست ڕۆژ مانەوە سەرۆکی ئێمە بە داڕشتنی نەخشەیەک بە ئەوکاری گەورەکانی دارایی و شارەبانی[١٦٥] شوجاعوددەولەیان بۆ بەڕێوە بردنی جەژنی دانی خەڵات بە خوێندکارانی هەڵکەوتووی قوتابخانەی قووچان بە ناوی شوجاعوددەولە یان مێهردادی پێشوو بانگ کرد، بەڵام هەر بە ئەوەی کە شوجاعوددەولە گەیشتە ناو دەفتەری سەرۆکی قوتابخانە گەورەکانی ژاندارمری و شارەبانی لە پشتی سەرەوە چەکەکانیان نا بان سەروشانی ئەو و کارێکیان کرد کە ڕای گرن .شوجاعوددەولە کەسەری لێشێوا بوو چاوی گێڕا بە قوتابخانە و دەوروبەرو بانەکان و چۆن هەموو جێگایەکی لەدەست ئەوانەوە بینی و بە ئومێدی ئەوەی کە کاری خراپی نەکردووە نەیویست کە پیاوەکانی خۆی لەگەڵ ژاندارمەکان شە ڕبکە ن و بە دەوروبەرەکانی خۆی دەستووری دا کە هیچ کارێک لە لایەن ئەوان یان خەڵکی شارەوە نەکرێت.[١٦٦] ئەو کاتە سواری گارییەکە بوو و لەگەڵ عەبدوڵلاخانی گرووبان و

---

١٦٣- ئەمە هەر ئەو سەرلەشکەر شەیبانەیە کە دوایی ناسراوە بە ئەمیرشەیبانی کە لە شەڕی لوڕستان بەرانبەر بە لوڕەکان لەزەمانی ڕەزاشا بەشدار بوو.

١٦٤- پلەی ئاسپیرانی بەرانبەر بە ستوان سێهەمی ئەمڕۆ بووە.

١٦٥- ستوان دووهەم خولام حوسەین خان سەرۆکی نەزمیە بوو.

١٦٦- و ئەمە لاوازی شوجاعوددەولە دەگەیێنێ بۆ ئەوەی کە ئەو بە ئاماژەیەک دەیتوانی فەرمان بدات کە سوارەکان و تیرئەنازەکانی هۆزی زەعفرانلوو لەپشتەوە هێزەکانی قەوام گەمارۆ بدەن و

دەکەسی دیکەی ژاندارم بۆ مەشهەد ڕوویی. دوای ئەوە ژاندارمەکان بە پێی نەخشەیەک کە زووتر دابین کرابوو، نزیکەی دووسەد کەسیان لە پارێزەرەکان و سوارەکان و خزمەکانی شوجاعوددەولە گرت و چەکەکانیان لێ ستاند و زیندانیان کرد و دوایی بۆ ماڵی شوجاعوددەولە هورووژمیان برد و بە بیانووی ماڵیاتەکانی دواکەوتوو تەواوی ماڵ و کەل و پەل و پارە و جەواهێرەکان و هەرشتێک کە دەیانتوانی ببەن تاڵانیان کرد و بردیان بۆ دادگاییەکەی من کە وەکوو سەرۆکی قەراوڵەکان لە ئۆتاغی میرئاخوڕی شوجاعوددەولە نیشتە جێ بووم دەنگی شوجاعوددەولەم دەبیست کە دەیگوت ئێوە نوێنەری دەولەتین یان تاڵانکەر؟ ئەگەر شوجاعوددەولە تاوانبارە بنەماڵەکەی کە تاوانبارنیە بەڵام کەس گوێ بەقسەکانی نەدا و هەرکەسێ لەبیری تاڵانی زۆرتردا بوو. لە ئۆتاغی میرئاخوڕیش دووکیسە پارەی نوقرە دۆزراوە هەرکیسەیەک ۲۵۰تمەن پارەی نوقرەی تێدابوو. خودا دەزانێ چەشتانێکی بە نرخ و بایەخدار و چە ئەسلەحە و موهێماتێک و چە پارە و جەواهێرێک لەماڵی شوجاعوددەولە تاڵان کرا و دەرنەکەوت کەچی بەسەریاندا هاتووە.[167]

گەڕینەوە بۆ سەرباس و هۆی ناکۆکی نێوان ڕەئیسوتوججار لەگەڵ شوجاعوددەولە کەبووە هۆی ئەم کارەساتە.

## ناکۆکییەکانی ماڵی نێوان شوجاعوددەولە لەگەڵ ڕەئیسوتوججار

ئەحمەد شای قاجاڕ کە وەکوو باوباپیرانی خۆی لەبیری سەیران و سەرخۆشی لەگەڵ مەعشووقەکانی فەرەنگی و سەیران لە ئورووپا بوو وەکوو جاران گمێزی کەفی کرد و کەوتە بیری سەفەری فەرەنگ. چۆن خەزانەی وڵات چۆڵ بوو و

---

ئەسلەحەکانیان بگرن و هەموویان زیندانی کەن و بەسەر بەرزییەوە بەرانبەر بە قەوام ڕاوەستن و بە ئەو بسەلمێنێ کەلەگەڵ چەکەسێ دەرکەوتووە. بەداخەوە کە شوجاعوددەولە بێ دەسەلات بوو.

۱٦۷- سەرهەنگ سەفاپوور گوتوویە: دوای گرتنی شوجاعوددەولە، قەواموسسەلتەنە، شوجاعوسولتانی کرد بە سەرۆکی گەورەی قووچان.

هەموو سەرچاوەمالییەکانی نەتەوایەتی لەڕابردوودا پێش فرۆش کرابوو، هەربەم بۆنەوە دەبوا ئەرکی ئەم سەفەرە لە گیرفانی ژێردەستەکانی فەقیرو تێکۆشەر کۆ بکرایە، ئەو کەسانەی کە ئەرکی هاتوچوونی شایان بۆ ئورووپا ڕێک دەخست بۆ دەسخۆشی ئەم کارە کە لە لایەن شا و سەدرئەعزەمەوە فەرمان دەدرا جگە لەوی کەسەرۆکایەتی گەورەیان بەدەس دەهێنا، دە ستیشیان بەسەرماڵ و نامووس و گیانی خەلکدا درێژ بوو و کەس نەیدەتوانی لەگەڵ ویستی ئەوان ناحەزی بکات.

یەکێ لەم دەلالانە مەهدەوی رەئیسوتوججار لە مووساییەکانی ئێسفەهانی دانیشتووی مەشهەد بوو کە لوتفعەلی خان لەهەواڵەکانی پێشووی خۆی بارودۆخی ئەو و ئامۆزاگەکەی ئەمینوززەربی لەتاران بۆ ئێمە تاڕادەیەک درکاند. ئابووری وڵات لەم کاتەدا بە دەستی ئەم جۆرە کەسانەوە بوو کەئەو بۆبەڕێک خستنی ئەرکی سەفەری شا بۆ فەرەنگ ویستی کە عەبدورڕەزاخانی شوجاعوددەولە لەسەرۆکایەتی قووچان لاچێت و بۆ تاران بانگ کرێت. ویستی ئەو بەڕێوە چوو و شوجاعوددەولە بانگ کرا. ئەو ڕۆژەی کە قەرار بوو کە شوجاعوددەولە بێ بۆ تاران مەهدەوی لەسەر ڕێگای ئەو لە ناویەکێ لەباخەکانی سەوزوخۆش‌دا بەزمی خۆش و سەرخۆشی دانا، دوای ئەوە لە کاتێکدا کەشوجاعوددەولە ماندوو بوو و تەپ و تۆزی ڕێگا لەسەروڕوویدا نیشتبوو خۆی بەرانبەر بە ئەم بەزمە بینی و پێشوازی مەهدەوی بەرانبەر بە خۆی دی .مەهدەوی بە فێڵەوە لەوەی کە دەرفەتێک بۆ خزمەت کردنی گەورەی هۆزی زەعفەرانلوو و گەورەکانی خوراسانی بە دەس هێناوە زۆردەس خۆشی لە خان کرد کە ئەم شانازییەی بۆ ئەو داناوە.

دوایی کە مەشرووب و تریاک هێنرا، مەهدەوی هۆی ناکۆکی و مەبەستی لەسەفەری شوجاعوددەولەی لەو ویست. شوجاعوددەولە کە زۆر بێ خەبەر بوو گوتی نازانم؛ بەڵام بازنامێهرەبانییە.

مەهدەوی وتی من ژیانی خۆم لە ڕێگای تۆدا فیدا ئەکەم و هیچ کاتێ ئیزنیان پێ نادەم کەبێ عیداڵەتی ئاوا لە حەققی تۆدا بکەن و خۆم دەسەلات و حکوومەت وەرئەگرم و ئەیهێرمە خزمەتتان. دووهەمین بەشی شانۆ بەباشی بەسەر برا. ڕۆژێکی

تر خۆی وانواند که پاش ڕەنج و مەینەتی زۆر بە دانی شەست هەزار تمەن بۆ مالیاتەدواکەوتووەکانی باپیران لە لایەن شوجاعوددەولە وە حکوومەتی قووچانی بۆ بەدەس بێنێتەوە. شوجاعوددەولە کە فریوی ئەم یەهوودیزادەی خوارد بوو پاش پێزانین و سپاسێکی زۆر لەو تکای کرد کە لە جیاتی پارە بەلگەیێکی لێ وەربگرێ تا پاش گەیشن بە قووچان پارەی ناوبراو پێک بێت و بنێردرێ. شوجاعوددەولە بە پێی دەسنووسێ، خاوەنداری چەند دێهاتی شیروانی کە شوێنی کاری هەزار جووت گا بوو دای بەمەهدەوی و ئەم یەهوودیزادە بەبۆنەی گەیشتن بەو سامانە ئەم هەموو پێشەکییەی چنی بوو. شوجاعودەولە دوای گەڕانەوە بۆ قووچان نیوەی پارە ناوبردووەکە خۆی پێکی هێنا و نیوەییێکی تری لە ئاغاکانی خێل و عەشایر و خەلکی قووچان بەزۆری شەلاخ وەرگرتبوو. چەن کەسیش وەکوو محەممەدحسەینخانی ئووغازی شەیخولخەوانینی بەند کرد و پاش لێدانی زۆر دووهەزارتمەنی بەزۆر لێیان وەرگرت. لەم لەشکرکێشانەی شوجاعوددەولە بۆ ئووغاز ئاغاکانی قووچان وەکو وەلیخانی قەهرەمانلوو تاجمحەممەد خانی بەهادوری، فەرهاد خانی تووپکانلوو، حەبیبوللاخان ناسرلەشکەر و چەن کەس تریش ئەویان هاوڕێی کرد. لەم کاتەدا شوجاعوددەولە کەلەبچەکردنی ڕۆستەمی لە ئەبوو تالب بەگی بیچەرانلوو داواکرد و چون ئەو حازر بە ئەنجامی نەبوو یەکسەد هەزار زەربەی شەلاخی لێی دا. دواجار شوجاعودەولە ئەوی کەتبەست کرد و بە پای پیادە ناردی بۆ قووچان و خستیە بەندیخانەوە. لە دانیشتنی داهاتوودا سەبارەت بە ئەبوو تالب بە چڕوپڕی باس دەکرێ. لە ئاکام دا بڕێ پارە لە خێل و عەشایری دێهاتەکانی قووچان وەرگیرا کە شوجاعوددەولە مەجبوور بوو بڕێک لەوە بە والیەکانی خوراسان وەکوو ڕوکنەدەولە و ناسرەدین میرزا کوڕی موزەفەرەدین شا و کامەران میرزا کوڕی ناسرەدین شا و بڕێکی تر لە زالووەکان و دەرباریەکان بدات و بڕێکیش لەبابەتی قەرزەکانی خۆی بە ڕەئیسوتوجار بداتەوە چون ئەو تا ئەم کاتە زۆرتر لە ۱۵۰ هەزار تمەن لە شوجاعوددەولە داواکار بوو و شوجاعودەولە بەلگەکانی ٦٠ دێهاتی خۆی بەو دابوو. پاش ماوەیک کەمەهدەوی ڕەئیسووتوجار هاتبوو بۆ مەشهەد و بە دەعوەتی

شوجاعوددەوڵــە بــۆ قووچــانیش هــات شوجاعوددەوڵــە دوای میوانــداری و ڕاگەییشتنێکی زۆر و درێـژەداری شـەوانە بـڕێکی تـر لـە پوولـەکەی پێـدا و چەنـد بەڵگەی خۆی لێ وەرگرتەوە. لە ئاکامی بەزمی شەوانە کەشوجاعودەڵـە سـەرخۆش بوو دیسان ڕەئیسووتوجار لـەبارودۆخ کەڵـکی وەرگـرت و دەسنووسـەکانی لـە ژێـر دۆشەکەی شوجاعوددەولە دەرهێنا و هـەر ئـەو شـەوە بـە سـواری ئەسـپ لەگـەڵ هاوڕێکانی خۆی ڕێی مەشهەدیان گرتەبـەر. ڕۆژی دوایـی کـە شوجاعوددەوڵـە لـە خــووی مەســی هاتــە ســەرخۆ زانی کــە دەسنووســەکانیان بــردووە. پێــشوێنی ڕەئیسووتووجاری گرت.. وتیان شەوی ڕابردوو چوو بۆ مەشهەد. شوجاعوددەولە کە تازە زانیبووی چ دەسەگوڵێکی داوە بە ئاوا لەتەشـقی تـووڕەیی و غـەزەب مـشتێکی دابەســەر خۆیـا و قیڕانــدی: بیــژن بــەوەلیخانی قــەهرەمانلوو بێــت بــۆ ئێــرە. خێــرا سەعاتێکیتر وەلیخان بەخزمەت گەییشت و شوجاعوددەوڵـە دەسـتووری گەڕانــەوە وکەلەبچە کردنی ڕەئیسوتوجاری دا بەڵام مریشک لەقەفەس هـەڵاتبوو وەلیخـان تـا نزدیک چناران ڕۆیشت بەڵام بـە ڕەئیـسوتوجار نەگەیـشت و هـەروا ناکـام گـەڕاوە. مەهدەویش دوای گەڕانەوە دەسی کرد بە پیلان گێڕان و لـە لای قەواموسەڵـتەنەی والی خوراسان شکاتی کرد کە شوجاعوددەولە نەتەنیا قەرزەکـەی ناداتـەوە بەڵـکوو دەیــەوێ بیکــوژێتیش دوای ئــەوە قــەوام و ڕەئیــسووتوجار بــۆ لەبــەین بــردنی شوجاعوددەولە دەستی برایەتیان داو توانیان لە ناوی ببەن.

### حوکمی بە هادوردیوانی وەلیخانی قەهرەمانلوو لەلایەن والی خوراسان

قەواموسەڵــتەنە والی خوراســان دوای کەلەبچــە کــردنی شوجاعوددەوڵــە بــۆ وەدەست هێنانی دڵی خانەکانی کوردی خوراسان دەس بە کار بـوو تـا لەیـەکێیتی ئەوان دژ بە خۆی بەرگیری بکات. حـوکمی نـاوبراویش لـەم بـارەوە نێـردراوە. ئـەم حوکمە بوو بە هۆی ئەوەی کە وەلی خان لەخەدوو سەردار جیا ببێتـەوە و ڕووبکاتـە ئوردووی دەوڵەتی. نیشانەی حوکم: دەوڵەتی گەورەی ئێـران ٩٧١٣ بـەرواری ١٦ی بەفرانبار ١٢٩٩ لەبەر ئەوەی کە توانا و هێز و خزمەت کردنی وەلیخانی قـەهرەمانلوو

بۆمان ڕوونه و شیاوی بەخشینی ڕەحمەتە بە بۆنەی ئەم حوکمە ناوبراو بە نازناوی بەهادوردیوان دەناسرێ و هیوادارین کە ئەم خەڵاتی دەوڵەتە ببێتە هۆی کار ئامەیی و توانایی زۆرتری و زۆرتر لە ڕابردوو بە کۆڕی خزمەت کردن و گیان بازی بۆ دەوڵەت و خەبات و شۆڕشی ڕووبهێنێت.[١٦٨]

## بارودۆخی قووچان و خێڵی زەعفەرانلوو دوای شوجاعوددەوڵە

هەبوونی عەبدوڕەزاخانی شوجاعوددەوڵە بە ئەوپەڕی ناتوانییەوە دیسان بوو بە هۆی دڵگەرمی و یەکێتی خەڵکی قووچان و هەرچێی بوو باشتر لە بێگانەکان بوو کەمەبەستێکیان جگە لە داگیر کردن و دزی نەبوو. ئەو ئاخرین یادگاری زنجیرەی گەورە و پیری مێژووساز بوو ئەو ئاخرین چڵی داری قەڵەو وپڕلە شاخ و گەڵاییک بوو کە ساڵەهای ساڵ لەبەرانبەر بەڵا و تۆفان و بۆرانی ڕۆژگاردا وێستا بوو بەڵام ئەمەی کەبۆچی ئاغاکانی کورد بۆ ڕزگاری شوجاعوددەوڵە هیچ کارێکیان نەکرد ئەبێ بەو شتانەی کە ئاماژەی پێی دەکەین سەرنج بدەین:

١. دڵخۆش نەبوونی زۆرتری ئاغاکانی کورد لە کاری شوجاعوددەوڵە.

٢. نەیاری ئاغاکانی کورد لەگەڵ یەکتر و نەبوونی یەکێیتی لەنێوانی ئەواندا.

٣. نەبوونی بیروڕای فەرهەنگی و ڕامیاری پێویست. نەیانئەزانی دوای لە ناو بردنی شوجاعوددەوڵە نۆبەی خۆیان ئەگات و دوژمن زۆرتر چاوەڕێی لاواز کردنی ئەم بنەماڵەو بەژێر چەپۆک کێشانی کوردەکان ببوەوبەوان بەزەی نایەت و نەئەهێڵن محەممەد ئیبراهیم خان بەسەر کۆشکی حکوومەت ڕابمێنێ و نەئەهێڵن سەردار بجنووردی و نە تاجمحەممەد خان و نە خەدووسەردار و نە وەلیخان و نە فەرەجوڵڵاخان بیچرانلوو و نە کەسی‌تریان. مەبەستی داگیرکەرانی ئینگلیس و

---

١٦٨- ئەم بەڵگەیە و چەن بەڵگەی تر کە هی کاک وەلیخانی قەهرەمانلووە ونەوە و نەبیرەکانی وەلیخانی قەهرەمانلووی بەهادوردیوان فتۆکۆپیان کردبوو و لەمەشهەدا بوو، لە لەناوچوونی بەرگری کرا. ئەسڵی ئەم بەڵگەیە لەگەڵ زۆربەی بەڵگە گەورەکانی خێڵی زەعفەرانلوو لە لافاوی وێرانکەری ساڵی ١٣٥٤ی قووچان لەناو چوو.

ڕووس ڕۆشنە لاواز کردن و لە ناو بردنی خێڵی کورد کەلە سەرووی دەسەڵاتی حکوومەت و قودرەتدا ڕاوێستاون. وێران کردنی لەسەرەوەی دەسەڵاتدا بەرەبەرە هەمووی دەسەڵات وێران ئەبێت. گای ڕەش هەر ئەو ڕۆژەی شێر کوشتی کە گای زەردو سپی کوژران. قەواموسەڵتەنە بەکرێگیراوی ئینگلیس لە خوراسان دا نەیتوانی تەنانەت بیری گرتن و زیندانی کردنی شوجاعوددەولەش بکاتەوە کە ئاوا بێ دەنگوباس توانی ئەو کارەی کرد. ئەو دوای بەڕێوە بردنی پیلانی ناپیاوانە و زیرەکانەی خۆی هەرکام لە ئاغاکانی بەجۆرێ سەرگەرم و هیوادار کرد و بۆ بڕێکیان شمشێر و خەلاتی نارد. محەممەد ئیبراهیم خان ڕۆشنی بەسەرپەرشتی خێڵی زەعفەرانلوو جێگری حکوومەتی قووچان دەستنیشان بوو و زۆریش لەقەواموسەڵتەنە سپاسی کرد. حکوومەتی قووچان کەوتە دەست غەیری کوردەکان. یەکێ لە ئاغاکانی توربەتی حەیدەریە بە ناو محەممەد میرزای قارەمان ناسراو بە شوجاعوسوڵتان دەستی دا بە فێڵەبازییەوە. دوای ئەوەی کە محەممەد ئیبراهیم خانی لە قووچان کردە دەرەوە خۆی لە جێگای ئەو دانیشت.

وەلیخان و فەراد خان و باقیەکەشیان وایان بە چاک زانی کە بچنە پێ وشوێنی مەڕومالدا وخۆیان لەدڵی کەژ و کێوا نوقم بکەن؛ بەلام ئەمەی کە ئەڵێن ئەمان لەگەڵ مەڕ و بەرخەکانیاندا ڕەفیق و هاوڕێ بن ئەبێ ببینین داهاتوو چی ئەڵێ. شوجاعوددەولە زەلیل و نەخۆش بوو. نەیتوانی لەبەندیخانە دەوام بێرێت یا ئەو جۆرە ئەیگێڕنەوە نەیانهێشت بەرنگاری ژیانی زیندان بێتەوە. قەوام وڕەئیسوتوجار بەیارمەتی قاوەی قەجەری لەشەڕی ژین ڕاحەتی کرد و لە ١٦ی سەفەری سالی ١٣٣٧ غەریبانە بەبێ تەشیع تەرم بەخاک سپێردرا.[١٦٩]

ئیستا مەهدەوی ڕەئیسوتوجار بێ هیچ ڕەقیبێ ئەیتوانی تەواوی مولکی شوجاعوددەولە لە قووچان و شیروان و ئەسفەرایەن وەدەست بێنێت بەلام کەسێکی دلێر و نەترس و بێ باک پێویست بوو کە پیلانی ئەو بەڕێوە ببات و پارێزەری قازانجەکانی ئەو بێت. لە مێژەوە گوتووبانە کرمی دار هەر لە خۆیەتی. ئایا کەسێ

١٦٩- جوغرافیای مێژووی قووچان، شاکری، لاپەڕەی٣ ٦٨

غەیری کورد ئەیتوانی ئەم کارە گرنگە بەڕێوە بەرێت؟ مەهەدەوی دانەی دانەی ئەو کوردانەی وابەکار ئەهاتن دایە ژێرنەزەر و کەوتە ناو فکر و ئەمجارە گوتی: پەیدام کرد ئایا باشتر لەوەلیخانی قەهرەمانلوو کەسێ پەیدا ئەبێ هەرگیز. وەلیخانی قەهرەمانلوو لە لایەن ڕەئیسووتووجار فەرمانی بەڕێوە بردنی کاری پێی درابوو و لەگەڵ چەن کەس لەنۆکەرەکانی خۆی و بەکرێ گرتنی چەن کەس لە کوردە بێوارەکان کە لە خۆی بێ باک تر بوون بەهەڵ گرتنی حوکمی ڕەئیسوتوجار کاری خۆیان دەس پێکرد و تەواوی دێهاتەکانیان داگیر کرد کەبرێ لەم دێهاتانە بریتین لە:

١- حسەیناوای شیروان

٢- بێگان شوێنی کارخانەی ئیمرۆیی قەنی شیروان

٣-توودە

٤- سیاگای شیروان

٥- نەجەفاوا

٦- مەش تەقی

٧- ئەڵلاڵائاوای شیروان

٨- بەشێ لە ئەملاکی قەڵای شیروان

٩- تەناسوانی شیروان و ١٢ دێهاتی تر کە لە دەهەنی شوور لە خۆراوای نەیشابوور تا ئەسفەرایەن‌درێژە.

بەڵام وەلیخان لە وەرگرتنەوەی پرتان و قاسماوای ئەسفەرایەن لە محەممەد ئیبراهیم خانی ڕۆشنی و دەهانەی شوور لەفەرادخانی تووپکانلوو برێ بەلاو ئاژاوە هاتە سەر ڕێگای؛ بەڵام پاداشی وەلیخان چی بوو؟ بە ئەمری ڕەئیسوتوجار بە دەستی پولیسی ڕەزاشا لە ماڵی ڕەئیسوتوجار لە تاران و لەسەر سفرەی نانەوە قۆڵبەست کرا و چەن ساڵ لە زیندان مایەوە و دوای ئەویش درا لەسێدارە کە لە بەرگی شەشم دا زۆرتر لەم بارەوە باس دەکەین. بەڵام لە ڕووداوەکانی دیکەی قووچان لەسەردەمی شوجاعوسوڵتان قۆڵبەست کردن و کوشتنی تەیموور خانی

جریستانی بوو کە کارەکانی زۆر ناشیرین و ناحەز بوو. جەزایێکی باشتر لەمەی ناتوانی ببێت. ئەو بەهاوڕێی میسرخانی جریستانی میلانلوو ناسراو بە پیرانی وەیسە قۆلبەست و بە جەزای خۆی گەیشت. تەموو لەگەڵ برای خۆی عەلیخان لەشەڕانیەکانی جریستان بوون. عەلیخان هەر ئەو کەسەی بوو وا پەری کاوانلوو ئەو کچە جوان و قارەمانەی کوردی، لەناو خێڵ دزی؛ بەڵام هەرگیز بەخاتری لەسەر خۆکردنەوەی پەری کە چەقۆیێکی بەدەستەوە بوو و ئەوی ئەترسان کە ئەگەر بەو نزیکەوە بێت خۆی ئەکوژێ، نەیتوانی دەسی پێ پەیا کات. تا ئەوەیکە عەلیخان‌بەگی بیچرانلوو و سوارەکانی کاویانلوو ئەویان تاقیب ئەکرد و دوای هەشت مانگ لە ناو خاکی شەوڕەوی حەشار درا وکوشتیان و پەری‌یان نەجات دا.

گۆرانی بەناوبانگی پەری گیان کە کاک محەممەدیووسف‌زادە بە یارمەتی سازی کاک عەلی ئاوشووری خوێندوویەتی کە بە بیرهێنانە وەی ئەم بەرنگاری قارەمانانەی پەریەیە کە لە کتێبی فەلسەفەی گۆرانیەکان و مووسیقا کرمانجیەکان زۆرتر لەسەری ئەڕۆین. لە ڕووداوەکانی دیکەی ساڵی ١٣٣٧ ی مانگی، شەڕو ئاژاوەی شامۆ و سوڵتانبەگ لەباجگیران و دەخالەتی ڕووسەکان لەوێدایە. بە دوای ئەم ڕووداوانە مەسەلەی خەدووسەردار لە دەستووری کاری بەکرێ گیراوەکانی ئینگلیس‌دا هاتە ئاراوە. چون خەدوو لەسەردەمی حکوومەتی شوجاعوددەولە ئەو جۆرەی کەدێت هاوڕێی محەممەدخان بۆ شیروان بووە. تاج محەممەد خان خەدووی بە گەورە ترین لەمپەری ڕێ و دوژمنی خۆی ئەزانی. بەم بۆنەوە بۆ لەناو بردنی ئەو دەسی دا بە هەندێ کارەوە. خەدوو بۆ ئەوەی کە خۆی لەم ئاژاوەی ناوچەییە بکێشێتەوە بۆ هیلاکی دەرکردن بە ماوەیێکی کەم سەرێکی دا لە عیشقاوای ڕووس کە لەم سەردەمەدا ناوەندی کار کردنی کۆمێنیستەکانی شەورەوی بەشی سەرۆی خەزەر بوو و لەوێ‌دابوو کەبۆ تۆڵە سەندنەوە لە تاج محەممەد خان و قەواموسەڵتەنە و تێکەڵی کومونیستەکان بوو و گەڕایەوە بۆ شیروان و گیلیانی بۆ بنکە هەڵبژارد.

## دەخاڵەتی ڕووسەکان لە ڕووداوەکانی باجگیران و کوشتاری ئەوان بەدەستی کوردەکان

گوتمان کە دوای کەلەبچە کردنی عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو بەبۆنەی قەواموسەڵتەنەی والی خوراسان لە ساڵی ١٢٩٧ هەتاوی شوجاعوسوڵتانی قارەمان لە ئاغاکانی توربەتی حەیدەریە کەلە باوکیەوە بە محەممەدخانی قەرایی و لە دایکیەوە بە قارەمان میرزا کوڕی نایبوسەڵتەنەی قاجار ئەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتداری قووچان هەڵبژیردرا و محەممەد ئیبراهیم خان ڕۆشنی زەعفەرانلوو لە ئامۆزاکانی شوجاعوددەولە کەلەم کاتەدا لە نێوانی ئەوانا پێکدادانێکی گەورە بەدی هاتبوو، بوو بەجێگری ئەو. لە کاری ئیدارەکردنی خێڵی زەعفەرانلوو لە گرنگترین ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەی قووچان ئەتوانین بە ئاژاوە و شەڕو شۆڕی نێوان شامحەممەد کوڕی کەربەلایی تەیموور کەم کەیلانلوو ناسراو بە شامۆ و سوڵتانبەگ باجگیری بوو کە ئەمەش هەردوو بەرەکێکی تر بوو و لەم شارە سنوورییەدا پێکیان هێنابوو. ئاماژەبکەین حکوومەتی باجگیران لەم سەردەمەدا لەسەر شانی محەممەد حسێن خانی سیوکانلووی ئووغازی بوو. لەم ئاژاوانە کەبۆ بە دەست گرتنی هێزو دەسەڵات لە نێوان دووکەس لەخەڵکی سیوکانلوو دەستی پێ کردبوو بەبیروڕاو چارەی محەممەدحسین خان چارەسەر نەکرا و چون ڕووسەکان و ئینگلیسیەکان هەردووکیان لەم شوێنە سنوورییەدا قازانجی خۆیان لەوێ ئەوینی، ئاوری شەڕو ئاژاوەیان تیژتر کرد. ئەم شەڕانەکە لەسەردەمی عەبدوڕەزا خانی شوجاعوددەولەدا دەستی پێ کردبوو ئیستا بە ئەوپەڕی خۆی گەیشتبوو. لە ئاکام دا شامۆ نەیتوانی لەبەرانبەر سوڵتان بەگ کەلە لایەنی محەممەد حسینخانەوە پشتیوانی ئەکرا خۆی بگرێ. بەم بۆنەوە هەڵات بۆ ئەودیوی سنوور. دوای ماوەیەک وەرگرتنەوەی باجگیران لەگەڵ یەک گورهان لەساڵداتەکانی ڕووسیە هێرشی کردە سەرباجگیران. هێزێکی ٤٧کەسەکەبریتین لە ئەفسەران و سەربازەکانی ڕرووس لە کاتی دەمەوبەیان لەگەڵ هاتنی کازیوەدا شاریان حەشار دا و ماڵی سوڵتان بەیگیان

وەبەرگوللەدا. سولّتان بەیگ خەریکی نوێژی بەیانی بوو کە گوللەکان بەشوێن یەکا لە پەنجەرەی ماڵەوە چوونە ناو دیوەکەی.

سولّتانبەیگ لە هیچ ڕووداوێکا و تەنانەت ئەگەر مەترسی کوشتنی ببوایا، نوێژی خۆی نابڕی. بەم بۆنەوە ژنی سولّتانبەگ چەکی مازووری هەڵگرت و لە پشت پەنجەرەوە سەنگەری گرتبوو و تیری دەهاویشت بۆ ڕۆسەکان و بە کوشتنی چەن کەس لەوان لەمپەری ڕێ ئەوان بوو. لەم ئاژاوەدا گوللەیێ درا لە دەستی ڕاستی ژنی سولّتانبەگ و چەک لە دەستی کەوتە خوار و هێزی لێ بڕا و دەستی بەسەر لاشیا شکا.

ئەم ژنە فرزو بێ باکە کە مێردەکەی خەریکی نوێژ خوێندن بوو دیسان خۆی گەیاندە چەکەکەی و بە دەستی چەپی تیر هاویشتنی دەست پێ کرد تا ئەوەیکە سولّتانبەگ نوێژەکەی تەواو کرد و بەیارمەتی ئەوەوە هات و بەسەروێنەکەی دەستە شکاوەکەی ژنەکەی بەست بە ملیەوە و گوتی زووکە پەیکێ بۆ گوندی بەردەر بنێرە و ئەبووتالبەگی بیچرانلوو لەم ڕووداوە ئاگاداربکە. ژنی سولّتانبەگ بە یارمەتی ژنانی هاوسێ ئەم پەیامەی بەپەیکێکی نادیار بۆ بەردەرنارد. نێوانی بەردەر لە باجگیرانەوە نزیک بەیەک فرسەخ و نیو بە ڕێگای کوێستانیە. سولّتانبەگ لەگەڵ شامۆ و ڕووسەکاندا خەریکی شەڕ بوو. تیشکی هەتاو لە پشتی کێوەکانەوە بە ئەسپایی هاتە نێو ئاسمان. ئەبووتالب بەیگ ئەو شاسەواری گۆڕەپانی دلێرییە و قارەمانی نەبەزی ڕووداوەکانی دوایی وەکوو هەڵۆیێکی تێژباڵ بەسەر شامۆ و ڕووسەکاندا هاتە خوارو و لە پاش سەریانەوە ئەوانی حەشاردا ووە بەر ڕەگباری گوللەیانی دا و وەکوو گەڵای پاییزی بەسەر عەرزدا رژان. هێشتا هەتاو نەهاتبووە نێوانی ئاسمان کەبە کوشتنی سیوسێ کەس لە ڕووسەکان و١١ بریندار و نیوەگیان شەڕ تەواو بوو، بەڵام شامۆ لەگەڵ سێ کەس لە ڕووسەکان توانیان لە هەوراز و نشێوی کێوەکانەوە هەڵێن و خۆیان بگەیننە ئەو دیوی سنوور. تا خۆراوای ئەو ڕۆژە ٧کەس تر لە برینداره‌کانی ڕووسیش کوژران. ٤ کەسی دیکە کە کەمتر بریندار بوون بە دەستووری سولّتانبەیگ تیمار کران و بۆ ڕۆژی دوایی درانەوە بە

سنووره‌وانانی ڕووسیه. چه‌ن مانگێ له‌م ڕووداوه به‌سه‌ر نه‌چووبوو که دیسان شامۆ له ڕووسیه گه‌ڕاوه بۆ باجگیران و دیسان شه‌ڕو ئاژاوه له‌نوێوه ده‌سی پێ کرد. که‌م ڕۆژ بوو که له‌م شاره سنووریه‌دا نێوانی هاوڕێیانی ئه‌وان شه‌ڕ هه‌ڵنه‌گرێ. به لاواز بوونی هێزی ئه‌و دوانه قه‌واموسه‌ڵته‌نه که به دوای ده‌رفه‌تێکی ئاواوه بوو بڕێ له ژاندارمه‌کانی خۆی له‌مه‌شهه‌ده‌وه بۆ باجگیران نارد. هه‌ردووکه‌سه‌که‌ی که‌له‌بچه‌کرد و هێنایانی بۆ مه‌شهه‌د و له‌شوێنی ئیسته‌ی هوتێل ستاره زیندانیانی کرد. له‌و سه‌رده‌مه‌دا ئێره کاروانسه‌راییێک بوو که به ده‌ستی ژاندارمێریه‌وه بوو و هه‌ر لێره‌دا بوو که ۱۲ ساڵیتریش خه‌دووسه‌ردار له‌وێدا زیندانی بوو. ئێستا ساڵی ۱۲۹۸ی هه‌تاوی بوو. هیواییێک بۆ ڕزگاری شامۆ و سوڵتانبه‌گ نه‌بوو، به‌ڵام محه‌ممه‌د حسێن خان ئووغازی ئیل به‌گی که‌یکانلوو ڕۆیی بۆ مه‌شهه‌د و شامۆ و سوڵتانبه‌گی له‌به‌ندیخانه ئاشتی داوه و هۆی هه‌ڵاتنی ئه‌وانی له‌به‌ندیخانه‌ی قه‌واموسه‌ڵته‌نه پێک هێنا. له شه‌وێکی جومعه‌دا که ژاندارمه‌کان بۆ داربڕین و که‌سب چووبوونه ناو بازاڕه‌وه، محه‌ممه‌د حسێن خان عه‌لی به‌لووچ ژاندارم پاسه‌وانی به‌ندیخانه‌ی له‌گه‌ڵ خۆیا هاوقسه کرد و زیندانیه‌کانی ئازاد کرد و له‌گه‌ڵ ژاندارمێکی ترچوونه ئێسته‌بڵی مه‌هده‌وی ڕه‌ئیسووتوجار و پێنج سه‌ر ئه‌سپی چاوکیان هێنا ده‌ره وه و سوار بوون و به‌ره‌و قووچان هه‌ڵاتن. هێشتا خۆرهه‌ڵنه‌هاتبوو گه‌ییشتنه چناران و سیمه‌کانی برووسکه‌ی به‌ینی ڕێیان قرتاند تا به ئه‌و شوێنه ڕاپۆت نه‌درێت. له نزیکایی چناران دا ئه‌سپی عه‌لی به‌لووچی سکه‌نده‌ری، عه‌لی دا به عه‌رزو عه‌لی له‌ژێر ئه‌سپه‌که دا گیانی ده‌رچوو و پاشماوه‌یان چوون بۆ باجگیران. ئه‌م ڕووداوانه خوا لێخۆش بوو سه‌رهه‌نگ سه‌خاپوور که خۆی هه‌ر له‌و ژاندارمه نێردراوانه بۆ باجگیران بوو بۆمی گێراوه‌ته‌وه. قه‌واموسه‌ڵته‌نه‌ی خوراسان که له هه‌ڵاتنی زیندانیه‌کان ئاگادار بوو، محه‌ممه‌د حسێن میرزای جیهانبانی زاوای براکه‌ی که سه‌رۆک ژاندارمی خوراسان بوو له‌گه‌ڵ سه‌د که‌س له ژاندارمه‌کاندا کرده‌به‌رپرسی که‌له‌بچه کردنی ئه‌وانه‌ی وا هه‌ڵاتبوون. محه‌ممه‌د حسێن خان له باجگیران چوو بۆ ئووغاز. شامۆ هه‌ڵات بۆ ڕووسیه و سوڵتان له‌باجگیران خۆی به‌ده‌سته‌وه دا. هۆی دوژمنایه‌تی

قەواموسەڵتەنە لەگەڵ سوڵتان‌بەگ و محەممەد حسێن خان ئووغازی ئەمە بوو کە دوای کەلەبچە کردن و دیل کردنی عەبدوڕەزاخانی شوجاعوددەولە ئاغاکانی کورد هەر کامێکیان سەربە خۆ کاریان ئەکرد. ئەم دووکەسە ناوبراوە لە حیزبی دیمۆکرات کە لەو سەردەمەدا لەمەشهەد دامەزرابوو پشتیوانیان ئەکرد و هیوادار بوون پەلی حیزبەکەیان لە قووچان و باجگیران پەرەی پێبدەن. ڕێگەی ئەم حیزبە سەر هێلی یاسای مەشرووتە و ڕاگرتنی سەربەخۆیی ئێران و ئازادی و بەرابەری دابوو و لەگەڵ گرێبەندی سەرشۆڕی ١٩١٩زایینی وسووقودەولەی برای قەواموسەڵتەنە کە ئێرانیان بە ئینگلیسەکان فرۆشت بوو دژایەتی ئەکرد و خەڵکی باجگیران و ڕێبەرەکەیان محەممەد حسێن خان ئووغازی ڕۆشن بیرو پێشکەوتوویی خواز بوون. سەرهەنگ سەفاپوور لە ژاندارمەکانی ئەو ڕۆژە بەرپرسی کەلەبچەکردنی سوڵتان‌بەیگ گوتی: من و ئاسپران یەحیا خان بەجیهانبانی پێشنیارمان دا کە چۆن بە هۆی کوێستانی بوونی ناوچەکەوە ناتوانین موحەممەد حسەین خان قۆڵبەست بکەین، باشتر ئەوەیەکە بەوبۆنەوە بچین کە فەرمانی دەسەڵاتداری باجیگرانمان بۆ هێناوە و ئەو فریوو ئەدەین تا لە ئووغازەوە باجگیرانی بێنین و دوا بە دوای هاتنی بۆشار کەلەبچەی ئەکەین ئەم پێشنیارەچەسپا و محەممەد حسێن خان بۆ باجگیران دەعوەت بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو پیاوێکی زیرەک بوو بەجێی ئەوەی‌کە هەوەڵ خۆی بچێتە ناو باجگیران بەر لە خۆرهەڵاتن لە ڕێگاییێکی دەرەوەی زیلانەوە کە ئووغاز و باجگیرانی بەیەکەوە ئەگەیاندەوە بە یەک سوارەکانی خۆی پۆل پۆل ناردبۆ باجگیران. بەڕۆیشتنی هەوەڵین دەسەی سوارەکان بۆ باجگیران ئەو ژاندارمانەی وا لەسەر تەپۆڵکەی خوارووی باجگیران لەسەر ڕێگای ئووغازدا سەنگەریان گرتبوو بە هیوای ئەوەی‌کە محەممەد حسێن خان هاتەوە بۆ ناو شار و ئەوان گەمارۆیان داوە هاتنە دەر و گوللەیان هاویشت و بە دوای ئەوە سنگەرەکانی تری دەورووبەری شاریش ئەم هەڵەیانە کرد و محەممەد حسین خان کە هێشتا بە چای ئاوەکانی باجگیران نەگەیشتبوو بەبیستنی دەنگی تیرهاوشتین لەم فێڵە تێ‌گەییشت و لەگەڵ سوارەکانی هاوڕێ بەرەولای کوێستانی زیلان و ئووغاز هەڵات

و هەروەکوو مریشک لەهێلانەهەلات. لەم شەڕو ئاژاوەدا دووکەس لە سوارەکانی محەممەد حسین خان بریندار و پاشماوەیان هەلاتن. لە ئاکام دا سولتانبەگی نارد بۆ مەشهەد. ماوەیێک لەبەندیخانەی قەواموسەلتەنەدا بوو.محەممەد حسێن خانیش دوای ماوەیێکی تر هات بۆ مەشهەد و بە زوانەچەورەکەی قەواموسەلتەنەی ڕام کرد و گەڕاوە بۆ باجگیران و بە حکوومەتی خۆی لەوێدا دوایی هێنا.[170]

## شۆڕشی کۆمێنیستی خەدووسە ڕداری کرمانج

شۆڕشی کومونیستی دیکتاتۆری شەورەوی کە لە سالی ١٩١٧ زایینی بە ڕێبەری لێنین و بەیارمەتی ولاتە ڕۆژئاواییەکان کەلە هێزی نیزامی نیکێلا دیکتاتۆری زالم و خوێنڕێژی ڕووسیە ترسا بوون دەسەلاتیان وەدەست هانی ولە لایەنگرانی بیری کومونیستیەوە پێک هاتبوو وکاریگەری لەسەر تەواوی سیاسەتەکانی جیهانی ئەو ڕۆژە دانابوو کە ئێرانیش یەکێ لەوانەبوو. بە بۆنەی ئەوەیکە ئێران هەر لە مێژەوە سەرنج ڕاکێشی ڕووسەکان بوو بە جۆرێ کە دەیانئەویست دەسەلات بدەن بە ئێران. کومونیستەکانیش هەر ئەو ڕێ و ڕەوشتی

---

١٧٠- ئەم وتوویژە لە سالی ١٣٥٧ لەمەشهەددا لە مالی سەرکار سەفاپوور بەڕێوە چوو. جارێکی تر لە نێوانی ئێمە وتوویژ پێک هات، چەن سالیتر لە تاران لە کاک عەباسی ئارمین [سەروان عەباسی] لە هاوڕێیانی دوکتور موسەدیق و بەرەی نەتەوەیی کە تا پای داریش ڕۆیی بیستم کەسەرهەنگ سەفاپوور مردووە. بۆ ئەوەیکە کوڕەکەی سەر لەشکەر سەفاپوور لەهاودەورەکانی کاک ئووغازی بووە بۆ سەرەخۆشی ئەو چووبوو.خوالێخۆشبوو سەفاپوور کتێبێکی دەس نووسی لەگەل برێ وێنەی بەرچاو لە ئاغاکانی کوردی خوراسان و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە نووسی بوو دوای سەرکەوتوویی شۆڕش بڕیار بوو ئەوانە بنێتە ئیختیارم کە لێکۆلینەوەی بکەم و لە چاپی بدەم. هەرچەن ئەم کتێبە لەفشەو ئیراد خالی نەبوو بەلام برِی شتی بەرچاوی تێدا بوو چون ناوبراو خۆی لە تەواوی ڕووداوەکانی سالیانی داهاتوو یانێ لە ١٢٩٧ی هەتاوی کەلەگەل قەواموسەلتەنە هاتبوو بۆ خوراسان و لەگەل تەواوی ئاغاکانا هاتووچووی بوو و بە جۆرێک لەگەلێانە نێوانی بوو. من وەکوو نووسەری مێژووی خوراسان لەبنەمالەی ئەو خوالێخۆش بووە ئاگام نییە. داواکارم بە جۆرێ کە خۆشە ڕەنجی نووسینی ئەو بەڕەحمەت چووە لە ناو نەچێت و با بەشێ لە مێژووی ولاتمان لە ناو نەچێت. ئەو نووسراوانە یا خۆیان لە چاپی بدەن یا لە ئیختیاری مندا دابنێن کە بە ناوی خۆیانەوە چاپی بکەین.

پێشکەوتن خوازیەی حکوومەتی تەزاریان وەبەرگرت و کەوتنە بیری پێک هێنانی شەڕوشۆڕش لە ناوچەسنووریەکانی ئێران و تاقمێ شۆڕشیان لە ئازەربایجان و گیلان و خوراسان دا بەرپا کرد. شۆڕشی خوراسان خوداوێردی سەرداری کوردەکانی خوراسان دایگیرساند. لەهەوەڵین کونگرەی کومونیستەکان کەلە باکوو[١٧١] پێک هات. گەورەترین بەشدارەکان لەوێدا ئێرانیەکان بوون کەلەدواییدا شوێنی لە ئازەربایجان[١٧٢] و گیلانیش دەرکەوت کە لەخوراسانیش جگە لەوەیکە مەسافەتێکی دوورودرێژی لەگەڵ باکوودا بوو. محەممەد سادق بەیگی ئەسفەراییني نوێنەری خەدووسەردار لەوێدا بەشداری کرد کە ئەو جۆرە حاج سلێمان خانی ڕۆشنی زەعفەرانلوو دەڵێ تاقمێکی زۆر لە جاڕنامەکانی لە چاپ دا و لەم کۆنگرە لەگەڵ خۆیا بۆ خوراسان هێنابووی و تا دوای جۆزەردانی ١٣٢٠ تاقمێ لەوانە لە ماڵی ئەوا ئەپارێزرا. کومونیستەکان لەم کۆبوونەوە بڕیاریان بە بەشدار بوان دا کە ئەگەر وەکوو شۆڕشی کومونیستی ڕووسیە لە وڵاتی خۆیانا پێک بێنن هەموو جۆریارمەتی و کەرستە و ئامراز لە ئیختیاری ئەوانا دادەنێ. بەم جۆرە ڕووسەکان لە باخی سەوز و بەدەعوەت کراوەکان بڕیاری زۆریان‌دا و ئاوری شۆڕشی ئەوانیان تیژتر کرد بەڵام

---

١٧١- باکوو هاوکێشی ماکوو لەناوە کوردیەکانە. شارێکە لەوبەری سنوورەوەیەو ئێمڕۆ ناوەندی کۆماری ئازەربایجانە و هۆی ناونانی ئەوە بەمانای بادکووبە یانی شارێکە لە بەر ڕێگای با وتۆفاندایە. لە کوردیدا پیتی د لەباد لا ئەبرێ و پیتی ب لە کووب وەرئەگێردرێتەوە و ئەبێت بە باکوو ناوی ئەم کۆمارەش کە کومونیستەکان بە بیانووی سیاسی بۆ بەش کردنی ئێران ئەم ناوەیان لێنا کە لە ڕابردوودا ناوێکی ئێرانی کوردی بوو و **ئاران** بوو کە دەستێوەرداوی **ئاروانە** یانێ نیگابانی ئاور. ئار ئاریان .ئێر ئێران تەواویان لێکدراو لەوشە کرمانجیەکانی ئار یانی ئاور.

١٧٢- شۆڕشی ئازەربایجان بەرێبەری شێخ محەممەدی خیابانی باپیری مووساخیابانی لەسەرکردەکانی موجاهیدانی خەلق کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کۆماری ئیسلامی لە تاران دا کوژرا بوو کە مەبەستی ئەو جیا کردنەوەی ئازەربایجان بوو. هەر بەم بۆنەوە ئازەبایجانیان ناونا ئازادستان. شۆڕشی گیلانیش بە ڕێبەری میرزا کووچەک خان دەسی پێ کرد و چون کومونیستەکان بەڕێبەری حەیدەرخانی عەمووئوغلی تیرۆریستی ناوداری تورک لەوێدا ڕەخنەیان کرد شکستی خوارد.

دوای ئەوەی ئەم نوێنەرانە لە ناوچـەکانی خۆیانـا شۆڕشـێکیان پێـک هێنـا[١٧٣] هـیچ یارمەتییێک نەکران و ڕووسەکان بە بڕیاری خۆیـان وەفایـان نـەکرد و ئـەم شۆڕشـانە یەک لە دوای یەک لە ئازەربایجـان و گـیلان و خوراسـان دا شکـستیان خـوارد. بـۆ ئەوەی‌کە وەکوو وەلاتە ڕۆژئاواییەکان نەبوو. ئـەم شۆڕشـە لەسـنوورەکانی سۆڤـیەت ئەولاتر بچێ ئە بێ بەهۆی ئەمە لەگەڵ دژایەتی ئینگلیـسیەکان ڕووبـەڕوو ببـێ. بی بی ڕابێعە نووسەری بەناو بانگی ڕووسی سەبارەت بە ئەم شۆڕشانە نووسـیویەتی:«لـە ئاوریلی سالی ١٩٢٠ لەتەبرێزدا شۆڕشـێ بـە ڕێبـەری شـێخ محەممـەدی خیابـانی دەستی پێ کرد. شۆڕشی بەرپانی ڕزگـاریخوازی نەتەوایـەتی خوراسانیـشی گرتـە بەر. لە سالـی ١٩١٧ هاوکـات لەگـەڵ شۆڕشـی سوڤـیەت لـە ناوچـەی شـیروانی خوراسان شۆڕشی فەقیرو هەژارەکانی کورد بەرێبـەری خـەدوو دەسـتی پێکـرد.[١٧٤] ژۆرژ لەنچاغێـسکی لــەم بــارەوە هێناویــەتی: خوراســان لــە سالــی ١٩٢٠ بەرانبەربە١٢٩٩ی هەتاوی مەکۆی شەڕو پێکدادانێکی زۆربوو. بیلـشوویکەکان هـۆی پێک هێنانی ئەوە بوون .داگیر کردنی عیـشقاوا لەگـەلاڕێزانی سالـی ١٩١٩ دوا بـە دوای ئەو داگیر کردنە سەرتانسەری ناوچەکانی ماوەرای خەزەر بوو بـە هـۆی هاتنـە ئـەم دیـوی کوموونیـستەکانەوە. گـەرچی کـە ئەرتەشـی سۆڤـیەت بـێ هـیچ شـەڕوپیدانێکەوە لـە خوراسـاندا خۆیـان پیـشاندا ؛بـەلام هەوڵـیان ئـەدا کـە دەسەلاتدارێکی دەس نیشاندەی سۆڤیەت لەوێدا بێننـە سـەرکار. قـسمەت بـە نـاو خـوداوێردی خـانی سـەردار دەرهـات کـە لـە لایـەن سۆڤـیەتەوە بەرپرسـایەتی داگرساندنی شۆڕش لەناوچەکەداکەوتە ئەستۆی وبڕیار وابوو کـە ئەگـەر لـەو پیلانـە

---

١٧٣- یەکێ لەهۆکارەکانی زۆر بوونی نوێنەرانی ئێرانی لە کۆنگرەی باکوو، بـوونی کومونیـستە زانـا ئێرانیەکان وەکوو ئەبولقاسمی لاهووتی لە کوردەکانی کرماشان بوو کـە لـە دوایـی دا بەگـەورەترین پلەو پایە لە سۆڤیەت دا دەستی پەیدا کرد و بوو بە سەرۆک کۆماری تاجیکستان و بە هـۆی ئەمـەی کە دوای ماوەیێک بە پووچ بوونی دروشمـە کومونیـستەکانی زانی لەوێـدا هـەلات و دای لـە ئـاوی جەیحوون و ڕۆیی بۆ ئەفغانستان. سەرنج بدەنـە کتـێبی **ژیـان و چۆنیـەتی وشـەرحی حالـی مـن** نووسراوەی ئەبولقاسمی لاهووتی.

١٧٤- تورکمەنەکانی ئێران بی بی ڕابێعە، لوگاشوا، لاپەڕەی ١٣٨

سەرکەوتوو وپیرۆز بێت لەئەرتەشی سوور یارمەتی وەربگرێت. ڕووسەکان بۆ ئەوەی‌کە خوداوێردی‌خان هان بدەن تاکوو سەربەخۆیی خۆی لە ئێران ڕابگەیەنێت تا ڕادەیێکی زۆر چەک و تەقەمەنیان لەسنوورەکانی باکووری ئێران بۆ خوراسان ناردبوو[۱۷۵] و ئەم شۆڕشە بێ‌یارمەتی ڕووسەکان نەیتوانی سەرکەوتووبێت و تەنیا کارێک کەشۆڕشگێڕەکان دەیتوانی ئازار گەیاندن بە گەورەکانی حکوومەتی خوراسان یان بە بەستنی ڕێ وبان داگیر کردنی دێهاتەکان بوو پیلانێکی ئاوا بەرزەفڕانە بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی بۆ کوردەکانی[۱۷٦] ئەو شوێنانە لەبارودۆخێکی ئاسایی‌دا باوەڕی پێ نەدەکرا. پاش ساڵی ۱۹۲۱ بەڕێوە بەرانی ئەم شۆڕشە شکستیان وەخۆوە دەبینی.[۱۷۷] بلوو ڕۆژهەلاتناسێکی‌تری ڕووس سەبارەت بەشۆڕشی خەدوو ئاوا ئەڵێ: لە ژوئەنی ۱۹۲۰ی زایینی لە ناوچەی شیروان و قووچان شۆڕشێ بەڕێبەری خودایی [خەدوو] کە هەر لە مێژەوە لە لای ئاغاکانی کوردی خێڵی زەعفەرانلووە بە کاری شوانی سەرگەرم بوو لە ئەوپەڕی هەژاریدا هەڵسا و ئەم شۆڕشەی دژ بە داگیرکەرانی ناوەکی و داگیر کەرانی ئەرتەشی ئینگلیس هەڵگیرساند.

ئەرتەشی ئێران بە ئەوپەڕی ڕەنجەوە بەیارمەتی چریکەکانی ژێر فەرمانی فەرماندە بە کرێ گیراوەکان لە سپتامبری ۱۹۲۰دا توانی ئەم شۆڕشەکە بخەوێنێ.[۱۷۸]

---

۱۷۵- هەر ئەم ڕەوشتە لەبارەی ئەستەراوا لە خۆرئاوای خوراسانیش بەکار براو تاقمێکی زۆر ئەسلحەیان بۆ تورکمەنەکان نارد تا کۆماری سەربەخۆی تورکمەن لە گورگان پێک بێرن.

۱۷٦- مەبەست کۆماری سەربەخۆی کوردستانی خوراسان بوو.

۱۷۷- سی ساڵ کێ بەرکێی خورئاوا و سۆڤیەت لە ئێران ، ژورژ لەنچافسکی. وەرگێڕاوەی حوور یاوەری، ل٨٦

۱۷۸- مێژووی ئێران ل.ک. بلوا. وەرگێڕاوەی کەیخوسرەو کشاوەرزی ، ل٤٤

**خەدوو سەردار بناسین**

**سەردەمی منداڵی و تازەلاوی خەدوو:** خوداویردی کە کوردەکانی خوراسان بەپێی ڕێزمانی خۆیان لە ڕواڵەتی جۆراوجۆری بکەری و بەرکاری و پێوەندی دراو و بشنۆیی و بزری دا بە چەن جۆری خود- خۆدی- خودە- خودۆ بانگی ئەکەن لە کوردە پاڵەوانەکانی دێهاتی تکمەرانی شیروان لەبنەماڵەیێکی هەژار و نەدار لە دایک بوو. هەروایە لەم جۆرە بنەماڵانەیە کەپیاوێکی گەورە،گەورە دەبێ و بێ پشتیوانی خەڵک لەسەر پای خۆیانا دەوەستن و مێژووی جیهان تێکئەدەن. دایک و باوکی خەدوویش لە ماڵدنیا شتێکیان نەبوو.ئەمەی کە بڕێک ئەڵێن هۆی شۆڕشی خەدوو ئەمەبوو کە عەبدوڕەزاخانی شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو گاو بەرخی باوکی خەدووی بە زۆر لێ وەرگرتبوو؛ بۆیە خەدوو شۆڕشی کرد درۆیە و مەبەستی ئەوان بچووک کردنەوەی شوجاعوددەولەیە.

لەم بنەماڵە فەقیر و هەژارە چەن منداڵی چکۆلە و برسی لە ناو خۆڵاخۆیان تلاوتل ئەدا کە مێژوو ناوی تاقمێکی لەوانی بە ئێمە ناساندووە: ١- قلیج٢- خوداوێردی ٣-ئەڵلاوێردی٤- حسێن و کچێک بە ناوی گوڵشەن. ڕۆژێ یەکێ لە پیاوانی ڕووناکبیری کورد لە گوندی عەلیاوای بجنوورد ڕێی کەوتە لای ماڵ باوکی خەدوو کە ئاشنای زووی بوو و بەبارودۆخێکی چەوساوە و بەمناڵانێکی برسی و ڕەشوڕووتەوە هەوڵ و پەرێشان بینی، تۆزێکی پێ چوو ئەم کە مێهری خەدوو چووە دڵی و لەگەڵ ئەم منداڵە پێنج شەش ساڵە کە چەن برینی لەسەری ئەومنداڵەشەوە دەبینی شۆخی دەکرد. خەدوو کەچەڵیش بوو وای هات بەدڵدا لەبەر ئەوەی خۆی منداڵی نەبوو، بەڵکوو باوکی خەدوو، خەدووی پێی بدات و بەباشترین شێوە پەروەرشتی بکات. بەڵێ بە باوکی خەدووی گوت و ئەویش لەڕێی بێ دەرەتانیەوە ئەم پیشنیارەی قەبووڵ کرد، چون ئەیزانی کە لانی کەم خەدوو لەمەبەدوا سکێکی تێر لەنانی گەنم یاجۆ ئەخوات و پێخوەرێ کە ئەو هەچی ڕۆژە ئەیخوات خۆشک و براکانیشی پڕ لە فرمێسک و دڵێکی خەمبار جێ هێشت و

خەدوو ڕێی غوربەتی گرتەبەرو لەقەڵای عەلیاوا لە باکووری بجنوورد کە تا توکور نزیک بە ٤٠کیلۆمیتر بوو مایەوە و ئەم نێوانە دوورە بوو بە هۆی ئەوەی کە خەدوو نەتوانێ ساڵیانی ساڵ دایک وباوک و براکانی ببینێ. خەدوو لە ماڵی تازەدا لە خۆراک و جل و بەرگێکی باش کەڵکی وەردەگرت؛ بەڵام هەر کاتێ ئەکەوتە بیری برا و خۆشک و هاوکایەبرسی و ڕووتەکانی خۆی لە دێهاتی توکوور دووکەڵ لە لووتی هەڵئەسا وبەهەناسەیێکی سارد و دڵێکی خەمبار بێ‌ئیختیار ئەچووە سووچێکەوە دەستی بەگریان دەکرد بەڵام ئیلکان دایکی تازەی ئەو کە ژنێکی دڵۆڤان و دڵسۆز و خوێن‌گەرم و خۆش زوان بوو و خەدووی زۆرتر لە گیانی خۆش دەویست، زوو بەرەولای خەدوو ئەچوو و فرمێسەکانی بە دەستە دڵۆڤانەکانی دەسڕی و دڵداری ئەدایەوە.

خەدوو بە هیوای ئەو ڕۆژانەی براوخوشکەکانی ببینێ ڕۆژشمێری ئەکرد تا ئەوەی‌کە بەهاری ساڵێکی‌تر ئیلکان و شووەکەی خەدوویان بۆ سەردان لە خۆشەویستەکانی بۆ توکوو برد و چەن ڕۆژی لەوێ مانەوە و بڕێ گەنم و ڕۆنیان بە ناو پێشکەشی بۆ دایک و باوکی خەدوو برد. ئەم جارە کە خەدوو لەتوکور ئەگەڕایەوە ئەیتر خەم و پەژارەی پێشوی نەبوو و بەدڵگەرمی و دڵخۆشی و خاتر جەمیێکی زۆرتر بە دوای گا و بەرخەوە بوو و جارجارێ بۆیارمەتی دایکی ئافتاوەیێکی حەڵەبی هەڵئەگرت و ئەرۆیی بۆسەر کانی بۆغانلوو و پڕی ئەکرد لەئاو و ئەگەڕایەوە، جارجاریش لەگەڵ منالانی جەسوور و بێ باکی بوغانلوو دەس بەیەخە ئەبوو و بە ئافتاوەی خاڵی ئەگەڕایەوە. خەڵکی عەلیاوا لەعەشیرەتی چالاک و بێ باکی بوغانلوو لەخێڵی شادلوون. منداڵانی ئەم عەشیرە هەر ڕۆژ لەکووچە و کۆڵان ڕێی یەکترینیان ئەگرد و بەچکۆلەترین بیانوو بەشەڕدەهاتن و تەنانەت دەبوو بە هۆی بەشەڕاهاتنی گەورەکانیش بەم بۆنەوە هەر عەشیرەتێ لەسەر تەپۆڵکەیەکەوە بوو جێکیان بۆ پاراستنی خۆیان سازدەکرد کە تا ئێستایش ئەم بورج و کووچە و کۆڵانە تەنگانە بیرەوەرییێکە لەم شەڕو پێکدانانی منداڵان. هەر تایفەیێک دەکۆشان بدەن لە منداڵانی عەشیرەیێکی تر.لە وەها جێگەیەکدا خەدوویش ئەبێ بارودۆخی خۆی

بناسێ. تەواوی منداڵانی قەڵا لێی دەترسان. ماوەیێکی زۆری نەبرد کەخەدوو توانی سکرتێری یەکێ لە کۆڵانەکان بگرێتە ئەستۆ. خەدوو کە شەوانە ئەگەڕاوە بۆ ماڵ یا پشتوێنە پەشمیەکەی دڕابوو یا درزی چۆخەکەی یا سەر و گوێچکەی لە خوێنا شەلاڵ بوو.

بەڵام ئیلکان ئەوژنە ئازا دڵۆڤانە نەتەنیا خەدووی لەم شەڕو شۆڕانە دوور ناکرد، تەنانەت هانی زۆرتری ئەدا و ئەیگوت ئەگەرچی تۆ لێرەدا غەریبی بەڵام لەبیرت نەچێ تۆ لەخێڵی پاڵەوانانی، ئەبێ پشت و پووزەی تەواوی منداڵانی بوغانلوو بدەی بەعەرزا. تەواو منداڵانی خێڵەکان ئەبێ لەتۆ فرمان بەرێن. ئیلکان بۆ ئەوەیکە ئەم بەچکە پاڵەوانە هەموو کات پیرۆز وسەرکەوتووبێت. ئەو ڕۆژانە کە ئاوگۆشتی درووس ئەکرد. کەوچکێ چکۆلە چەوری ئەکرد بەسەر ئاوگۆشتەکەی خەدوودا و بەشە گۆشتەکەی خۆی ئەدا بەخەدوو و پێی ئەوت: زۆر بخۆ تاهێز بگری و بتوانی بەربەرەکانی باش بکەری بەیانیانیش بەدزی مێردەکەیەوە کەوچکێ ڕۆنی زەرد یا چەن دانە قاورمەی لەگەڵ ناشتایی دا بەخەدوو ئەم کەڵەشێرە جەنگیەی خۆی ئەدا و بەم جۆرە کەڵەشێری جەنگی ئیلکان کەخەدووی ناو بوو لە ماوەیێکی کورتدا سەرکەردەیی تەواوی تازە لاوانی عەلیاوا و دەسەلاتداری گەورەی کووچە و کۆڵانەکانی وەدەست هانی. لە دواییدا لاوێکی ئازا و بێ باک و تیرهاوێژ و شمشێر وەدەست و پاڵەوانێکی تەواو وکارامەی لێ دەرهات کە خەڵکی بۆغانلوو ئەویان بەپاڵەوانی ئیلکان دەناسی. دیارە کەسێ‌کە لە ناو عەلیاواییەکان دا سەرچاوکەبێت لە هیچ کەسێ باکی نابێت جگە خەدوو کەسێ نەبوو کەبە دوای گا وبەرخ و کەرەوە بڕوات و هەر لە بەیانی تا ئێوارە زەوی و زار بکێڵێ و بەفروباران و سەرما و گەرما لەکۆڵ بگرێت تا سەدمەن گەنم بۆ نانێکی بژی ونەمیر ئەویش ئەگەر ئافەت و کوللە لێی نەدات، دایکیشی ئیلکان گەرەکی نەبوو کەڵەشێرە جەنگیەکەی بە دوای ئەم کارانەوە بڕوات بۆ ئەوەی مێردەکەی دوای تەمەنێ بەشوێن ئەم کارانەوە گوێرەی خۆی چ قوڕێکی کرد بەسەر خۆیا و چ ناووسەربەرزیێکی پێکهێنابوو کە ئێستا خەدوو بیکات. بەم بۆنەوە ڕێی خەدوو ڕێ‌ییێکی تر بوو. ڕۆژێ خەدوو نۆکەرەکانی

سەردار بجنووردی دی کەسوار بەسەر تاقمێ ئەسپی چاوک و شمشێر بەکەمەر و چەک بەشان و قەتارێ فیشەکیان پێ بوو و بە ئەو پەڕی شکۆ هاتنە ناوقەلا و خەڵکیش لەبەر ئەوانا سەری ڕێزیان دانەواند و هەر کام لەوان هەوڵی ئەدا تا زووتر خۆی بەهەوساری سواربگەیێنێت و ئەو بۆ ماڵ خۆی بباتەوە تاسەربەرزی بەدەست بێنێت. خەدوویش بۆ ئەوەی خۆی بەیەکێ لەسوارەکان بگەیێنێت چوە پێشەوە و لە دەوری دانەیێ لە سوارەکان هاتوچووی بوو. بەلام بەتانەو تەشەری سوار بەرەو ڕووبوو، ناچار ئەویی وێڵ کرد خەدوو لەو ساتەبەدواوە عەزمی کرد کارێ بکات کە وەکوو ئەم سوارانە خەڵکی عەلیاوا ڕێز و حورمەتی بۆ دانێن و پێشوازی لێ بکەن بەلام چلۆن؟؟. خەدوو بە دوای ڕێگەیەکەوە بوو تا بە ئەو ئامانجەی بگات.

## خەدوو ئەبێت بە سەردار

ساڵ کە دوای ساڵ ڕابورد خەدوو لاوێکی بەهێز و بەهەیبەتی لێ دەرهات. باوکیشی لەپەنای پشتیوانی ئیلکان ئەسپێکی بۆی کڕی بوو. خەدوو هەموو ڕۆژی بەسواری ئەسپە ئەچووە سەرکانی و کچانی جوانی بوغانلوو کە بەجل‌وبەرگێکی ڕەنگامە و جوانەوە وەکوو تاوسێکی سەرمەست لەپەنای ئەو تەختەبەردە گەورە و لەسەرکانی کۆ ئەبوونەوە دەستی ئەکرد بەشۆخی و دزەی نیگای بۆکچان بوو. خەدوو زۆر ئاواتی بوو کە دانەیی لەم تاوسە جوانانە سوار ئەسپی خۆی بکا و هەڵێ، بەلام لەترس دایک و باوکی نەئەوێرا. لەیەکێ لە ڕۆژان کە خەدوو بەشکۆ و عەزەمەتێکی زۆر سوار ئەسپەکەی بوو و بۆ بینینی دایک و باوک و براکانی خۆی چووبوو بۆ توکور، بیستی کەمحەممەد ئیبراهیم خان‌ڕۆشنی دەسەلاتداری شیروان بۆ گەڕان هاتووە بۆ توکور. خەدوو ڕۆژێکی‌تر سوار بەسەر ئەسپ خۆی بەمحەممەد ئیبراهیم خان و سوارەکانی گەیاندو سپاس وڕێزی بەجێ هێنا و لە ئەسپەکەی هاتە خوار و دیسان بە ئاماژەی ئاغاسوار ئەسپەکەی بوو. محەممەد ئیبراهیم خان لەڕێ و ڕەوشت و ڕەفتارو زبروزیرەکی خەدوو خۆشی هات و لەباردۆخ و ڕۆژگار و دایک‌وباوکی پرسیاری کرد و لەدوایی دا پێشنیاری کرد کە ئەگەر پێ‌خۆش بێت

ئەتوانێ لەگەڵ ئەو بۆشیروان بگەڕێتەوە و خەدوو بە بیستنی ئەم قسانە بزە هاتە سەرلێوی و ئەمەی وەکوو ئاواتێک ئەزانی وا لەخۆیا هەستی خۆشی ئەکرد کە واتئەزانی سوار لەسەر ئەسپ لە ناو هەورو ئاسماندا ئەسپ سواری ئەکات، بەم بۆنەوە لە ئاغا سپاسی کرد و ئیزینی داوا کرد کە بۆ عەلیاوا بگەڕێتەوا و لە دایک و باوکی ڕوخسەت بگرێت و لە شیروان دا بە خزمەتی بگەیێت.

ئاغایش لەگەڵ پێشنیاری خەدوو هاوڕێی کرد. خەدوو سوار بوو و کەژوکێو و دەرودەشتی بڕی و هەر نەیزانی چلۆن ئەم ڕێگا دوورودرێژەی تەواو کردووە تا کە ئەسپەکەی لەبەر دەروازەی قەڵای عەلیاوا سمی کوتا بەعەرزا. خەدوو دەروازەبانی ترسان و چووە ناو قەڵاوە، ئەسپەکەی پەلەپەل لەبەر گەوڕدا بەستەوە و بۆ خزمەتی دایک و باوکی ڕۆیشت. ئیلکان خۆشییەکی ئێجگارزۆری لە ناو چاو خەدوودا خوێندەوە و پرسیاری کرد. خەدوو ئەوشتەی وا پێش هاتبوو گێڕاویەوە؛ بەلام هەرچی خەدوو خۆشحاڵ تر ئەبوو ئیلکان پەژارەی زۆر ئەبوو. بۆ ئەوەیکە ئەو ڕۆژانەی ئەهێنا بەرچاو کە شایەت کەڵەشێرە جەنگیەکەی لەو دووربێت. باوکی وتی لەمن ئەبیسی بە دوای ئاغاکانەوە مەڕۆ. تیکەیێک نانی فەقیرانە بخۆ و خۆت تووشی چەڵەمە مەکە. تەواو ئاغاکان ونۆکەرەکانی وەفاو بەقایان نیە. ئەوان هەموو شتێک فیدای قازانجی خۆیان ئەکەن و لە ئاکامیشدا تۆ بە کوشتن ئەدەن.

لە مێژەوە گوتوویانە نانی ئاغا مەستی هێنەرە، دیارە مەستیش ئاکامێکی باشی نیە. ئیلکان کەدی مێردەکەی زۆر دەوری بۆی هەڵگرتووە وتی: نە، کوڕی من باکت نەبێت پیاوانی گەورە لە کاری گەورەوە بە شوێنی گەورە گەیشتوون. کەسێ کەلەسەختی و ڕەنج و مەینەتی پڕ لەمەترسی نەترسێ بە شوێنێکی گەورە ئەگەیێت و لە ناو هاوتەمەن و ساڵەکانی خۆیدا سەربەرز و ناودار ئەبێت.

ژیان یانی چی؟ ژیان یانێ ناوبانگ دەرکردن، ژیان یانێ سەرفەرازی، ژیان یانێ سەردانەواندنی خەڵکی لەبەرانبەر تۆ. ژیان یانی دوژمنانت لە تۆ بترسن و دوستانت بەگەورەت بزانن. یەک ڕۆژ مرۆڤ بەگەورەیی ژیان باتەسەرو بمرێ چاکترە لەسەد ساڵ ڕایەتی بکات و بێ ناو و نیشان گیان بدات. زۆرتر شەک بۆ کوشتن و قوربانی

کردن چاکترە. تۆ وەکوو شەکی. من لە ڕۆژی هەوەڵەوە دیم کە تۆ شەکێ گەورە ئەبی. ئێستا کە خوداوەند بۆ تۆ ئاوا چارە نووسێکی پێکهێناوە پشتەپای لێ مەدە. سبەینی سواری ئەسپەکەت ببە و بەرەو شیروان غار بکە وهیچ شتێ بۆت مەترسی دار نەبێ. تۆ پیاوێکی گەورە ئەبی نە ڕایەتێ کە لە شوێن قنگی کەرەوە بێ. هەرچەن جیایی و دووری تۆ بۆم مەحاڵە، بەڵام من سەرفەرازی تۆم ئەوێ. بڕۆ، بڕۆ، تۆ پیاوێکی گەورە ئەبی. من بۆ تۆ ئەپاڕێمەوە و ئەبینم کە زەحمەتەکانی چەن ساڵەم بەبار نیشتوون. شوی ئیلکان کەکش ومات چاوی بەدەمی ژنەکەیەوە بوو، بێ ئەوەی کەوتارێ لەدەمیەوە دەربێ، خزیا ناوجێگەخەوەکەی و لێفەجاجمیەکەی کێشا بەسەریا و تاوێک دواتر کەوتە پرخەپرخ کردن. بەڵام ئیلکان ئەوشەوە نەخەوت کەمێ ئاردی لە نێو کەنوەکە هاورد و بەزەردێنەی هیلکەوە ڕۆن و چزڵی و زەردەچۆ و پونیەی وشکی لە ناویەکدا قاتی کردو لەگەڵ ئاوی گەرم هەویری ساز کرد و پێش ئەوەی هەوا ڕوشن بکات چەن فەتیرەی کلفت و بامەزەی برژاند و نیایە نێو توورەکەکەی و دەستێکی هاورد بەسەر و گوێچکەی ئەسپەکەی خەدوو و وتی:

ئەی ئەسپی لە دوای خوا، خەدووم بە تۆ ئەسپێرم ئەو ساغ بێریتەوە بۆ لای من. ئەو کاتە فرمێسکی لە چاوانی کەوتە بان زەوی. کە خەدوو دەرگای ماڵی کردەوە و بەرەولای دایەی هات و سڵاوی لێ کرد ئیلکان دەستی بەسەری منالەکەیا کێشا و فرمێسەکانی لەخەدوو شاردەوە. خەدوویچ کە تووشی دڵبڕان و جیایی کریا بوو دەستی ئیلکانی ماچەوکرد ووتی: دایە من ببەخشە لە باری زەحمەتەکانتەوە من هیچ کات تۆ لە بیر نابەمەوە. جا هەر دوو بێ دەسەڵات سەریان وەبان شانی یەک نیا و گریان. خەدوو پێش هەتاو هەڵهاتن لە حاڵێ کە بابەودایەوچەن کەس لەدۆستانیئەویان ڕەوانە ئەکرد.لەعەلیئاوا چووە دەر وبەرەو ڕۆژهەڵات بەئەسپەکەی غاری کرد. هێشتا هەتاو تا بانی کێوەکە بەقەد کلفتی تەنافێ جیایی بوو کە لە دەروازەی شارهاتە ناو شیروان و یەکسەرە بەرەو مەحکەمە چوو.

میرئاخورخان ئەو شەو هاتنی خەدووی بە موحەممەد ئیبراهیم خان ڕاگەیاند و تایبەتمەندی بە ئەو وتی کە ئەم کابرا کە تازە هاتووە سوارێ قابل ئەبێت و ئەبێ لەتەربیەتیدا بکۆشی.

## دەس پێ کردنی دەورانی سیاسی خەدوو

خوداویردی لە شیروان بۆ هەوەڵین جار هاتنە نێو گرووپی ڕەنجبەران و چەک بەدەستانی حەمە ئیبراهیم خان زەعفەرانلوو. حەممە ئیبراهیم خان هەروا کە وترا لەبنە ئامۆزاکانی شوجاعودەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو لە حاکمەکانی قووچان بوو حکوومەتی دوروبەری باکووری خوراسان لە کاتی هاتنی کوردەکان بۆ ئەم سەرزەوینە بە ئەستۆی ئەم خانانە بووە کە هیچ کات لە دارو دەستەی ئەمیر شێخلوو نەبوون. شێخ ئەمیرلووله ئیلەکانی بە ناو بانگی کوردە کە ئێستا لە دێ زیارەتی شیروان کە پێشتر فغان ئاوای ناوبوو نیشتەجێن و ئەوانی دیکە یان لە قووچ قەڵا لە ڕۆژ ئاوای شیروان و لە شیروان و دوو دێهاتی شێخ ئەمیرلووی خوا رۆژوور لە نزیکی نووری و هەروەها لە قووچان و ئەسفەراین و ئەسەفجیر و قوردانلووی بجنوورد و لە باغچە نیشتەجێ بوون.

حەمە ئیبراهیم خان حاکمێ عادڵ و خێرخوازو دمۆکراتی پێشە و هوشیار بوو. گەرەکی بوو بێ باس وەدەرگیری لەگەڵ خەلکیا ژیان باتەسەر ئەو ساڵهای ساڵ حکوومەتی دەوروبەری سەلاسەی شیروان و ئەسفەراین و سەرحەداتی قووچان لە ئەستۆیا بوو خەڵکیش لێ ڕەزامەند بوون. بەڵام دوایی شوجاعوددەولە بێ سەبەب لێ ڕەنجیاو کاریان بەجیاوازی کێشیا.

خەدوو لە دەزگای حەمە ئیبراهیمخان ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ بەرزەو ئەبوو، تا ئەوجێگە کە لەنزیکی ساڵەکانی ۱۳۳۵ مانگی کرا بەسەرۆکی سوارەکانی زەعفەرانلووی شیروان. هەرکاروباری گرینگ و مەترسیدار کە لە لایەن حەمە ئیبراهیم خان یان شوجاعودەولە بە ئەو ئەسپێررا، بەچاکە لە ئەستۆی کاروبارەکەی خۆی دەرئەهات، کەیەکێ لەو کارانە دواکەوتن و لەبین بردنی ڕۆستەم سەفکانی[۱۷۹] سیفکانلوویی بوو، کە چون لەگەڵ بەربەرەکانێ و قەلاداری ڕۆستەم رووبەڕووبوو، بەینی قەڵای سەیفکانلوو کەلەبەینی ئووغازو دووربادەم لە چەمی حەمزەکانلووی

---

saf kanlo-۱۷۹

ژوورەوە لەسەر کێوێکی چکولە دروست کرابوو دەورو بەریان گـرت و لـە ئاکامـدا بـە وێـران کـردنی قـەڵا ڕوسـتەمی لەبـەین[180] بـرد، کەلەتلگرافـەکانی شوجاعوددەوڵـە بەسوڵتان بەگی باجگیرانی بەم کارەساتە ئاماژەکراوە.

لە نزیکیساڵی ١٣٣٧ مانگییـەوە، شـازادە نەیرەدەوڵـە والی خوراسـان کـە لـە دەس شوجاعوددەوڵەوە زیز ببوو، ئەم تەکبیرە کەوتە بیری کەپلەی ئیلخانیگەری لە شوجاعوددەولە بستێنێ. حەمە ئیبراهیم خان لە جێگای ئەودا دانرێت. وادیارە ئەم کارەساتە بەجۆرێکی شاراوە بە حەمە ئیبراهیم خان گوترابوو، بەڵام ئـەم ڕازە کەوتـە دەرەوە و شوجاعوددەولە لەمەبەستی والی و حاکمێ کە خـۆی دای نـابوو ئاگـاداری پەیدا کرد و بێ ماتـڵی حەمـە ئیـبراهیم خـانی لابـرد و تـاج حەمـەخانی بـادلانلوو (سـتووتو لمەلـەکی دوایـی) بووبـەسـەرۆکی حکوومـەتی شـیروان. لـەم ماوەیـەدا نەیرودەوڵەیش لە حـاکمی حکوومـەتی خوراسـان لابـرا و هێنـرا بـۆ تـاران. حەمـە ئیبراهیم خان و خەڵکی شیروان، تاج حەمەخانیان ڕێگەنەدا و خـەدوو سـەرداریش سەرۆکی سوارەکانی شیروان لە هاتنی تاج حەممەخان بۆشیروان بەرگری کردو کـە تلگرافەکانی ئەوکات کەلەبەینی تاران و مەشهەد و شیرواندا جێ بەجێ بوو داکـۆکی ئەم ڕاستییەیە.

ئا لەم کاتـە تەنگـەدا بـوو کـە دەوڵـەتی ئەحمەدقـەوام بـرای وسووقوددەوڵـە سەرۆک وەزیری وەختی بە حاکمی خوراسان دانا و بەئەختیاراتی زۆر ڕوانەی کرد تـا ئەم کاروبارەڕێک بخا.

حەمە ئیبراهیم خان لە ئاکامدا شیروانی وێڵ کرد و بەرەو ئەسفەراین چوو. لـەو جێگادا عیلاقەو ئاو و ملکی بوو. خـەدوویش ماوەیێـک هێـزی شـیروانی بـێ ئـەوە حوکمی ببێ لەدەستیا بوو، لە ئاکامدا بە بۆنەی دەست تێـدا بـوونی فەرەجولـلاخان زەعیمولقەلەکی دوایی لەبنەئامۆزاکانی شوجاعوددەوڵـە کـە شـووی تـووران بی بی خوشکی تاج حەمەخان بوو، بارودۆخی شیروان بـەقازانجی تـاج حەمـەدخان دوایـی

---

١٨٠- کەوتنەشوێنی ڕوستەم بەهۆی ئەوەبوو کە ڕۆستەم ناسـراو بـە ڕۆسـەم لـە نزیکـی بـاجگیران حەسەن خان سەرۆکی دارودەستەی بیچرانلووی کوشت بوو.

هات و خەدوویش لە شیروان دەرکرا.

خەدوو بۆ ئەوە کە ناڕاحەتی لە شوجاعوددەوڵە لابات، تەنیا سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو قووچان هات و لە شوجاعوددەوڵە عوزرخوازی خەتاکانی خۆی بوو.

شوجاعوددەوڵە کەبە لەرزان بوونی پایەکانی حکوومەتی زانی دەگەڵ خەدوو بە چاکە کرداری کرد و گونای سەرکەشی و بەقسەنەکردنی وی بەخشی. وادیارە کاتێ کەخەدوو دڵنیا بوو کە شوجاعوددەوڵە ئەوی بەخشیوە، لە بەرانبەری‌دا سەری دانەواند و تا دەرگای حەوشەکە هاوڕێی کرد، لە حاڵێکدا کە ئەمیر حەسەن خان منداڵی ٥-٦ ساڵەی شوجاعوددەوڵە لەکن باوکیەوە بوو.

خەدوو دەستی ئیلخانی ماچ کرد و سواری ئەسپەکەی بوو دەستی بە ناو تۆرەکەی تەرکبەنەکەی خۆی برد و کەمێ پارەی ئەوکاتەی لە تۆرەکەی دەرهێناو ڕژاندی بەسەری کوڕی ئیلخانی و ڕژاندیە نێو شەقامەکە کەهەژارو فەقیرەکان هێرشیان کرد و بۆ وەدەست هێنانی پارەکان یەکتریان لەژێر دەست و پێ ئەکرد.

خەدوویش لە حاڵێکدا سوار ئەسپەکەی بوو شەلاخێکی بەبۆنەی ئیحترام لەبەرانبەری شوجاعوددەوڵەتەکان ئەداو، تون لە ئەسپەکەی داو بەرەو شەقامە بەرد فەرشەکە غاری کردو دوورکەوتەوە.

ماوەیێک لەم کاروبارە تێ‌نەپەڕیبوو کە قەواموسەڵتەنە هەروا کە وترا بەمەکروفریو،شوجاعوددەوڵەی کەلەبچە کرد و لە مەشهەددا خستیە بەندیخانە و خەدوویش کە لەکینەی تاج حەمەخان ئەترسا ماوەیێ لەئەسفەراین و زەمانێ لە دەوربەری سەرحەددەگەڵ سوارەکانی خۆی ژیانیان تێپەڕکرد و لەبەین عەشق‌ئاوای ڕووسیەو خوراسان هات و چووی ئەکرد.

### سەردەمی شۆڕشی خەدوو سەردار

خوداویردی لەعەشق ئاوا بە دەستی یەکێ لەتورکە کۆچەریەکانی ئەوناوچەیە کە لە گەڵیا هات‌وچووی بوو، بە سەرۆکەکانی کومونیستی عەشق ئاوا ناسێندرا.

ڕووسەکانیش کە لە پێشینەی شەڕاشوویی و بێ باکی خەدوو ئاگادار بوون، بەچاکە چوونە پێشوازییەو و لەگەڵیا قەوڵ و قەراریان بەست کە ئەگەر بتوانێ حکوومەتێکی کومونیستی لەباکووری خوراسان دابنێ،پاڵپشتی لێ ئەکەن.

ئەم کات کە شوجاعوددەوڵە لەمەشهەدا لەبەندیخانەی قەوام دا بوو، کۆچی دوایی کرد. ئیتر لەباری ویژدانییەوە خەدوو بەرگرێکی بۆخۆی نەئەدی کە هێرشی خۆی دەس پێ بکات. چون ئەویش لە تاج حەمەخان کە لە ئەم کاتەدا جێگری حکوومەتی قووچان بوو زۆر دڵگیر و ناراحت بوو هەروەها فەرەجولّلاخانی شیروانی کە ئەوی بە شیروان ڕێ نەئەدا، ڕقی لێ هەڵسا، بەم چەشنە ناوەندی حکوومەتی خۆی بەقەلاگلیان لەباکووری ڕۆژهەلاتی شیروان گوێزایەوە و هێرشی کومونیستی خۆی دەست پێ کرد.

کومونیستەکان بە هۆی قەوڵ و قەراری خۆیان،لە پلەکانی هەوەڵین‌دا یاریدەری خەدوویان کرد. و بەهۆی قەوڵی عەلی بەگ کورد بورزانلوو دووسەد فیشەک و ٥٠-٦٠سنوق تەلاو و پارەی زێوی ئێران ونزیک بەیەک هەزار چەک کەبریتی بوو لە چەکەئینگلیسی و موسەلسەل بەخەدوویان دا کەبۆ گلیان گوێزایانەوە. خەدوو بەر لەوە کەشۆڕش بکات؛ دووجار بەیارمەتی کوڕی ڕەئیسوتوججار لەگەڵ قەوام دیداری کردبوو[١٨١]

خەدوو لەم کاتەدا بنکەی حکوومەتی خۆی لەدێ گلیان لە باشووری ڕۆژهەلاتی شیروان دانابوو.

چاوپێکەوتنی خەدوو لەگەڵ زینوویەف[١٨٢]ئەوی بە بڕیاری ڕووسیە

---

١٨١- قەوام بەیاری سەرۆک تاجرو دەستەیێکی دیکە مەبەستیان وابوو خوراسان لە ئێران جیا بکەنەوە و بە ئەوسەربەخۆیی بدەن، وادیارە وت و وێژی قەوام و خەدوو لەم بارەوە بووە، بەلام قانوون و یاسایان لە باتی جەهان‌بینیەوە فەرقی بووە. قەوام لایەنگەری خوراسانی جیا نزیک بە سیاسەتی بریتانیایی بوو، بەلام خەدوو وای ئەویست حکوومەتی کومونیستی سۆڤیەت لەوێدا بێنێتە سەرکار. بەم بۆنەوە مەبەستیان جیاواز بوو. ئەگەر خەدوو لەگەڵ قەوام هاودەس ئەبوو شایەد مێژووی خوراسان بە جۆرێکی دیکە لاپەڕەی بخواردبای.

١٨٢- زینوویف لە دوای مەرگی لنین لەگەڵ ستالین کێبەرکێ کردو لە ئاکامدا بەفەرمانی ستالین

کومونیستیەکان هیوادار کردبوو. بە تایبەت ڕووسەکان بەحەیدەرخانی ماموغڵی کە لەم کاتەدا لە مەشهەد خەریکی کاروباری کمونیستی بوو ئەمریان پێ کردبوو کە خەدوو یاری بکات. حەیدەر خان ماموغڵی بەرەو گیلیان چوو. قەلا و بورجەکانی خەدووی چاو پێ کەوت و لەوێدا لە ناوەندی ئەو بورجانە کەدەوراودەوری قەلا دانرابوون خەتی پەیوەندی کێشا تا ئەگەر جەنگ دەستی پێ کرد خەدوو فەرمانەکانی ڕاستەوخۆ بە هەواڵەکان بڵێ. بێ گومان جگە لە حەیدەر خان،ڕێکخراوەی جاسووسی شەورەوی لە قووچان لەگەڵ خەدوو پەیوەندیان بوو. ئەم کاروبارە لە ناوەندی وتووێژەکانی ئاقابکووف بەچاکە ڕوونە[١٨٣].

ئاقا بکووف لەم کاتەدا ڕاپۆرت دەرانی زیرەکی لە ڕۆژئاوای ئیران دانابوو.

کاروئیشی خەدوو لەنزیکی شیروان، ترسی خستە نێو دڵی فەرەجوڵلاخان شیخ ئەمیرلوو حاکمی ئەو کاتەی شیروان و ئەویش لەگەڵ خەدوو دوژمنی هەبوو، حەمەڕەزا میرزا خان ناسراو بە شوجاعولسوڵتەنە کە لە دوای کەلەبچەکردنی شوجاعوددەولە کە بە حکوومەتی قووچان دانرا بوو زۆرپێچی هاورد تا لەگەڵ خەدوو شەڕ بکات و ئەم شێرە لەناخەوە بخنکێنێ.[١٨٤]

---

کەلەبچەکرا و لەسێدارە درا. فەرهەنگی مەساحب، ب ١، ل١٢٠٢. بۆ ئاگاداری زۆرتر لە ئاکامی زینوویف و دیکەی ڕەقیبانی کە ستالین لەناویانی برد ، لەکتێبی بیرەوەریەکانی باژانوف وەرگێڕاوی دوکتور عەنایەتوڵلا ڕەزا کەلک وەربگرن.

١٨٣- ئاغەی قودرەتوڵلای ڕەوشەنی زافەرانلوو مندالی موزەفەروسسەڵتەنە کە خۆی لە نووسەران و وەرگێڕانی ئێرانە، لە کورتە بیرەوەرێکدا کە لەناوەندی فیشەکانیدا بوو، وای نووسیوە: نامەیێکە لە تاران ولەلایەن نوێنەرایەتی بریتانیا بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا، لەناویدا لە بوونی خوداوێردی ڕاپۆرت ئەدات کە لەلای بلشویکەکان سۆڤیەتەوە پالپشتی ئەکەن و پێکەوە بوونی ئەولەگەڵ بلشویکەکانی گیلان و مازەندەران و ئازەربایجان ئەگەیەنێ. کەوابوو ئەگەر بەڵگەکانی پارێزگاری خوراسان و نوێنەرایەتی بریتانیا و ڕووس و مەشهەدیان لەناو نەئەبرد جێگەگەلێکی تاریکی زۆرمان لە مێژووی ئەو سەردەمە بۆ ڕوون دەبووە.

١٨٤- ئاغەی شاکری لەکتێبی جوغرافیای مێژوویی قووچان، حاکمی ئەم کاتەی قووچانی ئەمیر تەیموور کەلالی لە خانەکانی هەزارەی ڕۆژهەلاتی خوراسان نوێنەرایەتی پێشووی پارلمانی ئەنجومەنی نەتەوەیی ئێران ناوبردووە. خوالێخۆشبوو عەلی بەگ بورزانلوو خوالێخۆشبوو سەرهەنگ

حاکمی قووچانیش کارەساتی بەقەواموسسەڵتەنە ڕاپورت دا. قەوام یەک دانە شمشێر و حوکمی سەرۆکی سوارەکانی ڕێگەکانی بجنووردـ شیروان، قووچان ـ باجگیرانی بۆخەدوو هەنارد تا بۆ مەبەستەکانی دانەهاتووی خۆی قازانجی لێ وەربگرێ، بەڵام خەدوو قەبووڵی نەکرد .چونکە هەروا کە گوزەرا مەبەستەکانی قەواموسسەڵتەنە لەگەڵ خەدوو لەباری سەربەخۆیی خوراسان جیاواز بوون. ئەو هەواداری بریتانیایەکان و ئەمیش هەواداری ڕووسەکان بوو.

ئاغەی شاکری لەزمانی خوالێخۆشبوو حاجی عەباسی قووچانی وای هاوردووە:

وتارێ بڵاوبووەوە کە ڕووسەکان لەگەڵ خەدوودا پەیوەندیان بوو.نهێنی بۆ ڕووسیە هاتوچووی بوو. بە چەکەکانی زۆر کە لەڕووسیە هاوردبووی مەبەستی وابوو بەپاڵپشتی هەموو خانەکوردەکان هێرش بکاتە سەرقووچان و مەشهەد و هەروەها ئێران.

لەم کاتەدا حسەین خان هوژەبەرولمەلێک پێشکاری پێشینی شوجاعوددەولە کارەساتەکەی بۆقەوام تلگراف دەکات کە ئەگەر ئیزنی تەواوت هەیە،خانەکانی کوردی ناوچە سنووریەکان لە خەدوو جیا کەیتەوە( لەم کارەساتە خەدوو بەرزئەبێتەوە چون چەکەکانی ڕووسی بوو نەیانئەتوانی لەبەینی ببەن) قەواموسسەڵتەنە چارەی وابوو جگە لەکەڵک وەرگرتن لە هێزەکانی ئەمنیەی خوراسان بەکەڵک وەرگرتن لەخانەکانی قووچان و بجنوورد و شاهرووود و هەروەها لە خانەکانی شارەکانی دیکەی خوراسان بە ماوەی سێ مانگ لە ناوچەی شیروان لەگەڵ خەدوو بەربەرەکانێ بکات. لە ئاکامدا چواردەوری خەدووی گرتووە و ڕووسەکانیش دەستیان لە پاڵپشتی ئەوکێشا. خەدوویش بۆ ڕووسیە دەربازبوو و کارەساتی خەدوو تەواو دەبێت.[١٨٥]

بەڵام کارەساتی خەدوو بەم ساکاریە تەواو نەبوو بەڵگەگەلێ کەلەم بارەوە بە دوادا دێن، جێگاو کارەکانی خەدووی تا ڕادەیێ ڕوون دەکاتەوە.

---

سەفاپووریش ئەو بروایانە پەسەن کرد. وادیارە ئەمیرتەیموور لە دوای شوجاعوسوڵتان بووە.

١٨٥- جوغرافیای مێژوویی قووچان، شاکری ل٦٨.

## بەڵگە گەلێک سەبارەت بە خەدوو سەردارو بارودۆخی خوراسان

وەزارەتی ناوخۆیی دایرەی کابینە تلگرافی شوجاعوددەولە لە قووچان. ڕێکەوتی ڕەجەبی ١٣٣٦ ژمارە ١٠ بەرانبەری ٢١ ی خاکەلێوەی ١٢٩٦

مەقامی گەورەی وەزارەتی نێوخۆیی

بە هۆی بایەخێ کە دەوڵەت بە خوداوێردی داویە، ناو بانگی دەرکرد و ڕێگەبڕلەئاودەرهات ماوەیێکە کە کەسێ کاری نەبووبەسەریەوە، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە تاوێ ئاسوودە دەمێنن وهەمیسان گیر دەکەون. ئەگەر ئیزنی لە ناو بردنی ناوبرا نەدەن بەتەواوی لاپەڕەکانی خوراسان خراپ دەکات و ئەبێتە هۆی زەحمەتی حاکمانی دەوڵەت. لەهەمان کاتدا خەرجەکانی سوار و فیشەکیش ئەبێ دەوڵەت بیدا ئەگەر وانەبێ ئا بەم حاڵەدا کە هیچ شت نیە و ئیش وکار زۆر سەختە. ژمارەی سێ ڕەنجبەری شوجاعوددەولە.

فەرمانی وەزیری ناوخۆ لە لەپەراوێزەوە بەم شێوەهاتووە.

دایرەی ڕۆژهەلات ولام دەنەوە قەواموسەڵتەنە بەڕێ کەوتووە و وەزارەتی ناوخۆیش یاری ئەکات. ژمارەی؟ ڕەجەب[١٨٦]

## لە تاران بۆ خوراسان

ژمارەی نووسین ٢٧٦ بە ڕێکەوتی ٢٢ یخاکەلێوەی ١٢٩٦بەرانبەری ٢ ی ڕەجەبی ١٣٣٦.

پارێزەری ڕێزداری خوراسان وسیستان

هەروا کە ئازیزتان دەزانن خوداوێردی ناو بانگی دەرکرد و ماوەیێک بوولە دەوروبەری قووچان و شیروان یاخیە و ئەبێتە هۆی زەحمەت، بەرگری لە ناو براو لە ئەستۆی گەورە ئیلخانی بجنووردە. ئەبێ بفەرموون ئەگەر کە شیروان بێتە بەشێ

١٨٦- ئەم بەڵگە، بەڵگەی ئارشیوی ناوەندی بەڵگەکانی نەتەوەییە. هەروا کە ئەبیندرێ ڕۆژی پێشوو وەزیری ناوخۆ ئەم تلگرافە لە سەبزەوارەوە بۆ والی خوراسانی نارد، تا خەدوو کەلەبچەبکرێ.

لەبجنوورد هەزار و پانسەد تمەنیش له باتی مووچەی دووسەد نەفەر سـواره بـدەن. ناوبراو ئامادەیه خەدوو لەناو ببات.

وەزارەتی ناوخۆ شیروانی کردوەته بەشێ لەبجنوورد و مافی سوارەکانیش هەروا که بەرپرسانی دەوڵەت بەرقەرار و ئیزنی دانی پاره کەیان داوه و ناو براو وادیـاره بـەر له ماڵیەگوتوویه ئەگەر ناوبراو نەیتوانی خـەدوو کەلەبچـەبکات و لەبـەینی ببـات لـه ساڵی ڕابردووی شوجاعوددەوله ئیلخانی قووچان بـۆی دابـین ئـەکرێت کـه ئەگـەر بەدانی خەدوو یاخیگەری تەرک بکات وبەڕاستی خزمەت بکـات زۆرباشـه. وەزارەتی ناوخۆیش ولامی داوه کەهەر کات ناوبراو چەکەکانی لێ بستێنێتەوه وئەو دزیانه کـه له خەلکی کردوویه بیداتەوه وزەمانەت بدات که ئەم کاروباره دەست پـێ نەکاتـەوه. کـه پـەنـا ئـەدرێت. شوجاعوددەولـه ئـەم ڕێگانـەی بـەدی نـەکرد وجگـه لـەوه یارمەتیشیداوه.

یەک وشه ناخوێندرێ تلگراف نهـێنی لـەناو بـراو شوجاعوددەولـه هـاتووه کـه سەواد ئەو له گەڵیا ئەهێنرێ چون بەم جوره...ئەرکە... لەسەرتەوه پـەس لـه دوای دیتنی هەرجۆر باشه و بەچاکی دەزانن دەست بەکار بن و وزارتیش لـه ئاکـامی کـار ئاگا کەنەوه. (ئیمزای وەزیری کاروباری ناوخۆ)

*********

**له تاران بۆ مەشهەد:** ڕێکەوتی دووشەممه گـەلاوێژی ١٢٩٦ ١٧ی زیقەعـدەی ١٣٣٦. ژمارەی نووسینگه١٥٩٠

پارێزەری ڕێزداری خوراسان وسیستان

به هۆی ڕاپۆرتی شیروان نەسروئەڵلاخان زافەرانلوو جێگری حکوومەت لەگـەڵ سوارەکان له شیروان کەوتوونه ڕێگا خەلکی زۆرتـر لـه تلگرافخانـه کـۆ بوونەتـەوه و کاروبار لەشاردانیه. چی بکەین فـەرمان بـەن کـه هـەر ئیشێ لـه بـاری ئاسایـشی خەلکی بکرێ، وزارەتی ناوخۆئیش له کاروبار ئاگادار کەنەوه.

*********

**هەواڵەکانی تلگرافی ناوخۆیی مەشهەد**

بەشوکری خـوا شـار بـه تـەواوی وا لـه ئاسایـشدا. خـوداوێردی زافـەرانلوو کـه

کاروباری پێویستی بەگوتن نیە و لە هیچ کام لە والیەکانی خوراسان سەری دانەنەواندبوو بە فەرمانی پارێزەر ئەمشەو دێتە مەشهەد. خوراسان لەوجوودی شەڕاشوەکان خاوێنە ویاخی و چەتە نەماوە.

٢٧ عەقرەوی١٣٣٦ی مانگی، ڕێکەوتی ٢٧ی گەلارێزانی ١٢٩٦ کەبڕیار بووە قەوام وخوداوێردی چاویان بەیەک بکەوێ.

*********

## هەواڵی ڕووداوەکانی شیروان

ڕۆژنامەی ڕووداوەکانی شیروان لەم بارەدا بەم چەشنە هاوردوویە:

دوابەشی هەواڵەکانی ناوخۆی شیروان (١٣سەرماوەزی ١٣٣٧ی مانگی)

ئاسایش پێکهاتووە و بە هۆی بارینی زۆری باران خەلکی خوشحاڵن. ١٢ کەس لە دزەکانی قۆشخانەو[١٨٧] بێبەهرە[١٨٨] (یەک وشەی نەخوێندراوە )بە هۆی نەبوونی سەرپەرشت و جێگر یا قەزاق[١٨٩]لە دەوروبەری سنووورداخەریکی دزیوچەتەیین. بە خاکی شیروانیش دەستدرێژیان کردووە و ڕێگای سەرحەدی قۆشخانەیان گرتووە چەن کەسیان ڕووتەوە کردووە، دوێنێ لەسێ فرسەخی شیروان لەگەڵ سێ کەس لە پیاوەکانی نەسروللاخانی برای زەغیمولمەلکی دوایی ڕووبەڕووبەرەو دەگەلیان بەربەرەکانێ کردووە، نوورمحەممەد ناوێ بریندار ئەسپ وچەکی ئەوی گرتووە، دوێنێ برینداره‌کەیان بۆ شیروان هاوردوە، خەریکی سارێش کردنی زامەکانیەنن. حکوومەت مەبەستی وایە کەمێ لە سوارە نیزامەکان لەگەڵ چەن کەس لە

---

١٨٧- قوشخانە یەکێ لە لادیەکانی سنووری قووچانە. کەوابوولە باکووری شیروانەوە لەگەڵ ڕووسیە هاوسنوورە. ئەم لادێیە پاشتر هاتە سەرشاری شیروان.

١٨٨- بێبەهرە یا بێوارە یەکێ لە لادیەکانی دێهاتی سنووری سیوکانلوو لەسەر ڕێگای شیروان_ئووغازە.

١٨٩- لەم کاتەدا شیروان بێ حاکم مابوو. شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو حاکمی قووچان، حەمە ئیبراهیم خان ڕۆشنی لە حکوومەتی شیروان لابرد و تاج حەمەخانی بادلانلوو قووچانیش بۆ حکوومەت نەهاتبووە نێو شیروان. ئەم سەرلێشێوانە بەردەوام بوو. هێزەکانی قەزاق کەبە هێزەکانی حکوومەتیان ئەگوت، بەڕاستی دەستیان لەهەموو کارێ برا بوو.

سـوارەکانی خـوداوێردی[١٩٠] بـە شـوێن شەڕاشـوەکاندا بنێـرێ. جێگـەی سـنووری خوار[١٩١] هەمووی لە قووچان و سەر حەددا بێ خـاوەنـن. (١٣ قـەوس (سـەرماوەزە)، غولامڕەزا[١٩٢])

*********

## دوابەشی هەواڵەکانی ناوخۆیی شیروان

لەسوارە وەلیخان تا ئێستا هـیچ هەواڵـێ نـەهاتووە. خـوداوێردی و سـوارەکانی ماتڵی ئەوانن. دوێنێ ماژۆر واکس و ماژۆر کـاس ڕوو بـەبجنوورد ڕێ کـەوتوون. لـە قەراری ناو براو تا دەڕۆژی دیکە دێنەوە. بە هۆی هاتنی خوداوێردی بەرەو شـیروان شەڕاشوەکان لە خاکی شیروان جیا بوونەتەوە.

دوێنێ ئیوارە زەمان خان ساحێب لەگەڵ سی کەس سوارەنیزام هاتوون. چـون سوارەکان ئـەبێ لـە دەرەوەی خـاکی شـیروان بکەوێتـە شـوێنی شەڕاشـوەکان و کەلەبچەیان بکـات، حکوومـەت بەشـەرحی تلگـراف زووبـەزوو لـە قووچـان ئیـزنی وەرگرتووە.

١٨قەوس (سەرماوەز)ی ١٣٣٦. غولامڕەزا

فــەرمانێ کــە وزارەتی نــاوخۆ بــۆ دایــرەی ڕۆژ هــەڵات هەناردوویــە، ١٥ی ڕەبیعوسسانییە.

*********

## دوابەشی هەواڵە ناوخۆییەکان

شـیروان- ڕێکـەوتی ٢٨سـونبلە ٢٨ی گـەلاوێـژی١٣٣٦مـانگی خـوداوێـردی ووەلیخان قەرامانلوو لەگەڵ حەفتا کەس سوارە بۆ دوەین لـەدووفرسـەخی باشـووری

---

١٩٠- خوداوێردی سەردار ئا لەم کاتەدا لە لایەن حەمە ئیبراهیم خانـەوە سـەرۆکایەتی سـوارەکانی حکوومەتی شیروانی لەئەستۆ بووە، بەلام حەمـە ئیـبراهیم خـان شـاری بـەجێ هێشتووە و بـەرەو ئەسفەراین چووە.

١٩١- مەبەست لە خوارناوچە، شاری شیروان و ناوچەکانی باشووری ئەوە.

١٩٢- غولامڕەزا تلگرافچی شیروان بووە و کارەساتی ناوچەی بۆ ناوەند هەناردووە.

ڕۆژ هەڵاتی شیروان چوون و شێست کەس لەخەڵکی گیراون و حکوومەت خەریکی کۆکردنی کاروبارە. عەلی ئەکبەر لە نامەیێکدا کە بە بۆنەی کاروباری سەرەوە لە وزارەتی ناوخۆوە بۆ پارێزەری خوراسانی ناردووە. بە بۆنەی ڕاستیەوە هێنراوە و لە ڕێکەوتی ۲٤ زیقەعدەی ۱۳۳٦بەرانبەر بە ۸ی میزانی مانگی ڕەزبەری ۱۲۹٦ و ژمارەی نامە۱۹۲٤ بووە کە بەم تەرزە هاتووە:

پارێزەری ڕێزداری خوراسان وسیستان

بەپێی ئاگادارییێکەوە کە هاتووە خوداوێردی وەلیخان لەگەڵ هەفتا کەس سوار بە دوویەن لە دووفرسەخی شیروان چووە وشەس کەس لەخەڵکی ئەوێ کەلەبچە کردووە و حاجی ئەسەدوڵلای موجتەهێد دەرچووە بۆ قووچان ئەمر بفەرموون کەهەر کارەساتێ کە ڕوو بدا وەزارەتی ناوخۆیش ئاگادارکەنەوە.

ئیمزای وەزارەتی ناوخۆیی، ژمارەی ۱۹۲٤ڕێکەوتی ۱٦ی میزانی ۱۲۹۷(۲ی مانگی)موحەرەمی ۱۳۳۷

*********

ڕاپۆرت

سەرۆکی ڕێزداری وەزیران

چەن ڕۆژ پێش بەهۆی ڕاپۆرتی تلگرافی شیروان لەباری شەڕاشوویی خوداوێردی بە ئاگاداری پارێزگاری ڕێزداری خوراسان گەیشت، ئێستا تلگرافی وڵامەکەی ڕێزداریان:

چونکە خوداوێردی یەکێ لەشەڕاشوە ناو بانگ دەرکردووەکانی خوراسانە و زۆر زیانی لە دەوڵەت داوە و دزی زۆریشی کردووە. ئێستا لە ڕێگەی بێعیلاجیەوە خەریکی کاروبارە بە ڕاستی کە لە دوای حەرەکەتی قەوام دووپات لە خۆبایی بووە.

پەس داوادەکەم کەبفەرموون پارێزگاری ڕێزداری خوراسان خەدوو لەژێر فەرمانی خۆیانە ڕووبە ناوەند بنێرن تا لێرەدا بە کاروباری ئەو بگەین و بەرگری بکرێ لەشەڕاشویەکانی.[193] تلگراف لە قووچان بۆ تاران، ڕێکەوتی ۲۰ی ساڵی ۱۳۳۷.

---

۱۹۳- بەڵگە بەڵگەی ناوەندی بەڵگەکانی نەتەوەیی ئێرانە، ئەم ڕاپۆرتە کاتێ لە لایەن وەزیری

*********

بە درۆ پەخش کراوەتەوە، حەمە ئیبراهیم خان، خوداوێردی لە فورتاندا کەلەبچەکردووە ولەگەڵ سی کەس سوار بردوویە بۆ مەشهەد، ڕاستی و دروستی ئەم کارەساتە نازانرێ. تەقی هەروا کە ئەبیندرێ ڕێکەوتی مانگی ئەم تلگرافە ناوبراوە نادیارە بەڵام لەقەراری ژێرەوە دەرئەکەوێ کە ۲۰میزان ڕەزبەری ۱۲۹۷بووە لە ڕاپورتی ژێرەوە ئاماژە کراوە کە لە وزارەتی ناوخۆیی ڕاپورتی بە وزارەتی کاروباری دەرەوە لە باری کارەکانی شیروانەوە هێنراوەکە نازانرێ چی بووە.

*********

لەڕێکەوتی دەی ڕەبیعولئەوەڵی ۱۳۳۷

ژمارەی نووسین ۲۵۷هێنراوە لە ۲۲ قەوس سەرماوەز

وزارەتی ڕێزداری کاروباری دەرەوە، سواد ڕاپۆرتی تلگرافی بۆ دیتنی سەروکەکانی ئەو وزارەتخانە لەگەڵیا ئەهێنرێ.

بیرەوەریەکە لە وزارەتی ناوخۆیی بۆ پاریزگاری خوراسان بەم تەرزە نووسراوە:

لە دایرەی ڕۆژهەڵاتی ناوخۆیی لە ڕێکەوتی ۲۷ میزانی ۱۳۳۷ بۆ پاریزگاری ڕێزداری خوراسان وسیستان لەقەراری ڕاپۆرتێ کەهاتووە خەدوو بەدەستی حەمە ئیبراهیم خان لە فورتان کەلەبچە کراوە و هێنراوە بۆ مەشهەد، باشتر وایە کە ڕاستی و دروستی ئەم کارەساتە بڵێن. ( ۲۷ میزان ژمارە ۲۰۳٦)

تلگرافێکی دیکەیش لەم بارەوە بۆ پاریزگاری خوراسان لە وزارەتی ناوخۆیی هێنراوە کەلە کاروباری کەلەبچە کردنی خەدوو، حەمەئیبراهیمخان ئاگداربکەنەوە ولە هاوردنی ئەو بۆ مەشهەد وزارەتی ناخۆیی ئاگداربکەنەوە. ژمارەی نووسین ۲۰۳٦بەڕێکەوتی ۲۷ میزان بەرانبەر لەگەڵ ۱۳ موحەڕڕەمی ۱۳۳۷

---

ناوخۆیی بە سەرۆک وەزیری ئەوکات چووە کە خەدوو لەگەڵ قەوام ئاشتیان کردووە و قەوام بۆی یەکدانە شمشێر و حوکمی سەرۆک سوارانی ناوچەی شیروان و قووچانی بۆ هەناردووە چون وەزیری ناو خۆیی لەخەدوو ترساوە، لە سەرۆک وەزیرداوا کاربووە کە ئیزن بدا، خەدوو بۆ تاران ببەن ولەوێدا جەزروداخی بکەن تا نە وەک قەوام لەگەڵ ئەودا قەوڵ و قەرارێکی دانا بێ؛ بەڵام وسووق برای قەوام کەسەرۆک وەزیر بووە وادیارە گوێ بەم ڕاپۆرتەی وەزیری ناوخۆ نەداوە.

دەوڵەتی ئێران

ئارمی شیرو هەتاو

وزارەتی ناوخۆ تاران –مەشهەد بەڕێکەوتی ٤٦ ڕەبیعولئەوەڵی ١٣٣٧(١٨قەوس)

ژمارەی ٢٥١٩ کارتۆن ٦ بەشی نووسینگەی ڕۆژهەڵات ١٨ قەوس

پارێزگاری ڕێزداری خوراسان وسیستان

بە هۆی راپۆرتی تلگرافی لە شیروان ١٢ کەس لە دزەکانی قووشخانەو بێ بەهرەو کەمەر بە هۆی نەبوونی سەرپەرشت، زۆرتر لە ناوچەسنووریەکان دەس بەدزی و ڕێگەبڕی دەدەن و بە خاکی شیروانیش دەستدرێژیان کردووە و چەن کەسیان ڕووتەوە کردوە و نوورمەحەممەدناوێکیشیان بریندار و ئەسپ و چەکەکەی ئەویان بردووە.

بفەرموون دزە ناوبراوەکان کەلەبچە و ئاسایشی ئەو ناوچەیە ساز بکرێت و لەقازانجەکەی ئاگادارمان بکەنەوە.

*********

## وەڵامی تلگرافی قەواموسەڵتەنە بۆ وەزارەتی ناوخۆ بە بۆنەی کەلەبچەکردنی دزەکانی سنووری

لە مەشهەد بۆ تاران. ژمارە ٥٤٤٧ ژمارەی تەلگراف ١٥٣ژمارەی وشەکان ٦٨.

ڕێکەوتی ٢٥ یقەوسی ١٣٣٧مانگی

وزارەتی ڕێزداری ناوخۆ

تەلگرافی ژمارەی ٢٥١٩گەیشت. ئاگاداربووم ئیشێ رووی داوە. پەنجا کەسمان بۆ کەلەبچەکردنی دزەکان هەنارد دەستەیێکیانیان کەلەبچەکرد وبەدوای پاشماوەکەیانەوەن .لەم ناوچەیە تەنیا ئەم دەستە لەم شەڕاشوانە بەجێ ماون. کەوابوو ئەوانیش بەئیزنی خوای گەورە لە قازانجی کاروبارێ کە کراوە کەلەبچە ئەکرێن. ٢٤ی قەوس، ژمارە ١٠٥٦٤. قەوام.

## بەربەرەکانێ وەلیخان قارەمانلوو لەگەڵ خەدوسەردار لە ئەسفەراین

لە دوای ئەوە کە شوجاعوددەولە، حەمەئیبراهیم خانی ڕەوشنی لە حکوومەتی شیروان لابرد، ناوبراو چووەتەوە بۆلای ملک و ماڵەکەی خۆی لە ئەسفەراین ولە کاروباری سیاسی کناری گرت، بەلام عەبدوڕڕەزا شوجاعوددەولە کە بە هۆی ئەوە هێشتا دڵنیا بوو، فەرمانی قەتڵی ئەوی بە وەلیخان قارەمانلوو دا؛ بەلام وەلیخان حەزی لە کوشتنی حەمەئیبراهیم خان نەدەکرد، چون مەبەستی وابوو کەلەبچەی بکات.

وەلیخان لەگەڵ هاوڕێیانی ڕووبەئەسفەراین چوو؛ بەلام پێش چوونی ئەم هەواڵە لە نێو دەزگای شوجاعوددەولە بڵاوەوە ببوو. حەمە ئیبراهیم خان، خەدووی بەسەر ڕێگای وەلیخان کە وایدەزانی لەچەمی میانلوو و یا ئەردووغان لەباکووری ئەسفەراین هێرش دەکات هەناردی. خەدوو چەن ڕۆژ لەو جیگادا ماتڵی وەلیخان بوو. وەلیخان کە بە هۆی ڕاپۆرتدەرانی خۆی بەم نەخشە پەیبردبوو، ڕێگای خۆی گوێزایەوە، لە لایەن دەهەنەی ئوجاقخانەوە هێرشی کرد.

پەیکێ سوارەکە لەلایەن حەمە ئیبراهیم خان گەیشتە خەدوو ئەوی لە کاروبار ئاگادار کردەوە خەدوو بێدرەنگ بەرەو ئەسفەراین چوو لەگەڵ وەلیخان ڕووبەڕوو بوو. هێزەکان ئەگەرچی کەمبوون؛ بەلام ڕێکوپێک و بە مووزیکی نیزامی، وبە دەوڵ و سوڕنای مەسعوودخان دەرەگەزی کە بە داخوازی حەمە ئیبراهیم خان بۆ یارمەتی ئەو لەڕێگای تەخت میرزا و ڕوویینقەلاوە هاتبوون. هاتنە نێو ئەسفەراین و بووە هۆی قوەتی ڕۆحی هێزەکانی ئەسفراین. لەم شەڕەدا کە خۆشبەختانە کوشتەو برینداری نەبوو، مەهدەوی سەرۆک تاجریش کە ماڵ وملکی شوجاعوددەولەی بردبوو لەگەڵ هێزەکانی یاریدەری وەلیخان بوون و دۆستی وەلیخان و سەرۆک تاجر بەناچاری بەتەرکی بەربەرەکانێ و پاشەکشێ دەستی پێ کرد، چون زانی کە ئەگەر لە ئەنجامی فەرمانی شوجاعوددەولە بەتەرزێ ڕاستەقینە بەربەرەکانێ دوایی بێت و بێگومان هەندێ زۆر لەهەر دوولا ئەکوژرێن و ئەمەیش بە قازانجی هیچ کەس نیە.

بەڵام وەلیخان لە ڕێگـای گەڕانـەوە خـۆی بەباخـەکان و دەشـتی وێنجـەکانی میانلوو زیانی گەیاندو ئەسـپەکانی خـۆی بـە نـاو ئەوانـدا وێـڵ کـردو بـە شـکاندنی گۆزەکانی شیرەی هەنگووری باخدارەکان و کەلک وەرگرتن لە شـیرە لـە جێگـای ئاو بە قوڕ بۆ ئەسپی سوارەکانی ئاخوڕی دروست کرد. پاش ماوەیێـک کـە وەلیخـان ناراحەتبوو و بـە ئـەمری ڕەزاشـا بـە شـوێنیاندا چـوون، خواڵیخۆشـبوو کەربـەلایی ڕەمەزان میانلوو وتی کە ئێمە بۆ تۆڵەکردنەوەی ئـەم کـارە گۆزەکـانی ڕۆنی زەردی وەلیخانمان شکاند و ڕۆنەکەیشی بەجێ جۆ ڕژاندمانده نێـو ئـاخوڕی ئەسـپەکانمان. وەلیخان لە نامەیێک کەبە ڕێکەوتی ۱۷ی زیقەعدەی ساڵی ۱۳٤٦ مانگی بەرانبـەری ۱۳۰٦ هـەتاوی یانـێ چـەن ساڵـی دواتـر بـۆ حەمـە ئیـبراهیم خـان نووسـیویە، لەگیروگرفتەکانی کەشوجاعوددەوڵە بۆ حەمەئیبراهیم خانی پێکهێنابوو، بەم جـۆرە نووسراوە:

بەفیدات بم، دوای بەجێ هێنانی فرمانەکانت، ڕاستی وابوو کە ماوەیێک بوو لـە سلامەتی ئێوەی ئازیز ئاگادار نەبوین، تا ئەمە کە نووسراوەیێک کە بۆ ئاغـەی وەکـیڵ زادە نووسیبووتان گەیشتە لای ئێمە. لە سلامەتی بەرێز زۆر زۆر شادبووم.

لەبارەی نووسراوەکانی خواڵیخۆشبوو شوجاعوددەوڵە کە بـۆ ئێـوە هـەناردبووی هەموو تەرزبۆ ئازاری گیانی ئیوە لەوێ ئامـادەبـوون. لـەو کاتـە بەندەیـشیان بەسـەر پەرشتی سواری زەعفەرانلوو[۱۹٤] بۆ کەلەبچە کردنی ئێـوە هـەناردبوو. نووسـراوەی زۆر لەدەستم دان؛ بەڵام لەنێو قەلادان.[۱۹۵] بەندە چوار پەنج ڕۆژ لەشاری قووچان ئیشێکی گرینگم هەیە. دوای ئەنجامی ئیشەکە بۆقەلا دەڕۆم و عەینی خـەتی خواڵیخۆشـبوو شوجاعوددەوڵە و نووسراوەکان بۆ ئیوە ئەنێر م، دڵنیابن.

لە گۆشەی ژووری نامەکەوە سلاو و پەیامێ بە ئاغەی هوژەبرولمەلـک قووچـانی دراوە. (ئیمزای وەلی قارەمانلوو مۆری ئەویش لە پشتی نامەکەوە.)

---

۱۹٤- ئەمیری سـوارەکانی زەعفـەرانلوو یـانی سـەرۆکی سـپای کوردەکـانی ژێرفـەرمانی ئیلخـانی قووچان، کە تا ئێستا بەکەمتر کەسێ دراوە.

۱۹۵- بەڵگەلەبەڵگەکانی خواڵیخۆشبوو حەمە ئیبراهیم خانە.

## دزرانی پۆستی دەوڵەتی بەدەستی خەدوو

یەکێ دیکە لەوزەربانەی کەخەدوو بە پەیکەری حاکمی قووچان و والی خوراسان دای، دزینی پوستی دەوڵەتی بوو کەبایەخێ زۆری بوو پارەی زۆری تێیدا هەبوو. خەدوو بە وەدەست هێنانی ئەم پارە ماوەیێک بەکاروباری خۆی و سوارەکانی سەروسامانی دا وچەن دەشت باخە هەنگوور و زەوینی لەباشووری ڕۆژهەلاتی شیروان کڕی. ئەم کارەساتە وادیارە ئەبێ لە ئاخری ساڵی ١٢٩٩ هەتاوی کرابێ.چون لەنامەیێکدا کە خوالێخۆشبوو حەمە ئیبراهیم خان لەولامی نامەی ڕێکەوتی ١٥ جۆزای ساڵی ١٣٠٢ خوالێخۆشبوو میرزا سلێمان خان خوسرەوی سەرپەرشتی ڕۆژنامەی هەتاوی تاران نووسراوە وادیارە نەهێنراوە یان پاک نووسەکەی هێنراوە بەم کاروبارە ئاماژە کراوە و توویەکە:

لە دوازدە ساڵ پێش کەبۆ شەڕی ملکی قاسم ئاوا، لەملکەکانی خۆم کەشوجاعوددەولە بەسەرۆکی تاجرەکانی خوراسان فروشتبووی، لەمەشهەد بووم خوداوێردی شەش هەزار تمەن پارەی دەوڵەتی لەنێوانی خاکی قووچان- بجنوورد دزی بووی. دەوڵەت تاوانی ئەودزیەی لەحاکمەکانی ئەو ناوچەیە گەرەک بوو. ئەوان یانێ والی خوراسان و حاکمەکانی قووچان و شیروان و بجنوورد بە ناوی ئەمەی کە خوداوێردی ماوەیێک نەوکەری من بوو کلاوێکیان بۆ بەندەدروست کردووە کە ئەم کلاوە بووەتە جەنگێ کە کەوتە دەستی سەرۆکی تاجران کە درێژەی هەیە...[١٩٦]

هەروا کە دیارە، خەدوو لەم کاتەدا بەتەواوی یاخی بووە. بەتێپەڕ کردنی ڕۆژگاری خۆی لە کێوەکانی باکووری خوراسان بەشۆڕشی خۆی دوایی ئەبەخشێ و هەرکات دەرفەتی وەدەستی ئەکەوێ دەسڕێژئەکاتە سەر هێزەکان و حاکمەکانی دەوڵەتی.

دزینی شەش هەزار تمەن لەوکاتەدا کەم نەبووە، بە ئەم پارە ئەکرا ١٥-٢٠هەزار

---

١٩٦- ئەم نامە کە بە دەسنووسی خوالێخۆشبوو حەمە ئیبراهیم خان موزەفەروسەلتەنە زەعفەرانلووە شتهایی تیایە کە سرنج دانی زۆر چاکە کەلەبەرگی شەشم لەجێگای خۆی دێن.

دانە پەز بکرِایە یان سەدان هێکتار زەوین و باخ .

*********

بەڵگەکانی دیکە لە بواری خەدوو سەردار لە دوای بەجێ هێشتنی شیروان ٢٤ ئەسەد، مانگی پووشپە، وادیارە ١٢٩٩

ئێستا کە پێش نیوەڕووە نەسروڵلاخان جێگری گشتی شیروان لەگەڵ سوارەکانی لە شیروانەوە حەرەکەتی کردووە و بۆ قەڵەندەر ئاوا چووە.[197] سوارنەگات منیش حەرەکەت دەکەم. هەرکارەساتی کە پێش بێت کێ وڵام ئەداتەوە. خەڵکیش هاتوونە تلگرافخانە، تلگرافیان بۆ قووچان کردووە. تلگرافەکەی سەرۆکی ئەمنیەتیش نووسراوە:

عەلی ئەکبەر لە لای حەزرەتی حاکمی قووچان لەگەڵ تەواوی سوارەکان لە شارەوە کەوتوونەڕێ و کەس نیە تا ئێوارە سوارنەگات منیش حەرەکەت دەکەم. خوداوێردیش لە ڕەززموغان دایە. (سەرۆکی ئەمنیە)

ئەم تلگرافە وادیارە بۆ تاران هێنراوە و ئەم باسە حەکایەت دەکات کەنەسروڵلاخان برای فەرەجوڵلاخان زەغیمەلمەلەکی دوایی کە جێگری حکوومەتی شیروان بووە، لە ترسی خەدوو سەردار کەلە لادێ ڕەزموغانی شیروان نیشتە جێ بووە، بەلادێ قەلەندەرئاوا کە مولکی بابی نەسروڵلاخان لە باکووری شیروان بوو، چووە و شاری شیروانیش بێ ساحێب ماوەتەوە. کەسەرۆکی ئەمنیەی شیروان لە ئاوا تلگرافێ هەڕەشەی کردووە. ئەگەر سواری یاریدەر لە قووچان بە شیروان نەگات، ئەویش شار بەجێ دێڵی.

لە ژێری تلگرافەوە وزارەتی ناوخۆیی نووسراوەکە:

---

١٩٧- نەسروڵلاخان برای فەرەجوڵلاخان زەعفەرانلوو لەبنەئامۆزاکانی حەمەئیبراهیم خان ڕۆشنی و شوجاعوددەولە بووە. قەڵەندەرئاوایش بە ناو قەڵەندەربەگ بابی وی لە لادێکانی ئەوێ بوو. نەسروڵلاخان و براکەی فەرەجوڵلاخان دوایی چوونە نێو دەوڵەت و ڕەزاخانیان یاری کرد و کاتێ ڕەزاخان بەپاوشایی گەیشت و ئیسکۆرتی ویست بگرێ . بۆیە نەسروئەڵلاخان بە نوێنەرایەتی ئیلی زەعفەرانلوو بۆ تاران چوو لەگەڵ ڕەزاشا بوو کە لە جێگای خۆی بە ئەو ئاماژە ئەکرێ و بەڵگەکانی لەو بارەوە دێن.

دایرەی ڕۆژهەڵات بگات بە خوراسان و دەست بە جێ بەرگری لە... بکات.
١٦ زیقەعدە[١٩٨]

*********

## بارودۆخی خەدوو سەردار لە دەوڵەتی ئێران لە کاتی شۆڕشی کوموونیستی

دەوڵەتی ئیران. شێروهەتاو. وزارەتی ناوخۆ. نووسینگەی ڕۆژهەڵات. تاران- مەشهەد. لە ڕێکەوتی ٩ سەرەتان. گەلاوێژ ١٢٩٩. شەوال ١٣٣٨

پاریزگاری ڕێزداری خوراسان وسیستان قەواموسسەڵتەنە!

کارداری بجنوورد ئاگادار دەکاتەوە کە خوداوێردی خەدوو نەوەد کەس لەشەڕاشوەکان کە لە ناو ئەواندا شەش کەس قەفقازیش[١٩٩]هەن، لە لای خۆی کۆی کردووەتەوە. هەشتسەد دانە چەک و سێ دانە تۆپی شەست تیر لە بلشوویکەکانی کڕیبوو. خەیاڵی هێرشی بەشیروانی بوو. هەروەها باوڕی هەبوو کە ئەگەر بە زوویی هێزەکانی لەمەشهەد بۆ سەرکوت کردنی ئەوان نەنێرێ دەوروبەرەکانی خوداوێردی هەروا کە خۆیان وتوویانە دەستە دەستە ئەبنەوە. گەرچی تا ئێستا تەواوی کارەسات نەنووسراوە بەڵام لە بەڕێزتاندا بەتەواوی دیارە کە کاروبارێ کە ئێستا هەیە زووتر تەواو بەسەر پێچی ئەوان نەدرا بێ وخوداوێردی ئەزیەت نەبێ. کەم کەم دیکەی شەڕاشوەکان بەوان هێرش دەکەن و شەڕێ هەرەگەورە دەست پێ دەکات، بەسەرۆکی دەسەڵاتدارەکە کە لەئەم کاتەدا لەلایەن ئەو ڕێزدارەوە بە هۆی ئەمنیەت و نەزمیەی گشتیئەو لاپەڕەکان نووسراوە. لەم کاتەدا دەوڵەت ماتڵە و بۆسەرکوت کردنی خوداوێردی دەسووڕا .[٢٠٠]

*********

### «مەبەستی ڕاستەقینەی دەوڵەت بۆ سەرکوت کردنی خەدووسەردار»

---

١٩٨- بەڵگەلەئارشیفی دایرەی بەڵگەکانی نەتەوەیی ئێران وەرگیراوە.

١٩٩- بەلام ڕاپۆرتی کارداری بجنۆرد بۆ وەزارەتی ناوخۆیی بە بۆنەی هەواڵە دروەکان بووە مەگەرنەهیچ قەفقازیێ بەو جۆرە تا ئێستا لەسپای خەدوودا نەبووە، چونکە تەواوی هاوڕێیانی خەدوو لە کوردەکانی ناوچەی شیروان بوون.

٢٠٠- بەڵگە لە دایرەی بەڵگەکانی نەتەوەیی ئێران وەرگیراوە.

لەمەشهەد بۆ تاران. تلگرافی ڕەمزی ژمارەی ١٠٦ بەڕێکەوتی ١٦ی سەرەتان. گەلاوێژی ١٢٩٩ بەرانبەری ٢٠ی شەوالی ١٣٣٨پارێزگاری ڕێزداری خوراسان و سیستان!

لە شوێنی تلگرافێ کەبۆ سەروک وەزیران هێنراوە، زەحمەت زۆر دەبێ کە: دەبێ خەدوو سەرکوت بکرێ.

*********

## دەوڵەت گەیشتووەتە ئەوقەناعەتەی خەدووی سەردار سەرکوت بکات

لە تارانەوە بۆ مەشهەد .ژمارە و بەرواری تەلگەراف ١٦ی گەلاوێژی ١٢٩٩هەتاوی

ئەیالەتەکانی خوراسان و سیستان:

پاش هاتنی تەلگەرافێ بۆ سەرۆکی وەزیران[٢٠١] ڕاگەیەندراوە: دەوڵەت گەیشتووتە ئەوقەناعەتەی تا بەرنگاری خوداوێردی و دارودەستەکەی ببێتەوە، بۆیە ئێوەش دەبێ بە باشترین شێوە یارمەتیدەربن سەبارەت بە بلشوویکەکانیش کە دەوڵەت پاش دوورۆژی دیکە دەگات بە قەناعەتێکی باش بە شێوەی ڕەفری ڕای دەگەیەنم پێتان. (واژۆی وەزیری ناوخۆ)

## داکۆکی دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی خەدو

لە تارانەوە بۆ مەشهەد خێرایی ژمارە تەلگراف ١٢٩٩/٥/١٧

ئەیالەتەکانی خوراسان و سیستان:

---

٢٠١- سەرۆک وەزیرانی ئەودەم حەسەن موشیردەولەبوو کە ڕۆژی ١٢ی گەلاوێژی ١٢٩٩ هەتاوی و پاش ڕۆخانی کابینەی وسوقوددەولەی برای قەواموسەلتەنە دەسەلاتی گرت و ٣ی خەزەلوەر دەسەلاتی لێ وەرگیردرایەوە و فەتحوللاخانی سپەهدار ئەعزەم لەبەرواری ٢٣ی خەزەلوەردا چووە خزمەتی ئەحمەد شا و تا ١٢٩٩/١٢/٢٩ واتا کۆدتای ڕەزاخان دەسەلاتی بوو، پاشان سەیدزیاتەباتەبایی دەسەلاتی گرتە دەست و کەوابوو شۆڕشی خەدوو لە سەردەمی چەند سەرۆک وەزیردابووە.

تەلگرافی ژمارە ١٢٩١ سەبارەت بە خوداویردی خان و بارودۆخی خوراسان گەیشت،دەوڵەت بە هۆی هێزوتوانای لە زۆری ئێوەوە تکای هەیە تا دوایی بهێنن بەم ئاکارە ناڕەوایە.

تەلگرافێکی تر گەیشتووە، وەک خۆتان دەزانن دەوڵەت گەیشتووتە ئەوقەناعەتەی هەمووی شۆڕشگێڕەکان لە ناو ببات و بۆیە بیروڕای بەڕێزتیان بۆمان گرینگە[٢٠٢]

*********

هەمیسان تەلگرافێک ڕەمزی سەبارەت بەشەڕێک لە نێوان خەدوو هێزەئینگلیزییەکان دا لەباجگیران.

ئەیالەتی خوراسان و سیستان

بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی کەبە دەستمان گەیشتوون وادیارە لە شیروان ڕەیسوتوجار لە وتووێژەکانی لەگەڵ خەدوو نەگەیشتووتە ئاکارێکی باش و نائومێد گەڕاوەتە مەشهەد و لە جەریستانی سیووکانلوو و بیچرانلوودا سەربازێکی ئینگلیزی بە دەستی هێزەکانی خەدوو کوژراوە و مەترسی ئەوە هەیە کە ئەودوو هێزە لەیەک بدەن.

لەبەر ئەوەی هەموو ڕاپۆرتێک جێ متمانە نیە، تکایە خۆتان هەمووی هەواڵەکانی ئەو دەڤەرە بۆ دەوڵەت ڕەوانە بکەن. (واژۆی وەزیری ناو خۆ)

## دامەزرانی هێزەهیندییە ئینگلیزیەکان لە ناوچەبی سنووری باجگیراندا

لەوەزارەتی ناوخۆ لە تاران بۆ:

ئەیالەتی خوراسان و سیستان: ١٢٩٩/٥/٢٠

بە گوێرەی ڕاپۆرتی تەلگەرافی قووچان بەم زوانە ١٢٠٠کەس لەسەربازەهیندییەکان بە٢٠دەستگا تۆپ و کەرستەی شەڕەوە خۆیان گەیاندوەتە ئەوێ کە ٢٠٠کەسیان بەرەو باجگیران ڕۆیین و پاشماوەکەشیان هەر لەوێ ماونەتەوە. هەروەها دوو ڕۆژی پێش ئیزن دراوە کەقەدەغەی بکەن. هاتن بۆ ئەم

---

٢٠٢- وادیارە والی خوراسان کەقەواموسەڵتەنە بوو سات بە سات هاتووە و خەدووی گەیاندووتەتاران

دەڤەرە و وەزارەتی ناوەخۆش لەم بارەوە سەرحەسێب کراوە و دەبێ هاوکات سەبارەت بە بارودۆخەکەش زۆرتر سەرحەسێب بکرێ[٢٠٣]

## تەلگەرافێک سەبارەت بە پەنابەرە تورکە ڕووسیەکان بۆ خوراسان لە ترسی کۆمۆنیستەکاندا

ئەم پەنابەرانەی کە لە سنوورەکانی باجگیران و دەرەگەزەوە هاتبوونە خوراسان هەموویان لەتورکەکانی ئازەربایجان بوون کە ڕوویان کردبووە عێشق ئاوا و لەوێ خەریکی کاری تیجارەت بوون، لەبەر ئەوەی حکوومەتی تزاری ڕووسیە لە ناو چوو و

٢٠٣- خوالێخۆشبوو حاجی دەولەت نامانلوو سەبارەت بەسەقامگیری هێزەئینگلیزیەکان لەسنووری باجگیران هەوالی داوە و هاوکات گوتی: ڕووسەکان کەهەمووکات ویستوویانە خۆیان بگەیەننە ناوچە باکوورییەکانی خوراسان و هاوکات ئینگلیزییەکانیش بۆ بەرگری لەوان، هێزێکی گەورەی هیندیان لە باجگیران دانا بەلام ڕاستەخۆ ڕەوانەی مەیدانی شەڕیانیان نەدەکرد. سەرەتا هێزەچریکییەکوردەکانیان دەدا بەگژی ڕووسیەکاندا و کاتێ کە ڕووسیەکان گلەیان دەکرد، ئینگلیزدەینا مل کوردەکان. ئینگلیزییەکان لەم کاتەدا لەسەردار خەدوو زۆرتر دەترسان کە نەوەک هاوکاری ڕووسەکان بێت و دەبێ بلێین لە ناو هێزەهیندییە سەربەئینگلیزییەکاندا چەندین کوردیش دەبینران وەک مامۆم مەلاڕەمەزان و خالۆکانم: یووسف و غۆلامڕەزا و حەیدەرو عەلی کوڕی شاولات و ئیبراهیم و ئیسماعیل کوڕی ئەسەدوللا و جەعفەرقولی و کوێخاسادق و ڕەمەزانی کوڕی غولام حسێن و حسێن کوڕی ئەللاوێردی ڕەنگرەز و ئەبولموعجەن برای پێغەمبەر قولی ئیبراهیم پیر عەلی و... کەهەموویان مردوون و ناویان لەبیری سەکینەی دایکم چووتەوە و وادیارە کە ئینگلیزییەکان سەرکەوتوون کە لە ناو کوردەکاندا جێ خۆیان بکەنەوە.
دایکم دەلێ سەرۆکی ئەم هێزانە کەسێ بە ناوی موولی خان بووە کە لە زەماوەنی خالۆ یووسفم دا بەشداری کردووە و ڕەمەزان غولام کە عاشقی کچێ بە ناوی خانگول بوو هەلدەپەڕی و بەکازەعاشقی دەگوت

کازۆتو لیخ ئەزبلیزم — ئەزنۆکەرێ ئینگلیزم

لە دەفتەرێ ناف نویسم — ئوزنۆکەرێ ئینگلیزم

حکوومەتی کوموونیستی پای گرت ئەو کەسانەی کە ماڵ و پارەیان زۆر خۆش دەویست هەڕایان کردە ئەم بەری سنوورەوە کە پاشان لەسەردەمی ڕەزاشادا لە ئوردووی دەرەگەزدا مانەوە و پاشان ڕوویان کردە شارە باکوورییەکانی خوراسان.

ئەمەیش دەقی تەلگەرافەکە:

لە تارانەوە بۆ مەشهەد: ۱۲۹۹/٦/۲۹ی هەتاوی

ئەیالاتی خوراسان و سیستان:

بەپێی تەلگەرافی گەیشتوو پەنابەرە ئێرانیەکان کە دەچنە سنووری خوراسانەوە هەموویان نیگەرانن و ژیانیان لە ئاستێکی نالەبار دایە و ئاگارێکی زۆرپیس و خراپیان هەیە. باش وایە وەک چون لەقەزوێن و تاراندا یارمەتی کۆ دەکرێتەوە لەوێش کۆبکرێتەوە.

## تەلگەرافێک سەبارەت بە جیابوونەوەی وەلیخانی قەرامانلوو لە خەدوو لەمەشهەدەوە بۆ تاران: ۱۲۹۹/۷/۱۵

وەزارەتی ناوەخۆ

لەوەڵامی تەلگەرافی ژمارەی ۱۹۲٤ سەبارەت بە هاتنی خوداوێردی خان و وەلیخان قەرامانلوو[۲۰٤] بۆ گوندی دوێنی شیروان و کەلەبچەکردنی ٦۰کەس لە دانیشتوانی ئەوێ، چەند سەربازی‌تریش نێردران بۆ بەڕێوەبردنی کارانی‌تر. پاشان وەلیخان پەنای هێنایەوە مەشهەد. خوداوێردیش ڕەوانەی گلیان کراو بڕیاری داوە ئیتر کاری خراپە نەکات.

## قەوام، خەدووی پەناداوە

لەمەشهەدەوە بۆ تاران ۱۲۹۹/۸/٦

لەبەر ئەوەی خوداوێردی بڕیاری داوە تووشی کاری خراپ نەبێ پەنامان داوە و

---

۲۰٤- وەلیخان قەرامانلوو بە ئامۆژگاری مەهدی ڕەیسوتوججارەوە لەخەدوو جیا بۆوەو گەیشتە خزمەتی قەواموسەڵتەنەو ڕیزیان لێی گرت.

ئەگەردووپاتی بکاتەوە سزای دەدرێ

لەژێری دەقی تەلگەرافەکەدا نووسراوە

دایرەی ڕۆژهەلات ڕاپۆرتی کەگەیشتە دەستی سەرۆکی وەزیران ئەمەش دەقی نووسراوەکەی لەبەر دەستی بەڕێزتاندابێت.

## شەڕی خەدو دژ بە قەواموسەڵتەنەو خانە خوراسانیەکان

قەوام زۆر سادە نەیتوانی لەو شەڕەی خەدوو سەرکەوێ. عەلی بەیگ برزانلوو لەهەڤالانی تاج موحەممەد خانی بادانلوو کە خۆی لەمەیدانی شەڕانخێزدابووە و دژ بە خەدوو وەستاوە و ئێستا ٩٠ساڵی تەمەنە لەم بارەوە دەڵێت[٢٠٥]

ئەمیر تەیمووری کەلالی دەسەلاتداری قووچان بووە، هاوڕێ تاج موحەممەد خان و سوارە زافەرانلووکان و سەربازەکانی قوام گەیشتنە گلیان، وەلی خان قەرامانلووش چووە ڕیزیان. موحەممەدحوسێن خانی ئووغازی و خانە سنوورنشینەکانی بیچرانلوو و قۆشخانەو هەروەها زۆربەی خەڵکی خوراسان و قەواییەکان لە توربەتی حەیدەرییە و شەوکەتولمەلێک عەلەم لەبیرجەند و سەردار موعەزەزی بجنووردی ئیلخانی شادلوو لە بجنوورد و خانەکانی سەبزەوار و نەیشابوور هاتنە ناو هێزی شیروانەوە و بەم شێوەیە ١٥ هەزار هێزی چەکدار لە دەوری خەدوو کۆ بوونەوە و گەمارۆی خەدوویاندا، خەدوو کەچەکی زۆری بوو هەموویانی ڕاو نا، هەرکەس دەچووەپێشەوە هاتنە دوای زۆر سەخت بوو، هێزە دەوڵەتیەکان زیانی زۆریان کرد. قەوام لەڕێ ناچارییەوە لەگلیانەوە بۆ شیروان پاشەکشێ کرد و ئەم شەڕە چەند مانگی خایاند.

ڕۆژێکیان سەید حەیدەری بەربەری ناسراو بە شا کە نۆینەری قەوام بوو،بڕیاری دا بوو کە هێرش دەکاتە گلیان و خەدوو کەلەبچە دەکات و دەیهێنێتە خزمەت قەوام. ڕۆژی دوایی سەیدحەیدەر هاوڕێ بەربەرییەکان هێرشی کردە گلیان و خەدوو ئیزنی دا بە ئەوان کە تانزدیکی بورجەکان بێنە پێشەوە و پاشان تۆپی خستە

---

٢٠٥- ئەم وتووێژە ساڵی ١٣٦٤ کراوەکە بە داخەوە دوای ماوەیەک عەلی بەیگ کۆچی دوایی کرد.

کـــار لێیـــان و هـــەموویانی ڕاونـــا. زۆرکەســـیان کـــوژران و تەنانـــەت ئـــامۆزای سەیدحەیدەریش کوژرا. خودی سەیدحەیدەر بـەهۆی ئەسـپەچالاکەکەیەوە دەربـاز بوو و ڕووی کردە شیروان و جگە لە کەنینێکی پڕمانا بۆ قەوام هیچ نەمایەوە و سـەید حەیدەر لە ڕووی هەڵنەدەهات لە لایانەوە دانیشێ و بۆیە لەوێش فیراری کـرد و لـە شیروان و لە ماڵێکی شیرواندا خۆی شاردەوە[٢٠٦]

ڕۆژی دوایی و بە فـەرمانی قەواموسەڵـتەنە هێزێکـی بەسـەرۆکایەتی سـەروان حـەکیمی‌یـەوە و بـە هاوکـاری سـتوان ئیـزەدی و سـتوان ڕەفعـەت و سـەرهەنگ جەلائودەوڵە ڕازاندەوە و ئەوانیش خێرا هێرشیان کردە گوندی ورگ و قەڵای گلیـان و هێزی ژێرفەرمانی ستوان ئیزەدی بەهێزی تۆپەوە سەرەتا هێرشـیان دەسـت پـێ کرد.

خەدوو لەم کاتەدا لە شادبورج کەیەکێ لە گرینگ تـرین قـەڵاکانی گلیـان بـوو هێزەکانی خۆی ڕێنوێنی دەکرد و ئیزنی نـەدا کـەس تـیر بهـاوێژێ و هـەتا هێـزە دەوڵەتیەکان نزدیکتر بوونەوە، هێـزی جندرمـە کـە وایـان دەزانی داو ودەسـتەی شۆڕشگێڕدەربازبوون، بەخێراییەوە چوونە پێـشەوە. کاتـێ نزدیـک بوونـەوە خـەدوو فەرمانی دا وجندرمەکان و زۆربەیان کوژران و ئەگەرکەسیان دەیەویست دەربازبێـت خودی خەدوو بەتیرخەلاسیانی دەکرد و هاوکات ئەم شێعرەی دەخوێندەوە.

ژاندارم بێوە دووسەد هەزار مینا دەپان دەکەم قەتار

جگە تاقمێکی کەم هەمووی هێزەکان کوژران

سەرتاسەری ئەو شەوە خەدوو و یارانی بەژن و مێرد و گـەورە و بچووکـەوە لـە خۆیان دیفاعیان کرد و هاوکات دەیانگوت: هاقولی هاقولی[٢٠٧]

---

٢٠٦- سەید حەیدەر بەربەری لەڕووداوەکانی دوایـی و بـە تایبـەت لـە ڕووداوی کولنـل پـسیان دا دەستی بووە. پاشان سالی ١٣١٥بۆزەنجان دوورخرایەوە و لەوێ مرد. ئەم سالە بـە سالـی شۆڕشـی بەربەریەکان ناو بانگی دەرکرد.

٢٠٧- هاقولی وشەیەکی کوردییە وەک جوێن وایە. کورد کاتێ خووک ڕاو دەنـێ دەیهێنێتـە سـەر زار.

هێزی دەوڵەت هەتا گوندی ورگ کە ناوەندی فەرماندەییان بوو ڕاونران. پاش دوو شەو ویەک ڕۆژ شەڕ، هێزو سپای ئێران تێکشکا. خەدوو چووە سەر تەرمی کوژراوەکان و بە کوڵ بۆیان گریا و گوتی من حەزم لێ نەبوو بەسەرهاتی وەها پێش بێت، خۆیان کاری وایان کرد و پاشان فەرمانی بەخاک سپاردنیانی دا، لە کاتی ناشتنیاندا دوژمن وەک باران تیری دەباراند سەرهەنگ جەلاپوورکە لەو تاقمە کەسانەی بوو زیندوو مابوو پاش ٣٦ ساڵ دوای ئەو بەسەرهاتە و کاتێ کە دەیزانی ئیتر خەدوو زیندوو نابێتەوە لەبەرواری سەرماوەزی ساڵی ١٣٣٦ و لە ڕۆژنامەی ئافتاب شەرق لە مەشهەد دا نووسیوویە کە هێزەکانی دەوڵەت زۆر بە هێزبوون؛ بەڵام کوردەکانِ وەک چوار پا وا بوون و هەرکەسیان کە دەگرت بەخراپترین شێوە ئەشکەنجەیان دەکرد. لەهەمان کاتدا ئێمە دەزانین کوردان حەزیان لە ئازار و ئەشکەنجە نەبووە، کوردەکان پیاوانە هاتوونەتە مەیدانی شەڕانخێزو پیاوانە دەیانکوشت و پیاوانە دەمردن.

ناوبراو جگە لەوەی زۆر خراپەی بەکورد و خەدوو گوتووە هاوکات لەشوێنێکی دا نووسیوویە:

ئەسیران بەفەرمانی خەدوو چەکیان لێ وەردەگیردرا و لە نێو خەڵکی گلیان دا دابەش دەبوون و هاوکات خەدوو فەرمانی دەدا کە نەوەک کەس بێ حورمەتی بەم ئەسیرانەبکات و دەبێ وەک کەس و کارەی خۆتان لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکرێ، تەنیا ئەوەی نەبێ کە بغاولە پایان بکرێ و دوان دوان بیانبەستن بەیەکەوە نەوەک دەربازبن.

جارێکیان یەکێ لەو گلیانیانەی کەبراکەی لە لایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە کوژرابوو ویستی یەکێ لە ئەسیرەکان بکوژێ و کەچی غولامڕەزاخانی سەرداری برازای خەدوو پێی زانی و زۆر لێ تووڕە دەبێ و هاوکات خەدوو بەخەڵکی گوت تۆڵە کردنەوە لە گۆڕەپانی شەڕدا دەکرێ نەک کاتی ئەسیرکردن.

ڕۆژی دووەم پاش نیوەڕۆ، ستوان ڕەفعەتی سەرۆکی گوردانی چوارەم بە ئاگری تۆپ و تانکەوە هێرشی کرد و هەمیسان ئەوانیش دەرباز بوون.

ڕۆژ سێهەم خەدوو هەمووی هێزەکانی خۆی کۆ کردەوە ویستی هێرش بکاتە سەر شیروان بە مەبەستی کەلەبچە کردنی قەواموسەڵتەنە و بۆ گەیشتن بەم مەبەستە دووگرۆپ لە هێزەکانی خۆی بەسەرۆکایەتی ئەڵلاوێردی و حوسێنی برایەوە ڕوانەی شیروان کرد. هەر گرۆپێ سەد سەرباز بوون کە خۆیان دابەش ببوون بەچەند گرۆپی ترەوە و هێرشیان کرد. ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە سێ دەزگا تۆپ و چەکی پێنج تیر و یازدە تیر بوون.

سەرهەنگ سەفاپوور دەڵێ هۆی شکستی هێزەکانی دەوڵەت پاڵپشتی کوردەکانی شادلوو و بەرپەرپەکان لەهێزەکانی خەدوو دەزانێ.

پاشان سەبارەت بە دەرباز بوونی سەربازانی دەوڵەتی دەڵێ:

دوژمن بە ئەو پەڕی هێزیەوەهێرشی کردەسەر هێزەکانی دەوڵەت و هێزەکانی دەوڵەت ئاگرێکی دەوڵەت ئاگرێکی گەورەیان بەچەک و تیر باران بۆ دوژمن پێک هێنا بەڵام دوژمن سەرکەوت و هێزەکانی دەوڵەت زۆربەیان دەرباز بوون .ئەڵلاوێردی و حسێنی برای خەدوو بەباشترین شێوە پاڵپشتیان دەهانی. پاش ماوەیەک تاقمێکی زۆر لە هێزەکانی دوژمن کوژران و بەڵام بەداخەوە هێزی دەوڵەت گوللەی لێ بڕاوە و لەڕێ ناچارییەوە دەربازبوون.

سەدچەکدار لەعەشیرەتی هەزارە وسەدکەس لە عەشیرەتی شادلوو دەربازبوون و ئەمە بوو بە هۆی تێکشکانی ئێمەوە و دوژمن بەسەرۆکایەتی خەدوو وەک گورگ و پڵنگی هار هێرشیان هانی.

پاش دەرباز بوونی تاقمێکی تر لەزافەرانلووەکان، پاشماوەی هێزە دەوڵەتیەکانیش دەرباز بوون.

هێزە سەربازییەکانی دەوڵەت ئیتر بەقسەی سەر کردەکانی خۆیانیان نەدەکرد[٢٠٨]

سەرهەنگ سەفاپوور لەڕووی هەڵنەهاتووە ڕاستیەکەی بدرکێنێ و بڵێ کە بەچ

---

٢٠٨- ڕۆژنامەی ئافتاب شەرقی، سەرهەنگ سەفاپوور، بە سەردێڕی سەرداران قولابی بەرواری ١٣٣٦/١٠/٦، ل ٢.

شێوەیەک ناوەندی سەرکردایەتی هێزەکانی دەوڵەت لە گوندی ورگ دا وێران بوو و هەمووسەرباز و سەرکردەکان بەچ شێوەیەک دەرباز بوون و خەدوو بە چ شێوەیەک ئەسیرانی ئەوانی وەک قەتارەی وشتر دەبەست بەیەکەوە و دەیانی برد بۆ گلیان.[٢٠٩]

یان برا وەک شێرەکانی خەدوو بەچ شێوەیەک توانیان ژاندارمری هەتا پشتی دەروازەکانی شیروان ڕاو بنێن.

ئەم ئاکارە بۆ قەواموسەڵتەنە زۆر گران تەواو بوو و ناوبراو بۆ بەرگری لەخەدوو تانەیەتە ناو شاری شیروانەوە بورجەکانی شاری قەوی کردەوە و بە ڕاوێژی خانە کوردەکانەوە گوندەکانی دەوروبەری گلیانیان گرتەوە تا بەم شێوەیە ئیزن نەدەن کەس یارمەتی بدات بە تاقمی خەدوو و ئەم گەمارۆدانە ئابوورییە بوو بە هۆی ئەوەی تا خەدوو هەمووشتێ جیرەبەندی بکات.

هێزەکانی خەدوو بەشەودا هێرشیان دەکردە سەردوژمن و زۆریان لێیان دەکوشت و پاشان دەگەڕانەوە.

هەرچەندە بە هاتنی وەرزی سەرماو سۆڵە کاری خەدوو تووش تر بوو.

بەلام هێزەکانی دەوڵەت بەبینینی خەدوو و هێزەکەی دەبوای تەنیا دەربازبن.[٢١٠]

---

٢٠٩- لەکتێبی نەزەری بە جونبش کارگری و کومونیستی ئیران. نووسراوەی عەبدوسەمەد کامبەخش لەسەر کردەکانی حیزبی توودە، لە خەدوو ناوبراوە.

٢١٠- یەکێ لەو ڕاوێژانە ئەوە بوو کەچەند سوار بچنە ئێسفەراین و موحەممەد ئیبراهیم خان ڕەوشەنی بهێنن بۆ شیروان بەلام مەبەستی ئەوان ئەوە بوو موحەممەد ئیبراهیم بدزن و بیهێننە شیروان، لەبەر ئەوە ناوبراو نەدەهات، لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی خەدوو تەنیا بە قسەیی ئەودەکات، پێنج کەس ڕەوانەی ئێسفەراین بوون و مالی موحەممەد ئیبراهیم خانی موزەففەروسەلتەنەیان گەمارۆدا کەلە گوندی پەرتان بوو، بەیانی ئەو ڕۆژە خان هاوڕێ نۆکەرێکی بۆ حەمام چوو بۆ ناو شاری ئێسفەراین، لەم کاتەدا ئەوپێنج کەسە هاتنە ناو حەمام و خانیان ڕازی کرد کە بڕوات و کەسیش حەقی نەبێ لەگەڵ خان بڕوات، تەنیا هەر ئەوەند کەسێ ئەسپەسپیەکەی خان بهێنێ. پاش دوو ڕۆژخان گەیشتە بجنۆرد و لەوێ پێشوازی لێ کرا و هاوکات سەردار موعەزەز لە تەلگەرافیکدا

قەوام کە ئەمەی بیست لەگەڵ سەرۆکی ئیلەکاندا کەوتە ڕاوێژ و ئەمجارە تاج موحەممەد خانی بادلانلوو کە دوژمنی سەرسەختی خەدوو بوو پێشنیارێکی کرد کە هەموان پەسندیان کرد.

عەلی بەیگ بزانلوو کەلە یارانی تاجموحەممەدخان بوو و هاوکات لەم شەڕەشدا بەشدار بوو سەبارەت بە فێڵی پێشنیاری تاج موحەممەد گوتی:

تاج موحەممەد خان سوارەیەکی ناردە گوندی ڕەزمغان و حاجی تاتاری بانگ کردە شیروان. حاجی سێ کوڕی لاوی هەبوو و هەرسێکیان هاوڕەزمی خەدوو بوون و خەدووش حاجی تاتاری زۆر خۆش دەویست و پێی دەگوت بابا.

تاج موحەممەد و قەوام کلاویان نایە سەر ئەم پیاوە پیرە و گوتیان حاجی ئاغا ئێمە تۆپێکمان هێناوە کەلە ئاسمانەوە دەفڕێ و بۆ هەرکوێ بینێرین دەڕوات و لەهەرکوێ بدات بە عەرزا ئەو شوێنە یەکسەر خراپ دەکات ئێمەش نامانەوێ هەمووی دانیشتوانی گلیان بکوژرێن و بۆیە حاجیان ڕەوانەی گلیان کردو جەجوو هاتە پێشوازییەوە و گوتی:

حاجیگیان چی خەوەرە بەخێرهاتی.

حاجی ڕاستیەکەی گوت بە خەدوو. خەدووش بایەخی بەقسەکەدا و پێکەوە ڕاوێژیان کرد.

خەدوو کە سەرکەوتبوو کلاوی بەسەر چوو گلیانی بەجێ هێشت و بەم شێوە ڕۆژی دوایی هەواڵ گەیشت کەشەڕ تەواو بوو و خەدوو دەرباز بووە لەهەمان کاتدا کەس نەیدەتوانی بەئەم هەواڵە بڕوابکات لەبەر ئەوەی هەموان چاوەڕێ بوون خەدوو هێرش بهێنێ.

قەوام خێرا خۆی گەیاندە گلیان و پڕ هۆماری چەک و تەقەمەنی دۆزیەوە و خێرا ڕەوانەی مەشهەدی کرد و ئێمەی بە سەرۆکایەتی تاجموحەممەد خانەوە نارد بە دوای خەدوو دا. خەدوو بەرەو سنوور ڕۆیشت و هەمووی چەکەکانی خۆی فڕێ

---

ڕایگەیاند کەشەڕ گەیشتووتە ئاکام و دەتوانێ خان بڕواتە شاری شیروانەوە.

دابوو. [۲۱۱] نەمانئەوێرا نزیکی بکەوین، هەمووکات فرسەخێ نێوانمان بوو ئەو چووە ڕووسیە و ئێمەش گەڕاینەوە. پاش ماوەیەک کولوونێل موحەممەد تەقی خان پسیان کە بوو بە فەرماندەی ژاندارمری خوراسان و هەواڵی پێی گەیشت کە:

خەدوو لە ڕووسیەوە بەچەکێکی زۆرەوە گەڕاوەتەوە. ئەم هەواڵەبوو بە هۆی دڵنگەرانی تاج موحەممەدخانەوە کە تازە لە لایەن پسیانەوە پلەی ئەفسەری پێی درابوو و خێرا بارودۆخەکەی بۆ کولونێل ڕوون کردەوە.

کولونێل چەند کەسی لە پادگانی قووچانەوە ڕەوانە کرد تا بە یارمەتی تاج موحەممەد، خەدوو کەلەبچە بکرێ. ئێمەش بەسەرۆکایەتی تاجموحەممەدخانەوە لە قووچان چوینە دەرەوە و گەیشتینە حەسارئەندف و خەڵکی گوتیان خەدوو دوێنێ لێرەوە ڕووی کردە بەرزلئاوا ئێمەش لە سمسارەوە ڕوومان کردە بەرزلئاوا. خەدوو زانی و خێرا ڕووی کردە دومن و پاشان چووە سەرچەشمە و لەوێوە چووە گلیان. لە ڕاستیدا کەس نەیدەوێرا بکەویە توخنی.

لەم کاتەدا زانیمان کە ڕووسەکان یارمەتییێکی وەهای خەدوویان نەداوەو ئەوچەکانەش کە بە دەستی گەیشتبوون ڕەوانەی گلیانی کردبوو و لە ناو ڕێ دا خانە بیچرانلووییەکان دەستیان بەسەری داگرتبوو و خەدوو هیچی بە دەستەوە نەمابوو و ئێمەش بەم بۆنەوە ڕوومان کردە گلیان. خەدوو گلیانی بەجێ هێشت و ڕووی کردە بجنوورد و پەنای بردە سەردار بجنووردی.

حسەینی مەکی لەبەرواری ۲٤ی خاکەلێوەی ۱۳۰۰ی هەتاوی لەم بارەوە نووسیوویە: ۲٤ی خاکە لێوە تەلگەرافێ گەیشتە دەوڵەت سەید زیا کە نووسرابوو خوداوێردی و هاوڕێکانی کەلە خوراسان شۆڕشیان کردبوو بە دەستی هێزەکانی کولونیل موحەممەد تەقی خانی پسیان تێکشکان و خوداوێردی دەرباز بوو و چووە

بجنوورد و پەنای بردە حاکمی ئەوێ.[212]

## ئاکامی کاری خەدوو و لە سێدارەدرانی لە لایەن کولونێل موحەممەد تەقی خانی پیسیانەوە

شۆڕشی کومۆنیستی خەدوو کە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٢٩٨ی هەتاوی ڕووی دا و لە ئاکامی ساڵی ١٢٩٩ی هەتاوی بەلە سێدارەدانی خەدوو لە ٧ی پووشپەڕی ١٣٠٠ی هەتاوی گەیشتە ئاکام هۆی تێکشکانی خەدوو چەند خاڵێکی گرینگ بوو وەک:

١- تاقمی کورد کە هەموویان سنوورنشینن بە هیچ جۆرێ حەزیان لێ نەبوو بچنە ژێر حوکمی کومونیستەوە.

٢- کومۆنیستەکانی یەکێتی سۆڤیەت زۆر مەکرباز و درۆبێژبوون وەک چۆن بڕیاری یارمەتیان دا بە خەدوو؛ بەڵام لە نیوەی ڕێدا پشتیان خاڵی کرد. بڕێ گوتوویانە حەیدەرخان عەموغلی کومۆنیستێکی گەرم بوو ڕاپۆرتی داوە بە ڕووسیەکان کە سەرکردەکوردەکانی خوراسان گوێ بیستی خەدوونابن و هیچ قازانجێکی نابێ بۆتان لە ئێراندا.[213]

٣- سێهەم ئەوەی کە هەبوونی کەسایەتییێکی سیاسەتمەدار وەکوو ئەنلگووفیل و دیکتاتۆرێکی وەکوو قەواموسەلتەنە لە وڵاتێکی وەکوو خوراساندا دەبووە هۆی هەرجۆرە هەلسوکەوتێکی ڕووسەکانەوە لەو وڵاتەدا وە هەروەها کە دەزگای جاسووسی یەکیەتی سۆفیەت لەو ناوچەیەدا هەموو جۆرە ئامێرێکی پێشڕەوانەی ئەو

---

٢١٢- تاریخ ٢٠ساڵەی ئیران، حسێن مەکی، ب١، ل٣٣٤

٢١٣- ئەم وتە، وتەی حاجی سلێمانی ڕۆشنبیر و ئەویش لە زمانی

سەردەمەی بوو. هاوکات ئینگلیزییەکانیش پاڵپشتی قەواموسەڵتەنەیان دەکرد و ئیزنیان نەئەدا تاکوو کۆماری کۆمۆنیستی کوردستانی خوراسان پابگرێ.

٤- ساویلکەیی و نەزانکاری خەدوو لەشەڕی دژی قەواموسەڵتەنەدا گرینگ‌ترین هۆی شکستی ئەو بوو، بە تایبەت بەو پیلانەی قەوام بڕوای نەبوو و گلیانی بەجێ هێشت و ڕەوانەی ڕووسیە بوو.

بەهەر شێوەیەک بوو خەدوو پەنای بردە ڕووسیەو لەوێش گەڕایەوە و تاج موحەممەد بادانلوو بەهەموو هێزێکی خۆی و دەوڵەتەوە لە دوای کەوتبوو و لە ڕێ ناچاریەوە پەنای بردە سەرداری بجنووردی و هاوکات ئەویش نا پیاوانە دای بە دەستی جندرمەوە.

تاج موحەممەدخان و هێزی سەربازی هاوڕێ نەیانوێرا لە ناوچەی شیروان بەرەو بجنوورد هەنگاوێک بەرەو پێش بچن، لەبەر ئەوەی زۆر لە سەرداری بجنووردی دەترسان. بۆیە ڕاپۆرتێکیان سەبارەت بە خەدوو و بەسەرهاتەکەی ئاراستەی کولونێل موحەممەدتەقی‌خانی پسیان کرد کەلەو کاتەدا سەرکردەی هێزی جندرمەی خوراسان بوو. کولونێل کە لەم سەردەمدا سەرۆکی خوراسان بوو. لەنامەیەک دا داوای کرد لە سەردار موعەزەزی بجنووردی کە یان خۆی خەدوو بدات بەدەستەوە؛ یان ئیزن بدەن هێزی سەربازی دەوڵەت بێتە ناو شارەوە و کەلەبچەی بکەن. دەبێ ڕابگەیەندرێت لەم چاخەدا سەردار موعەزەز لەبجنوورد دەسەلاتدارێکی خۆگەڕ بوو و هێزەکانی دەوڵەت بەبێ ئیزنی ئەو نەیانئەوێرا بچنە بجنووردەوە. تاج موحەممەد خان و هاوڕێکانی چوونە شاری بجنوورد، عەلی بەیگ بورزلانلوو و سەرهەنگ سەفاپوور لەم کارەدا بەشداریان کردووە و نووسەر خۆی لەگەڵ هەموویان و هەروەها مەلاڕەمەزانعەلی مامۆی و کۆیخا سادق ئووغازی کەلە کاتی کەلەبچە کردنی خەدوو لەبجنوورد دابوون وتووێژی کردووە:

عەلی بەیگ دەیگوت:

دوایین ڕۆژەکانی ڕەشەمە کە چووینە بجنووردەوە تاج موحەممەد خان و میرزامەحموودخانی دەرەگەزی سارمولمەمالیک دوایی و ئەفسەرێکی ژاندارمری

هاتبوونە چاوپێکەوتنی سەرداری بجنووردییەوە.

پاش چاوپێکەوتن سەردار بە بیانووی نەچیر لەشار چووە دەرەوە و یەک فرسەخ لە شار دوورکەوتەوە خەدوو وبراکانی لەیەکێ لە کاروانسەراکاندا لە نزدیکی بورجی سەردارەوە جێیان گرتبوو و نەیاندەزانی چی ڕادەبرێ و بڕوایان نەبوو کەس بتوانێ کەلەبچەیان بکات چون سەردار پەنایانی داوە لەم کاتەدا ئێمە هێرشمان کردە سەر کاروانسەراکە و گەمارۆی ئەوێی دا. بجنووردییەکان بەرنگارمان بوونەوە بەڵام تاج موحەممەد خان زۆر خێرا تر لەو باسانە بوو، توانی زۆربەی بجنووردییەکان بکوژێ و خەدوو و براکانی کە زانیان بارودۆخەکە ئاڵۆزە هاتنە دەرەوە و دەستیان برد بۆ چەک و بەڵام ئیتر زۆر درەنگ بوو.

حسێن برای خەدوو هێرشی کردەسەر جندرمەیەک و چەکەکەی لێ وەرگرت و بەڵام میرزا مەحموودخانی دەرەگەزی دەرفەتی نەدا و خێرا بریندای کرد. هاواری حسێن، خەدووی دێوانە کرد و هاوکات کە خراپەی دەگوت بە تاج موحەممەد خان، زانی ئێمە دەست بە ستەین و خێلی دەرەگەزی دەیانئەوێ بمانکوژن، ئێمە بدەن بە دەستی سوراە قووچانیەکانەوە.

بە فەرمانی تاج موحەممەد خان ئێمەی سوارەی قووچانی کە قلیچ قازمەیی و حەمە لونگیشمان لەگەڵدا بوو؛ خوداوێردی خان و ئەڵلاوێردی خانی برایمان سوار کردو پێش هێرشی بجنووردییەکان بەرەو شیروان بە ڕێ کەوتین و تاج موحەممەدخانیش لە دوامانەوە وەک پاراستنی ئێمەی لەهێرشی بجنووردییەکان دەپاراست. پاشان گەیشتین بە شاری شیروان و چوینە ماڵی فەرەجوڵاخانی شیروانی و ئەڵلاوێردی خانی برای خەدوو کە زۆر بریندار بوو هەر دەیناڵاند.

سەرهەنگ سەفاپووریش لەم بارەوە گوتی:

خەدوو کە پارەی لەلا نەبوو، سەعاتەکەی لە دەستی کردەوە و بەمنی داو گوتی کە ئێمە نانی دەستی ئەم ناپیاوانە ناخوێن. بڕۆ ئەم ساعەتە بفرۆشەو نان و پێخۆرمان بۆ بهێنە، من خێرا چووم نان و قلیانم بۆیان حازر کرد و تا بەیانی لە

ناڕەحەتیدا هەر قلیانیان دەکێشا و خەدوو زۆر بە دەستی سەرداری بجنووردییەوە نیگەران بوو.

لەفاروو‌جدا خەدوو درایە دەستی ژاندارمەکانەوە و ئەوانیش ڕەوانەی مەشهەدیان کرد و لەوێ خرانە بەندیخانەوە.

ناوبراوان لە مەشهەد لەشەقامی سەروو لە کاروانسەرای کووچەی ئاومیرزادا زیندانی بوون.

خەدوو ڕۆژی چواری گولان کەلەبچە کرا و هاتەشاری مەشهەد. خەڵکی شار هاتبوونە تەماشا و پاش ٦٥ڕۆژ تیرەباران کرا. پسیان تەنانەت ئیزنی بەخەدوو نەدا لەگەڵ ژن و منداڵەکەیدا دیداری هەبێ و لە نێو شەوێکی تاریکدا لەگەڵ براکەی لەسێدارەیانی دا.

خەدوو بەکولونێلی گوتبوو: تۆمن مەکوژە دەزانم ڕۆژێک ئەتۆش گیر دەکەی وخانە کوردەکان لە ناوت دەبەن. مەمکوژە پێکەوە دەتوانین کاری باش بکەین، بەڵام کولونێل لەخۆبایی بوو و کوشتی. بەڵام کاتێ خۆی لە قووچان گیری کرد کەوتە بیری قسەکەی خەدوو و ئیتر بێ قازانج بوو و کولونیلیش هەر بەو دەردەوە چوو .کونسوولی ئینگلیز لەبارەی خەدوو دەڵێ: خوداوێردی خان و ئەڵلاوێردی خانی برای هاوڕێ ۱۹کەس لە هەڤالانی لە بەرواری ٤ی گولانی ۱۳۰۰ی هەتاوی ڕەوانەی مەشهەد کران. ئەم دووبرایە حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ دەبڕێنەوە.

هەمیسان کونسوولی ئینگلیز لە ڕاپۆرتێکی‌دا بۆ مەشهەد پاش، باس لەسەر بەسەرهاتی حەفتەی پێش تر لە ۷ی جۆزەردانی ۱۳۰۰ی کۆچی هەتاوی سەبارەت بە باس‌وخواستی کولونێل لەخەدوو دەڵێ:

باس و خواست لە خوداوێردی خان بەم زوانە تەواو دەبێت بیستوومە کە خودا وێردی لەباس و خواستەکانیدا گوتوویە: یەکێ لە نۆکەرەکانی ڕەئیسوتتوجار پێش لە ئاخرین هەڵاتنی خەدوو بۆ ڕووسیە داوای لێی کردووە تا کوو لە ناوچەکانی سنووری قووچان و شیرواندا دەست بدات بە شۆڕشەوە وکاتێ ڕەئیسوتتوجار کەئەو کاتە نوێنەری پارلەمان بووە ویستوویە بڕوات بۆ تاران و لە تاران بڵێ کە نۆکەرەکەم بە

داوای قەواموسەڵتەنە و حاجی شێخ جافر[٢١٤]کشمیری و موقبیلوسەڵتەنە ناردووتەخزمەتی خەدوو.[٢١٥]

لەڕاپۆرتی حەفتەی پێش ٢ی ژووئیەی ١٩٢١ی زایینیدانووسیویە: خوداوێردی و ئەڵلاوێردی دووبرای جەردە لەکاتژمێری یەکی نیوەشەوی ڕۆژی ٢٨ی ژوەندا ١٣٠٠/٤/٧ی هەتاوی تیر باران کران.

## وتووێژ لەگەڵ خالە جەهان بی بی بیچرانلووی ٩٥ساڵان سەبارەت بە خەدوو

پێش وتووێژ، واباشترە لەگەڵ خالەجەهان بی بی دا ئاشنایەتێیک پەیدا بکەین. ناوبراوکچی موحەممەدقولیبەیگ و منداڵی یەعقووب بەیگەو لە عەشیرەتی شاملووی بیچرانلووە. زمستانی ١٣٦٨ی هەتاوی لەمەشهەد گەیشتمە خزمەتیان. لەماڵی بەڕێز خالقی کورپاندا ژنێکی ئارام و لەسەر خۆ و ژیرە و زۆر ژنێکی بەدینە.

لە گوندی قەڵابەیگ هاتووتە دنیا و ئێستا ٩٥ ساڵانە، بەڵام وا ئەزانیێ ٦٠ساڵی تەمەنە. باڵای بەرزو ڕێکوپێکی هەرنەچەماوەتەوە، پێستی ڕوومەتی سەوزە و دەست و مەچەکی دروشتە و برۆکانی پڕ و لووتێکی درێژی هەیە.

لەهەمووی بەسەرهاتەکانی سنووری بڕێتی لەعەشیرەتەکانی سیووکانلوو، بیچرانلوو، میلانلوو و جریستان و قۆشخانە ئاشنایەتی هەیە و جوانیان دەناسێ. لەسەردەمی منداڵی و دەزوورانداری ناوبراوپرسیم.

گوتی: لەتەمەنی ٩ساڵەییمەوە نوێژم نەفەوتاوە. لەبیرمە کە حەسەنقولی هاتە داوامەوە پاش وتووێژە سەرەتاییەکان کە بەڕێوە چوو و هەردوولا ڕازی بوین. باوکم ئیزنی لەمن گرت و منیش ئیزنم داوگوتم ئیزنم لە دەستی ئێوەدایە.

بەم شێوە ئێمە بوین بە دەزووران. ئەو کاتە سەرەتا مارەیان نەدەبڕی و بڕیارێ کە دەدرا حوکمی مارەبڕینی دەکرد. لە کاتی زەماوەندا کە پاش سێ یا چوار ساڵ ڕووی ئەدا مەلایان دەهانی بۆ مارەبڕین.

---

٢١٤- حاجی شێخ جەعفەر کشمیری سکرتێری پارتی دیمۆکراتی مەشهەدبوو

٢١٥- هەمان سەرچاوە، ل ٥٩ و ٦٩.

پرسیم: مارەیی ئێوە چەند بوو؟

گوتی: ئەودەم مارەیی کچ گەدا و دەوڵەمەند ١٠تمەن و بێوەژنیش ٥تمەن بوو.

پرسیم لەسەردەمی دەزووراندارێتان بۆمان قسە بکەن.

گوتی: وەک دەزانن سەردەمی دەزوورانبازی بۆ کچ و کوڕی کورد زۆر سەخت بوو. ئەگەر لەدەزوورانبازیدا کەس بیزانیباوکوڕەکەی بگردبا ئەوە ئیتر دەبووە هۆی ئابڕووچوونی کوڕوکچ و کوڕەش کوتەکێکی خراپی دەخوارد.

شەوێکیان حەسەنقولی خان ویستبووی بێت بۆ دەزوورانبازی و بۆیە چوو بوو لە تەوێڵەکانی ئێمەدا خۆی شاردبووە و چاوەڕێ بوو تا چراکانی ماڵەکەمان بکوژێنەوە و باوک و براکانم بنوون و خۆی بگەیەنێتە من.

حەسەنقولی وایدەزانی ئیتر باوکم شەو ناڕوات سەری گاو ئەسپەکان بدات؛بەڵام باوکم ئاخری شەو بەچرامۆشێکەوە ڕووی کردە تەوێڵە تا سەر مەڕوماڵەکان بدات و حەسەنقولیخان بەبینینی باوکم لە ناو ئاخوڕەکەدا خۆی ڕاکێشا بوو و بەڵام باوکم بینی بووی و حەسەنقولی خان خێرا دەرباز بووبوو.

باوکم هاتە ماڵەوە و هاوکات غەرقی کەنین بوو و گوتی:

حەسەن قولیخان هاتبوو مانگاکەی بباتەوە و ئەم داستانە بڵاو بووە و بەیانی هەرکەس بەحەسەنقولی دەگەیشت دەیگوت مانگا کەت هێنایەوە.... پاشان داوام کرد سەبارەت بە زانیارییەکانی لەبارەی خەدووە بۆم بدوێ. گوتی: مێردەکەم لەو سوارانەی بوو کە چووبووە مەیدانی شەڕی خەدووە. خەدوو خەڵکی توکوور بوو و برایەکی بوو بە ناوی قلیچ. قلیچ بە درەختێک تفەنگێکی دروست کردبوو کەجەردەگەری دەکرد و زۆرتر لە نزیکی گوندی لووجەلی تەکمەرانی شیرواندا خەریکی ئەم کارە بوو و هەرچێکی دەدزی لەو نەزدیکانەدا دەیشاردەوە و پاش ماوەیەک ڕازەکەی بەرمەلا بوو. لە ڕۆژێکی بەهاریدا، ژنە لووجەییەکان بۆ کۆکردنەوەی سەوزی و گیا دەچنە دەرو هەراوەکان. ژنێک لە دوورەوە دووکەڵێک دەبینێ و ڕووی تێ دەکات و دەبینێ کە لە ناو کەلەکێکی بچووکەوە دووکەڵ دێتە دەرەوە. ئەو ژنەش دەڕواتە پێشەوە و دەچێتە ناوکەلەکەکە و دەبینێ کە لەسەر

وەجاخەکەوە پڵاویان لێ ناوە و کەسیش لەوێ نیە. و پڵاوەکـە دادەگـرێ و تێروپـڕ دەخوات و چاوی بە زێڕ و نوقرەیەکی زۆر دەکەوێ و پارە و پارچەش دەبینێ. پـارە و پارچەکە هەڵدەگرێ و دەڕوات و دەڕواتەوە بۆ لووجەیی و پاش چەند ڕۆژ پارچەکە دەدوورێنێ و دەڕواتە ناو دێ. هاوکات حەیدەرخانی بیچرانلوو لە لووجەیی دەبێ.

قلیچیش بە شوێن شتە دزراوەکاندا دەگـەڕا و بـە شـوێن دزەکەیـدا وێـڵ بـوو. ڕۆژێکیان قلیچ چوو بۆ لای حەیدەرخانی بیچرانلوو و چاوی بە ئەو ژنە دەکەوێ کـە پارچەکەی کردبووە جلو بەرگ و پارەکە دەناسێتەوە و بانگ دەکا:

دزەکەم ئەو ژنەیە بیگرن.

حەیدەرخان ئاکارەکەی لێ دەپرسـێ و هەمووشـتێ ڕوون دەبێتـەوە و هـەموو شتێ لەو ژنە وەردەگرنەوە و دەیدەنەوە بە قلیچ .تۆپە پارچەیەک بـەدیاری خـەڵات کرد بەحەیدەرخان.

ئەم داستانە خێرا دەنگی دایەوە و دەوڵەت زانی، جندرمە لە شیروانەوە هـاتن و قلیجیان کەلەبچە کرد و بردیان.

لەشیرواندا بەهەر شێوەیەک بوو قلیجیان لە ژێر ئەشکەنجەدا کوشت.

حسێن قولی خانێکی خەڵکی شوورەکی شـیروان ڕاپـۆرتی قلیجـی دابـوو کـە دوایی بە دەستی خەدوو کوژرا.

مێحراب بەیگ بیچرانلوو پاش ئەوەی خەدووگیلانەکی بـەجێ هێـشت بەسـەد سوارەی بیچرانلـوو ڕوانـەی ئـەوێ بـوو. لـەو سـەردەمەدا بـەم سـوارە چەکدارانـە دەیانگوت قەرەنۆکەر کە مووچەیان وەردەگـرت و نۆکـەرەکان مووچـەگیر نـەبوون. هەشت قەرەنۆکەر خەڵکی گوندی ئێمە بوون و لەبورجـەکانی خـەدوودا دەمانـەوە و ماوەی ٤٥ڕۆژ لەوێ بوون.

لەوێ بوو کە حەسەنقولی خان مێردم ١٦ قەبزەچەکی دۆزیەوە کە خـەدوو وەک غەنیمەت لە دەوڵەتی وەرگرتبوو. ئەم چەکانەدوایی درانەوە دەستی ژاندمری شیروان. چەک وتەقەمەنی لە ڕێگەی سنوورەکانی جریستان و بیچرانلـوو لـە لایـەن یەکیـەتی سۆڤیەتەوە ڕەوانەی خەدوو دەکرا و دەگەیشتە دەستی میسرخانی بیچرانلوو.

ژنێکی خەدوو لە کۆنەقووچاندا خۆی کوشت. خۆی خستە ژێر چەرخی گاری. خەدوو تەنیا کچێکی لێ بەجێ ما، لەو کاتەدا ئەم شێعرە وێردی سەرزاری خەڵکی بوو:

گێلانەکێ وەدار گوییزە
گولەدەکە ویزە ویزە
ژەخودێ مایێکە قێزە

یان لە شێعرێکی فارسیدا دەیانگوت:

سدبار گوفتم پلو نخور خودا ویردی
سەردار
بە دور بجنورد تاونخور خوداوێردی
سەردار[٢١٦]

لێرەدا وتەکانی خالەجەهان بی بی سەبارەت بەخەدوو دوایی هات. سەبارەت بە بەسەرهاتەکانیتریش قسەی کرد کە لە شوێنی خۆی دا ئاماژەی پێی دەدەین. پاشان لە حاڵەتی نوێژدا بە سفارشی خۆی وێنەیەکی لێ هەڵگیرا.

## وتووێژێک لەگەڵ خاتوو سێفرگوڵ تووپکانلوو سەبارەت بە سەردار خەدوو

جگە لە خالەجەهان بی بی، سێوگەڵی ئامۆزامان کچی عەلی موحەممەد خانی کوڕی فەرهان خانی ئیلبەیگی تووپکانلووش سەبارەت بە خەدوو بڕێ زانیاری نایە بەر دەستمان.

باوک و باوەگەورەی سێو لەم شەڕی خەدوودا بەشدار بوون. سێوگوڵ ژنی ئەفراسیاوی ئاموزای بوو و ژنێکی زۆر بە توانا و لە هونەرمەندە بە ناوبانگەکانی گۆرەوێ، پلاس، جاجیم، قالی بافی بوو کە ماڵەکەی خۆی بەو هونەرانە ئاراستە کردبوو.

---

٢١٦- دەوڵەتابادی لەکتێبی کەلیدەر کەسەبارەت بە گوڵموحەممەد کەلمیشی باس دەکات ئەم شێعرەی هێناوە لەبەرگی حەوتەم دا سەبارەت بەکەلمیشی باس دەکەین.

پاش وتوویژ لەگەڵ ئەم ژنە پیاو سەرئەفراز دەبیٚ، بە بۆنەی ئەوەی کـە دەبـینی لە ناو کورددا ژنیٚکی ئاوەها بە غیرەت هەڵدەکەویٚ. کورد وتەنی: **«ژمسەری نینکان زیٚردەرژیٚ»**

ئەم وتوویٚژە زانیاریٚیکی باشی لە مەڕ میٚژووی سەد ساڵەی خوراسانی باشوور بـە دەستمانەوە دا. هەروەک خالەجەهان زانیاریٚیکی پـوختی لـە میٚـژووی خوراسـانی باکوورەوە نایە بەر دەستمان.

ناو براو لە بارەی خەدوو گوتی: باوەگەورەم فەرهاد خان لەگـەڵ ڕووسـیەکان و کومونیستەکاندا زۆر دوژمنایەتییٚکی قووڵی هەبوو و بەو خـاترە چـووە شـەڕی دژ بـە خەدوو.

بەڵام وەک دەزانن پاش ٦ مانگ کاتیٚ کەشەڕی کوردان و کولونیٚل موحەممـەد تەقیخان داگیرسا لەقووچاندا ئەو بەشداری نەکرد.

فەرهادخان هاوڕیٚ ٧٠سوارەوە کە زۆربەیان پیاوی شـەڕانخیٚز و بـیٚویٚنـە بـوون ڕووی کردە قووچان و پاشان چـوو بـۆ شـیروان. لـە نـاوڕیٚ دا هەڵـۆییٚک لـە ڕووی سەریانەوە فڕی. فەرهاد خان گۆتی بە عەلی موحەممەد خانی کـوڕی: ئەگـەر ئـەم هەڵۆیە پیٚکی لەشەڕی خەدووداا سەردەکەوین. فەرهاد خـان دەستەوسـان هەڵـۆی پیٚکا و ئەوە بوو بە هەواڵـی خـۆش بـۆ سـەرکەوتنیان. فـەرهاد خـان کاتـیٚ گلیـانی گەمارۆدا پەیامی ناردەسەر خەدوو پیٚی گـوت مـن دەزانم خـەدوو تـۆ لـەم شـەڕەدا سـەرناکەوی و بـاش وایـە بـەر لـە کـوژرانی سـەربازانت زوو خـۆت دەربـاز کـەی بەرەوسۆڤیەت.

بەڵام خەدوو پیاویٚکی وەها نەبوو کە خیٚراخۆی دەرباز بکـات و پیاوانـە شـەڕی کرد و تا پای سیٚدارەش ڕۆیشت.

باوکم فـەرهادخان دەیگـوت: پـاش کـوژرانی خـەدوو حـەفت خـەروار قـەن و ٢٠٠کیلۆ ڕۆن و پارە وچەک و هەماریٚ پڕ لە فیشەک لیٚ بە جیٚ ما کە قەوام لەگەڵ خۆی بردیە مەشهەد.

قەوام لەو شەڕەدا شمشیٚریٚکی زیٚـڕی بـە هـۆی ئازایـەتی فەرهادخانـەوە وەک

خەڵاتی پێی دا کە پاش مەرگی کەوتە دەستی ئەسەدوڵلاخانی مامـەم و دوایـی ون بوو. هەروەها کاتێ فەرهاد خانی بابم، غوڵامعەلی لوڕی کوشت، قەوام خەنجـەرێکی زێڕی پێی خەڵات کرد.

فەرهاد خانی بابم دەیگوت: کاتێ کولوونێل خەدووی مەحکووم کرد بە مـەرگ پێی گوت هەر ئەمشەوت بە دنیاوە ماوە هـەرچێ وەسـیەتت هەیـە بیـڵێ. خـەدوو گۆتی من هیچ وەسیەتێکم نیە و تەنیا قـسەیەکم هەیـە بـۆت و ئـەوەش بـە هـۆی زیندوو بوونی خۆمەوە نایڵێم و لە لاویی و بێ ئەزموونیت ئەیڵیم. من دەمەوێ بـڵێم تۆ من مەکوژە و لـە ئەزموونـەکانی مـن کەڵـک وەرگـرە و ئـەم ئاکـارەی کەخانـە کوردەکان بەسەرمندا هێنایان بەسەر تۆشدا دەیهێـنن. کولونێـل کـەنینێکی کـرد و گۆتی من پێداویستێکم بە یارمەتی تۆ نیە. پاشان فـەرمانی دا خـەدوویان بـرد و لـە پشتی کێوی بەردینەوە لەگەڵ ئەڵلاوێردی برای دا تیرەبارانیان کرد.

پاش چەند مانگ کولوونێل لە قووچان کەوتـە نـاو گـەمارۆی خانـەکوردەکان و کەوتەوە بیری وتەکەی خەدوو و بەڵام ئیتر دێر بوو.

## ماڵ و دارایی خەدووسەردار

لەپاکەتێکـدا مـاڵ و دارایـی خـەدوو هـاوڕێ وەرەقەیـەک شـکایەتی خەڵـکی ئوردووغـانی ئیـسفەراین نووسـرابوو و دۆزرایـەوە کـە خوالێخـۆش بـوو موزەفەروسەڵتەنەی ڕەوشەنی بە خەتی خۆی لەسەر پاکەتەکەوە نووسیبووی:

بەڵگەیە و پشتی پاکەتەکەش بەخەتی خوالێخۆش بوو حوسێن هوژەبردیوانـەوە بەخـەتی جـوانی خـۆی لـە ژێـر دێـڕی موزەفەروسەڵـتەنەی نایبولحکوکوومـەدا نووسیبووی و ناردبووی. ئەمەش دەقی بەڵگەکە:

لەگلیاندا: زەوینێک لە نزدیکی دێ دا کە لـە کوردیـدا پێـی دەگـوترێ مەفەتـە و نووسەریش هەروای نوسـیوە لـە وەرگ دا جفتـێ مـلک و تەختەیـەک بـاخی تـرێ. لەڕەزەمقاندا کەیەکێ لە گوندەکانی شیروانە عەمارەتێک و٥ تەختە باخی تـرێ و سـێ هەزار وێنجە و لە پیرشەهیدی شیروانیشدا چوارتەختە بـاخی تـرێ و ٤رای مـلک لـە زیارەت ئەفغان ئاوای شیروان، جووتێ ملک و دوو تەختە باخی مێو و دوو تەختە وێنجە.

لەتەکمەران کە هەراوێکی گـەورەی شـیروانە پێـنج جـووت ملکـی دەیمـی و هەروەها مافی ٧ شەو ورۆژکەڵک وەرگرتن لە ئاوی گوندی بیک هەیە.

ئەمە سەرجەمی ماڵ و دارایی خەدوو خان بوو.

خوالێخـۆش بـوو موحەممــەد ئیـبراهیم خـانی ڕەوشەنیموزەفەروسەڵـتەنەی حاکمی قووچان و سەرۆکی عەشیرەتی زافەرانلوو و بەخەتی خۆی لە سووچێکی ئەم حەسێبەدا نووسیویە:

لەگلیاندا زەوینێک بەبایەخی سەد تمـەن لـە ورگـدا جووتـێ مـڵک و بـاخ بـە بایەخی هەزارتمەن.

لە زەرموغان چوار تەختە بـاخ و سـێ تەختـە وێنجـە و عـەمارەتێک و تەختـە باخێک و عەمارەتێکی تازە و تەختـە وینجەیـەک بـایی ٥٠٠تمـەن و دوو تەختـەی داگیر کراو لە حاجی عەزیز و تەختە باخێکی حەواڵـە کـراو بـایی ٥٠٠تمـەن، سـێ تەختـە بـاخ و دووتەختـە وێنجـەی سـپیدال زار وزەویـنی عـەمارەتی خـەدوو بایی ٧٠٠تمەن و تەختە باخێک لە پیرشەهید بایی ١٢٠تمـەن. لـە زیـارەت تەختـە باخێک بایی٣هەزار تمەن. لەتەکمـەران ٥ جـووت وێنجـە و نۆتەختـە بـاخی لونـگ بایی ٥٠٠تمەن داگیر کراوە.[٢١٧]

## ماڵ و دارایی ئەڵلاوێردی برای خەدووخانی سەردار

ئەم بەڵگەیە لە ناو بەڵگەکانی خوالێخۆش بـوو موزەفەروسەڵـتەنەی ڕەوشـەنی دۆزرایەوە. ژنەکەی ئەڵلاوێردی خەڵکی قەڵاشـوور بـوو و ئـەم بەڵـگەیە کـە مـۆری ئەڵلاوێردی خانی پێوەیە و ساڵی ١٣٣٧ واتا سێ ساڵ پێش کوژرانیان ئامادە کـراوە و دوایی بۆ خوالێخۆش بوو موزەفەروسەڵتەنەی حاکمی ئەو دەمی قووچـان نێـردراوە و بەم ڕاڤەی ژێرەوەیە:

چارشـەوێکی ئاورێـشمی و کـۆتێکی ئەتـڵەسی ژنانـە و نیمـە تۆپـێ پارچـەی

---

٢١٧- ئەم بەڵگانە لە ناو بەڵگە ئارشیڤیەکانی موحەممەد ئیبراهیم خانی ڕەوشەنی موزەفەروسەڵـتەنە دایـە و باش وایە کچەکەی خەدوو لەم بەڵگانە کەڵک وەرگرێ بۆ وەرگرتنەوەی میراتەکەی خۆی.

ئەلاجە(؟)قەوارەیەک ئەتلەسی سەوز و سفرەیەکی شین و جووتێ تورکبەنی ئەتلەسێ و مەجومعەیەکی ئەتلەسی و جووتێ ڕوومەجومعەی ئاورێشمی گولداری سپی، قەوارەیەک ڕووپووشی ئاورێشمی و شالێکی سووری پیاوانە، کراسێکی ئەتلەسی سپی، قەوارەیەک ئەتلەسی سپی و زەرد و چارشەوێکی شەوانەی ساف و جووتی نیزامی تەنگ و پێنج دانە دەستمالی ئاورێشمی پیاوانە وبیست دانە کراسی سوور، قەوارەیەکی سپی شوالی ژنانەی کوردی و کراسێک، جووتێ گۆرەوێ ئاورێشمی سپی و کراسێکی سوور و زۆر شتی دیکە لەهەر دووپات کراوەتەوە. (مۆری ئەللاوێردی سەردار)

هەروەها لە پشتی بەڵگەکەوە نووسراوە: ئاورێشم دوومەن، لێفی چیت ۱۰دانە، جواڵەی ئاش ۳دانە. ۱۰۰تمەن پارە و چوار دانە سینەبەند و...کە هەمووی لەگەڵ ماڵ و داراییەکەی خەدوودا لە ماڵی نەنەخانم دایە

## سیاهای چەکی نۆکەرەکانی ئەللاوێردی سەردار

بابا موحەممەد، چەکی ڕووسی، موزر ڕووسی قاسم، چەکی عوسمانلوو و فیشەک ٤٥ دانە. نەسروڵلا چەک سێ تیخ و شەست و سێ دانە فیشەک، مەرساقولی چەکی ڕووسی و ۱۵۰دانە گوللە، حەسەن بوزئابادی تفەنگێ ڕووسی ۱۰۰دانە گوللە. موئمێنی عەلی چەکی ئاڵمانی و ۳٥ دانە گوللە. غولامڕەزا چەکی سێ تیخ و ۳٥ دانە گوللە. عەلی موحەممەد چەکی ڕووسی ۱۱۰دانە گوللە. سەید حوسێن، چەکی ڕووسی و ۳۲ دانە گوللە. باواقولی چەکی ڕووسی و ٥۰دانە گوللە. ئادینە موحەممەد چەکی عوسمانی و ٥۰دانە گوللە.

لە پشتی ئەم وەرەقەشەوە سەید جەلال ناوێک مۆری لەسەری کردووە و نووسیویە زۆر ئاشکرایە کە چەکێکی سێ تیر تایبەت بە ئەللاوێردی سەردار و ۱۱ دانە تیر لە لای من (سەی جەلال) وەیە و هەر کاتێ بیانەوێ دەیدەمەوە. (لەبەرواری ۱٥ی زیقەعدەی ۱۳۳۷ جەلال حسێن)

## ناڕەزایی دەربڕینی خەڵکی ئوردووغان لە موحەممەد سادق بەیگ مونشی خەدوو سەردار لە لای موزەفەروسەڵتەنەوە

ئەم شکایەتنامەیە مۆروواژۆ نەکراوە، تەنیا لە ئاکامیدا هاتووە:

باسێ موحەممەد کازم: هەروەک گوتمـان خوالێخـۆش بـوو موزەفەروسەڵـتەنە لەسـەر پاکەتەکـەوە نووسـیویە: سـەبارەت بەخـەدوو جـورم و جەنایەتـەکانی هەرشکایەتێ گەیشتۆتە دەستمان ڕاستە.

بین بە فیدات: باسی ئێمە کەچەندکـەس دانیـشتووی ئوردوخـانین ئەوەیەکـە موحەممـەد سـادق بـەیک و خـەدوو غـەدری زۆرمـان لـێ دەکـەن و چەنـد سەرمەڕومالّمانیان دزیوە و لە بەیگ موحەممەدیش ١٥٠تمەن وەرگیردراوە و سادق خان لە فەیزوللا سەدتمەن و لەکەربەلایی ئەکبەر و کوڕەکانی ئیـسحاق ٧٠تمـەن و لەکازمی نووسەری ئـەم شـکایەتنامەش ١٢ تمـەن .لـە عـەلی چـراق ١٢ تمـەن و کاوڕێک لەجەهانگیر و مەڕێکی بەراتی کوڕی ئیسحاق و مـەڕ ێکـی مەلاموحەممـەد باقر و دانەی کەربەلایی ئەکبەر و دانەی منداڵەکانی فەیزوللایان بردووە و کوڕەکەی سەلمانیشیان دایە بەرگوللە. هیوادارین بگەن بەفریامانەوە.

ئەم بەڵگەیە بـەرواری لەسـەر دانـەنراوە و هوژەبەرولمـەلیک لـە پـشتەکەیەوە نووسیوویە ٥ی سەفەری ١٣٤٢ی کۆچی ؛بەڵام لەبـەر ئـەوەی لەسـەرەوە نووسـراوە چوار ساڵی پێشوو، وادیاری دەدات کە ساڵی ١٣٤٢ی کـۆچی بەرانبـەر بـە ١٣٠١ی هەتاوی ئەو کاتەی موحەممەد ئیبراهیم خـانی ڕەوشـەنی حـاکمی قووچـان بـوو و هوژە برولمەلیک ئەم شکایەتەی ناوەتە ناو پاکەتێک و مـۆری کردبـێ و دابـێتی بـە دەستی موزەفەروسەڵتەنەوە کـە موحەممـەد سـادق بـەیگی مونـشی چـی بەسـەر خەڵکی ئوردووخان دا دەرهانیوە و ئەمە دەی دەچێتەوە ساڵی ١٢٩٨ی هەتاوی.

## وشــکە ساڵــی ساڵــی ١٣٣٦ی کــۆچی و بــارودۆخی ســەردەمی خــەدوو لەبەڵگەنامەکانی بجنوورد دا

بجنوورد و گوندەکانی مەکۆی ئەوین و فەرهەنگ و کولتووربووە و زۆر پەرتووک و کتێب سەبارەت بەم خەڵک و دەڤەرە نووسراوە. هەڤالی خۆشەویستم بەڕێز عـەلی ڕەحمــەتی قوردانلــوو کــە لەبەرگــەکانی‌تــردا ناویمــان هــانی. زۆر نووســراوەی کــۆ کردۆتەوە و زۆرشتمان بۆدەردەخەن کەلەو باسانەی وەک ســیحر و فــاڵ گرتنــەوە و پێداهەڵگرتن و شیعری فارسی و کوردی و تورکی و ڕاڤــەی ژیــانی خــەدووی تێیــدا نووسراوە و بە تایبەت لەوێدا لەسەر ئەم بابەتانەی خوارەوە، باس کراوە.

١- کوژرانی نادرشای ئەفشار لە قووچان و لە سالی ١١٦٠.

٢- کۆچی دوایی ئاغا موحەممەد خان قاجار١٢١١.

٣- هاتنی ئیسماعیل تەلایی ١٢٣٩پێم وایە مەبەست ئیــسماعیل خــانی قاجــار کەچووە شەڕی دژی ڕەزاقولی خانی ئیلخانی زافەرانلوو. بێت

٤- کۆچی دوایی ڕەزاقولی خان ئیلخانی زافەرانلوو ١٢٤٨.

٥- کۆچی دوایی جەعفەر قولی خانی ئیلخانی شادلوو ١٢٧٤.

٦- وێران‌بوونی بجنوورد بە دەستی ئەمیری ماکۆیی ١٢٦٤.

٧- وشــکە ساڵــی مــەنێ چوارهــەزار ساڵــی ١٢٨٨ هــەر لــەم ساڵــەدایە کەجەعفەرقولی خانی شاعیر وموناجاتنامەی بەرزی نووســی و لــەو ساڵــەدا زۆربــەی خەڵکی خوراسان لەناوچوون.

٨- گرتنــەوەی وڵاتــانی ئێــران بــە تایبــەت مــەهین بــە دەســتی کــوردان لەتورکمەنەکان ١٢٨٩ .

٩- حکوومەتی یارموحەممەد خانی ئیلخانی شادلوو ١٢٨٩.

١٠- هاتنی ناسرەدین شا لەسەردەمی حەیدەر قولی خانی ئیلخانی ١٢٨٤.

١١- هاتنی ناسرەدین شا بۆ جاری دووهەم لەسەردەمی یــار موحەممــەد خــان ١٣٠٠.

١٢- دەست بەسەرگرتنی ڕووسیە لەسەر گۆگ تەپە ١٢٩٨لەباکووری بجنووردا کە ئێستا سەر بە کۆماری تورکمەنستانە.

١٣- بوومەلەرزەی کۆنی قووچان ١٣١١و١٣١٢.

١٤- کوژرانی ڕەمەزان خان و میرزا نەجەفقولی ١٣١٢.

١٥- کۆچی دوایی ناسرەدین شا ١٣١٣.

١٦- گیر کردنی سلێمان خان بە دەستی باوکیەوە یارموحەممەدخان ١٣١٤.

١٧- کۆچی دوایی ئەمیر موحەممەد خان ١٣١٦.

١٨- ناخۆشی وەبا کە بوو بە هۆی کۆچی دوایی خوالێخۆش بوو سەید موحەممەد ڕەزاشەوە ١٣١٠.

١٩- هێرشی کولە بۆ بجنوورد ساڵی ١٣٢١و١٣٢٢.

٢٠- هاتنی لافاوی وێرانکەری بجنوورد ساڵی ١٣١٩.

٢١- وێرانبوونی ئەتەک لە سنووری بجنوورد و تورکستاندا ١٢٩٨.

٢٢- هێرشی ناخۆشی تاعوونە ١٣٠٩.

٢٣- هاتنە دنیای موزەفەرەدین شا ١٢٦٩.

٢٤- بە دنیا هاتنی زیلوسوڵتانی کوڕی ناسرەدین شا ١٢٦٦.

٢٥- ساڵی هێرشی تاعوونەی دووەم ١٣٢٠.

٢٦- تاج بەسەرنانی موزەفەرەدین شا ١٣١٤.

٢٧- تاج بەسەرنانی موحەممەد عەلیشا ١٣٢٤.

٢٨- شەڕی نێوان دەوڵەت و نەتەوە ١٣٢٤.

٢٩- کۆچی دوایی یارموحەممەدخان ١١ی شەوالی ١٣٢١.

٣٠- شەڕی نێوان ئەڵمەنیا و ڕووسیە ١٣٠٢ شەڕی جیهانی یەکەم.

٣١- ڕووسیە گومەزی ئیمام ڕەزا دەداتە بەر تۆپ ١٣٣٠.

٣٢- ساڵێ کەگەنم کیلۆی بایی٢١٥ڕیاڵ بوو.

ئەو ساڵە هەرنەباران و نە بەفرنەباری و مەلاعەلی کە دەرسی بە منداڵان دەگوت مووچەی پێی نەدرا و پاش ٨ مانگ منداڵەکانی بەجێ هێشت و زۆربەی

کەسان لەبرسیەتیدا مردن و مەڕومالات مردار بوونەوە خەڵکی ناوچەکانی سەبزەوار، نەیشابوور لە ڕێگەی بیرجەند و کەلاتی نادری و دەرەگەز و نزدیکی قووچان و شیروان و جوەینەوە هاتنە نزدیکی مانە و سمەڵقان و بجنوورد چون ئەم ناوچانە دەوڵەمەندتر بوو.

و پاش نەورۆزی ئەو ساڵە خەڵکی برسی دەستیان کرد بە گیا و سەوزە خواردن کە بوو بە هۆی ئەوەی تووشی ناخۆشیەکانی وەبا و تاعوون ببن. زۆرکەس لەسەر دارتووەکان دادەکەوتن و دەمردن. [دەچوان تووی کاڵ بخۆن]

لەم ساڵەدا عەبدوڕڕەزاخان شوجاعوددەولە بۆ ڕزگار کردنی خەڵک لەبرسیەتی لە قووچاندا نانەواخانەی دایر کردووە.[٢١٨]

گەنم مەنێ ١٢قران.جۆمەنێ ٨قران. بارێ کا ٨تمەن.

ئەرزەن ٢تمەن.ڕۆنی زەرد ٥تمەن.

برنج ٢تمەن. ڕۆنی خاشخاش ١٢قران.

کونجی تمەنێ. ڕۆنی خاشخاش ١٢قران.

ماش ٦قران. لۆکە تمەنێ.

لوبیا ٦قران.

## ناو بانگ دەرکردنی خەدوو سەردار

حکوومەتی ڕووس هەمووشتی وەک تەلیفۆن و قوورخانەی داوەتە خەدوو. ئەویش لە گلیان، قەڵایەکی گەورەی دروست کرد بەمەنارەی زۆر بەرزەوە و هەمیشەش پانسەد کارگەر لەبەر دەستی‌دا کاریان دەکرد. ویستی لەسەردەمی ئەحمەد شای قاجاڕ دژ بە دەسەڵاتی ئێران بووەستێ و دەسەڵاتدارانی قووچانیش نەیانتوانی نەیارمەتی بدەن و نەبەرنگاری ببنەوە و بۆیە ڕاپۆرتیان دایە دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتیش خێرا قەواموسەڵتەنەی نارد بۆ سەرکوت کردنی و ئەویش هاوڕێ خانەکانی

٢١٨- شاعیرێکی کوردیش باسی کردووە کەلەبەشی سێهەمی مێژووی ئەدەبی کوردی چاپ دەبێ.

بجنوورد و شیروان گەمارۆی گلیانیان دا و خوداوێردی یەک مانگ لەو گەمارۆدا بوو.
بەڵام هەمیسان نەیانتوانی کارێکی باش بکەن و سەربازەکانی حکوومەت هێرشیان کرد. بەو هیوایەی بتوانن شابورج داگیر بکەن. لەم لاشەوە خەدوو تۆپی لێیان بەست و زۆربەیانی لەناو برد. سەرداری بجنووردی کە ئەم ئاکارەی بینی خەدووی هان‌دا تا گلیان چۆڵ بکات ورِوو بکاتە ڕووسیە و خەدووش ئەو شوێنەی بەجێ هێشت و چووە ڕووسیە و دەوڵەتیشی بە یارمەتی سەردار بجنووردی دەستی گرت بەسەر مال و منداڵ و ژینیدا.

## دەنگدانەوەی شۆڕشی خەدوو لە گۆڤاری کوردی هاوکاری تورکیە

لە گۆڤاری کوردی زمانی هاوکاری ژمارە ١٩٩٠/٨/٢/١٩٩ی زایینی کەلە کوردستانی تورکیەدا دەردەچوو، بەڕێز کەمال مەزهەر لە نووسراوەیەکدا سەبارەت بە باسی خەدوو سەردار لە خوراسان دانووسیویە:

شۆڕشەکەی خەدوو لە لایەن خانە کوردەکانی خوراسان کە نوێنەری ئینگلیز و قەوام بوون سەرکوت کرا.

کەمال مەزهەر ئاماژەی بە ئەوەنە داوە کەلەچ سەر چاوەیەک کەڵکی وەرگرتووە نووسراوەیەکی باشە با بەڵام زۆربەی ناوەکان بە هەڵە نووسراوە لە جیاتی خوداوێردی خەدوو خان وێردی نووسراوە تاج موحەممەد خان بادلانلوو و موحەممەد ئیبراهیم خان ڕەوشەنی بەیەک کەس داناوە و سەردار موعەزەزی بنجۆردی بەسەردار موعەزەم خان ناردەبات و بەوەلیخان قەرامانلووی گوتووە وەلی خانی کرمانلی و بە حسێن خانی ئووغازی گوتووە مەمیز باجگیری و بەکەریم خانی ڕەشوانلووی گوتووە کەریم بەیگ و بەقەڵای گلیانی گوتووە گلین بە تایبەت سەبارەت بە سەیدەورتەزا و سەید حەیدەر بەربەری نووسیوە کە ناو براوان هاوڕێ قەوام دژ بە خەدوو شەریان کردووە. و ساڵی ١٩٢٠گلیان گەمارۆ دراوە.

ئەم نووسراوەیە لە لایەن بەڕێز ڕێکار ئەحمەد لە کوردانی بارزانی و بەرپرسی گۆڤاری پێشەنگ گەیشتە دەستم.

منیش نووسراوەیەکم نارد تا لە گوڤاری هاوکارییدا چاپ بکرێ بەڵام بە هۆی هێرشی عێراق بۆ سەر کوردان نازانم ئەم نووسراوە چاپ کرایان نە.

سەبارەت بە شۆڕشی خەدوو لە گوڤارەکانی کاریگەری و کومۆنیستی ئەو سەردەمدا چاپ بوو کە بە داخەوە هیچیان نەگەیشتوونەتە دەستم.

## بارودۆخی کوردانی قەراچلوو پاش مردنی نادرشای ئەفشار

عەرەب دەڵێ: الامور مرهونه باوقاتها

فارس دەڵێ: نەهەنگ لە دەریا گەورە دەبێ

کورد دەڵێ: فلانی ئاڤ ناوینی ئاژنێ کە ئاو ناوینە ئاژنێ کە ئەم سێ و تەیە ناوەڕۆکەکەی ئاماژە بەو ەدەکەن کە کات و شوێنی پەروەردە کردنی کەسایەتیە قارەمانە نەتەوەییەکان لەسەر خودی کەسایەتیەکەیان کاریگەری زۆری هەبوو.ە ڕاستە کە کوردان قارەمانی لە ناو خوێنیاندایە بەڵام دەبێ ئەم هێزو هەڵمەتانەی ئەوان پەروەردەکرێ.

لە سەردەمی نادرشای هەوشاردا کوردەکانی قەراچورلوو زۆرتر لەهەر عەشیرەتێکی تر توانیان خۆ بنوێنن بەڵام عەشیرەتی شادلوو بە هۆی کەڵک وەرگرتن لە ئەلکول و شەرابەوە ناو و نیشانی خۆیان لە دەست دا.

پاش مردنی نادرشای ئەفشار بە تایبەت لەسەردەمی دەسەڵاتی شاڕوخ لە مەشهەدا و دەوڵی خانی شادلوو لە بنجۆرد ئەم بارودۆخە بە شێوەی گشتی گۆڕا، واتا عەشیرەتی قەراچورلوو لەبیر چوونەوە و عەشیرەتی شادلوو ناو و ناوبانگی دەرکرد و ناوەندی دەسەڵاتەکەشیان بوو بە بنجۆرد، بە تایبەت پاش شەڕی ڕەزاقولیخانی ئیلخانی و عەباس میرزای نایبوسسەڵتەنە لە قووچاندا گەلی کورد لە خوراسان بوو بە دوو ئیلخانی شادلوو و زافەرانلوو و هاوکات شادلوو هەمیسان ناو و نیشانی خۆی پەیدا کرد عەشیرەتی قەراچورلوو لەبنەماوە سەر بە عەشیرەتی زافەرانلوویە و دانیشتووی ڕۆژ ئاوای بنجۆردن و پاشان بوون بە ژێر دەستەی عەشیرەتی شادلوو، پاش ژن و ژنخوازی ئەم دوو عەشیرەتە لەیەکتر هەردوو

عەشیرەتەکە بوون بەیەکێ، هەتا سەردەمی سەردار موعـەزەزی ئیلخـانی شـادلوو و پاش خەرمانانی ١٣٢٠و لە سەردەمی ئەردەشێر خـانی شـادلوو، بـارودۆخ هـەر بـەم شێوە بوو، بەڵام دوایی بـە هاتنـەوەی خانلـەرخانی قـەراچلوو ئیلخـانی شـادلوو بـۆ ناوەرۆکی سیاسەت بەڕێز خانلەرخان کە سەبارەت بە جوغرافیا و مێژوو و کولتـووری شاری بنجۆرد و تورکمان سـەحرا زۆری دەزانی و زانیـارییەکی زۆری هـەبوو و چـوار خولیشی نوێنەری خەڵکی بنجۆرد بوو لە پارلەمانی نەتەوەیی ئێراندا و داوام کـرد لـە بەڕێزیان تا سەبارەت بەکەم هێز بوونی عەشیرەتی قەراچورلووی پاش نـادردا بۆمـان باس بکات و ناوبراویش گۆتی: پاشماوەی کوردەکـانی قـەراچورلوو لـە ڕۆژ هـەڵاتی دەریاچەی واندان و تاقمێکی تریان لە ئازەربایجان و لە باشووری ئەرسەوەل کـە لـە شوێنێکی دیکەدا باسی دەکەین.

بەڕێز قەراچورلوو سەبارەت بە عەشیرەتەکەی خۆی نووسیوویەتی:

پەسمام[219]گیان! وەک خۆتان باشتری دەزانـن، کوردەکـانی قـەراچورلوو پـاش چەند ساڵ شەڕۆپێکدان لە ناو هێزو سوپای نادردا پاش مەرگی نـادر لـە س یاسـەت دوورخرانەوە و ئەوانیش کەلە شەڕماندوو بوو بوون دەبـێ بەوڕاسـتیەش دادان بنـرێ کە زۆر کـ.ڕەشێری ئەم عەشیرەتە لەشەڕەجۆراجۆرەکاندا کوژراون.

هەر چەندە ئێستا ناوەندی ئەم عەشیرەیە لە ڕۆژ ئاوای بنجـۆرد دایـە بـەڵام زۆر بەشیان لە دەرەگەز و خوارو وەرامین ودەماوەندا دەژیـن زووتـریش لـە کـاتی کـۆچ کردنیان بۆ خوراسان تاقمێک لە کوردەکان لە دەماوەند مانەوە کەبە گاوستیانلوو نـاو بانگیان دەرکرد، واتا ئەوانەی واگاکانیان ماندوو بوون بەڵام نادرشاش تاقمێکی لەسـەر بازانی قەراچورلووی دووبـارە بـۆ وەرامـین دوورخـستەوە و ئێـستا لـەوێ دەژیـن و دەورێکی گرینگ دەگێڕن و مووسا کوردی قەراچورلوو لەم بارەوە کتێبێکی نووسیوە و هاوکات دەستەیەکیان لە ئیسفەرانیدامانەوە کـە مەسـعوود خـان سەرپەرشـتیانی دەکرد. بەڵام هەروەک گوتمان، زۆربەی قەراچۆرلووەکان لە ڕۆژ ئاوای بنجـۆرد و لـە

---

٢١٩- ئامۆزا

سملقان و شۆغاندا مانەوە و گوندی کەڕەک[٢٢٠] بوو بەمەکۆی ئەم عەشیرەیەو هاوکات بۆ شۆغان و کێوی ئالاداغ لە هاتوچوودا بوون.

وردە وردە وازیان لە چادرنشینی هێن و دەستیان دا کاری فەلایی و کشت و کاڵەوە. و ناوبراوان دووریان گرت لە شەڕەناوەخۆییەکانەوە، بەلام پاش مردنی نادرشای[٢٢١] ئەفشار و جێگرەکانی شەڕوپێکدادانەکان لە نێوان عەشیرەتەکاندا گەیشتە ئەوپەڕی خۆی و ئەرتەشی ئێرانیش کە هەر ئەو ئێل و عەشایرانە بوون بە تەواوی شێوا و هیچ کەس گوێبیستی قسەی سەرۆکی عەشیرەتەکان نەدەبوو و تورکمانەکان بە هەمە چەشنە هێرشیان دەهێنا و خەریکی جەردەگەری بوون.

تەنیا جێگەی ئومێدوهیوا ئەوەی بوو کە تاقمێک لە دارودەستەی عەشیرەتی شادلوو هەستانەوە و عەشیرەتە پرژوبلاوەکانیان کۆ کردەوە و هاوکات لەگەڵ بنەماڵەی نادریش دا نێوانێکی وەهایان نەبوو لەسەردەمی ئاغا موحەممەد خانی قاجاڕدا کە هێرشی کردە مەشهەد و ئیبراهیم خانی شادلوو کە سەرۆکایەتی عەشیرەتەکانی بنجۆردی وە ئەستۆ بوو، بوو بە شەڕیان و ئاغا موحەممەد خان دەسەلاتی لێ وەرگرتەوە و ماڵ و داراییەکەش بە زۆر لێ ئەستاند. بەلام زۆر کەسان لە دەسەلاتی سەرۆکی عەشیرەتەکان پالپشتیان کرد و سەردارە قاجاڕەکانی شلەڕێ ناچارێیەوە هەمیسان وەک خەلکی مەجبوور بوون پالپشتیان لێوە بکەن.

بەلام تورکمانەکان جاروبار هێرشیان دەهانی و سەڕوماڵ ناوچەکانی سملقان و بنجۆردیان بەغارەت دەبرد و زۆر کەسانیشیان دیل دەکرد شەڕێکی خراپ لە نێوان تورکمانەکان و کوردەکانی مامیانلووی قەراچورلوودا ڕووی دا و زۆرکەس لە ئەو

---

٢٢٠- لەسەردەمی قاجاڕ دا بنیات نراوە و ناوەندی دەسەلاتدارێتی بووە

٢٢١- لە جوغرافیای مێژوویی توربەتی حەیدەریەدا کە نووسراوەی موحەممەد ڕەزای خەسرەوییە لە لاپەڕەی ٥٨دا نووسراوە: ناکۆکی نێوان مندالەکانی شاهرۆخی ئەفشاردا زۆری گرت و نەسروللامیرزا پەنای هێنایە کوردەکان و موحەممەد ئەمین خان قەراچورلوو و جەعفەرخانی زەعفەرانلوو بە ٦هەزار سەربازەوە چوونە یارمەتیەوە بەلام چۆن لە تورکمانەکان ژنی خواست کوردەکان دەستیان لە یارمەتی ئەوهەلگرت

ناوچەیەدا لەسەرپارق هەڵاتن و مردن و گۆڕەکانیان هێشتا لەوێ هەرماوە.

موحەممەد قولیخان شادلوو کەلەو شەردەمدا سەرۆکایەتی عەشیرەتی لە ئەستۆ بوو و لە دەستی تورکمانەکانەوە شکستی خوارد و لە کاتی دەرباز بووندا لەهەرگاوەکانی هەزار چەشمەدا لە سملقان داگیری کرد و نازناوی پالچق سەرداری پێی درا. (۱۲۸۹ کۆچی)

بە داخەوە لەم کاتەدا شەڕوپێکدادانەکان لە نێوان خانەکاندا پەرەی سەند و پاش مەرگی حەیدەر قولیخان شادلوو ناوچەکە زۆر شێوا و لەبەر ئەوەی عەشیرەتەکان لەشەڕو ئاژاوەی تورکمانەکان زۆر تووڕە بوون، شکایەتنامەیەگیان ئاراستەی بارگای قاجاڕی کرد و یارموحەممەدخانی یەزدانقولی، برازای حەیدەرقولیخان کە زۆر ئازاو کارامە بوو و سەرۆکایەتی عەشیرەتی شادلووی کەوتە ئەستۆ یارموحەممەد خانی شادلوو کە پیاوێکی دلێرو ئازابوو بوو بەسەرداری عەشیرەتەکانی بنجۆردە ئێسفەراین، جوەین، سەبزەوار، فەردێن، جاجەرم، گۆگلان، و ئەستەر ئاوا لەم بارودۆخەدا عەشیرەتەکانی ناوچەکە لە هێرشی تورکمانەکان لە ئازار و ئەزیەتدا بوون و لەنامەیەکدا کە بۆ یارموحەممەدی سەرکردەیان نووسی داوایان کرد تا سەبزعەلی خان کە زۆر کارامە بووبێ بەسەر کردەی عەشیرەتی قەراچورلوو بەڵام بە داخەوە شەڕەکانی نێوان ئامۆزاکانی سەردار یارموحەممەد شادلوو باڵادەگرێ و شەڕەکان گەیشتە ئەو پەڕی خۆی بەڵام پاش حازر بوونی سەرۆکی عەشیرەتەکان شەڕەکان، ئارام دەبێتەوە سەبزعەلی خان دەبێتە سەرۆک حکوومەتی سملقان، شووقان و بەشێکی گووگلان.

سەبز عەلی کە پیاوێکی کارامە بوو پاش چەند هێرشی بۆ سەر تورکمانەکان، تێکیانی شکاند و کارێکی وەهای بەسەریاندا دەرهانی کە ئیتر کوردەکان بە دەستی هێرشی تورکمانەکان ڕزگاریان هات.

بەڵام ڕەزاقولی و بیگلەر یارم ئاغا و دارو دەستەکەیان ڕاهەت نەبوون لەم کاتەدا سەبز عەلی خانی حاکمی ناوچەکە و یارموحەممەد خانی شادلوو و سەردار موفەخخەم و موحەممەد ئەعلەم خانی مستەوفی کە خۆی بۆ ڕاگەیشتن بە

کێشەکەدا هاتبووە ناوچەکە و بە تایبەت هاتە سملقان ڕەزاقولیخان یارم ئاقا کە خۆی بریندار بوو بوو، نۆکەرێکی خۆی هان دا تا ئەللاقولیخان جێگری سەبز عەلی خان بکوژی ڕۆیکیان کە موحەممەد ئەعلەم خانی مستەوفی سەردار و ئەللاقولی خان بۆ هەلگرتنی خەرمانەکانی قەلای نەجەف و قەلای موسەللابرۆن و کابرای قاتل هێرشی کردووە و لە نیوەی ڕێگەدا دووکەس لە نۆکەرەکانی ئەللاقولیخانی کوشتووە و هاوکات ئەم هەوالەیان پێی دەکات.

نزدیکانی پێشنیار دەکەن کە قاتل ویستوویە ئێوە بکوژێ و کەچی ئێوە چەکتان نیەودمیێ دەرباز ببن، بەلام ناوبراو دەرباز نابێت هەمیسان پێشنیار دەکەن تا لە ژێری خەرمانەکاندا بیشارنەوە و ئەم کارە بۆخان زۆر گران دەبێت و مل بە ئەم کارەداناکات لە ناکاو قاتلەکەپەیدا دەبێت و خان دەکوژێ قاتلەکەش لەو تەنگی غریوەدا دەرباز دەبێ. پاش چەند ڕۆژی ڕەزاقولیخان یارم ئاغا شکایەتێکی تیرۆتە سەلی لە لایەن یارموحەممەد خانی شادلوو و سەبز عەلی خانی قەراچۆرلووی سەرۆکی عەشیرەتەوە بەهەمان قاتلدا ڕاسپێری تاران کرد و ناوبراویش شکایەتەکەی بردە دەرباری قاجاڕی و خۆیشی دژی ئەو کەسانەی ئەو کارەیان کردووە وەستا نامەیەک لە لایەن دەربارەوە ڕەوانەی حکوومەتی خوراسان کرا و سەبارەت بەم ئاکارە لە یار موحەممەد خان پرسیار کرا. یارموحەممەد ڕاڤەیەکی لەولامدا بۆ دەربار نووسی و داکۆکی کرد کە قاتل کەسی کوشتووە و ئەگەر بەسزای کاری خۆی نەگات ناوچەکە دەشێوێت یارموحەممەد خانی شادلوو کە دەرباریش زۆر خۆشی دەویست چەند کەسی لە دەولەت ویست تابۆ چارەسەری کێشە کەڕەوانەی مەشهەد بن و لەوێوە ڕەوانەی بنجۆردبن تا قاتلەکەبدەنە دەستی سەبز عەلی خانی سەرۆک حکوومەتی مسلقان و ئەوی شقاتلەکە بدەنە دەستی سەبز عەلی خانی سەرۆک حکوومەتی سملقان و ئەویش قاتلەکەی ئەللاقولیخان دەکوژێ و تا ماوەیەکی زۆر ئاشۆ و شەڕو شۆڕی ناوچەکە درێژەی دەبێ بەلام پاش ماوەیەک ژیانێکی ئارام و لەسەر خۆ هاتە سەر خەلکی ناوچەکە. و عەشیرەتی قەراچورلوو بوون بە فەرمانبەرداری شادلووەکان بەلام سەبز عەلی کەبەرگری دەکرد لەشەر و ئاشۆو

ناکۆکی ناوچەکە کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەشی بۆ نەجەف گۆزرایەوە و لەتەنشتی گۆڕەکەی جەعفەر قولیخانی ئیلخانی شادلووە به خاک سپێردرا.

لەبەر ئەوەی سەبز عەلیخان کوڕی نەبووە بۆیە موحەممەد قولیخان کوڕی شاحوسێن خانی برازای تری دەبێتە جێگری.

هەواڵی کۆچی دوایی سەبز عەلی خان گەیشتە گۆی تورکمانەکان و بۆیە دوو هەزار سوارەی تورکمانی یە مووت هێرشیان کردە ناوچەکە و بەفرەمانی سەردار یارموحەممەد خان تاقمێکی زۆری ئەو تورکمانانە کوژران و تاقمێکیشیان کەلەبچە کران و ماڵەدزراوەکانیش درانەوە خاوەنەکانیان.

سەردار یار موحەممەد خان بۆ سپاس و ڕێزلێنانی هێزو هەیبەتی کوردەکان تا شائاوای سملقان هاتە پێشوازیانەوە...

حکوومەتی موحەممەد قولیخان زۆری نەخایاند کە کۆچی دوایی کرد و سەرۆکایەتی ناوچەی سملقان و شۆقان و بەشێکی لە گۆگلان درایە دەستی حوسێن قولیخانی قەراچلوویی کوڕی گەورەی موحەممەد قولیخانەوە گۆڕی خوالێخۆشبوو موحەممەد قولیخان قەراچورلوو لە دووکیلۆمەتری گوندی کریک وەیە.

حسێن قولیخان کە پیاوێکی ئازاو دلێر و عادڵ و باسەواد بوو لە ناوچەکدا ناونیشانێکی زۆری وەدەست هانی و توانی نێوانی دوو عەشیرەتی قەراچورلوو و شادلوو زۆر خۆش بکات.

حسێن قولیخان کە زاوای سەردار موفەخخەم بوو خوشکی سەردار موعەزەز شادلۆش بوو خوشکەکەی خۆیشی مارە کرد بۆیەکێ لە براکانی سەردار موعەزەز شاهرۆخ شادلوو بەیەکگرتنەوەی ئەم دوو عەشیرەتە کاری حکوومەتیشی لەو ناوچەیەدا زۆر ئاسان بووە و هەر ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی تا عەشیرەتە ڕەشماڵنشینەکان، سەقامگیربین و گوندەکانی ئاوەدان بکەنەوە و لەم کاتەدا هەراوەکانی ئاڵا داغ لە لایەن حوسێن قولیخانەوە دەفرۆشی بە ئەم عەشیرەتانە

لەم کاتەدا کە کوردەکان یەکجانشین بوونەتەوە و حکوومەتی تزاری ڕووسیەش

بۆ سەرکوت کردنی تورکمانەکان هێرش دەکات و لە کۆک تەپەدا بە خراپ ترین شێوە تێکیان دەشکێنێ و تاقمێک لەسەردارەکانیان وەک ئاراز سەردار و توخمەسەردار لە ڕێگەی جەرگەلانەوە پەنادەبەنەحسێن قولیخانی قەراچورلوو و ئەویش ئەیانداتە دەستی سەردار موعەزەزەوە و دەستەیەکی تریشیان لە تورکمانەکان دەرباز دەبنە ناوچەکانی بنجۆرد و دە هەزار کەسێکی تر لە تورکمانەکان ڕوودەکەنە خوراسان و ناوچەکە سەقامگیرتر دەبێتەوە بەڵام پەنا بردنی تورکمانەکان بۆ بنجۆرد و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ تورکمانەکانی دانیشتووی ئەوێ کێشەیان بۆ ناوچەکە دروست کرد و چەند شەڕی پیسیان هەڵخڕاند بەڵام هەموو کاتی لەشەڕەکاندا شکستیان دەخوارد، بە تایبەت لەشەڕێکی گرینگدا کەلە نەریندا ڕووی دا و ئادینە موحەممەد بەیگ قەراچورلوو و غولامڕەزا بەیگ بادلانلوو و چەند کەسی دیکەش کوژران کەلە بەرگی سێهەم دا ئاماژەی پێی کرا.

بەڵام لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا سەردار موعەزەز بە باشترین شێوە عەشیرەتە کوردو تورکمانەکان دەلکنی بەیەکەوە.

سەرۆکی عەشیرەتەکانی گووگلان بە تایبەت دەولەت گلای خانی باوکی دوردی خان و سەرۆکی عەشیرەتی تەقتەمش و هەروەها شادی خان هەر لەو عەشیرەیەو عەلی موحەممەد خان و جانی خان لە عەشیرەتی قارناس گولی داغ و هەروەها شێخی خان و ساتە لەق خان لە عەشیرەتی یەمووتی تورکمانەکان بانگهێشت دەکرێن بۆ کریکی ناوەندی حکوومەتی حسێنقولیخان و کۆ بوونەوەیەکی ڕاوێژکاری دەست پێ دەکات.

لەم کۆ بوونەوەدا بڕیار درا کورد و تورکمان هێرش نەکەنە سەریەکتر و لەوەڕەکانیشیان ببێ بەشەریک و هاوکات پارەش لەو ئاژەڵدارە بیانیانەی کەلەوێن وەربگیردرێ کە حسێن قولیخان بوو بە بەرپرسی ئەو کارە و سەردار موعەزەزیش بوو بە بەرپرسی ڕاگرتنی ئارامش و ئاسایشی ناوچەکە

خەڵکی بە گشتی حورمەتێکی زۆریان بوو بۆ حسێن قولیخان و چەند شوێنیان بۆ پاراستنی مەڕومالی خەڵک دروست کردبوو و هاوکات حسێنقولی خانی

یووزباشی بوو بە بەرپرسی پاراستنی ئەو مەڕوماڵاتە کە خۆی لە عەشیرەتی گـوودری تورکمان بوو کوڕێکی بوو بە ناوی سلێمان کـە لـە دەشـتی شـاخلوو دا بـە دەسـتی تورکمانـەکان دەکـوژری و هاوکـات کەربـەلایی عـەلی ئەکبـەریش بـە دەسـتی تورکمانەکان دەکـوژرێ پاشـان تاقمێـک لـەو قاتلانـە دەسـگیر دەکـرێن و لەسـەر گۆڕەکەی کەربەلاییەوە تیرە بـاران دەکـرێن و پاشماوەکـەیان دەدرێ بـە دەسـتی موحەممەد بەهادر خانی ناسراو بە مەمۆوە و هەمیسان ناوچەکە ئارام دەبێتەوە

حسینقولی خان ڕیزی زۆری دەگیردرێ و بنەماڵەکەشیان هەر ئێـستەش ئـەو حورمەتەیان ماوە بەڵام بیری ئیستیعمار ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ دەسـەلاتە ناوچەییـەکانی بەرتەسک تـر دەکـردەوە و دەسـەڵاتی لـە دەسـەڵاتدارانی ناوچـەوە ردەگرتـەوە و کەسانی تری لە شوێنەکانی ترەوە دەهانی و دەیانکردە دەسەڵاتدار بە تایبەت پـاش هاتنە رووکاری ڕەزاشای پالەوی پاش ئەوەی بیروباوەڕی کومۆنیـستی لـە یەکیـەتی شۆڤیەتەوە پادەگرێ وردە دەسەڵاتەکانی ئێـرانیش دەگەنـە ئاکـامی خۆیـان لەبـەر ئەوەی هاوکات بۆیان دەست نادات کەلەگەڵ هەمووی سەرکردەکاندا بـاس بکـەن و بۆ مەبەستەکانی خۆیان سەریان دانەوێنن و هـەر ئەوەنـدە کـە بتـوانن پادشـا ڕازی بکەن بۆ کارەکانیان کاریان دروستە بۆیە دەستیان دا بە شێواندنی نێـوانی خەڵـک و سەر کردەکان و ئاویان کردە ژێری ئەو سەرکردانەو بارودۆخیانیان شێواند و بوون بـە هۆی ئەوەی تا سەر کردەکان یەک لە دوای یەک لە کارو دەسەڵاتی خۆیان ببنـەوە، بە تایبەت یەکێ لەو سەردارانە سـەردار موعـەزەزی شـادلوو بـوو کەلەبـەر ئـەوەی نەیانتوانی بە فێڵەو مەکرەوە بێ دەسـەڵاتی بکـەن و بۆیـە بـانگی دەکەنـە تـاران و دەیانئەوێ بە تەڵێ بڕوات و کەچی لـە نیـوەی ڕێکـەدا دارودەسـتەکەی خەبـەر دار دەبن و هەزار سوارە ناو ڕێگە دەگرن و هەر بە بۆنەی ئەوەی سەردار زۆر نەترس بـوو خۆی داوا دەکات تا بچنە دواوە و ئەو تا تاران دەڕوات و دەگەڕێتەوە و سـوارەکانیش بە فەرمانی حوسێن قولیخان گەمارۆ کە دەشکێنن و واز لەو گەمارۆیە دەهێنن.

سەردار لە سەنخاستەوە بەرەو جاجەرم و شارۆد و لەوێوە بۆ تاران دەبرێ هـەتا دەیبەنە خزمەتی سەردار سپە ئـەویش شمـشێرێکی خـەلات دەکـات و هەمیـسان

دەگەڕێتەوە ناوچەکەی ئەم کارە دەبێتە هۆی مەترسی سەرداری سپاوە کە مەلەکوششوعەرای بەهاریش لە کتێبی ئەحزاب سیاسیدا ئاماژەی پێی داوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی سیاسەتی گشتی شتێکی دیکە بوو نەتەنیا سەردار موعەزەز بەڵکوو هیچ سەر کردە کوردێک سەقامگیر نابن. کاتێ کە سەردار موعەزەز لە خوراسان نابێ، سەردار سپا سپایەک بەسەرۆکایەتی مەهدیخان دەڕازێنێتەوە ڕەوانەی بنجۆردیان دەکات و هێرش دەکەنە سەر کورد و تورکمانەکان و دەیانەوێ وابکەن کە خەڵک بگەن بەوقەناعەتەی کەسەردار موعەزەز هیچ توانا و هێزێکی نەماوە و دەبێ دەوڵەت ئەم ناوچانە ئەهوەن بکاتەوە بەڵام هێزی دەوڵەت لەگوڵی داغی دا واشکستێک دەخۆن کە جگە لە دەرباز بوون هیچیان بۆ نامێنێتەوە.

حسێنقولیخان قەراچورلوو و موحەممەد بەهادر خان ناسراو بە مەمۆ دەبنە بەرپرسی کۆ کردنەوەی کەرەستە و غەنیمەکان و دەیدەنە دەستی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بەڵام ئەم پیاوەیتە بەنا پیاوی ولامی دەدرێتەوە و دوو هەزار سوار هێرش دەهێنن و هەمووی مەڕو ماڵاتی ئەو ناوچەیە دەدزن سەردار موعەزەز هاوڕێ براکانی و حوسێن قولی خان و سپاکەیانەوە لە ئینچەی ژوور و قەرەقواخدا بەرنگاریان دەبن بەڵام بە هۆی سەرمارو کرێوەوە عەشیرەتی شادلوو تێک دەشکێ پاش ماوەیەک دەگوترێ کە تورکمەنەکان لە لایەن بنکە نیزامیەکانی ئێرانەوە ساپۆرت دەکرێن و هەروەها شایعە دەکرێ کەتیری دەستەی سەردار موعەزەز هەمووی فەساد بۆتەوە.

لە ئاکامدا دوژمنانی سەردار موعەزەز بەسەرۆکایەتی عەبدولحوسەین خانی تەیموورتاشی نەردێنی سەر بە سەردار موفەخخەم کە کینەیەکی زۆری لەگەڵی کورد بوو کەلەو کاتەدا سەرداری سپابوو و پاشانیش بوو بە وەزیری دەرباری پالەوی و هاتە سەر ئەو هەڵویستەی تا سەر کردەکانی عەشیرەتی شادلوو لە ناو ببا پاشان باسی دەکرێ.

پاش ماوەیەک عەزیز وڵلاخان سەردار موعەزەز، عەبدوڵلاخان، ئەسەدوڵلاخان شاڕۆخ خان، یووسف خان، ئەفراسیاو خان، برای سەردار و حسێنقولیخان حاکمی

سملّقان و سەر کردەی عەشیرەتی قـەراچورلوو و موحەممـەد ڕەزاخـان کـەیکانلوو میرئاخوڕ و جەعفەر قولیخان حەمزە کانلوو سەر کـردەی قـەزاق و گـاردی سـەردار موعەزەز و موحەممەد بەهادور خان قەراچورلووی سـەر کـردەی سـوارەکانی کـورد بانگهێشت کرانە مەشهەد و بە فێڵەی چەند کەس لـە دوژمنـان و دروسـت کـردنی نامەی جەعلی لە لایەن سەردارەوە بۆ دەعوت کردنی ئەحمەد شا بۆ شۆڕشی دژ بـە سەردار سپا دەبنـە هـۆی ئـەوەی هێـرش بکردرێتـە سـەریان عەشـیرەتی شـادلوو تورکمانەکانی گـووگڵانیش بەسـەرۆکایەتی ئەسـفەری بـرای موحەممـەد بـەهادور هێرشیان کردە سەر بنجۆرد و هێزی دەوڵەت بە سەرۆکایەتی سـەرهەنگ ئەنـساری بـاوکی وەزیـری نـاوخۆی سـەردەمی دەسـەڵاتی موحەممـەد ڕەزاشـای پالـەوی گەمارۆدران.

سەرهەنگ ئەنساری سەر کردەی نیزامی هاوڕێ چەند سـەربازی کـوژران بـەڵام ئەم جارە هێزی خوراسان بەیارمەتی خانەکانی قووچانی و شیروانی و بـەبۆمباکردنی شاری بنجۆرد گەمارۆکەیان شـکاندو کوردەکـان و تورکمەنـەکان نائومێـد گەڕانـەوە وڵاتەکانی خۆیان.

سەردار عەزیز وڵلاخان عەبدوڵلاخان، ئەسەدولـڵاخان شـادلوو و حوسـێنقولی و موحەممەد بەهادور قەراچورلوو و موحەممەد ڕەزاخانی کـەیکانلوو و جەعفـەر خـان حەمزەکانلوو بەبێ لێپرسی لەسێدارەدران و پاشماوەکەیان زینـدانی کـران و تاقمـێ لەسە کردەو فەرماندەکان دەسـت دەدەن بـە چـەپاوڵ کـردنی مـاڵ و کەرسـتەی خەڵکەوە و تاقمی کورد رووت دەکەنـەوە و دەیبەنـە مەشـهەد و هـەمووی کـەل و پەلەکەیان دەفرۆشن جان موحەممەد خان ئەمیر لەشکری ڕۆژهەڵات پاش چـوونی بۆ بنجۆرد لە سملّقاندا گوندی کرک مورتزای قولیخـان جێگـری حـسێنقولی خـان دەداتە بەرشەلاخ و هـەمووی مـاڵ وزێـڕ و داراییەکـەمان دەدزی و هاوکـات چەنـد کەسیش لە قەسری قەجـەر و بـەدرانلوو و ئاشـنانە دا دەدا لەسـێدارە و حکوومـەتی چوار سەد ساڵەی کوردانی باکووری خوراسان دەگاتە ئاکام.

هـەر چەنـد بـۆ سـاڕێژ کـردنی ئازارەکـان حـوکمی ئیلخـانی گـەری درێتـە

یارموحەممەد خـانی دووەمـی کـوڕی عـەزیز ولـڵاخان و بۆسـەقامگیری ناوچەکـە یەحیاخان کوڕی موحەممەد بەهادور خـانی دەکـری بەسـەرۆری سمـڵقان و سـەر کردەیی عەشیرەتی قەراچورلووش دەدرێ بە دەستی حاجی موحەممەد[٢٢٢] خانوە.

بەڵام هیچ کاتێ ئەم فەرمانە جـێ بـەجێ نـەکراو ئـەم حوکمانـە هـیچ نـەبوون ماڵەکەی حـسینقولیخان کرایـە شـارەوانی و ماڵـەکانی کریـک بـوون بـە دایـرەی دەوڵەتی و زێروپارەکەشیان خورا.

هەمووی قەڵاکانی کریک و ناوچەی دەوروبەری وێران دەکرێن پـارەی ئیلخـی سەردار دەدرێتە دەستی ئەسغەر ئیلخیەوە کەلـە گونـدی جـۆری ئەسـپەکان بـوون دەدرێنە دەوڵەت جەنگەڵەکانی ئالاداغ چاوکەی خان و مەرجان لە دەستی کـوردان دەرهات و ئەیوانی ئەرمەنی بوو بە خاوندارى و لەبەرانبەریـەوە پارەیـەکی زۆرکـەمی دەدا پێیان.

پاش ماوەیەک ڕەزاشای پالەوی هەمووی ماڵ و داراییەکەی بە قـازانجی خـۆی لە ژێر دەست گرت و ماڵی خانە کوردەکانی لە بنجۆرد و سمـڵقان دا کـە زۆر ڕازاوە بوون بۆ خۆی داگیریانی کرد هـەموو زەویـنی کـشت و کاڵیـشیان داگـیر دەکـرێ سەرهەنگ ڕەخشا سەر کردەی ماڵ و دارایی پالەوی لـە بنجـۆرد دەبێتـە بەرپرسـی ماڵەکەی سەردار موعەزەز و وردە وردە بنەماڵەی شادلوو لـەوێ دەگرێنـە دەرەوە و هاتە تەنانەت بەوەیـشەوە ئـەو سـەردار ڕەخـشایە وازناهێنـێ و ڕاپـۆرت دەدات تـا خانەکان لە بنجۆرد دابن کەس بە گۆی سەر کردەکانی دەوڵەت ناکاو بۆیە داخـوازی دوورخستنەوەی خانەکان دەبێت.

و بۆیە دەوڵەت داخوازییەکەیان دەپەزێرێ و خانە کوردەکـان دوور دەخرێنـەوە

---

٢٢٢- حاجی موحەممەد خان قەراچورلوو پـاش چەنـد سـاڵ و لەسـەردەمی دەسـەڵاتی ڕەزاشـادا دەیەوێ لەخەڵکی ناوچەکە تریاک بکڕێ، بۆیە داوەری وەزیری دارایی دەڕواتە بنجۆرد و بانگهێشتی کڕینی تریاک دەکات بەلام خەڵکی نەیانوێرا تریاکەکانی خۆیان بهێنێن و خوالێخۆشبوو دادەریش لە حاجی داوا دەکات تا بە خەڵکی متمانە بدات هیچ پلانێکی بـە دەسـتەوە نیـە و بۆیـە حـاجیش لـە خەڵکی داوادەکات تریاکەکانی خۆیان بهێنێن و ئەوانیش بێ قەولی ناکەن.

بۆ ئێسفەهان و تاقمێک سەرکردەی لوڕ لە لوڕستانەوە دەهێندرێ.

سەرۆکی عەشیرەتە لوڕەکان کە بریتی بوون لە میدرنبووس خان میرنە سروڵڵاخان میر موحەممەد خان، ئەمیر خان لە شائاباد قازی، و ئینچەی ژووروودا نیشتە جێ کران پاش ماوەیەک میردنبووش تیرۆر کرا. دەستەی بەرپرسی کۆ کردنەوەی مالیەکە تا خەرمانانی ١٣٢٠بارودۆخ هەروەعا دەچواپێشەوە، بەڵام پاش لە ناو چوونی ڕەزاشا، لوڕەکان دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و دوور خراوە کوردەکانیش دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان لە نیوەی ڕێگەی گەڕانەوەی لوڕەکاندا ڕووسیەکان ڕووتیان دەکەنەوە و هیچ بە دەستیانەوە ناهێڵن

## قەراچورلووەکانی خوارو وەرامین

با بزانین کوردەکانی خوارووەرامین کە نادرشابۆ پاراستنی تاران ڕەوانەی ئەو شوێنەیانی کردبوو لەچ حاڵێکدان:

پاش خوێندنەوەی کتێبی نیشب و فراز نووسراوەی مووسا قەراچورلوو سەر کردەکانی کوردی خوارو وەرامینم ناسیەوە و هاوکات چاوم بە شێعریک کەوت کە دەڵێ:

ڕەگەزم کوردیە و لە تیرەی قەراچورلووم و خەریکی کاری کشت و کاڵم و دانیشتووی داوود ئاوای وەرامینم، لەبەرواری ١٢٨٧/٦/٢٠ی هەتاوی هاتوومەتە دنیاوە باوکم ناوی حەسەن خان کورد قەراچورلوو بوو کەلە سەردەمی قاجاڕەکاندا پلەی سەرتیپی پێی درابوو و دەسەڵاتی ناوچەکانی دەوروبەری تارانی بە دەستەوە بووە و باوگەورەم شێخ عەلیخانە لە مێژدا لە ئازەرئابادگانی ڕۆژ ئاوا دا دەژیانین لەسەردەمی سەفەویەکاندا چەند تیرە لە قەراچورلووەکان و کەیوانلووەکان و زافەرانلووەکان کە ناسراو بوون بەچامەشکەزک بەفەرمانی شاعەباس ڕەوانەی بنجۆرد و دەرەگەز شیروان، قووچان ئیسفەراین دەکرێن و لەسەردەمی نادرشایش دا کوردەکان زۆری یارمەتی دەدەن و پاش دەسەڵات پەیدا کردنی نادر دەستەیەک لە خێڵی قەراچورلوو بوو لە دەوروبەری تاران لە وەرامین و گەرمساردا دەمێننەوە و

خەریکی کشت و کاڵ و ئاژەڵداری دەبن.

باب و کاڵی من هەر لەسەردەمی نادرەوە تا ئەمڕۆ سەرۆک و سەر کردەی ئەم عەشیرەتە بوون.

لێکۆڵینەوەیەک لەسەربەردی گۆڕخانەی ئیمام لەنگەری بنجۆرد

زگورستان گذر کردم صباحي
شنیدم ناله وافغان و آهي
شنیدم کله اي با خاك ميگفت
که این دنیا نمي ارزد بەکاهي

بەردی گۆڕ یاکێلی گۆڕەکان لەو شایەتانەن کە بایەخیان پێی نادرێت بەڵام لە بواری مرۆڤ ناسیەوە زۆر ڕێکوپێکە

پووشپەری ١٣٦٨ی هەتاوی کە هاوڕێ هەڤاڵم حاجی قەنبەر قوردانلوو و براکەی واتا عەلی ڕەحمەتی و عەلیجانی کوڕی لەبنجۆردەوە ڕەوانەی گوندی لەنگەر بو ین، لەکەناری ڕێدا گەیشتینە گۆڕخانەی ئیمام لەنگەر و خەریکی خوێندنەوەی نووسراوەی سەکێلەکان بوین.

١- کێلی لەتیف بەگ بوغانلوو باغچی لەسەرهەنگەکانی دەزگای یار موحەممەد خان شادلوو ئیلخانی بجنوورد ناوبراو هەر ئەوکەسەیە کە کەماتێکدایار موحەممەد خان سلێمان خانی کوڕی دەکوژێ پێی دەڵێ تا ئەو کورەکەی بۆ بکوژێ و ئەویش دەڵێ من کاری واناکەم و تۆمن بکوژە.

بەرواری سەرکێلەکە ١٣٣٨ی کۆچیە سەردەمی سەردار موعەزەز

٢- عەلیخان بەگ بوغانلووی کوڕی لەتیف بەگ کەلەشەڕی دژی تورکمانەکاندا جوانە مەرگ کرا ١٣٢٢ی کۆچی

٣- عەلی قولی خان کوڕی موحەممەد کەلە نووسەرەکانی تایبەتی

یارموحەممەد خان بوو و کوڕەکەشی بوو بەسەردار موعەزەز ١٣٣٦کۆچی

٤- گۆڕی حاجی شێر موحەممەدی خەندەقلوو ١٣٤٩کۆچی

٥- گۆڕی سوڵتان قولیخان سەرتیپ و لـە کـوردانی هیزانلـوو ١٣١٨ی کـۆچی هیزانلوو و عەلەمیەکان لەنەتەوەی ئەون

٦- گۆڕی ڕەحمان قولیخان سەرهەنگ ١٣٠١ی کۆچی

٧- گۆڕی ئاغاڕەزامەرگان باغچفی ١٣٤٩/٢/١٠کۆچی

بەلام بۆچی گۆڕی ئەم هەموو گەورانە لەوێ کۆبۆتەوە؟

لەبەر ئەوەیە کە لەوێدا ئیمامزادەیەکی تێیدا هەیە و ناسراوە بـە ئیمـام لەنگـەر: ئیمام لەنگەر لە بنەماڵەی ئیمام مووسـای کـازم بـووە و ئـەو ئیمامـە منداڵـی زۆری هەبووە و لەهەر کۆی دەبینی لەبنەماڵەی ئەو هەیە و گومەزوبارگای بۆسـاز کـراوە و ئیتر نازانم ئەم درۆیە چەندەی ڕاست بێت.

ئەم گۆمەزوبارگا تایبەتەبە سوڵـتان موحەممـەد ڕەزای کـوڕی ئیمـام مووسـا و ئەمگومەزە لە سەردەمی سوڵتان موحەممەدی خودا بەندەدا ساز کراوە

لەبەرواری ٨٧٦ی کۆچی و هەمیسان سالی ١٣٧٠ی کۆچی دەستی لێ دراوە.

بەڕێز عەلی ئەسغەر قورکانلوو لە گۆندی بیدەکەوە هاتبوو و ٨٥ساڵی تەمەن بوو پرسیارم کرد لە بارەی ئەم بارگاوە و ئەویش گوتی مـن گرانیەکـەی ساڵـی ١٣٣٦ی کۆچیم لەبیرە و سەردەمی گەنم مەنێ تمەنێکم لەبیرە

ناوبراو گوتی کچێکیان دەدا بە لەتەنانێ سالاگەنم وەقەران ژەکەچکێ قـەرەمانان ناوبراو هەناسەیەکی هەلکێشەو گۆتی دەنەی وەقەران دەنەی وەقەران

## بەڵگەکانی سەبارەت بە جەجوو

لەبەرگی سێهەم دا لەم بارەوە باسی زۆرمان نووسی پاش چاپی بەرگی سـێهەم بـراێ ئـەدیب و شـاعیری کـوردی زەنگلانلـوو لـە گۆنـدی خریجـەوە سـێعرێکی مەلاڕەمەزانی بۆ ناردم کەلە بارەی شەڕەقارەمانانەکانی جەجۆوە بـوو. ئـەم شـێعرانە هەمووی بە زمانی تورکی نووسراون.

## شه ڕی جه جوو و ڕووسه کان له عه لی ئاوای قووچاندا

داستانی شەڕی جەجوو کەلەبەرگی سێهەمدا چاپ کرا گەیشتبووە عەلی ئـاوا و پاشان لەگەڵ حاجی قوربانی سلێمانی دا ئاشنا بوومەوە لەبـەر ئـەوەی باوەگـەورەی دەلاک بوو، ناز ناوی سلێمانیان پێی درابوو خەڵکی عەلی ئاوا تـورکن لەبـەر ئـەوەی ئەمان شێعەن و تورکمانەکان و ئوزبەکەکان سوننی بوون خو ێنیان حـەڵاڵ کرابـوو و زۆربەی زۆریان بـە دەسـتی ئوزبەکـەکان دەکـوژران و بۆیـە ڕەزاقولیخـان ئیلخـانی گەورەی کورد هاتە مەزرای عەلی ئاوا و لەوێ مایەوە لەبەر عەشقی ڕەزاقولیخـان بـە حەزرەت عەلی ئەو گوندەی ناو نا عەلی ئاوا عەلی ئاوا ئێستا کە لـە گونـدە خـۆش و دڵنشینەکانی قووچانــەوە و لەســەرەتای شـیوی دیزادیـز و گـووگڵان دایـە حـاجی سلیمانی لە زمانی باوکیەوە گێرایەوە کەربەلایی ڕەمەزان ٨٣ساڵ تەمەنی کرد و لـە ساڵی ١٣٦٩ی کۆچی دا کۆچی دوایی کرد:

ڕۆژێکیان جەجووخان هاوڕی ٧٥سوارەی زۆرپڕ توانا و هێزی دا هاتنە عەلی ئـاوا و بەپێی بڕیاری پێشوو کە لەگەڵ حاجیـدا بـڕیبوویان چوونـە ماڵـی ئەوانـەوە پـاش خواردنی نانی نیوە ڕۆ دارودەستەکەی پرژ و بڵاو بوونەوە ناو گوندەکەدا عەسری ئـەو ڕۆژە جەجو و بانگی لە ئێمە کرد و گۆتی: کەربەلایی داواکارم کە تۆزی ئەم ڕیـش و قەژەمان هەڵپاچە.

منیش فەرمانەکەیم جێ بە جێ کرد. بە فەرمانی جەجوو سـەرەتا سەروڕیـشی سوارەکانم تاشی و ڕۆژی دوایی کەوتە نەوبەتی جەجۆوە، کە زۆر خۆش قسەو شۆخ بوو و لە ئاکامدا دراویشی دامێ و لەم کاتـەدا هاوڕێکـانی بانگیـان کـرد کـە وادیـارە کەسیک بە بایسیکلەوە لە قووچانەوە ڕووی کردووتە عـەلی ئـاوا هـەروا بـوو چـەرخ سوارەکە کە زانی جەجوو لە عەلی ئاوادایە خێراگەڕایەوە.

جەجوو گوتی: ئەوە بەکرێ گـیراوی ڕووسـیەکان بـوو، هـەر ئێـستا دەزانم لـە قووچانەوە هێرش دەکەنە سەرمان.

جــەجوو و ســوارەکانی عەســری ئــەو ڕۆژە ســوارەکانی خــۆی تــەیار کــردو

ڕووسیەکانیش گەماڕۆی گوندەکەیان دا و جەجوو گۆتی نابێ ئیزنیان بدەین کە تۆپەکانیان دامەزرێنن و بۆیە سوارەکان لەسەربان ماڵەکانەوە دەستیان کرد بە تیرهاویشتن.

جەجوو گۆتی: کەهەوالێل بوو ڕووسیەکان توانای شەڕیان نامێنێ هەروەها بوو لە دڵی شەودا گەماڕۆکەشکاو ڕووسیەکان لەسێ شوێنەوە کۆ بوونەوە و خەریکی شلێو خواردن بوون و جەجووش هەرمێرا دیواری سێ حەوشی کوناکرد و خۆی سوارەکانی لەوێوە بەرەو ناوەخ بەڕێ کەوتن.

جەجوو بە خەڵکی گوندەکەی گوت: بۆ ئەوەی ئازار نەدرێن، و ئەم ڕووسیانە نەتانخەنە ئازارو کێشەوە ئالف و ئاوی ئەسپەکانیان بدەن بەیانی سپای ڕووس هەر خەریکی تۆپ باران کردنی گوند بوون و خەڵکی گوندەکەش بە یامیان نارد بۆیان کە دوژمن لەوێ نەماوە ڕووسیەکان هاتنە گوندەکەوە و زۆر ئازاری خەڵکیان داو ٢٥لاویان کەلەبچە کرد. و ڕەوانەی قووچان کران ئەم لاوانە بە دەستی تاجرێکی تورک ئازاد کران پێش ئەوەی بگەنە قووچان.

لەو شەڕەدا ژنێکی عەلی ئاوایی بریندار بوو و پیاوێکی سیاقیش کوژرا ڕووسیەکان کەوتنە شوێنی جەجوو کە جەجوو بەرەو دیزادیز چوو بوو و جەجۆش کە دەیزانی بە دوایەوەن لە شیوودۆڵەکانی گوندی خەلێکانلوو و کوچێلانلوودا ڕووسیەکانی گەمارۆدا و لەو ٧٠٠کەسە ڕووسیەدا نەیەگیان گیانی سالمی دەرنەکرد پاش چەند ڕۆژ تەرمی ڕووسیەکان لەوێ دەفن کران جەجوو دەیگۆت: ئەگەر ئێمە خۆمان پیاوبین دوژمن چلۆن دەتوانێ بەرنگاری ئێمە ببێتەوە و ئاوەها سووکایەتیشمان پێ بکات ئێمە دەسەڵاتێکی ئازاو دلێرمان نیە:

جەجوو خانوو تۆسیاروی سەلات هاتیە دەوی داوی

جەجوو لە زمانی حسێن بەراتی خەڕیجیەوە

حسێن بەراتی لە عەشیرەتی شێخکانلوو کە شێعریشی دەگۆت و سەبارەت بەجەعفەرقولیخان زەنگەلیش ناوبراو یارمەتی زۆری داین و هاوکات سەبارەت بەجەجووش گۆتی: دایە گەورەم دەیگێڕایەوە کە:

ئێمــه منــداڵ بــوین و لەوکاتــەدا خــەریکی کــاری ئاژەڵــداری بــوین و ئــەوێ ئارگامان[٢٢٣] بوو و له ناکاو ڕووسیەکان هاتنه ئەوێ و گوتیان: جەجوو قەڕەپێشی.

واتا جەجووی کتکه ڕەش له کۆی دایه؟

عەلیخان کــه تــۆز قالــێ ڕووس دەزانی لــه چادرەکــەی چــووه دەرێ و گــۆتی جــەجوو چەنــدین سالــه لێرەنــەماوه و ڕوســەکان تۆزێــک ئــازاری پیاوەکانیــان داو ڕۆیشتن جەجووش لەوبەری عەمارەتەوه دەهــاتهوه و حەیــدەر ســویریش وەرگــرێ ڕووسیەکان بوو و هاوکات جاسووسیشی دەکــرد بۆیــان و لــەو سەریــشەوه هەواڵــی ڕووسەکانیشی دەدا به جەجوو و لەهەردوولا پارەی وەردەگرت و ڕووسیەکان پــارەی زۆرتریان پێی دابوو و بۆیه چوو جەجوو بدات بەدەستەوه.

حەیدەر لەگەڵ جەجوو بەڕێگەدا دەڕویشتن کەله ناکاو جەجوو بــۆنی ســیگاری ڕووسیەکان یهات به لووتی دا و زانی ئاکارەکەچیه و خێرا حەیدەری کوشت و خــۆی بەرەو کێوەکانی هەزار مەسجدی دەرباز بوو.

**سۆراب فەرهادی تۆپکانلوو سەبارەت به جەجوو چی دەڵێ:**

ناوبراو لەبەرواری ١٣٦٨/١/١٢دا له نامەیەکدا نووسیووی سڵاو بۆ عێوەز و ڕۆحــی جەجوو له ناو ئارامش دابێ و کــەلیم زینــدوو بمــێنی برانگــی کــەلیم: تەوەتەلاشــی شەڤانەڕۆ،تاریخ وفەرهەنگی مەکورمانجیان وەگیان هانیی ژەخادێ دخــازم هەمێــشه وەگیــان بــەویی، تاخەلــک ژەکــارێ تەپڕتربەهرەمەنــد بــەوی نــاوبراو لــەو نامەیــەدا گووتوویه جەجووی سەرۆکی ڕۆژ هەڵات پێش ئەوەی دەست بدات بــه شۆڕشــەوه و کاتێ کەبەرپرســی ناوچــەکانی کــەپکان و دۆڵــێ میــانکێوی دەرەگــەز بــوو لەگــەڵ ئەسەدوڵڵای شوورەکیدا هەڤاڵ بوو و نــاوبراو توانــای داوابکــات لــه خوالێخــۆش بــوو عەبــدوڕەزاخانی شوجاعودەوڵــەی ئیلخــانی زافــەرانلووی حــاکمی قووچــان هــەتا دەسەڵاتی گوندەکانی باکووری ئەترەک بداته دەستی ئەسەدوڵڵاخانەوه.

ئەسەدوڵــڵاخان خــۆی لــه توورکــانی شــورەک بــوو، لەقووچانــدا ناســراوه

---

٢٢٣- ئاگرگا

بەئەسەدوڵلای خەلکی پشت کێو ئـەم ئەسەدولـلایە لەهـە/مـوو شـوێنێکدا هـاورێ جەجوو بووە لەسـەرەتای شۆڕشـەوە نێـوانی جـەجوو شوجاعودەولـە چـاک بـوو و شوجاعودەولە چـەک و تەقەمەنیـشی دەدا بـە جـەجوو و هـانی دەدا تـاکوو دژ بـە ڕووسیەکان بووەستێ. خەلک لەزمانی ئـەو ئەسەدولـلا خانـەوە گێڕاویانەتـەوە کـە جەجوو پیاوێکی کورتەبالا و چوار شانەو چاوگـەورەو ڕەش بـووەو برۆکـانی پێکـەوە لکابوون لووتی درێژ و گوێخچکەکانی گەورەو سمێلێکی زل و دەنگێکی زلی هەبووە و نـاوبراو زۆر پیـاوێکی پیاوانـەو مـاقووڵ بـووە و قورئـان و شـانامەی زۆر جـوان دەخوێندەوەحاجی عەزیز دەیگوت باوکم گوتوویە شەوێک جەجوو و ئەسەدولـلاخان هاتنە قووچان و لەگەڵ شوجاعودەولەدا وتـووێژێکی کـردو پاشـان ڕەوانـەی شـەڕی کۆماسی دژ بە ڕووسیەکان بوو لەکاتێکدا ڕووسیەکان بارەگای ئیمام ڕەزایان تۆپباران کرد جەجوو زۆری لەوان کوشـت بـەلام بەداخـەوە تـیری پێـی نـەماو دەربـاز بـوو، لەماڵێکدا شاردیانەوە جەجوو بڕیاری دایـە هاوڕێکـانی وەرگەڕێنـەوە بـۆ دەرەگـەزو شەوی دوایی لەگـەڵ هاوڕێکـانی گەڕایـەوە بـۆ دەرەگـەز و دژایـەتی خـۆی دژ بـە دەسەلاتی قاجاڕی و ڕووسیەکان ڕاگەیاند.

لەئاکامدا ڕووسیەکان چەند سەرکردەی کـوردی وەکـوو موحەممـەد ئیـبراهیم خـان ڕەوشـەنی و فەرەجولـلاخان شـیروانیان دا بـە گـژی جـەجوودا جـەجوو تـا دواچرکەپیاوانە دژ بە دوژمن وەستاو بوو بە هۆی شانازی گەلانی ئێرانەوە.

پاش کوژرانی جەجوو و هاوڕێکانی ئەسەدوڵلابەگ تـەنیا کـەوت و ڕووی کـردە گوندی گورجی.

### قەڵەم شێرەژنی سنوورداری کورد

قەڵەم یەکێک لەو شێرەژنانەی بووەکەبۆ هەتاهەتایە ناوی لەدڵی مێژووی کـورد دا دەمێنێتـەوە نـاوبراو لەشـەڕی تورکمانـەکانی دژ بـە کوردەکانـدا زۆرکەسـی لـە تورکمانەکان کەلەبچە کردووە و لەبەر ئەوەی دەربـاز نـەین هـەردووپایانی بەتـەوەر کەی خۆی قەڵەم کردووە.

هاوکـات پیـاوە گـەورەکانی کـورد لـە هـەموو دانیـشتنەکانیدا قەڵەمیـشیان کۆدەکردەوە و لە ئەندێشە و بیرەکانی کەڵکیان وەردەگرت

## حاجی باوای پالەوان گورجی

حاجی بابای پاڵەوان بۆ سەید موحەممەدی هاشمی گێڕابووەکە:

نەمدەزانی زۆر پڕهێزم تا تەمـەنی چـل سـاڵان ئـەو سـەردەمە چـووم بـۆ کـار تەجارەت و یانزەقەتارە وشترم بوو لە ناکاروشترێکم کەوتـەناو چاڵـەیەک و خـەریک بوو نجنکێ کەچوومەژێر زکی و ڕزگاریم کرد و ئەوسـاش زانـیم کەچەنـدە پـڕزۆر و هێزم.

لـە گورانـک وشـترم وەرگـرت و لـە غاوەکـەیم گـرت و بۆسەرهەڵـم کێـشا وشترەکەش تەکانێکی وەبـەر خـۆدا و مـنی دڵـنیا کـرد کـە سـاغەودەس و قـاچی نەشکاوە. باری وشترەکەش کە هەمووی جواڵەی مەویژ بوو، بازم کـرد و جواڵـەکانم هەروەکوو ئەهروم لە ژێر ئەژنۆی وشترەکەداناو هەیێکم لێ کـرد، وشـترەکە لەسـەر جواڵەکان هەستا سەرپێ وڕاوستا. بە دوای ویـدا خـۆم هاویـشتە پـشتی وشـترەکەو لەوێیـەوە لـە نـاوبیرە ئاوەکـەدا خـۆم فـڕێ دا دەرەوە. کاروانچییـەکان هـەموویان نووستبوون و منیش نەمویست هیچ کامیان لە خەو هەستێنم و ببمە هۆی زحمـەت بۆ ئەوان. گورێسەکەم دوولۆنە کرد و بەستمە ژێـر سـینگ و کەمـەری وشـترەکە و دوو سەری گورێسەکەم لەسەر شانم دانا و بە هەمووی هێزمەوە کەوتمە ڕێگەو هـەر چەند لەبەرانبەر ئەودا وەکوو بەرخێک بووم وشترەکەم لە نـاو بـیرە ئاوەکـەدا کێـشا دەرەوە و دوای پێڕاگەیشتن و چـاک بوونـەوەی وشـترەکە چـووم و لـە تەنیـشت ئەوانی دیکە نووستم. بەیانی زوو منیان لە خەو هەسـتاند و وتیـان: خێـرا لـە خـەو هەستە چونکە فریشتەی ئاسمـانی هـاتووە و وشـترەکەی لـە بیرەئاوەکـە کێشاوە دەرێ!!!بەم جۆرە توانیم بەسەر هێزێکی شاراوەدا کە لـە جەسـتەی منـابوو زاڵ بم بەڵام هێشتا لەگەڵ کەسا دەست بە یەخە نەبووم و زۆرانم نەگرتبوو تـا ئـەوەی کـە سەفەری تاران هاتە پێش و کاتێ کە لە قووچـان مـەویژمان بـۆ مازەنـدەران ئـەبردو

برێنجمان ئەهێنایەوە بۆتاران. لە کاروانسەرای کەماڵی ئێمەش لەوێ بوو، ژوورێکی هەنبانەی جیا بە دەستی ئێمەوە بوو کەجل و بەرگو، کەرەستەکانمان لەوێ دائەنا. لە یەکێ لەم سەفەرانە کاتێ هاتمە ناو کاروانسەراکە کەسێکم بینی کە لە ژووری هەنبانەکەی ئێمەدا خەریکی حەسانەوەیە. لە خاوەنی کاروانسەرا کە هۆکاری ئەمەم پرسی و وتی: ئەوە پاڵەوانی شاهڕوودییە و خاوەنی کاروانێکە کە بریتییە لەدەقەتار وشتر، ئەویش کلیلی ژووری هەنبانەکەی لە ئێمە ویست ئێمەش پێمان نەدا و ئەویش قوڵف و زەنجیرەکەی دەرهێنا و هەموو کەل و پەلەکانی خۆی بردە ئەوێ. لێرەدا بوو کە بە پێویستم زانی تۆڵەیەکی باش لە پاڵەوانی شاڕوودی بسێمنەوە. منیش یەکێ لە لۆکەکانیم لەسەر دەس بەرز کردەوە و لە پلەکانی هێوان بردە سەر و بۆ لای پاڵەوان کەوتمە ڕێگە وتم: لە جێگەی خۆت هەڵسەو ژوورەکەم بۆ چۆڵ کە ئەگینا لوکەکە دەکوتمە سەر تا؟

پاڵەوان کە لەد یتنی ئەم کارەساتە خۆی وەکوو دۆڕاوێک ئەوێنێ، بە بێ دەنگ هاتە دەرەوە و داوای لێبووردنی لێکرد و فەرمانی دا کە دەبێ ژوورەکە چۆڵ بکرێت. منیش لوکم بردە ناوەڕاستی کاروانسەرا و دامنا. خەڵکەکە هەموویان کۆ بوونەوە پاڵەوانی شاهڕوودی پێشنیاری دا کە بۆ ئاشتی کردن لەگەڵ یەک و بە بۆنەیەکەوە ناسراوی یەکن. تەواوی وشتروانەکان و جەماوەری هەردوو کاروانی قووچان و شاهڕوودی بۆ نانی شەو دەعوەت کەین. منیش قەبووڵم کرد کە پووتێک برێنج لەگەڵ خۆما بێنم، پاشماوەی خەرجییەکانیش هەردووکمان وەکوو یەک بیدەین. بەو مەرجە کە ئەو ئیزن بدات من مشتێک مەویژ لە بارەکەی ئەو هەڵگرم. پاڵەوانی شاڕوودی لەم پێشنیارە منداڵانەی منە سەری سووڕما و گوتی: هەر چەند مشتێک کە ئەتەوێ هەڵگرە و چۆنکە گرینگ نییە. دوایی منیش سەریەکێک لە جواڵەمەویژەکانیم باز کردو دەسم کردە ناو جواڵەکەو بۆ ناومەویژ بردم و پەنجەکانم بە توندی لێکنا. ئەوەندە مەویژەکانم لە ناو دەستما گووشی کە کاتێ ویستم مشتم دەربێرم دەستم دەرنەدەهات و بە ناچاری جواڵەکەیان دڕاند، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پاڵەوانی شاڕوودی و ژمارەیێک زۆر لە خەڵکەکە لە دەوری ئێمە کۆ بوونەوە و

چاویان لەم کارەی ئێمە ئەکرد. کاتێ کە مشتێک مەویژم کە زۆرتر لە نیمێک لەمەویژی جواڵەکە بوو لەسەر فەرشەکە خاڵیم کرد. پاڵەوانی شاڕوودی بەسەر سوورمانەوە لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی: مشتی ئێوەی قووچانی ئاوەهایە؟

وتم: بەڵێ، مشتی ئێمە قووچانیەکان ئاوەهایە.

بەم جۆرە ناوبانگی حاج بابا پاڵەوان ساربان باشی لەسەرانسەری تاراندا بڵاو بووەو پاڵەوانیان بۆ بارەگای ناسرەدین شا برد. پاشا داوای لێ کرد کەلەگەڵ پاڵەوانی بارەگایدا زۆرانێک بگرێت. لە ڕۆژێکی دیاری کراو هەزار کەس لەژن و پیاو لە دەوری گۆڕەپانەکەدا کۆ بوونەوە تا زۆران گرتنی پاڵەوانی کوردی قووچانی لەگەڵ پاڵەوانی پێتەخت بە چاوی خۆیان ببینن ماوەی کاتژمێرێک لە دەست پێکردنی زۆرانە کە تێنەپەڕیبوو کە پاڵەوانی قووچانی پاڵەوانی پێتەختی لەسەر دەست بەرز کردەوە و لەگەڵ هاوار و ئاپۆرەی خەڵکدا بەزەویدا دا. تارانییەکان و دەست و پێوەندییەکانی پاڵەوانی پێتەخت بەدارو چەقۆ هێرشیان کردە سەر پاڵەوانی قووچانی و ویستیان بیکوژن. حاجی بابا لەسەر ناچاری خۆی هاویشتە ناو خەڵکەکەو کە زۆربەیان ژن بوون و لە نێو خەڵکەکەدا هەڵات و خۆی گەیاندە کاروانسەرا.

ئەو شەوە کاروانی حاجی بابا بەرەو ڕێگەی قووچان کەوتنە ڕێیەو جارێکیتر قەت نەگەڕانەوە بۆ تاران لەسەرانسەری خوراساندا تەنانەت یەک ڕەقیبیش بۆ ئەو نەبوو. وتراوە حاجی بابا نەزەر کراوی حەزرەتی عەلی بووە و جێگەی قامکەکانی ئەو حەزرەتە لەسەر شانی ڕاستی دیتراوە. بەم هۆیە بوو کەلەکاتی حەمام ڕۆیشتن لە جیاتی خاولییەک لە دوو خاولی کەڵکی وەردەگرت و خاولی دووهەمی لەسەر شانی و ژێر باڵی ئەبەست تا چاوی خەڵک بەو نیشانە نەکەوێت. ئاغای مەرغزاری دەیگوت: ئەو وەسیەتی کردبوو کە دەبێ مامی من واتە خوالێخۆش بوو سەید عەلی بە دوای مردنیا ئەو بشوات. مێژووی مردنی پاڵەوان بەدروستی نازانم وای بۆ ئەچم. ساڵەکانی کۆتایی دەسەڵاتداری ئەحمە و شای قاجاڕ بوو بێت.

## پاڵەوان سەفی نازکچە کوردی خەباتکاری کوردی تورکیە

ڕژیمی ڕەگەزپەرەست و زۆرداری تورکییە کە هاوکات لەگەڵ سەرکوتی بێ بەزەییانەی خەڵکی کورد، بەدرێژایی مێژوو خراپتر لە عەرەبە خوێن ڕێژەکان و بەعسییە جنایەت کارەکان بووە. ساڵەهایە تێدەکۆشی، بوونی کوردستان و ئازادیخوازی کورد کە زۆرتر لە پازدەملیۆن کەسن حاشا بکات و ناسناوی تورکی کێوی بەوان بدات!!!

بەڵام خەباتی پڕ لە شانازی شێرەپیاوان وشێرەژنانی کورد ئاگرێک نییە کە بکرێتە ژێر خۆڵەمێش و جارێکی‌تر هەڵنەگیرسێتەوە بەڵام بڵێسەکانی توند و لە بڕانەهاتووی ئەو ئاگرە لە داهاتوویەکی نزیکدا پایەکانی ئەم جۆرە حوکومەتە دیکتاتۆر و خوێن مژو دزە مرۆڤانانە بەلەرزە دەردێنێ و لێکیان دەژێنێ.

هەرچەند کە دادگاکانی نیزامی تورکیە و عێراق کە ڕۆژانە سەدان کەس دەسپێرنە دەس جەللادەکانی مەرگ و نەمان و یان لەژێر ئەشکەنجەو ژوورەکانی تاکە کەسی دەیانکوژن.

ئەوان چاک دەزانن تا ئەو کاتەی دایکانی کورد مندالانی کورد بە نیا بێنن زۆر زەحمەتە کە ئاوی خۆش لە گەرووی ئەو خوێن مژانە بڕواتە خوارەوە، مەگەر ئەوەی دایکانی کورد نەبنە خاوەنی منداڵ. بەڵام تا ئەو جێگایەی ئێمە بزانین هێشتا دایکانی کورد لە کوردستانی عێراق و تورکیە منداڵی کورد بە دونیا دێنن و ڕەسەنایەتی فەرهەنگی و نەتەوەیی خۆیان لە دەست نەداوە و هێشتا جارێکی‌تر نووری پاشا و سەفی ناز و قەرافاتمەو لەیلا نازدار و خەیری و مەلا موستەفا و عێزەت نامدار بە دنیا دێنن.

سەفی ناز کچێکە ئاگا و ڕۆشنبیر و خەباتکار بە ئەخلاقێکی کوردانەوە هەروەکوو چەپکە گوڵێکی ڕازاوە، شێرە ژنی کورمانج لەگەڵ بێگانە و داگیرکەراندا بە ڕاستی ئازایە. ئەو لەیەکێک لە قوتابخانەکانی تورکیە خوێندکارە.

لە سەرەتاکانی مانگی بانەمەڕدا ١٣٦٨یەکێک لە مامۆستایانی سەر بەڕێکخراوی

ئاسایشی تورکیە سەرەڕای باس لەسەر شێعر و نووسەرەکانی ئەو وڵاتە لەسەر کلاسی دەرس دەڵێ: بە داخەوە یەکێک لە گەورەترین شاعێرانی تورکیە کورد بووە، هەر چەند کە کوردەکان ناحەزو پیس و بێ بایەخن، بەڵام لە ناو ئەواندا پیاوانی گەورەش دەکەونە بەرچاو. سەفی ناز کچەکوردی بە ئەمەگ و ئازا ناتوانێت گوێی لەم قسانە بێت لە جێگەی خۆی هەڵدەستێت و ناڕەزایەتی خۆی لە دژی مامۆستا دەردەبڕێت و بەهێنانەوەی بەڵگەو قسە کردن بە زمانێکی پاراو مامۆستا بەوقەناعەتە دەگەیەنێت و دەڵێت: کوردەکان خەڵکێکی ئازادیخواز و خەباتگێڕو ڕەسەن و پاکن، هەرچەند کە ئەمڕۆ منداڵانی موغۆل بەسەر ئەواندا زاڵن؛ بەڵام خۆر لە ژێر هەوریشدا گەرمەو تیشکی خۆی دەهاوێژێ. من کچێکی کوردم و بە زمان و نەتەوە و باب و باپیرانم شانازی دەکەم و ئیزن بە ئێوە نادەم قسەی خراپە لە دژی نەتەوەکەم بکەن. مامۆستای ناوبراو کە وەڵامێکی دروستی لەبەرانبەر ناڕەزایەتی دەربڕینی بەرحەقی سەفی نازدا نابینی. بە شێوەی هەمیشەیی دیکتاتۆرانی مێژوو و بەکرێ گیراوانی دەزگای ئاسایشی تورکیە بانگی هاوکارەکانی کرد و سەفی‌نازی بە تاوانی جیایی خوازی بەوان سپارد و یەک ڕاست لەکلاسی دەرسەوە بەرەو بەندیخانە بردیان. ڕۆژی دوایی باوکی سەفی ناز دەستی بە گەڕان بەدووی کچەکەیدا کرد و لە کاتی لێپرسینەوە لە لایەن ئەندامانی ئاسایشی تورکیاوە ئەڵێت کە کچی من هیچ تاوانێکی نیە، چونکە ئەو لە کوردستان لەدایک بووە و تایبەتمەندیەکانی نەتەوەیی خۆی پاراستووە و لە بەرانبەرخراپە وتنی مامۆستاکەی نەیتوانیوە خۆی ڕابگرێت و لەشەرافەت و کەرامەتی نەتەوەیی خۆی بەرگیری کردووە، مامۆستایەک کە هیچ تایبەتمەندیەکی مرۆڤانەی نیە. لە جیاتی ئەوەی خوێندکارانی خۆی بۆ زانکۆ بنێرێت بۆ بەندیخانەیان دەنێرێت.

بەڵێ خۆشک و برایان ئاوەهایە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا کە مرۆڤ دەستی گەیشتووەتە ئاسمانەکان هێشتا لە هێندێک جێگەدا دەبینین کە تەنانەت مامۆستای قوتابخانە بچووکترین نیشانەیەک لەوانەی ئەخلاق و کردار و دەروونناسی نازانێ هەواڵی گرتنی سەفی نازو بردنی ئەو بۆ بەندیخانە و بەنرگیری کردنی لە دەرس

خوێندنی ئەو لە لایەن ڕادیۆ بی‌بی‌سی و دوای هەواڵێک سەبارەت جنایەتەکانی ڕژیمی دژە مرۆڤی سەدام لە کوردستانی عێراق دەرهەق بەگەلی کورد و خاپوور کردنی شار و گوندەکان و ڕاگواستنی بەزۆری خەڵکەکە بڵاو کرایەوە، ڕژیمی خوێن‌مژی سەدام دوای بوردوما نکردنی شاری حەڵەبجە و شەهید کردنی بیست هەزار کەس لە ژن و پیاو و منداڵ، ئێستا دەستی داوەتە خاپوور کردنی شار و گوندەکان و ئەیهەوێت عەرەبەکان لەجیاتی خەڵکی کورد لە کوردستان نیشتە جێ بکات.

ئێمە بە نۆرەی خۆمان تەواوی ئەو جنایەتکاران و زۆردارانە و هەموو ستەمکارانی مێژوو بە تایبەت ڕژیمە خوێن‌مژەکانی عێراق و تورکیە شەرمەزار دەکەین و بۆ سەفی‌ناز و تەواوی ئازادیخوازانی جیهان سڵاو دەنێرین و شانازی بە بوونی ئەوان دەکەین. بە بۆنەی ڕێز لێنانی دایکان و ژنانی کورمانج.

هەموو دەزانن کە من شاعێرنیم؛ بەڵام هێندێ جار وەکوو پێشینیان دەڵێن فیلم بیری هێندووستان دەکات و هێندێ وشە پێکەوە ئەلکێنم بە تایبەت ئەمشەو ۷۱/۲/۲۳کە بارانێکی بەهاری بە خوڕە دەبارێ تا کاتژمێر ۱۱/۳۰بۆ دوایین جار کتێبەکەم بۆ بردنە چاپخانە ئامادە دەکرد کە چاوم بە بەشی پاڵەوانەکان کەوت بە بوونی ئەم هەمووە پاڵەوانە کورمانجە شادی و خۆشی دامی‌گرت و دوایی بۆ ئەو دایکانەی کە ئەم کوڕە سەربەرزانەیان بە دونیا هێناوە سڵاوم نارد و جارێکی‌تر قەڵەمەکەم گرتەوە دەست و دەستم کرد بە نووسین و هۆنینەوەی ئەم شێعرانە تاکوو پێشکەشی کەم بە تەواوی دایکان، بە تایبەت دایکانی پاڵەوانی کوردی خوراسان کە شارەزایی و دەستڕەنگینی و ئازایی وجەنگاوەری و هونەرمەندی ئەوان بە تایبەت لە مۆسیقا و دروستکردنی فەرش و کەرەستە دەست چنەکان ئەبنە هۆی سەرسووڕمانی هەر مرۆڤ و لێکۆڵەرێکی ناوخۆ و دەرەوە.

لە جوانی خوراسان چی بڵێم کەزمان لەزاردا توانای وتنی نیە.

باکووری خوراسان بەبچووک و گەورەوە

هەموویان پاڵەوان و کوردن

هـــــەموویان ورزێـــــڕ و باخـــــدار

هــەموویان شــوان و خــاوەنی مــێ و

هونەرمەنـــــــــــــــــــــــد

هــەموویان ســەربەرز و بــەناو بانــگ

هــــەموویان مێهرەبـــان و میوانـــدار

هــەموو پــارێزەرانی سـنووری ئێـران

تۆڵـــە ئەســـتێن و دوژمـــن کـــوژ

هـــەموو شەڕڤـــان و بـــەناو بانــگ

هـــەروەکوو پـــڵێنگ لـــە بێـــشەدا

هەموو هـەر لـەژن و پیـاو وپـیرو گـەنج

ئــازا و دلێــر و دڵــپاک و ســـەربەرز

لــە کــاتی شــەڕدا هــەروەکوو شــێر

لە کاتی شاییدا هەموویان ڕەقیبی یەکن

هـــەموو لــەژنی کــوردەوە ئــەدوێن

کــە نموونــەی هونەرمەنــدی و ئازاییــە

هــەروەکوو شــیرین[٢٢٤] و توحفــەگوڵ و

شــــــــــــــــــاهیار

وەکــوو گوڵــشەن و مــەرجان دوژمــن

بـــــــــــــــــەزێنن

گولێـــــستان کولمیــــشی نــــاودار

کلیـــدێر گـــەورەیی ونازنـــاوی خـــۆی

لـــــــــــــــەوورگرتووە

لە کاتی شایی دا وەکوو تاووســی جــوان

224- شیرین ژنە قارەمانی ئازا و شەڕڤانی ناوچەی کەلات و لایین بوو.

هـــەروەکوو پاڵـــەوانی کـــاتی شـــەڕ
ژنی کـوردە کـە وەکـوو هونەرمەنـدێک
کـــە لـــە ڕووی جیهانـــدا بـــێ هاوتایـــە
ئـــازاو ســـوار چـــاک و بـــوێرە
زانـــا و بلیمـــەت و بەناوبانگـــە
ئەگـــەر دانەدانـــە هونـــەری بژمێـــرم
سەدان شاهنامەی  بۆ نووسینی ئـەوێت
ژنی کورد پاڵەوان ولاوی ئـازا بـە دونیـا
دێنێـــــــــــــــــــــت
کوڕی ئەو ناوی ئێران سـەربەرز دەکـات
لەوانم جەعفەر قولیەکان لە دایک بـووە
یـەکێک شـادلوو و یـەکیان زەنگـەلی
وەکوو سام خان و جەجووخانی پاڵـەوان
کـــە ئـــازا و پاڵـــەوان و بـــەتوانان
وەفـــــادار  و فـــــیلابی و دادڕەس
کەشـــێری‌ئـــازاش لەبەرانبـــەری
ئەواناوەکوومێـــــــــــــــــــشە
وەکـوو مـەحموود مـەرگان و خاخیـان
وەکـوو پاڵـەوان بـورجی ئـازاو بـوێر
وەکـــوو ســـەحرایی عـــەلی پاڵـــەوان
وەکـوو  نـاودارانی‌تـری دڵـپاک و بـوێر
یاوەکووماموستاجەوزانی کـە ماموسـتای
تـــــــــــــــــــاربوو
یـان ڕەحـیم بەخـشی بـە نـاو بانـگ

یان وەکووسارۆ کە خواوەندی سازی
نــــــەی بـــــــوو
کە کۆشکێکی بە ناوی نەی پێکهێنا
یــان ڕەمـــووی گــورانیبێژی نــاودار
کە مامۆستای زۆر ناو ئامێری قوشمە بوو
ئێستا وەکوو ئەو هەیە و نەهاوتایەک بۆ
ئـــــــــــــــەو
ئەگەر هونەر و شارەزایی ئەو بژمێرم
پزشکەبەناوبانگەکانی ئاکارجوان و ڕەوش
چــــــــــــــاک
مامۆستایانی گەورە و تینووی زانست
هەموویان شیری دایکانی کوردیان خواردوەو
بوونەتە گەورە پیاوی سەردەمی خۆیان
سلاو و ڕێزی تایبەتی ئێمە بۆ ئەوان و
خــاکی پــاکی ولات و دایکــانی کــورد
کە ئێمە هەرچیمان هەیە لە ناوی ئەوە
هەروەکووئاوی کانیاوە کە سەرچاوەی
ئــــــــــــــەوانن
ســوێندبەخوای گەورە کەتا ئەو کاتەی
زینــــــــــــــدووم
دڵــم بــە خۆشەویــستی ژنی کــورد
بەســــــــــــتووە
لــە نیــا دا ئەوانــە کــە قسەیان خۆشــە
لــە شــیری ئــەم دایکانــەیان خــواردووە

## نامە گەیشتووەکان پاش چاپی بەشی سێهەمی ئەم کتێبە

کاغـــــــەزهاتن وەچـــــــە والان
ژەیـــــــــارانو ژەهەڤـــــــالان
ژەوان یـــــاری نـــــە کانیمـــــان
ژەکـــــــالانو، ژەمنـــــــدالان

بـۆ زانـای خۆشەویـست و لێکۆڵـەری دڵـسۆزی کـورد: بـەڕێز کەلیمۆڵـڵای تەوەحودی لە خاکی پیرۆزی کوردستانەوە بـۆ هـەرێمی کـوردانی خوراسـان سـڵاو دەنێرم و بۆ ئێوە کە ڕۆڵەی دڵسۆز و ئەمەگی ئەم نەتەوەیـەن، سـڵاو ڕێـزم هەیـە و سەربەرزی و سەرکەوتوویی ئێوە بۆ خزمەت کردنی زۆرتر بە کورد و کوردسـتان لـە خوای مەزن بە ئاوات دەخوازم لێکۆڵینەوەکانی زۆر دڵسۆزانە و شـارەزایانەی ئێـوەی بەڕێز کەنیشاندەری ڕاستی زمان حاڵی نەتەوەی کوردە جێگـای ڕێـز و سپاسـی لـە ڕادەبەدەرە:

لەهەر خاکێ کـە بـۆنی عەشـق هەڵـسا
بزانەو باوەڕت بێ گۆڕی لەیلایە لـە وێـدا

ئەگەرچی بەو جۆرەی کە شیاوە ئاگاییمان سەبارەت بـە کوردەکـانی خوراسـان نەبوو، بەختەوەرانە بە بڵاو بوونەوەی کتێبە مێژوویی و لێکۆڵینەوە بە نرخەکانی ئێـوە کە نیشاندەری قەڵەمی بە توانای کوردێکی دڵسۆزی وەکوو ئێوەیە لە هەموو بوارێکدا داخوازییەکان جێ بەجێ بووە و هەموو کەم و کۆڕیەک بە ئاسانی چارەسـەر بـووە و ئەوەی کە ئێمە ئەمانەوێ بـە قەڵـەمی ئێـوە نووسـراوە لـە خـوای مـەزن داوا کـارم سەربەرزی زۆرتر و لەش ساغی بە ئێوە بـدات کـە هەمیـشە بەختـەوەر و لەڕێگـەی خزمەت کردن بە نەتەوە و خاکی نیـشتمان شـانازی دەخوڵـقێنن دیـارە نەتـەوەی کورد هیچ کات بیرەوەریەکانی تاڵـی تایفـە و عەشـیرەتە کوردەکـان و کـۆچی بـە

زۆرەمای ئەوان لە خاکی کوردستان بۆ شوێنەکانی‌تر وەکوو خوراسان لە بیرناکەن و هەمیشە ئەم دووری و کۆچکردنەیان وەکوو بیرەوەریەکی تاڵ زانیوە ئێستاش ئێمە خۆمان بە بەختەوەر دەزانین کە ئێوە بە بڵاو کردنەوەی کتێبە مێژوویەکان ئەم دووری و جیا بوونەوەیەتان کەم کردووتەوە و بوونەتە هۆی لێک نزیک بوون و پێکەوە بوونی کوردان و لە خوای گەورە داواکارین بەختەور و سەرکەوتووتان کات.

هەروەها چونکە لە چاپی دووهەمی کۆچی مێژوویی کوردەکان بۆ خوراسان ویستووتانە کە قەڵەم بە دەستانی کورد بە سەرهاتی و ژیانی خۆیان و ئاسەوارێک لە کارەکانی خۆیان بۆتان بنێرن. منیش بۆ وڵامدانەوەی ئەم بانگەوازەی ئێوە و بۆ ئەوەی لە کۆڕی ئەم بەڕێزانەدا بەشدار بم، نووسراوێک لە بەسەرهات و ئاسەوارەکانی خۆم بۆتان بەڕێ کرد کە هیوادارم وەکوو یادگارێک لەو هەرێمەدا بمێنێت. بە سڵاو و ڕێزەوە.

قەلعەیی بەیگ قەڵابەیگی: ڕاپۆرتە هەواڵێک لە لایەن برای بەڕێزمان ئاغای بەبرعەلی حەسەن زادەی بیچرانلووە کەسەرەڕای دەربڕینی هەستی پاک و دۆستانەی خۆی و ڕێزلێنان لە کارەکەی من سەبارەت بەزیندووکردنەوەی مێژوو و فەرهەنگی نەتەوەی کورد بە سەرهاتێک لەبارودۆخی هۆزی خۆیان کەلە سنووری نێوان ئێران و ڕووسیەدا هەڵکەوتوو لە باکووری قووچان نیشتەجێن. لە دوو پەرتووکی چل لاپەڕەییدا بۆم نووسیوە و بەڕێ کردووە.

ئەمنیش وەکوو نووسەر سەرەڕای ڕێزلێنان لەم کارەی بەڕێزیان کورتەیەکی لەو بابەتە لێرە دێنمەسەر کاغەز و لەو جێگایانەدا کە پێویستە لە هێندێ بابەتی‌تریش کە بەکەڵک بێت کەڵک وەردەگرم. ئەم جۆرە کارانە بەڕاستی بەکەڵک و جێگەی شانازین و من لە تەواوی خۆشک و برایانی کورمانج چاوەڕوانی ئەوەم هەیە وەکوو ئەم برا بەڕێزە دەست بە تێکۆشان کەن تا بەیارمەتی ئەوان مێژووی نەنووسراو و ون بووی ئێمە تا ئەو جێگەیە کە توانامان هەیە جارێکی تر زیندوو بێتەوە.

ئاغای بەبرعەلی لە مامۆستایانی مەزن و باشی ناوچەکە لە ڕێگەی باوک و باپیر و دایە گەورەکانی هۆز و وتووێژ لەگەڵ ئەواندا بەم جۆرە ڕووی لەمن کرد و نووسیویە

بۆم: بەڕێزتەوەحودی: گەیشتوومەتە ئەم ڕاستیە کە بەبێ هیچ درۆیەک خزمەتێکی جێگەی ڕێز و شیاوتان بە مێژووی کوردەکانی کورمانجی خوراسان کردووە. ئەگەرپاش چوارسەد ساڵ چاوێک بە شەرەفنامەی بتلیسی دا بخشێنن، تەنیا کتێبەکانی ئێوەیە کە وەکوو نووسراوەیەکی جێگەی باوەڕن و بەرەکانی داهاتوو دەتوانن بۆ لێکۆلینەوەی مێژوویی وەکوو سەرچاوە کەڵکی لێ وەرگرن و بەو پێیە کە کتێبەکان وەکوو منداڵی نووسەرن و هەر دایک و باوکێک بۆ ڕاهینان و پەروەردە کردنی منداڵەکانیان چاکترین تێکۆشان دەکەن. ئێوەش لە کۆکردنەوە و نووسین بە ڕاستی تووشی تەنگ و چەڵەمەی زۆ هاتوون؛ بەڵام لەبەرانبەردا بوونەتە خاون زانینێکی واتایی و بە بێ پێداهەڵگوتن ناوی ئێوە ناوێکی ئاشنایە بۆ هەموو خەڵکی کورمانج لە خوراسان و زۆربەی لایەنگەرانی مێژووی ئێران و کورد سەبارەت بەوەی کەلە کتێبەکەتان باسی سەر کردەی ناوداری کورد واتە سەلاحەدین و هەوڵەکانی ئەو لەشەڕەکانی دژ بە خاچ پەرەستان نووسیوتانە. ئەم سەرکردە کوردە نەتەنیا لە ئازایی‌دا بەڵکوو لە دەست ئاوەلایی و پیاوەتی لە ڕۆژگاری خۆیدا بە ناو بانگ بووە و ئەمە خوو و ڕەوشتی هەموو کوردانە کە لە کاتی تەنگانەدا بە چەوساوەکان و ئاوارەکان پەنای داوە و هەروەها کە دەزانین کاتێ کە عیمادەددین محەمەد کوڕی سەفیەدین ئێسفەهانی ناسراو بە عێمادی کاتب نووسەر و ئەدیبی بە ناوبانگی سەدەی ٦ کە دەکەوێتە بەررەق وقینی مەلەک سالەحی ئێسماعیل فەرمانداری دەمشق هەڵدێ بۆ مووسڵ و پاش ماوەیەک سەلاحەدین دەست بەسەر دەمشق دائەگرێت.

عێماد لە لایەن دام و دەزگای حکومەتی سەلاحەدین پلەو پایەی پێدەدرێت و کتێبی «الفتح القسی فی الفتح القدس» کە لە بواری گرتنی وڵاتی شام و فەلەستین باس دەکات دەنووسێ و پاش مەرگی سەلاحەدین گۆشەی تەنیایی هەڵدەبژێرێت و لەئاکامدا لە دەمێشق کۆچی دوایی ئەکا. بەڵام باس لەسەر ئەمەیە کە کوردەکان بەمەیل و خواستی خۆیان یان بە زۆرە کۆچ دراون. چۆنکە هێزی یەکیەتی کوردەکان بە قازانجی پاشا و دەسەلاتدارانی لە دوو بەشی دوور لەیەک جیا

بووەتەوە و گەمارۆی بە سەرداسەپاوە و ئەمە ئەوشتەیە کە دوژمنانی ئێمە بەردەوام بەدرێژایی مێژوودا لەو ترساون و بەردەوام بۆ لاواز کردن و لە نێو بردنی کوردان هەوڵیان داوە و لە هەر هەل و دەرفەتێک کەبۆیان ڕەخساوە کوردەکانیان دوور خستووەتەوە و بەزەبری شمشێر ئەوانیان کوشتووە و هەموو ئەمانە بە قازانجی دەسەلاتدارانی ئەوکات بە ئاکام گەیشتووە. بەلام ئەوەی کە لە لاپەڕەی ١٦٦ی چاپی دووهەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کوردەکان بۆ خوراسان نووسیوتانە کە خەلکی قەرەچێشمەکانی ڕەش لە هۆزی کۆپانلوون و هێندێ بەلگەشتان لەم بارەدا چاپ کردووە دمبێ بلێم جۆری دەربڕینی دروستی ئەو وشەیە گۆپانلوویە کەبەڕا و بۆچوونی باوکانی ئێمە واتە گوێ پانەکان، چونکە لە ڕابردوو دا لە هەموو شوێنێک گافی فارسیان وەکوو کافی عەرەبی دەنووسی؛ بەلام گۆپانلوویان کۆپانلوو نوسیوە کەلە بەلگەکان و نووسراوەکانی ۲۰۰ساڵەی ئێمە هەر کۆپانلووە.

سەبارەت بەم خاڵە هاوبەشە ڕەنگە ئێوە بیروڕایەکی زانستی‌ترتان بێت و ئەگەر دەکرێ ئێمەش ئاگادار کەن باوکم سەبارەت بەدابەش کردنی هۆزەکەی ئێمە دەڵێت:

١- ئولاشلووەکان هەر کال‌عەباس واتە عەباس پیرن کە باپیری بەڕێزیان بووە و خەلک پێدەلێن کالەواس.

٢- تورانلووەکان کە دەچنەوە سەر کال ڕەزا واتە ڕەزای پیر کە باپیری ئەوان بووە.

٣- قەرە چێشمەیی واتە کانی ڕەش کە پێدەلێن کال حاج و خەلکەکە پێدەلێن کالاج واتە پیاوی بە سالاچووی حاجی.

٤- زیندنیلووەکان کە پێیان دەلێن کال‌تەم کە هێندی کەس بە قال تەم یان قالتمەمانلوو ناوی ئەبەن.

ئێستەش بیروڕای ئێوەی بەڕێز هەرچی بێت نازانم بۆچوونم هەر ئەوە بوو کە لە پەراوێزدا نووسیومە تا ئەگەر دەرفەتێک هەبێت ئەو بەلگانە لەداهاتوودا دەست کەوێت و ڕوون بکرێتەوە و ئیتر قسەیەکی ترم نیە. لە لایەکی ترەوە لە لاپەڕەی

٢٥٠تا ٢٥٢چاپی دووهەم لە زمانی بەڕێز حاج دەولـەت نامـانلوو نووسـیوتانە کەلـە قەڵای شواتەسو وترا نامانلووەکان نیشتەجێ بوون.

بەڵام باوکم دەڵێت خەلکی ئەم ناوچانە کە بـریتین لـە بیچرانلـوو و سـیوکانلوو کەیکانلوو لە هەر گوند و هۆزێک یەک بنەماڵەیان وەکوو پـارێزەر لـە قـەڵای شـواتە جێگیر کراون کە پاراستنی سنووریان لەبەرانبەر دوژمنـدا وە ئەسـتۆ گرتـووە دیـارە هەموویان نامانلوونین بەڵکوو یەک تا دوو بنەماڵەیان نامانلوویی بوون کەلـە هێرشـی تورکمانەکان کوژراون.

قەڵای بەیگ کە لە دووبەشـی قـەڵای بەگـەکان و قەرەچیـشمە و کـانی ڕەش پێکهاتووە، خەلکەکەی لە هۆزی گۆپانلوون بە چوار دەستە دا بەش کراون.

١- تۆپەرێ قەجی منـدالانی قەجـەر ٢- تۆپـەرێ مـبرێ مێهـراو ٣- تۆپـەرێ قاسێ قاسم ٤- تۆپەرێ ئیمێ ئەمامویردی.

نزیک بە ١٢٠ساڵ لەمەو پێش کە شوجاعودەولە کوێـستانە سـنووریەکانی ئـەم ناوچەیەی لە نێوان هۆز و عەشیرەتەکان دابەش کرد کوێـستانی مـەرزی گولیـل درا بە بیچرانلووەکان و شەیخ ئەمیرلووکان، جیرستانیەکان و ناوچـەی هێـلی سـنووری بەردەر درا بە هۆزی گۆپانلوو و ئەمانە زۆربەیان لە قەڵای بەیگەوە کۆچیان کردبـوو و لەوێ گوندی بەردەریان دروست کردبوو کە دەکەوێتە نزیک باجگیران و هـەر چـوار تۆپەوە کە لەوێدا نیشتە جێن و دوو هۆزی دیکە بە نێوی تایانلوو و شاملووش لەگـەڵ ئەوانن. ناوچەکانی باشوور کەبەسێوکانلوو بەناوبانگەو نالیسێوێکیشی پێدەڵـێن هـەر لە گوندی قەرچەغـە هـەتاکوو بـاجگیران و دۆڵـی ئۆغـاز و بوانلـوو و کۆمکێلانلـوو و هەموویان بە هۆزی سێوکانلوودا کە ناوەندەکەی ئۆغـازە بـەم پێیـە ئـەم هۆزانـە لـە قەڵای بەیگ و بەردەرنیشتەجێن.

١- گۆپانلوو کالاجلوو ١- قەجەڕییەکان

٢- مێرابیەکان ٣- قاسمیەکان

٤- ئەمامویردیەکان کەبەڵگەکانیان لە بەرگی دووهەم دا چاپکراوە.

قەڵای بەیگ بیچرانلوو.

٢- شــاملوو یــا شــامالیان کەیەکــەمین خەڵــکانی قــەڵای بــەیگ بــوون و لــە کوردەکانی شامن و هەروەها کە لە چاپی یەکـەم دا وتـراوە خوالێخۆشـبوو دوکتـۆر شاملوو لەوان بووە.

٣- تایانلوو کە بوونەتە دوو تۆپەر: تۆپەری حەقی و حەقی وێردی.

٤- ئال و دۆڵان کە هەر دووک مندالانی دووبـرا بـوون بـە نێوەکـانی ئالخـان و دۆڵخان کە خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەد بەردەری لەوانە.

**شــاملووەکان:** شــاملووەکان کەبــە شمامالیــانیش ناویــان دەبــەن دوای بــڵاو بوونەوەیان ئیمڕۆژە بێجگەلە قەڵای بەنیگ و بەردەر لە گوندەکانی قەڵای حەسەن، هۆنامـە، قـەلجووق گـەلجووک قەلاچـە، کەلاتـەی بـالی لۆجـەلی، یـەنگی قـەڵای قۆشخانە: قەڵای نەقدونەقدعەلی و شیروان نیشتەجێن.

تا ئەو جێگەیەی کەباب و باپیرانی ئێمە دێتەوە بیریان شاملووەکان بەپەنج هـۆز دابەش ئەبەن کەبە نێـوی گـەورەی هـۆز و باپیریـان ناسـراون و هـەموویان هـاوڕێ لەگەڵ حەسەن بەگی ناودار لە وڵاتی شامەوە هاتوون. قەڵای حەسـەنیش بـە نـاوی حەسەن بەگی دووهەمەوە ناونراوە.

١-هۆزی ئاقاجان بەگ ٢- هۆزی ڕەمەزان بەگ ٣- هۆزی سـەجاخان شـوجاع خان ٤- هۆزی مامەجان ٥- هۆزی نەقد. عـەلی بـەگ. (منـدالانی مووسـا بـەگ و ئاقاجان پاشماوەی مندالانی ئاقاجان بەگن).

لە ڕەمەزان بەگ مندالانی خوالێخۆشبوو فەرەجوڵلا خان بیچرانلووی ناودار کـە ڕاپەڕینی خەرمانانی ١٣٢٠ی ڕێبـەری دەکـرد مـاون لەسـەجاخان ئاغـای حـەجی قوربان کەلاتەبالی کەلەچاپی دووهەمی کتێبەکەی خۆتاندا ناوتان بـردووە. لـە مامـە جان مندالانی جەعفەرخان فەتحعەلی بەگ و محەممەد ڕەزا بەجێ ماون.

لە نەقد عەلی بـەگ منـدالانی خوالێخۆشـبوو ڕەحمـان قـولی بـەگ و ئاغـای مێرلادقولی بەگ و مندالانی ئەوان بەجێ ماون.

**پــەری پزێــشک و جــەڕاح بیچرانلــوو:** ئاغـای تـەوەحودی، چیرۆکـی تـەخت کوشتاری ئێوە کە لە لاپەڕەکانی ٢٨٢تـا ٢٨٤چـاپی دووهەمـدا هـاتبوو کـە ژنـان و

پیاوانی کوردی لایین لەشەڕ لەگەڵ دوژمنانی ئێراندا چە ئازایەتی و خوڕاگرییەکیان خوڵقاندووە لەسەرمن و باوکم زۆر کاریگەری کرد و ئەمن بۆ خۆم دیتم کە باوکم دەگریا. دوای ئەوەی کە ماوەیەک گریا و تۆزێ هێور بوو و کوڵی دڵی دامرکا، دەم و چاوی شۆرد و فرمێسکەکانی پاک کردەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: کوڕم تۆ نازانی بەسەرباب و باپیران و ژنان و خۆشکان و برایانی ئێمەدا چی هاتووە و ئەوان چیان چێشتووە کە ئێوە ئیمڕۆ ئاوەها بە ڕاحەتی ئەژین و قەدر و بایەخی هیچ شتێک نازانن و تەنیا ئەوە فێر بوون کە بڵێن باوکانی ئێمە بێ سەواد بوون و هیچ شتێک تێنەدەگەیشتن. ئێوە نازانن کە شەو و ڕۆژ دوژمنانی ئێمە لەم شاخ و دولانەدا و لە سنوورەکان تێدەپەڕین و هێرشیان دەکردەسەد ئێمە و ئەوەی لەسەر ڕێگەی خۆیان دەیاندی لە ناویان دەبرد و ژنان و مندالانی ئێمەیان بەدیل ئەبردو و بە کۆیلەیی دەیانیا نفرۆشت لەوەها هەل و شەر جێک دا ژنانی کورد کە هەمیشە شان بە شانی پیاوانی ئازا لە شەڕەکاندا بەشداریان دەکرد و تەورو شمشێر و کۆلەکەی خێوەتەکانیان هەڵدەگرت و چالاکانە و بوێرانە هێرشیان دەبردە سەر دوژمن، زۆربەی ئەم ئێسک و پرووسک و گۆڕە بەکۆمەلانە کە هێشتا لە نێو ئەم شاخ و دۆلانەدا بە جێ ماون و دەیبینن یادگاری ئەو شەڕانەیە کە هەر دوولا تێدا دەکوژران، تورکمانەکان هەمیشە شکستیان ئەهێنا و هەڵدەهاتن. ئەوان توانا و ورەی ئەوەیان نەبوو کە لە شەڕی دەستەویەخەدا کوردەکان ببەزێنن بەڵکوو بەسواری ئەسپەکانیان وەکوو چەتە و دز هێرشیان دەکرد و هەرچیان دەدی هەڵیاندەگرت و بەرەو کەویری خارەزم هەڵدەهاتن. ئەوان تریاکیان دەدایە ئەسپەکانیان تا ماندوونەبن و هەروەکوو هەڵۆ لە دەشتە بێ ئاو و گیاکاندا بسوورێن. بەڵێ ئەوە ئەسپەکانی تورکمەن بوون کە ئەوانیان لەڕێگری و چەپاوکردن یارمەتی ئەدا دوای کۆتایی هاتنی شەڕ کوژراوەکانیان ئەسپەردەی خاک دەکرد و بریندارەکانیش کە پێویستیان بەپێڕاگەیشتن بوو چاک دەکرانەوە یەکێک لەم پزیشکە نەخوێندەوارە و بە قەولی ئێوە کە دەڵێن (بێسەواد) شێرەژنێک بوو کە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ شمشێرەکەی لەزەوی دادەنا و دەستی دەکرد بە

پێراگەیشتن و تیماری بریندارەکان و چاک کردنـەوەیانی وە ئەسـتۆ ئـەگرت پـەری لەژنەبەناو بانگەکانی گۆپانلوو بوو. بێجگە لە پزشکی لە ناسینی گیاکانـدا زۆر پـسپۆڕو شارەزا بوو و هاوکات دەوای دروست ئەکرد و جەراحێکی چاکیش بوو. باوکانی ئێمـە دەیانوت: پەری بەسەرەتاییترین کەرسـتەکان وەکـوو چـەقۆ، مقەسـت و دەرزی و شریتی هەورێشمی جـەڕاحی دەکـرد و زۆربـەی عەمەلەکانیـشی سـەرکەوتووبوون، ئەولەگۆشتی کوژراوانی دوژمن کەورد ورد دەیجـنی و لـە نێـو قازانێکـدا دەیکولانـد جۆرە مەلهەمێکی دروست ئەکرد کەلە چاکبوونەوەی برینەکاندا زۆر بە کەلک بـوو و زۆر زوو برینەکانی چاک دەکردەوە. زۆر جار بووە کە ئەو کەسانەی کەلـە گۆڕەپـانی شەڕدا بریندار بوون و بە تایبەت ئـەو کەسـانەی کـە ورگیـان دەدڕا پـەری بەنـەخ و دەرزی و شۆردنەوەی ئەو بەمیزی منداڵ جارێکی تر برینەکانیان تەقەڵ دەدایـەوە و چاک دەبوونەوە ئەو چەقۆ و دەرزی و خەنجەری کارەکەی بە ئاگر خاوێن دەکرد کە پۆی بڕاو و دەستی قرتاو و ورگی دڕاو هەمووی بـە دەسـتی پـەری چـاک دەبـوو و دەیدووراندەوە و ئەو بە ئەو مەلهەمانەی کەبە گیاکانی ئەو ناوچەیە دروسـتی ئـەکرد برینەکانی سارێژ ئەکرد و بریندارەکانی لەمەرگ ڕزگار ئەکرد.

بەڵێ کوڕم ئێمە لەگەڵ ئەوەی کە چـارەنووس دەمـانی خـستە سـەر ڕێگـەی شمشێری دوژمنان هێشتا نەبەزیوین و زیندوو ماوین و تەنیا تاوانی ئێمە کورد بوونی ئێمەیە جا بەڕێز تەوەحودی ئەگەر دەرفەت هـەبوو و هەلـێک ڕەخـسا سـەرێک لـە قەلای بەیگ و هۆز و عەشـیرەتی ئێمـە بـەن هێـشتا زۆرن ئـەو پیـاوە بەتەمـەن و بەساڵاچووە دڵپاکانە کە زۆربەی ئـەم ڕووداوە خـوێنین و تالانـە لەسـەرزاری بـاب و باپیرانیانەوە دەگێڕنەوە چیرۆکەکان، ئاوازەکان، ئاهەنگـەکان هـەموویان لـە مێـژووی خوێنباری ئێمەوە بۆمان ئـەدوێن بـە هیـوای دیداری دووبـارە و سـەرکەوتنتان لـە ڕێگەی بە ئاکام گەیاندنی کارە فەرهەنگیەکانتان.

براتان بە بر عەلی گۆپانلوو حەماسەی گولشان و ئەماویردی کەیکانلوو.

نامەیەکە لە برای گەورە و بەڕێزمان ئاغای جەلیل ئـەماویردی زادەی گۆپـانلوو کە هێندە بەڵگە لە باپیرانیانەوە لە لاپەڕەکانی ٤٩٤و ٤٩٥ی چاپی دووهەممان بـڵاو

کردوەتەوە ئەمان بنیانەری قەڵای بەیگ بوون کە پێش هاتنی کوردەکان بۆ ئـەوێ جێگەی تورکەموغولەکانی گرایلی بووە و پێیـان وتـووە قەرەچێـشمە (کـانی ڕەش) کەبەسەر هاتی ئەوە لە نامەی پێشوودا هات. نـاوبراو دوای دەربـڕینی ڕێـزو سـپاس بەرانبەر بە نووسەر دوای ناردنی دوو چیرۆکی شایانی خوێندن و مێژوویی گوڵشان و ئەمامویردی کەودەخرێتە بەرچاوی ئێوە دەفەرموون:

... بیرەوەری ئازایەتی و بوێری کوردەکانی خوراسان کە خەریک بـوو بڕواتـە دڵی خاک و بۆ هەمیشە لەبیر بچێتەوە جارێکی تر بە دەسـتی ئێـوە و بەزحمـەت و لێکۆڵینەوەکانی شەو و ڕۆژی ئێوە کە ماندوونەناسانە کارتان دەکرد زیندوو بووە و بـۆ هەمیشە لەبیر ناچێتەوە.

گومان لەوەدا نیە ئەو کەسەی ڕەگەزو بنەچەی کوردی بێت دەبـێ سوپاسـی زەحمەتی ئێوە بکات و ماندوونەبوونی تان پێ بڵێت.

لێرەدا بە نۆرەی خۆم ئەمهەوێ لەم هەموو مەیل و خۆشیەکە لـە خوێندنـەوەی کۆچی مێژوویی کوردەکان بۆ خوراسان نووسراوی ئەم برابەڕێزە بـەمن دەسـتی داوە کە ئاکامی زەحمەتی زۆری ئێوەیە بە دڵ و گیان سپاستان بکەم و سەرکەوتنی ئێوە لەم ڕێگەیە دا لە خوای مەزن داواکارم لێرەدا بـە پێویـستی دەزانم کەلـە چۆنیـەتی ڕووداوی قەڵای شواتە قەڵای سووتاو کەلە لاپەڕەی ۲۵۲لـە زمـانی حـاج دەوڵـەت نامانلوو نووسیوتانە، هەندێ تێبینی بخمەمە ڕوو کـە ئەگـەر پێویـست بێـت وەکـوو بەڵگەیەکی مێژوویی لە مێژووی باپیرم کە خۆی بە منداڵی لە قەڵای شـواتە گـەورە بووە دەگێڕایەوە کە کاتێک تورکمانەکان هێرشیان کردەسەر قەڵاکەمان نەیـەنتوانی لە دیواری قەڵاکـە سـەرکەون بـەڵام بـە داخـەوە بەکەڵـک وەرگـرتن لـە دارێکـی بەرزکەیەکێک لە گوندنشینەکان لە دەرەوەی قەڵا جێهێشتبوو و بـە کوتـانی بزمـار لەسەر ئەو دارە وەکوو پەیژەیەک کەڵکیان لێ وەرگرت و بە هۆی ئەوە لە دیوارەکـە سەرکەوتن. چونکە وەرزی زستانیش بـوو و لـە نێـو ماڵـەکان و حەوشـەکاندا داری وشک بۆ سووتاندنی زسـتان کـۆ کرابـووە وە تورکمانـەکان ئاگریـان تێبـەردا تـاکوو خەڵکەکە زۆرتر بترسـنن و لـە ئاکامـدا هـەموو گوندەکـە یەکـسەر بـوو بـە ئـاگر و

هەنبانەکانی کاوگەنم و جۆ یەکسەر سووتا و مەڕومالاتیش هەمووی لە نێو گەوڕەداسووتان. دەنگی هاواری ژنان و منداڵان و پیاوان بەرز بووەوە ئەمام ویردی باپیرم دەیوت: ئەو کات من ٧ ساڵە بووم کە باوکم ئێبراهیم لەم شەڕە لەگەڵ تورکمانەکاندا بەسەختی بریندار بوو و هۆیەکەشی ئەمە بوو کە ئەو تیرەی کە لە ئەو درابوو بوو بە هۆی لە کار کەوتنی دەستی چەپی. دایکم ویستی شیوەن بگێڕێ، بەڵام باوکم نەیهێشت و هاواری کرد کە بێدەنگ بێت و وتی ئەگەر دوژمن بزانێت کە پیاوانی گوند کوژراون یان برینداریان داوە ورەیان زۆرتر دەبێت و تا دوایین پشوو لە خاپوور کردنی قەڵاو بەدیل گرتنمان تێدەکۆشن. بابم بە دایکمی گوت: بەلەچکەکەت برینەکە ببەستەو دوایی دایکم تفەنگێکی خێرلی بەبارووت پڕدەکرد و بەرەو دوژمن دایدەنا، بابم بە دەستی ڕاستی کەساغ بوو تەقەی دەکرد.

لەم نێوەدا لاوێکی تورکەمەن کە زۆر بە دەست و برد و کەڵەگەت بووە و کڵاوێکی سپی لە سەردا بوو گەیشتە نزیک تفەنگەکەو باوکم دەستبەجێ سینگی کردە ئامانجی چەکەکەی و لەگەڵ نەعرەتەیەکی جەرگ بڕکەوتە زەوی و لەوێ لەسەر دیواری قەڵاکە کەوتە نێو ئاگری نێو قەڵاکە دوایی پیاوەکان توانیان ژمارەیەک لە ژنان و منداڵان لە پشت قەڵاکەوە ببەنە دەرەوە و فێریان کردبوون کەچی بکەن و ئەوانیش لە نێو شاخ و تەپۆلکەکاندا هاواریان دەکرد ئاغاجان بەگ، حەسەن بەگ خێراکەن و لە پشتەوە ڕێگەیان لێ بگرن و مەهێڵن هەڵبێن ئەمانیان مەدەن و مەهێڵن هیچ کامەیان زیندوو بمێنن بێ ئەوەی کە ئاغاجان و حەسەن بەگێک بوونیان هەبێت، ژنان و منداڵان بانگی ئەوانیان دەکرد کە ئاواکەن و بەو جۆرە لێیاندەن تورکمەنەکان وایان دەزانی کە ئاغاجان بەگ و جەماوەری بیچرانلوو لە ڕووداوەکە تێگەیشتوون هەڵبێن و تەنیا توانیان دوومنداڵ و دوو ژن بەدیل ببەن. ناوی یەکێک لە ژنەکان گۆلشان گولشەن و ئەوی تر پەری بوو. گولشان کە نزیک بوو ببێتە خاوەنی منداڵێک و تەنیا چەند مانگێک بە دونیا هێنانی منداڵەکەی مابوو و نەیدەتوانی بڕواتە ڕێگا و لە نێوان قولهەک و نزیک دۆڵی بەردەر لە حاڵێکدا کە هەناسەبڕکێ کەوتبوو و تا ئەژنۆ لەبەرف چەقیبوو پاڵی دا بە تاشەبەردێک و وتی:

ئیتر ناتوانم بێم بەڕێگادا و چی لەدەستتان دێت بیکەن. تورکمانەکان ڕژانە سەری و بەشمشێر و قامچی لێیان داو برینداریان کرد و ئەویش دارێکی وشکی کەلە نێو بەفرەکە بوو دەرهێنا و کوتایە سەریەکێک لە تورکمانەکان و خوێن لە نێوان چاوانی تورکمەندا هەڵقولا. دوژمن کە ئاوا ئازایەتی و بوێریکی لەم ژنە بینی ڕژانە سەری و بە شمشێر لەت لەتیان کرد.

دوایی خەڵکەکە لە شوێنی کوژرانی گوڵشان بۆ ڕێزگرتن لە یادی ئەو چیلێکیان دروست کرد کە ئێستاش ئاسەوارەکەی ماوە و بە چیل گوڵشان بە ناو بانگە.

بەڵام تورکمەنەکان بە هەر جۆرێک بوو پەرییان لەگەڵ خۆیانا برد پەری کەبیری لەڕزگار کردنی خۆی دەکرد وای نیشان دا کە قاچی دەشەلێت و ناتوانێت بڕواتە ڕێگاو هەر بۆیە یەکێک لە تورکمەنەکان بوو بە مەئمووری پەری و ویستی پەری بەدووی کاروانەکەدا ببات. بۆیە تۆزێک لە باقی سوارەکانی تر بە جێمان تورکمەنەکە بۆ ئەوەی زووتر بگەن پەری لە کوێرە ڕێگەیەکەوە برد و کاتێک کە گەیشتنە نزیک تەختەبەردێکی گەورە تورکمەنەکە دانەوی و پەری بەسەرشانی ئەودا ڕۆیشتە سەر تەختە بەردەکە و تورکمانەکەش چەکەکەی دایە دەستی پەری تاکوو بتوانێت خۆی بگەینێتە سەر بەردەکە و هەر کە دەستی ولاقی لەسەر بەردەکە ناو ویستی بڕواتە سەر پەری لوولەی چەکەکەی بەنێو چاوانیەو ناو و دەستی بۆ پەلەپیتکەی چەک برد و مێشکی تورکمەنەکە یەکسەر بە حەواداپژا بەبیستنی دەنگی گوللەتورکمانەکان بە خێرایی هەلاتن چوونکە وایان دەزانی کە ئاغاجان بەگ بیچرانلوو هاتووەتە یارمەتی خەڵکی قەلا. پەری لەو هەلەکەڵک وەردەگرێت و چەکەکە لەگەڵ خۆی دەباتەوە بۆ قەلا. دووکوڕە منداڵەکەش کە تورکمەنەکان بەدیل گرتبوویان یەکیان ناوی سوڵتان و ئەوی تریان ناوی محەممەدخان بوو دوایی کەس و کاری ئەو منداڵانە چوون و بەدانی پارە سوڵتانیان ڕزگار کردو هێنایانەوە بەڵام دایکی ئەولاوە تورکەمەنە کە کوڕەکەی لە نێو قەلا و بە گوللەی باوکم کوژرا بوو محەممەدخانی نەدایەوە. کەس و کاری ئەوە چوونکە دەستی منداڵاکەی لە نێو یەقەی خۆی نابوو و ئەمەش لەداب و نەریتی تورکەمەنەکاندا بەمانای مەحرەم بوونە.

دوایی له ساڵــی ۱۳۲٤ای هــەتاوی لــه قــەڵای بــاقر لەیــەکێک لــه گونــدەکانی کوردنشینی عەشق ئابادی ڕووسیه من خۆم نەوەکانی ئەومحەممەد خانــەم بــینی و هاتنه خێوەتەکانی ئێمه بۆ سەردانمان و پرسینی حاڵی ئێمه.

## بەسەرهاتی ئەمام ویردی:

باپیرم ئێبراهیم که دەوترا لەشەڕی قەڵای شواته دەســتی چــەپی قرتــابوو و بــه هۆی چلک کردنی برینەکەی گیانی لەدەسدا باپیری ئەویش که ناوی ئەمام ویــردی بوو خوارتر له قەڵای نامــانلوو هــاوڕێ ســێ کــوڕی و کارەکەرێکــدا خــەریکی درەون ناوبراوان شەوانه لەسەردارەکانەوە دەنووستن نەوەک دوژمن بیانبینێ.

شەوێکیان ۲۱ کەس تورکمان هێرش دەکەنه سەر ئیمام وێردی و کوڕەکــانی و شەڕێکی گەورە دەست پێ دەکات. ئیمام وێردی و کوڕەکــانی ســەردەکەون یــەک کەس له تورکمانەکان دەکوژێت و باقیەکەیان دەرباز دەبن و ئیمام وێردی به دوایــان دەکەوێ و پاش شەڕێکی قوولتر و بریندار بوونی هەردوولا تــەنیا تورکمانێــک تــوانی دەرباز بێت و باقیه کەیان کەلەبچه کران بەڵام ئیمام وێردی لەبەر ئەوەی زۆر بریندار بوو بوو کوڕەکانی تا گەیشتنه قەڵاکــه ١٦ تورکمانیــان ســەربڕی و کردیانــه ســاقەی ئیمام وێردی و تەنیا سێ کەسیان لەوان نەکوشتبوو و دایــان بــه دەســتی شــوجاعود دەوڵەوە و ئەویش بۆ هەر ئەسیرێ ۱۰تمەن و بــۆ هــەر ســەرێک ٥تمــەنی خــەڵات کردن و ئیمام وێردی پاش سێ ڕۆژ مرد و ئەم ئاکاره بــۆ تورکمانــەکان زۆر گرینــگ بوو ئیمام وێردی ۲٥۰ساڵ لەمەوبەر کوژراوە

## داستانی مەرجان

وەک گوتوومانــه تورکمانــەکان لــه ناوچــەکانی لایــن و دەرەگــەزدا زۆر ئــازاری کوردانیان داوە جارێک هێرش دەهێنن و سێ ژن به ناوی مریەم، مــەرجان و مــەرار که خەریکی کار دەبن تووشیان دەبێ به تووشیانەوە و تورکمانەکان خێــرا مریــەم و مەرار که هێشتا کەنیشکن دەیانخەنه سەر ئەسپەکانیان و دەرباز دەبن و یەکیان کــه

دەبێتە بەرپرسی دزینی مەرجان لەبەر ئـەوەی مـەرجان دووگیـان بـووە نـەیتوانیوە زووسواری بکات و لەو کێش بەکێشەدا مەرجان کابرا لە ئەسپەکەی دەخاتـە خـوارێ و خۆی سواری ئەسپەکەی دەبێت و فیرار دەکات و لەم کاتـەدا پیـاوێکی لایـەنیش حازر دەبێت و تورکمانەکە دەکوژێ و مەرجان ڕزگاری دێت لەو لاوەش مەرار لە ژێر ئەشکەنجەی تورکمانەکاندا دەمرێت و مریەمیش پـاش هێرشـی ئاغـا گـولی بـەیگ ڕزگار دەبێت.

(مەرجان ژنی شاهوێردی خان بووە.)

داستانی مـەلک مـەحموودی مـەرگانی یـەنی پـاش هاتنـە دەرەوەی بـەرگی دووهەمی ئەم کتێبە کە سەبارەت بە مەلـک مـەحموود باسـم کـرد بـوو تێیـدا زۆر کەسان بە نامە ڕێنوێنیان کردمەوە بە تایبەت:

١- **حاج ئەڵلا وێردی** ٩٥ساڵە کە خۆی لە بنەماڵەی شاهوێردی خانە نووسیویە لەو هێرشە نامەردانـەی تورکمانەکانـدا بـۆ سـەر کوردەکـان کـە تریاکیـان دەدا بـە ئەسپەکانیان تا خێراتر بچن، مەحممود مەرگان توانی هـاوڕێ یارەکـانی بـەرنگاریان ببێتەوە بەڵام مەحموود مەرگان پاشان دەکوژرێ و لە تەپۆڵکەی مەحموود مەرگاندا بە خاک دەسپێردرێ.

٢- نامەیەک لە **مامۆستا دوکتۆر شەوکەتەوە** کە لە کوردانی دانیـشتووی تارانـە کە سڵاوی مامۆستا هەژاریش ڕاگەیاندووە و گوتوویە لـە کـاتی شۆڕشـە مەزنەکـەی بارزانی لە ساڵی ١٩٦١تا ١٩٧٥کە ڕێکەوتنامەی ئەلجـەزایر بـوو کـوردان نەهامـەتی هێنا و ئێستا ئێمە لە تاران ئاوارەین و بۆیە سڵاوی ئێمە بگەیەنە هەموو کوردان.

٣- نامەیە کە لە **دوکتۆر موحەممەد ساڵح ئیبراهیمی (شـەپۆل)** لـە کـوردانی دانیشتووی تاران کە بڕێ بەڵگەشی ئاراستە کردووم.

٤- نامەیـە کـە لەبـەڕێز **عـەلی موقەدەسـیەوە** کەلـە کوردەکـانی سـارمێرانی ئێسفەراینە و ئێستا دانیشتووی ئازادشارە. ناوبراو گوتوویانـە مـن لـە ڕەگـەزی ئیلـی دیرانلووم.

هـەروەها چەنـد تێبینیـشی سـەبارەت بـە گونـدەکانی ئـەردووخان و بیـدواز

نووسیبوو کە پاشان باسی دەکرێ.

٥- نامەیەکە لە **مامۆستا موحەممەدی ڕەیبانی** دانیشتووی مێهرشاری کەرەج کەلەوێ مامۆستای قوتابخانەیە کە نووسیوویە کارێکی کریس کۆچێرام بە ناوی بزوتنەوەی کوردان وەرگێراوەتەوە کە داگری شتهاییکە لە دەسەڵاتی بەدرخانیەکانەوە (۱۸٤۰تا ۱۹۷٥). ڕەیبانی لەنەبوونی پارە بۆ چاپی ئەو کتێبە باسی کردووە.

٦- نامەیەکە لە برام **عومەری فارۆقیەوە** لەسەقز واتا شاری جلوبەرگە جوانە کوردییەکان.

ناوبراو ئاماژەی بەوە کردووە کە دوو هەڤالی عیراقیمان کەبە دوای بەرگی یەکەمی کتێبەکەی تۆوەبوون کەچی نەبوو.

هەروەها نووسوویە لەبەرگی دووهەمدا شێعرێکی حاجی قادرت داوەتە ئەمیرشەرەف خان کە هەڵەیە ڕاستی بکەرەوە.

٧- نامەوبەڵگەی پیرۆزباییک بوو لە **مامۆستا عوبەیدوڵلائەیووبییان** و کاک سەیدواحێد کەلەوی لەمەهابادەوە کە لەگەڵ دەربڕینی خۆشەویستی، داواکاری دووپات کردنەوەی چاپی بەرگی یەکەم بوون، ناردم.

٨- نامەی پڕ لە خۆشەویستی کاک **ڕەحمەتولڵلای سەعادەتیش** لە کەلاتی نادرییەوە کە منی بچووکی بەقەڵای بە ناو بانگی کەلات کە ماوەییک زۆر نادرشای ئەفشاری لەژێر دیوارەکانی خۆیدا سەر لێشێواو گێژ کردبوو، بانگ کرد و سپاسی گەورەییان دەکەم و هیوادارم بتوانم هەرچی زووتر بگەمە خزمەتیان و لێکۆلینەوەی کەلات لە نزیکەوە دەس پێکەم و لەبڕینجی خۆشی کەلاتیش پلاوێ بخوەین کەوێنەی لە هیچ جێگای دونیادا پەیدا نابێت.

٩- نامەیەکە لە برامان **سەید هاشم کەریمی** لە مەهابادەوە کە هیوا دارم بەرگی یەکەمیان پێگەیشتبێت.

١٠- دەرەگەز **کاک حوسێنعەلی بەبدی** بەوری زیندانلوویش لەگەڵ دەربڕینی خۆشەویستی داوای ناردنی چەند بەرگ کۆچی مێژوویی کوردی کردبوو کە خەڵکی

دەرەگز نەیانتوانیبوو کاتی خۆی ئەو کتێبە بکڕێن.

١١- **بۆکان** نامەیەکە لە برای شاعێرمان **کاک موستەفایلخانیزادە** لە شارە جوانەکەی بۆکان کە خودی ئەو گەورەیە لە زانایانی وڵاتی کوردستانن و تا ئێستاش چەند بەرگ کتێبیش لەم بەڕێزە بە چاپ گەیشتووە.

لەگەڵ دەربڕینی خۆشەویستی داوای دوو ژمارەی لە بەرگی ئەوەڵیان کردبوو کە هیوا دارم بە چاپکردنی ئەم کتێبە بە ئاواتیان گەیشتبێتن، ئەو شێعرانەش کە ئەو بەڕێزە ناردبوویان لە کتێبی شاعێرانی کورد چاپ دەبێت.

١٢- **ئەندیمشک** نامەیەکە لە برای کرمانج **بەڕێز خزری** لە گۆڕەپانی بەربەرەکانی باشووری وڵات و ئەندێمیشک لەگەڵ پیرۆز بایی جێژنی نەورۆز و لەگەڵ دەربڕینی فەرموویانە ئێمە لەگەڵ برا کوردەکانمان کتێبی ئێوە لە نێومەتەرێزەکانی خۆپارێزیی ئێران دەس بە دەس دەگەڕێنین و لە وتەو نووسراوەکانی سەرانسەری جەستەمان پڕ لە خۆشی و سەرمەستی دەبێت.

وەکوو باوکانی سنوورپارێزی خۆمان لە خوراسان کەیەکێک لە گەورەترین مەتەرێزەکانی وڵاتە، پاراستوویانە و ئێمەش ئەمڕۆ لە سنوورەکانی ڕۆژ ئاوای وڵات لەبەرانبەر داگیر کەرانی سنووربەزێن دەیپارێزین و سڵاو دەنێرین بۆ ئێوە کە ناوی باپیران و مێژووی ئێمەتان زیندوو کردوەتەوە دوایی گوتوویانە خوزگا دەمتوانی ئەم نامەیە بەزمانی شیرین کرمانجی بنووسم کە دڵگیرتر بێت بەڵام مخابن کە بە ڕێنووسی کرمانجی شارەزاییم نییە، هیوا دارم یارمەتی ئێمە بدەن و فێری مە بکەن کەلە داهاتوودا نامەکانی خۆم بە کرمانجی بنووسم بۆ تان.

من و هەموو هەڤالانی کرمانجم لە خاوەن پلەکان و پلەبانەکان و سەربازان بۆتان سڵاو دەنێرین و هیوای سەرکەوتنی ئێوە لە لایەنی ئامانجەکانی کەلتووریتان دەخوازین. (ئەندیمێشمک ٦٧/١/٧)

١٣- **هەمەدان** برای بەبەها و زانا و زانادۆستمان **کاک سەید حەسەن ڕزبانیش** هیوادارم بەرگی یەکەمیان بە دەست هێناوێ

١٤- **کرماشان** برای مامۆستاو لایەقمان **کاک مێر ئەحمەد خوسرەوی** لە

گوندی مەسنوور ئاقای جوانڕۆ سەر بەشاری پاوە نامەیێک پڕ لە خۆشەویستی و بەڕێنووسی کوردی نووسیبوو کە: برای سەرکەوت و زانای تەوەحودی.

لە داوێن و سەرشاخی کوێستانەکانی هەورامان و جوانڕۆ سڵاوی گەرم و بەدڵ پێشکەش دەکەم...

بەزاڵ بوون و پسپۆڕایەتی ئێوە بە کەلتوورو مێژوو و وێژەی کورد ئافەرینم گوت: تۆ وەکوو عیسای مەسێح بە جەستە مردووی. بە مێژووی وێژەی کورد گیانت داوە و زیندووت کردوەتەوە.

١٥- **مەهاباد** لە شاری کەلتوور پەروەر و مێژوو سازی مەهاباد لە وڵاتی زەرتوشت و چێڵی موکری، نامەی جوانی برامان یووسف ڕەسوولیم سۆران بوو کە هاوڕێ لەگەڵ هەواڵم حاج موەفەقی کە یەکێکە لە کەلتوورپەروەرانی ئەو وڵاتە بە دەستم گەیشت.

١٦- **توربەتی حەیدەرییە** نامەیێک بوو لە برایانی کوردی بارزانی عێراقیمان لە توربەتی حەیدەرییە کە پاش لە داییک بوونیان هاتبوون و لەو وڵاتە نیشتە جێ بوون.

برایانی چاک و دڵسۆز و تێکۆشەرمان بەڕێزان عسمەت هاشم، بێهزاد، میکائیل، کاک موحەممەد و خوێندکارانی کوردی عێراقی توربەتی حەیدەرییە لەگەڵ دەربڕینی گەورەیی بێ ترس و وەرگێڕانی دەقی پەیماننامەی یاسایی ڕێکخستنی بەرەی کونگرەی نەتەوەیی کوردستان لە عێراق کە هەموو پارتەکان و کۆمەڵەکان لێژنەکانی کوردی ئەو وڵاتە پاش چەند ساڵ خەبات توانیویانە لەم سەردەمەدا دژ بە حکوومەتی زاڵمی بەعسی عێراق لەکنی برایانی خۆیان لەگەڵ ئەو داگیرکەران و خوێن مژانە خەبات کەن و بە مافەکانی بەڵگەیی خۆیان بگەن. بەش بە حاڵی خۆمان لە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بووین. ئەم سەرکەوتنە بە برایان و خوشکانی کوردمان بە تایبەت بە ڕێبەرانی ڕاپەڕین جەلال تالەبانی و مەسعوود بارزانی و ئورگانەکانی ڕێکخراو و پارتەکانی دیکە وەکوو لەوانە بە ئورگانی کەلتووری یەکیەتی خوێندکارانی کوردستان لەقی توربەتی حەیدەرییە پیرۆز بایی دەڵێن کە

ژمارەیەک لە سروودی ئاهەنگی نەتەوەیی خۆیان بۆم ناردبوو کەلە جێگای خۆیدا کەڵکی لێوەر دەگیردرێت.

هەروەها لە تاوان‌بارکردنی سەددامی خوێن‌مژ کە شاری حەڵەبجەی بوردوومان کرد و بیست هەزار کەس ژن و منداڵی بێ‌گوناهی بە خاک و خوێن کێشا ئەم هەڵبەستە شێعرە جوان و پڕ لە هەستیانە نارد بوو کە:

دوژمن بزانە خەیاڵت خاوە
بنچینەی ڕێگەت لەسەر لێلاوە
هەروەک لەمێژوو دیارە و نووسراوە
بووکی ئازادی بە خوێن ڕازاوە
نەبووە لە مێژووی کوردی قارەمان
سەردانەوێنێ ئەو بۆ دوژمنان
دەیان نموونەی وەکوو حەلەبچە
لەڕابردوومان بووەبەمەرجە

١٧- **بوجنوورد موحەممەد ئاوای مانە** برامان بێهرووز ڕەحمانی بە هاوپێچ لاپەڕەی ١٢٤کتێبی مەتلەعوشەمس ئێعتێمادوسەڵتەنە کە لە پێوەندی بە مێژووی بجنوورد و شادلووە، نووسیبوویان کە ئەم کتێبە لە ئەم گوندا بووە، ئەوەندە دەس بە دەس گەڕا و بێ قەدر بوو، بێ بەها کە هەمووی سڕیاوە و لە ناو چوو، جگە لەم لاپەڕە تەنیا ئەم لاپەڕەیە ماوەتەوە

جگە لەوە دانەیەک لە باپیرانم کتیبێکی سەبارەت بە خێڵەکان و تایفەکان و بنچینەی ڕەسەنی کوردەکانی شادلوو و وڵاتی بجنوورد نووسیبوو کە تا چەند ساڵی ڕابردوویش بوو، بەداخەوە ئەویش گوم بوو و من لەم بابەتەوە زۆر داخوازم.

ئێمەش لەم بێ قەدرکردنە سەرنج نەدانی ڕابردووکانمان بە کتێب و کتێب‌خوێنی توێژینەوە و پاراستنی زۆر داخوازین ئێمە چێوی بێ سەرنجی و خوێڕی بوونی ئەوان دەخوەین. هیوادارم نەوەی لاومان بە تێکۆشانی خۆیان ئەم

کەم و کۆڕییە قەرەبوو کەنەوە بە بۆنەی ئەوە کە نووسیبووتان سەبارەت بە موحەممەدئاو او ڕازی لێکۆڵینەوەکەم ئەڵبەت ئەمە ئەرکی سەرشانی منە. چەند جار هاتم، بەڵام ئاوی ڕووباری بێ پردی موحەممەد ئاوا ئیزنی بەمن نەدا.

جێگەی داخە کە فەرماندار و نوێنەرانی بجنوورد لە پارلمانی ڕاوێژگەی ئیسلامی بچووکترین سەرنجێک بەئیشی ڕێسازی و پردسازی ڕاناکێشن.

بەرهەمەکانی خەڵکیش لەم بێ سەرنجییەی گەورەکان لە ناودەچێ و لە کاتی خۆیدا ناگەیێتە بازاڕەکان. ئەمن لە نامەیەکدا ئەم کێشەیە بەبرادران حوسێنی و ڕزایی نوینەرانی بجنوورد بە ڕیکەوتی ۷۱/۳/۱۷ ڕاپورتم کرد و داوام لێیان کرد کە کۆتایی بەم موشکلە بێنن. هەروەها دوکتور ڕەحمانی بە پردسازی دروست کردنی پرد لە سەر ڕووباری قولجۆق شیروان کەبە ماوەی چەند مانگ ڕێگری هات و چووی خەلک بوو و مرۆڤ بەشارە ئاگادار بن و خەڵکیش لەم کێشە ڕزگار کەن.

هاتوچۆی خەلک بۆ ناو شار سەرنج بدەن و خەڵک لە دەستی ئەم نەهامەتیە ڕزگار بکەن. خەڵکانی جیهان دەست دەگرن بە سەر سەییارە ئاسمانیەکاندا، ئێمە ناتوانین پردێک ساز بکەین و ئەمە دەبێتە هۆی چارەڕەشی .

**۲۰- ئوتریش (نەمسا)**: بەڕێز ئێشتانسێر لە ڕێکەوتی ۲ی نوامبری ۱۹۸۷ نامەیەکی لێکۆڵەرانەیان بەڕێ کردووە و فەرموویانە: ماوەی یەک ساڵە کە خەریکی لێکۆڵینەوە دەربارەی فەرشەکان و گلێمەکانی کوردی خوراسانم؟ شەش مانگ لە مەوبەر هاتم بۆ ناوچەکانی ئێسفەراین و بجنوورد و شیروان و قووچان و دەرگەز و لایین و کەلاتی نادری تا لە نزیکەوە پیشە دەستیەکانی خوراسان تاوتوێ بکەم. من لە ڤیەن پێتەختی ئوتریش ۲۵۰ جووتی ئەم پیشە دەستیانەم لەبەر دەستدایە و لە کتێبێکدا چاپیان دەکەم.

بەڵام لە گەڕانەوە بۆ ڤیەن بیستم کە زۆر کاری شیاوتان لەمەڕ مێژوو و فەرهەنگ و پیشە دەستیەکان و موسیقای کوردەکانی ئەو هەرێمە بە ئەنجام گەیاندووە. بیستنی ئەم هەواڵە بوو بە هۆی داخ و کەسەرێکی زۆر کە نەمتوانی لە خوراسان چاوم پێتان بکەوێت. چونکە کتێبەکانی ئێوە لە دەرەوەی وڵات دەست

ناکەوێ، تکایە بۆمی بنێرن، کە بە دڵنیاییەوە لە کتێبەکەی خۆمدا لە نووسینەکانی ئێوە کەڵک وەردەگرم و وەکوو سەرچاوەی جێ باوەڕی ئاسەواری ئێوە لە ئورووپا دەیانناسێنم... نرخەکەشی بە هەر شێوەیەک کە ڕایبگەینن بۆتان بە ڕێ دەکرێت.

بە سپاس لە دەربڕینی ڕێز و پێزانین و زەحمەتەکانی بەڕێز ئێشتانسێر چونکە بەرگی یەکەمم نەبوو، ژمارەیەک لە بەرگی دووهەمم بۆیان نارد و بەرگی سێهەمیش کە لە ژێر چاپ بێتە دەرەوە پێشکەشی بەڕێزیان دەکەم و سەرکەوتنی بەڕێزیان داوا دەکەم.

لێرەدا پێویستە ئەوەش زیاد بکەم کە بەڕێز ئێشتانسێر ئەمساڵیش هات بۆ خوراسان. کتێبی فەرشی کوردەکانی خوراسان لەلایەن بەڕێزیان بە شێوەیەکی زۆر جوان بە دوو زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی چاپ کراوە و لە کتێبە گرینگەکان بە باشی کەڵکیان وەرگرتووە و سپاسی خۆیان دەربڕیوە. ڕۆژی ۷۱/۳/۱۵ پێکەوە ڕۆیشتوون بۆ کوێستانی ئارموتەلی بۆ نێو کۆچنشینەکانی سبوکانلوو، هیزولانلوو و کاویانلوو کە جێگەی ئێوەش زۆر خاڵی بوو کە فەتیری مسکە و دۆیەکی بێوێنەمان خوارد. بە تایبەت لە شێوەی پۆشینی جلوبەرگی جوانی ژنانی کورمانج لە هیزولانلوو و پیشە دەستیەکان و قاڵیەکانی ژنانی هونەرمەند زۆر وێنە و ئێسلایدمان وە دەست خست و بەڕێزیان لەو سەفەرە زۆر خۆشحاڵ و شادمان بوون. بەڕێزیان لەمەڕ داواکاری وڵاتی ئێران بۆ بەشداری لە پیشانگای نێونەتەوەیی فەرشی ئێران کە لە شاری تاران بەڕێوە دەچێت بەشداریان کردووە. زۆر ستایشی کارەکانی منی کرد و بە تایبەت داوای لە من کرد کە هەرچی زووتر کتێبی «جلوبەرگ و پیشەکانی دەستی و فەرش و خشڵ و زەنبەری ژنانی کورمانجی خوراسان چاپ و بلاو بکەمەوە تا ببێتە ڕێخۆشکەری قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەی لێکۆڵەرانی ناو و دەرەوە. ئەو بە منی وت: کارەکانت لە ئورووپا و دەرەوەی وڵات کەوتووەتە بەر سەرنجی لێکۆڵەکران و نووسەران و لە زۆر کتێبدا ڕێزیان لە ئێوە گرتووە.

بەرێز ئێشتانسێر ژمارەیەک لە کتێبی بە نرخی فەرشی کوردەکانی خوراسانیان بەم قەڵەمە پێشکەش کرد کە من سپاسی بەڕێزیان دەکەم، بە بۆنەی ئەو هەنگاوەی

کە لە ڕێگای بڵاو بوونەوە و بەرفرە کردنی فەرهەنگ و هونەری خوراسان هەڵیان گرتووە، دەورەیەک لە کتێبەکانم بە بەڕێزیان پێشکەش کرد.

٢١- **تاران:** نامەی برای زانامان بەڕێز موحەممەدباقر نەجەفزادەش لە ئیدارەی ڕۆژنامەی ئیتلاعات گۆڤاری حەوتانەی ئیتلاعات گەیشت کە لەگەڵ برووسکەی بەڕێز دوکتۆر فەرەیدوون جونەیدی نووسەری بە ناوبانگی ئەدەبیاتی کەونارای ئێران، کە خوازیاری هێندێک گۆرانی (هەڵبەستی کورت) و فۆلکلۆرەکانی کورمانجی بوون کە لە کاتی خۆیدا پێشکەشی بەرێزیان دەکەم کە لە کتێبەکەی خۆیاندا بە چاپی بگەینن.

٢٢- **توربەت حەیدەریە:** نامەی جوان و خۆش خەتی خۆشکی بەڕێزی بارزانیمان خانمی ڤیان (خێزانی برای زانا و پسپۆڕمان بەڕێز عێسمەت هاشم ناسراو بە دڵ ڕەش) لە توربەت حەیدەریەوە گەیشت کە دوای دەربڕینی ڕێز و خۆشەویستی نووسیبوویان:

من لە موتالای ئاسەواری ئێوە هاتمە سەر ئەم باوەڕە کە سپاس و پێزانینی خۆم سەبارەت بە ئەو چالاکیە بەرفرە و بەرینە کە لە بەستێنی فەرهەنگ و ئەدەبیات کردووتانە و دەیکەن دەرببڕم. تا ئەو جێگایەی کە ئاگادارم سالانێکە کە جەنابتان ئەرکی قورسی ئەم بەرپرسیاریەتیە مێژووییەتان وە ئەستۆگرتووە و ئەمە دەبێتە هۆی شانازی و دلگرمی هەر تاکێکی کورد، چۆنکە هەروا کە مێژوو شایەتی داوە سێبەری ڕەشی دواکەوتوویی فەرهەنگی و نەخوێندەواری لەسەر نەتەوەی ئازای ئێمە کاریگەی نەرێنی لە بە ئاکام گەیشتنی ئازادی بووە.

هیوادارم ڕۆژ بە ڕۆژ قەڵەمتان پێداگرتر و تێکۆشەرتر بێت و لە ڕێگای خزمەتی فەرهەنگی بەم خەڵکە چەوساوەیە سەرکەوتوو بن.

سلاو و ڕێزی من بە خێزان و منداڵەکانتان و یەک بە یەکی برا و خۆشکانی کوردی خوراسانی ڕابگەینن. (خۆشکی کوردی بارزانیتان ڤیان- ٦٧/٤/٢)

٢٣- **ڕەشت:** برای زانامان بەڕێز عەلیئەکبەر مورادیان گەرووسی کە بە زمانەکانی گیلەک و فارسی. ئاسەوار و هۆنراوەی زۆری هەیە، ڕوو لە من

فەرمووبوویان.

سڵاو کاک کەلیموڵلا تەوەحودی

هیوادارم سەرکەوتوو و سەربەرز بن. بەرگی دووهەمی کتێبی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسانم خوێندەوە، هەوڵ و تێکۆشانی ئێوە لە دانان و ڕێکوپێک کردنی ستایش دەکەم...

من کوردێکم کە لە گیلان لە دایک بووم بەڵام هەموو کوردەکانی مادی و ئێرانی لە هەر کوێ کە بن خۆشەویستی منن و خۆشیانم ئەوێ. سپیدڕوود گەرچی لە گیلاندایە بەڵام سەرچاوەکەی لە چاکانی چل چەمەی کوردستاندایە.

باوکم (عەزیز) کوڕی (موراد) خەڵکی گوندی (مەیدان موزەفەرخانی گەڕووس) لە سەرەتای شۆڕشی جەنگەل هات بۆ گیلان و شان بە شانی میرزا کووچەک خان لە ڕێگەی ئازادیدا خەباتی کرد. یەکێک لە براکانی کوژرا و سەرگەردان بوو، تا ئەوەی کە لە گوندی بۆساری ڕەشت نیشتەجێ بوو. من لە ڕەشت لە دایک بووم. بڕوانامەی خوێندنم لیسانسی بازرگانیە و ئێستا خانەنشین کراوم. بەڵام سەربەرز و سەرفەراز وەکوو چیاکانی زاگرۆسم .هەرچەند کە هێندێ کات دەست دەبم بۆ خامە و نمنمەیەک لە شێعری گیلەکی و غەزەڵی فارسی دەهۆنمەوە و پێشکەشی دەکەم. لە ساڵی ١٣٥٩ ئیمتیازی حەوتەنامەی (گیلەمەردم) هەبوو کە ٧٢ ژمارەی بڵاو کرایەوە و دوایی داخرا.

ئەمنیش سەرکەوتنی برای زانامان بەڕێز گەڕووسی لە خوای مەزن داواکارم و وێنە و شێعر و نووسراوەکانیانم لە زانستنامە گونجاندووە، هیوادارم بە زوویی چاپ بکرێ و هەموو لایەنگرانی زانایی و هونەر لەگەڵ ئاسەوارەکانیان ئاشنا بن.

٢٤. ئەم جارە نامەی برای کرێکار و زەحمەتکێش و فەرهەنگ دۆستی ئێمە بەڕێز شەعبان سەبری زیندینلوو دەرگەزی لە گورگانەوە گەیشت کە نووسیبووی:

... کوردەکانی عەبدولمەلەکی کە لە پارێزگای مازەندەران لەگەڵیان ئاشنا بووم. کوردەکانی عەبدولمەلەکی مازەندەران دانیشتووی زاغمەرز و بێهشەهر، دەڵێن کە نزیکەی ١٨٣ ساڵ لەوەو پێش [نزیکەی ١٢٢٥ی کۆچی مانگی] بە

فەرمانی فەتحعەلیشای قاجاڕ لە قوورەی کوردستانەوە بۆ ئێرە دوور خراونەتەوە تا هەموویان بخەنە ناو دەریا و ڕژیمی شاهەنشاهی قاجاڕ بە دەست ئەوانەوە ئاسوودە بێت، بەلام ئەوان سەرەڕای ئەوەی خەسارێکی زۆریان لێکەوت، لە کەناری زەلکاوەکانی دەریای مازەندەران کە مێشوولەکانی لە ڕۆژگارەدا فیلیان لە پێیان دەخست هەروا خۆڕاگر و بە ورە خۆیان پاراست و هێشتا مەتەرێزەکان و تەنانەت بەندیخانەکانی ئەوان کە بۆ دوژمنانیان سازیان کردبوو ئاسەوارەکەی دیارە.

چەندە لەم کوردانە بە هۆی ئازار و ئەشکەنجە و دژواریەکان لە نێو چوون ئەمن نازانم، بەلام ئەمڕۆژ ئەمانە لەم گوندانە و شارەکانی مازەندەران سەربەرز و سەرفەراز و شادمان دەژین کە بریتین لە:

١- زینوەند ٤٠ بنەماڵە ٢- ئەمیرئاباد ٧٠ بنەماڵە

٣- حوسەینئاباد ٣٥٠ بنەماڵە ٤- زاغمەرز ١٥٠٠ بنەماڵە

٥- یەکەتووت لە کەناری دەریا لە نزیکی بێهشەهر ١٢ بنەماڵە

پەنجا بنەماڵەش بۆ تاران و ٢٠٠ بنەماڵە بەرەو شارەکانی نکا و ساری و بێهشەهر کۆچیان کردووە و ٦٠ بنەماڵەشیان لە ئالمانی ڕۆژئاوا دەژین. زۆر چالاک و مێهرەبان و خوێنگەرمن، بەلام زمانی خۆیان هەتا ڕادەیەک لە دەست داوە و ئێستا لەگەڵ خزم و کەس و کاری خۆیان لە قۆرەوەی کوردستان هاتوچوو و پەیوەندیان هەیە. ئەم زانیاریانە لەلایەن بەڕێزان عەلی یاسمی عەبدولمەلەکی و حاج وەلی سەلیمی عەبدولمەلەکی لە زاغمەرز نزیکی بێهشەهر بە منیان دا.

سەرکەوتوو بن بە هیوای دۆزینەوەی کەسانی تر کە دوورخراونەتەوە و هەموو ئاوارەکانی کورد لە سەرتاسەری جیهان. (شەعبان سەبری زیندینلوو)

بە سپاس لە براامان سەبری کە لە سەبری دووهەمیش لەمەڕ عەشیرەتەکان و تایفەکانی کوردی دەرەگەز ئێمەیان یارمەتی دا، سەرکەوتنان دەخوازم و ئەوەش وەبیر دێنمەوە کە سەبارەت بە کوردەکانی ناوبراو لە جێگایەکی تردا دەنووسم کە مێژوویەکی سەرنجڕاکێشیان هەیە.

٢٥- تەورێز: نامەی پڕ لە خۆشەویستی براامان بەڕێز موحەممەد مورتەزایی لە

تەوریز بوو کە خوازیاری چاپی دووبارەی بەرگی یەکەم بوون.

٢٦- **نەغەدە:** نامەیەکی پسپۆڕانەیە لە برامان بێهزاد بەرواری لە گوندی چیانەی نەغەدەی کوردستان کە فەرموویانە:

••• بەڕێز تەوەحودی سلاوی گەرمی من لە کوردستانەوە قەبووڵ بکەن بە شێوەیەک کە لە کتێبی پڕ لە شانازی زەعفەرانلوو هێندێک بیر و بۆچوون هاتبووە ئاراوە، من لەسەر ئەو باوەڕەم کە گوایا بنەمای سەرەکی وشەی زەعفەرانلوو ئێمڕۆژە واتایەکی ڕوونی نیە و ئەمنیش بە هاوڕێیی و یارمەتی هەڤالانم بە سەرنجدان بە هۆگرییەکی تایبەت کە بە کتێب و نووسراوەکانی ئێوە هەمانە لەمەڕ ئەم ناوە لێکولینەوەیەکی بەرینی ناوچەییمان ئەنجامداوە و بەم ئاکامە گەیشتووین کە:

نزیکەی زۆرتر لە هەزار ساڵ پێش ئێستا شارێک بە ناوی «زەعفەران» لە پازدە کیلۆمێتری شاری زاخۆ (لە سنووری کوردستانی عێراق و کوردستانی تورکیە) بووە و ئێستاش ئاسەواری ئەو کە تێکەلاوێکە لە دیوارەکان و هێندێک ئاسەواری‌تر لە کانی‌یەکی ئاوی گەورە بە جێماوە. سەرچاوەی ئاوی ناوبراو لە گوندی دێرەبینە لە ٢ کیلۆمێتری نێوان سنووری تورکیە و سووریە هەیە. بە بڕوای ئێمە وشەی زەعفەرانلوو لە هەمان وێرانەی شاری زەعفەران سەرچاوەی گرتووە و کوردەکانی زەعفەرانلووی خوراسان بەو شێوەیە ناسێنراون. (بێهزاد بەرواری ١٣٦٧/٦/٥)

بەلێ برای بەڕێز وا پێدەچێ کە پەیوەندی هەبێت بە شاری زەعفەران یان دەیری زەعفەرانیەکە بە دوای گواستنەوە بۆ دەوروبەری تاران ناوی زەعفەرانلوویان لەوێدا بە یادگار داناوە و دوایی بەرەو خوراسان بە ڕێ کەوتوون و ڕێباتی زەعفەرانی سەبزەواریان ساز کردووە و هەروەها بە زەعفەرانلوو ناسێنرا بن.

٢٧- **مەهاباد:** نامەیەکی پڕ لە ڕێز و خۆشەویستیە لە بەڕێز ئاغای حاج موحەممەد خەلیل مووەفەقی بەرپرسی کتێبفرۆشی و سالهایەکە لە ڕێگای پێشخستنی ئامانجەکانی فەرهەنگی کورد تێکۆشان. بێ‌وچانی خۆیان درێژە دەدەن و کتێب فرۆشیەکی ئابروومەندیان هەیە.

بەڕێزیان سەرەڕای وتنی پیرۆزبایی جێژنی نەورۆز بە من و هەموو کوردەکانی

خوراسان فەرموویانە: «هیوادارم دوعاتان سەبارەت بە کوردەکانی پەراکەندە و سەرگەردان و ژێر ستەم بە ئاکام بگات.» ئینشائەڵلا... ٦٨/١/٦. (منیش دووبارە دڵێم ئینشائەڵلا.)

٢٨- **خووزستان:** نامەیەکە جوان و پڕ لە خۆشەویستی و لێکلۆڵەرانە لە برای کوردمان بەڕێز عەلی مورادی هەزاروەند زەنگەنە لە خوزستان بەڕێزیان لە بەشێک لە نامەکەی خۆیان فەرموویانە:

ئامانج لە نووسینەکەم، هێنانە زمانی هێندێک مەسەلەیە لەمەڕ کتێبی کۆچی مێژوویی بۆ خوراسان و هەروەها پرسیارگەلێک سەبارەت بە عەشیرەتی زەنگەنە. لەوەی‌کە لە کۆکردنەوەی مێژووی کورد بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەوڵی بەرچاوتان داوە، بە ناوی برایەکی هاوعەشیرەت سپاس دەکرێت. بەڵام لەم نێوەدا مەسەلەیەک بۆم نادیارە و ئەویش ئەوەیە هەتاکوو ئێستا نەمتوانیوە کتێبێکی بە بێ‌کەم و کۆڕی لەمەڕ عەشیرەتی خۆم (زەنگەنە) بدۆزمەوە. هەڵبەت کتێبی زۆر هەیە، بەڵام تەواو نین. زۆرتریان زەنگەنەکان لە عەشیرەتەکانی نۆ جۆرەی کورد دەزانن و لەم عەشیرەتە بە ناوی یەکێک لە گەورەترین خێڵەکانی ئێران ناو براوە... لەوانە لە کتێبی خووزستان کۆهگیلوویە و بویرئەحمەد نووسراوەی بەڕێز ئیقتداری لەبارەی زەنگەنەکان قسە کراوە بەڵام کاتێک عەشیرەتەکانی کوردی کرماشان ڕاڤە دەکەن، زەنگەنەکانیان لەم دابەشکردنە جێگە نەداوە، بۆ نموونە لەمەڕ عەشیرەتی کەلهۆڕ یان سنجابی زۆرتر قسەیان کردووە، بەڵام لە زەنگەنەکان خەبەرێک نیە.

ئەمەویست ئەی مامۆستای بەڕێز لە ئێوە بپرسم کە عەشیرەتی زەنگەنە لە چەند خێڵی سەرەکی پێکهاتووە و بارودۆخی ئەوان بە درێژایی مێژوو چۆن بووە و ئێستا لە کوێ و لە چ هەلومەرجێک دەژین؟

خۆم لە عەشیرەتی زەنگەنەم، بنەماڵە و خێڵ و ڕەگەزم هۆگرییەکی زۆریان بە زانینی مێژووی نەتەوەیی خۆیان هەیە. دەڵێن: عەشیرەتی زەنگەنە لە باغمەلێکی جانکی خووزستان لە دەورانی نادرشای ئەفشار کاتێک دەیویست موحەممەدخان بەلووچ سەرکوت بکات، حکوومەتی جانکی دەسپێرێتە عەلیڕەزا بەیگ زەنگەنە و بە

سێ دەستەی: زەنگەنە، کورد زەنگەنە و کورد دابەش کراون و هەرکام لە ناوچەیەک جێگایان گرتووە. شاخەی زەنگەنە لە دوو ڕەچەڵەکی هەزاروەند و مادیوەند پێکهاتووە.

هەزاروەند بریتیە لە: شەرامەند، کیچوەند، سەلمانوەند و پادراز.

مادیوەند بریتە لە: عەباسوەند، گراوەند، کولابوند، قەدوئی، ئابوندولەر.

ئایا دابەشکردنی ئەم عەشیرەتە لە ناوەندە سەرەکیەکەی واتە کرماشان هەر بەم شێوەیە بووە یان نە؟

هەڵبەت ئێوە لەمەڕ ئەم هەڵە عامیانەیە کە هێندێک کەس کوردەکانی زەنگەنەیان بە عەرەب زانیوە، لە بەرگەکانی دووهەم و سێهەم شی کردنەوەی باشیان کردووە و نووسراوەگەلێکیان لەمەڕ دوعای حەزرەتی ئیمام سەججاد هێناوەتە زمان و باوکانی ئێمەش هەر ئەمەیان بە ئێمە وتووە...

بریا دەتانتوانی کتێبێکی جیا لەمەڕ ئەم عەشیرەتە گەورە و پەراکەندەیە بنووسن کە لە ئێسفەهان و کرماشان و خووزستان و فارس و خوراسان و جێگاکانی تر بلاو کراونەتەوە...

تەوەحۆدی‌گیان! سوێند بە خوای مەزن لاوانی ئێمە نازانن کە کێ بوون و لە مێژووی خۆیان بێ‌خەبەرن. تەنیا دەزانن لە ئێوە ئەوەمان ئەوێ ئێمە زۆرتر لەگەڵ مێژووی ئێران و باپیران ئاشنا بکەن و لە سەرلێ‌شێواوی ڕزگار بکەن...

برای ئێوە عەلی موڕادی هەزاروەند زەنگەنە

لە وەڵامی برامان عەلی موڕادی هەزاروەند زەنگەنەی خووزستان عەرز دەکەم کە زەنگەنە لە عەشیرەتەکانی بەناوبانگ و ناوداری کورد و ناوەندی سەرەکیان مەڵبەندی کرماشانە کە لەوێوە بۆ ناوچەکانی‌تری ئێران ڕۆیشتوون. ئەم عەشیرەتە پیاوانی ناودارێک وەکوو شێخ عەلیخان زەنگەنە وەزیری بە توانا و بێ‌هاوتای سەردەمی سەفەوی پێشکەشی کۆمەڵگای ئێران کردووە، لە حاڵی حازریش برامان بیژەن نامدار زەنگەنە وەزیری هێژای وزە لە وەزیرەکانی زۆر چالاکە کە پێشتر وەزیری جەهادی سازەندگی بووە. ئەم قەڵەمە لە کتێبی «خێڵەکان و

عەشیرەتەکانی ئێران کە ئێنشائەڵلا هیوادارم بەم زوانە چاپ و بڵاو بکرێتەوە تا ئەو جێگایە کە توانیومە خۆم سەقاڵی ناساندنی عەشیرەتی ئێوە و عەشیرەتەکانی تری ئێران کردووە. سپاسی هاوکاری بە نرخی ئێوە دەکەم هەروەها نامەی دووهەمی ئێوە کە زۆر تێر و تەسەل بوو لەم کتێبە چاپ دەکرێت».

٢٩- **قووچان:** نامەیەکی پڕ لە هەستە لەلایەن برای بەڕێزمان ئاغای ڕەحمەتوڵلا ئیبراهیمی لە کارمەندانی چالاکی جەهادی سازەندگی قووچان کە ڕوو لە من فەرموویانە: بەو پێیە کە منیش یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵگای کوردەکانی خوراسانم بەش بە حاڵی خۆم لە هەوڵ و تێکۆشانی بێوچانی بەڕێزتان ڕێز دەنێم و سپاستان دەکەم...

هەر سێ بەرگی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان کە ئاکامی هەوڵی بێبڕانەوەی شەو و ڕۆژی ئێوەیە لەبەر دەستمدایە... بە بڕوای من بەرگی سێهەم باشتر و پاراوتر لە بەرگەکانی ترە. هیوادارم لە درێژەی بەرگەکانی دوایی ئاسەواری بە نرخ و تەواوتر و هەرچی پڕ بایەختر بە یادگار دابنێن.

هەروا ئەگەر من لە جیاتی ئێوە بایام سەرەتا کتێبەکانی: «فەرهەنگی وشەی کورمانج»، «ڕێزمانی کورمانجی» و «گەپی مەزنانم». هەرچی زووتر چاپیانم دەکرد و دەیانمکردە یەکەم ئەولەویەت. چونکە هەروا کە دەزانن زمان و فەرهەنگی ئێمە خەریکە لە نێو فەرهەنگی بێگانەی شاریدا دەتوێتەوە و ئەگەر چارەسەرێک نەدۆزرێتەوە هەتا چەند ساڵیتر ئەم زمان و فەرهەنگە لە نێو دەچێت و ئێوە لەم بارەدا بەرپرسن.

هێندێک لە لاوانی کوردی ئێمە بە بێسەرنجدان بە ڕەسەنایەتی فەرهەنگی خۆیان هەرکات دێن بۆ ناو شار وەها لە نێو فەرهەنگ و زمانی نامۆدا غەرق دەبن کە بە یەکجاری ڕەسەنایەتی خۆیان لە بیر دەچێتەوە.

بە شێوەیەک کە گومان دەکەیت قەت کورد نەبوون و هیچ پەیوەندیەکیان لەگەڵ فەرهەنگی کورمانجی نەبووە. دڵی من لە بینینی ئەم هەموو ناسپاسیە و هەڵاتن لە فەرهەنگی خۆیان خوێنە.

بەداخــەوە ئەویندــاری فەرهــەنگی نـامۆ پــەرەی ســەندووە و لــە ســەر هــەموو ئاستەکانی ژیان بریتی لە شێوەی پۆشینی جلوبەرگ، شێوەی بەرهەم هێنان، شێوەی ژیان، شێوەی ئاخافتن و داب و نەیتی میوانداری کاریگەری داناوە و سێبەری ڕەشی خۆی خستووەتە سەری. بۆ نموونە لە خۆمەوە بڵێم لەگەڵ ئەوەی باوک و دایکم کوردن و خۆم لەگەڵ هاوتەمەنەکانم کورمانجی قسەم کردووە و ژیاوم. بەوەشەوە هەست دەکەم لە بەرانبەری فەرهەنگی ڕەسەن و پاراوی کورمانجی زۆر ناتوانم و شتێک نازانم، زۆر جار لە وتوویژ لەگەڵ کەسانیتر دەبینم کە چەندە قسەی نەستەق و دەستە واژە و شێعری باش و ناوی جوان لەمەڕ کەسان یان گیا یان دارەکان و شتیتر هەیە کە منیش لەوانە ئاگاییم نیە چە بگات بەو کەسانەی کە لە شار گەورە بوون و لە فەرهەنگی خۆیانیش بێگانە کراون.

لەم ڕووەوە دەڵێم کە باشتر بوو کتێبەکانی فەرهەنگتان لە پێشدا و زووتر لە کتێبە مێژوویەکان چاپ بکردبایت تا ببێتە لەمپەرێک لەبەرانبەر تێکچوونی ئەم فەرهەنگ و زمانە.تا بە خێرایی ڕێگای لە ناوچوون نەپێویت. چونکە ڕوون نیە کە چەرخی ڕۆژگار دەرفەتی ئەنجامدانی هەر کارێک بە مرۆڤ بدات. هەڵبەت بە فالی خراپی دامەنێین... (١٣٦٧/٩/٩)

... بە سپاس لە برامان بەڕێز ئیراهیمی قووچان کە نەیانفەرمووە لە کامە خێڵ و عەشیرەتی کورمانجن، هیوادارم بتوانم داخوازی بەڕێزمان جێبەجێ بکەم و لەم ڕووەوە دیوانی عیرفانی کورمانجی جەعفەرقولی زووتر لەم کتێبە بە چاپ گەیشت و باقیەکەشی ئینشائەڵلا بە زووترین کات بە چاپ بگەیەنم و هەروەها وەبیری دێنمەوە کە لە کورمانجیدا ئێمە بە ڕوباعی یان دوو بەیتی، چارخشتی یان چارلنگەی (چوارێنە)دەڵێین.

٣٠- **ئازەربایجانی ڕۆژئاوا- سەردەشت:** نامەیەکە لەلایەن برای خۆشەویستمان بەڕێز لەحافدووز کە نووسیویانە: برای بەڕێزم کاک کەلیمولڵلا تەوەحۆدی.

پاکترین سڵاوی من پێشکەشی ئێوەی بەڕێز بێت. بەر لە هەر شتێک بڵاوبوونەوەی سێهەمین بەرگی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بە ئێوە

سەرۆکی هێژا و هەموو لایەنگرانی زانست پڕ بە دڵ پیرۆزبایی دەڵێم. خوا سێبەری ئێوە لە سەرمان کۆتا نەکات و سەرکەوتن و سەربەرزیتان پێ بدات کە بە چاپی هەموو ئاسەوارەکانی خۆتان ئێمە بۆ هەمیشە بکاتە قەرزداری هەول و تێکۆشانی بەڕێزتان. بە دیتنی بەرگی سێهەمی کتێبی ئێوە بۆ ماوەیەک مەزنایەتی کاری ئێوە وەکوو پریسکەیەک دڵی منی ڕوون کردەوە. بزەیەک کە نیشانەی خۆشحاڵی دەروونی منی دڵ ماندوو بوو کەوتە سەر لێوانم و هەزاران بار ئافەرینم پێشکەشی ئاسەوارە جوانەکەت کرد... (سەردەشت ٦٧/٩/١٢ برات لەحافدووز)

**٣١- مەشهەد:** برای زانا و ڕووناکبیر و نووسەری تێکۆشەرمان بەڕێز ئاغای جابانی (کوردجابان) قووچانی کە لە مامۆستایانی خانەنشین کراوە و ناویان لەگەڵ قووچان تێکەڵ بووە. نووسیویانە: بڵاوبوونی سێهەمین بەرگی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بە بەڕێزتان پیرۆزبایی دەڵێم.

هەروا کە دەزانن شانازی کردنی جەماوەری هەر وڵاتێک بە مێژوو و بە سەرهاتی باپیرانیانەوە پەیوەندی هەیە. مێژوو هەموو ئاستەکانی تاریکی گەلان و پێشکەوتن و سەرکەوتنی ئەوانمان پیشان دەدا.

نووسین لەم پەیوەندیەدا یارمەتیەکە بە ڕوون کردنەوەی بە سەرهاتی حەقیقی پێشێنیان و کارێکە یەکجار دژوار.

کۆکردنەوەی زانیاریەکانی مێژوویی و شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی ئەوان لە هەر ناوچەدا لە ئەرکەکانی خەڵکانی ناوچەیە.

ئەوانەی کە دەستیان داوەتە قەڵەم هەموو سەختیەکان بە دڵوگیان قەبووڵ دەکەن و لەم ڕێگا پڕ لە مەترسیە هەنگاو هەڵدەگرن و لە هیچ ئاستەنگێک ناترسن. هەنگاوتان لەم ڕێگایە پەیوەندی هەیە بە خۆڕاگری و ئیرادەی خەڵکانی هەر ناوچەیەک...

مەشهەد ١٦ی سەرماوەزی ١٣٦٧. موحەممەد جابانی.

هیوای سەرکەوتنم بۆ ئەو هاوشاریە بەڕێزە هەیە.

**٣٢- تاران:** برای زانا و هەڵکەوتوومان بەڕێز سەرهەنگی موهەندیس شارەبانی

بەڕێز قولی ڕاست‌خەدیو بوانلوو کە بلیمەتی و توانای هۆشییان بە تایبەت لە بیرکاری (حەسێب) بووەتە هۆی سەرسووڕمانی هەموان و لەو کەسانەیە کە جێگـای شـانازی عەشیرەتی کیکانلووە لە زانکۆی ئەفسەری پێکەوە هاودەورە بووین. ڕاست‌خەدیو لـە سالی شەشەمی سەرەتایی خوێندنگای ڕوودەکی ئوغاز وەکوو خوێنـدکاری زیـرەک لەو پۆلەدا پلەی یەکەمی بە دەست هێنا. دوایی کە لـە شـارەبانی بجنـوورد دامـەزرا شەش سالی دەورەی دواناوەنـدیی بـە سـێ سـاڵ تێپەڕانـد و بـوو بـە یـەکێک لـە خوێندکارانی خاوەنی پلەی یەکەم لە زانکوی ئەفسەری پولیس و دوای تەواو کردنی دامەزراوەی پەروەردەی مامۆستایان لە نارمەک بڕوانامـەی ئەنـدازیاری دامـەزراوەیی وەرگرت و ئێستا چەند بڕوانامەی لیـسانس و فـەوق لیسانـسی هەیـە و سـەرهەنگی شارەبانیە و لە نامەیەکدا بۆ من نووسیویانە:

کەلیم گیان! وێڕای سلاو و هیوای سەرکەوتنی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژی ئێوە لە بردنـە سەری ئاستی فەرهەنگی نەتەوەی ئازای کورد و دانان و نووسین و تۆمارکردن و بلاو کردنەوەی کۆمەڵە کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسـان، بـەرگی سـێهەمیش گەیشتە دەستم. زۆرم پێ خۆش بوو کـە بـەرگی سـێهەم کـە شـاکاری ئێوەیـە لـە نزیکەوە ببینم و موتالای کەم، بە تایبەت بـە سـەرنجدان بـەو ئاسـتەنگانەی کـە لـە بەردەم چاپ کردنی هاتبووە پێش و من لەوە ئاگادار بووم کە بە درێژایی مانگەکان و ساڵەکان لە ڕێگای تاران و مەشهەد دووچاری چ کێشەگەلێک هاتوون. چالاکیەکانی هوشیارانەی ئێوە و هاتووچۆی لە دوای یەکی ئێوە بۆ تـاران و سـەرەنجام بـە ئاکـام گەیشتن و لە هەموو گرینگتر هەولەکانی چەندین ساڵەی ئێـوە لـە کـۆ کردنـەوەی کتێبەکـە زۆرتـر مـنی کردووەتـە ئەوینـداری دیـتنی ئـەم کتێبـە. بـە دوای دەست‌خستنی کتێبەکە ویستم بە پەلە سپاس و پێزانینی خۆم بەرانبەر بە هەسـتی پاکتان بە نووسراوە یان بە تەلەفۆن ڕابگەینم بەلام بە چەند هۆیەکەوە و لـە هـەموان گرینگتر پێویستی موتالای لاپەڕەکانی زۆرتر لـە کتێبەکـە مـنی هێنایـە سـەر ئـەو باوەڕە کە نەختێک دێرتر نامە بنێرمە خزمەتتان.

ئێستا کە زۆرتر لە نیوەیەک لەوەم موتالا کردووە، دەتوانم تا ئاستێکی باشـتر لـە

سەری بیر و بۆ چوونی خۆم دەربڕم. گەرچی هیچ شی کردنەوە و شرۆڤەیەک ناتوانێت ئەو هەموو تێکۆشان و تاوتوێ کردنی دەقیق و شارەزایی و مامۆستایی قەڵەمی تیژی نووسینی ئێوە لە دانانی کتێبەکە باس بکات، بەڵام بە کورتی دەتوانێ بوترێ: ئەوەی کە مرۆڤانی مەزن هەیانە تۆ بە تەنەیایی هەتە، تێکەڵاوێک لە شێعری حەماسی، دیمەنگەلێک لە پیاوان و ژنانی مەزنی کورد، مەتەڵۆکی باو کە بە یادگار لە سەردەمەکانی لەمەوپێش، گۆرانیەکان و ئاوازەکانی دڵگیر بە نیشانەگەلێک بەرچاو لە بارودۆخی سەردەم، داوەری نووسەرەکانی سەردەمانی جۆربەجۆر سەبارەت بە نەتەوەی ڕەسەنی کورد، گەورەزانایان و بلیمەتانی کورد، زانیاری گەیاندن بە خەڵکێک کە هەمیشە بە هیوای وەدەست خستنی پێناسەی خۆیانن بە چەندین هۆکارەوە دەرفەتی دەست پێ ڕاگەیشتنیان بەوە نەبووە و هەروەها زانیاری لەمەڕ پەرتەوازەیی خێڵە جۆربەجۆرەکانی کورد و مێژوو و جوغرافیای ئەوان و سەدان بواری تر تەنیا لە کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بەرچاو دەکەوێت و ئەم هۆکارانە بەسە تا هەر خوێنەرێک بە تایبەت ئەگەر کورد بێت دێڕ بە دێڕی ئەو بە ئەو پەڕی ئەوینداریەوە موتالا بکات و تام و چێژی لێوەربگرێت. ئەمن بەش بە حاڵی خۆم لە ئێوە و هەوڵەکانی ئێوە دەستخۆشی دەکەم و هیوادارم کە ساڵانی ساڵ زیندوو بمێنن تا بە درێژەدانی ئەم بەرپرسیاریەتیە فەرهەنگی نەتەوەی کورمانج بۆ هەمیشە بە کتێبە پڕ بایەخەکانی خۆتان بەهرەمەند بکەن. (دۆستی هەمیشەییتان ڕاستخەدیو. تاران ٦٧/٩/١٨)

٣٣- سنە: برای زانامان بەڕێز ئەحمەد شەریفی سەرەڕای دەربڕینی ڕێز و خۆشەویستی زانیاریەکیان لەمەڕ گۆڤاری کوێستان بە ئێمە داوە کە لە ساڵەکانی ٢٥- ١٣٢٤ لە تاران لەلایەن بەڕێز دوکتۆر ئیسماعیل ئەردەڵان بڵاو دەکرایەوە. و بە زمانەکانی کوردی و فارسی بووە.

بە داخەوە منیش وەکوو بەڕێزیان هێشتا نەمتوانیوە ژمارەیەکی بە دەست بخەم. هیوادارم ئەو هاوڕێیانەی کە ئەم گوڤارەیان لە بایگانی خۆیان هەیە ئێمەش لە نیعمەتی خوێندنەوەی بەهرەمەند بکەن.

**۳٤- هەمەدان:** هاوڕێ زانا و پسپۆڕمان و نووسەری لێکۆڵەر بەڕێز پەرویز ئەزکایی کە خەریکی نووسینی مێژووی کەونارای گەلانی ئێرانن و لەوانە سەبارەت بە کوردەکانی چیاکان لێکۆڵینەوەگەلێکی بەرفراوانیان هەیە سەبارەت بە من ڕێزی خۆیانیان دەبڕیبوو و لەوەی کە بەرگی یەکەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد نەگەیشتووەتە دەستیان گلەیی و گازندەیان کردبوو کە منیش لە بەرانبەریاندا خۆم بە شەرمەسار دەزانم. چونکە ژمارەی زیادیم لەبەر دەستدا نەبوو کە پێشکەشیان بکەم. هیوادارم چاپی دووهەمی بەرگی یەکەم گەیشتبێتە دەستیان.

**۳٥- ئیلام- مێهران:** برای خوێندکاری زانکۆ و خۆشەویستمان بەڕێز عەلی ئەسغەر فەریبا کەهرنیپا لە نامەیەکی جوان و پڕ لە هەستی خۆیان کە بە کوردی نووسیبوویان ئا بەو شێوەیە دلۆڤانی خۆیانیان هێناوەتە زمان: بە ناوی خوای گەورە. کەلیم‌گیان! دەمهەوێ بڵێم کە تۆ تەنیا یار و دۆستی ئێمە خەڵکی کوردی. تۆ بۆ کوردان جێگای شانازی و دەسکەوتێکی گرینگی سەربەرز و سەرکەوتوو بیت.

کەلیم‌گیان! بەرگی سێهەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانم موتالا کرد و خوای مەزن بە شایەت دەگرم کە ئەمە یەکەمجارە کە ئەوەندە خۆشحاڵیم بە خۆمەوە نەدیوە. نازانن چۆن و بە چ ئەوینێکی بێوێنە خوێندمەوە. ئێمە کوردەکانی ئیلام زۆر شانازی بەوە دەکەین کە ئێوە برایانی خۆشەویستی کورمانج لە ڕەگەز و ڕەچەڵەکی ئێمەن. خەڵکی ڕۆژئاوای وڵات خەبات و تێکۆشانی مێرخاسانی ئێوە کوردانی خوراسانیان لە بەرەکانی شەڕی سەپێنراوی عێراق لە دژی ئێران لە نزیکەوە دیوە و بە خولقاندنی قارمانیەتی لەلایەن ئەوانەوە شانازی دەکەن. من لەلایەن منداڵانی پارێزگای قارەمان پەروەری ئیلام هاتووم کە بە تەنیا گەیشتوومەتە خزمەت ئێوە تا پیرۆزباییتان پێ بڵێم. بە بۆنەی تێکۆشان و هەوڵی لە ڕادە بەدەرتان بۆ چاپی ئەم کتێبە زۆر جوان و بە نرخە، کتێبێک کە سەمبۆلی قارمانیەتیە. سەمبۆلی ئازایەتی و مێرخاسی و دلۆڤانی و لە خۆ بوردوویی و یەکیەتی و پێکەوە بوونی هەمیشەیی کورد و کورمانج.

سەرکەوتنی هەرچی زۆرتری ئێوە و خەڵکی بە شەرەفی کورمانج لە خوای

ەزن داواکارم. بە سپاسی زۆرەوە لەلایەن خوێندکارانی پارێزگای ئیلام عەلی
ەسغەر فەریبا کەهرنیپ. (٣٠ سەرماوەزی ١٣٦٧)

نامەی ناوبراو لە لایەن برای زۆر هێژا و لێهاتووم عەلی ئەسغەری

بەڕێز کە لەگەڵ خۆیان هێنابوویانە باخی شای نادرشا لە مەشهەد و لەوێ بە
نیان دا و بە هەمان ڕاستبێژی و ڕەسەنایەتی خۆیان فەرموویان کە من هاتووم لە
یەن خوێندکارانی پارێزگای ئیلام دەستی ماندووی ئێوە ماچ بکەم و ئەو جارە لە
ەڕێزتان داوا بکەم ئیزن بە من بدەن دوای ئەوەی کە زەماوەندم کرد و خوای مەزن
ەکەم کوڕی بە من دا ناوی بنێم (کەلیم).

من مات و حەیران لە بەرانبەر هەستی پاک و بێخەوشی ئەم خوێندکارە
ۆشەویستە کوردە کە هاونیشتمان و هاوڕەگەزم بوو بە دوای کۆتایی هاتنی
سەکانی ئەملاو ئەولایم ڕاموسی کە بە نوێنەرایەتی من دەست و چاوی هەموو
ندالانی چالاک و زەحمەتکێشی ئیلام ماچ بکات. ئەو جار وتم: منیش لە ئێوە
اواکارم و داواکاریەکەشم ئەوەیە ناوی یەکەم کوڕی خۆتان (جەجوو) و
ووهەمینیان (سەردار عەوەز) و سێهەمیان بنێن (کەلیم)...

بەڵێ ئەی هاونیشتمان! من ئەگەر شەو و ڕۆژ و تا کاتی مەرگ بنووسم و کار
کەم ناتوانم وڵامدەری زەڕڕەیەک لە خۆشەویستیەکانی ئەو بەڕێزانە بم. خوای
ەزن خەڵکی ئەم وڵاتە لە هەموو کارەسات و ڕووداوێک بپارێزێت و بەختەوەری
وو جیهان پێشکەشیان بکات. ئینشائەڵلا.

**٣٦- قوم ١٩٨٨/٩/١٤**: نامەی ڕازاوە و پڕ لە هەست و پڕ لە ئەزموونێکە لەلایەن
ای زانا و پسپۆڕمان و شاعێری ئاوارەی کورد لە شاری مەزهەبی قوم. ئەو
بێکەسی کوردیە» کە زۆربەی زانایان بە تایبەت خەڵکی کورد لەگەڵ شێعرەکانی
ۆربەجۆریان لە ڕۆژنامەی جەهادی کوردی و کتێبەکان و وتارەکانی جۆربەجۆریان
شنان. ئەو کوردێکە ئاوارە و چەوساوە لە ستەمی ڕۆژگار.

دەرکراو لە کوردستانی عێراق وەکوو سەدان و هەزاران بنەماڵەی تری کورد کە
دەست ستەم و چەوساندن و زەختی حیزبی دژە مرۆڤی بەعس و خوێنمژانێک

وەکوو ئەلبەکر و سەددام دەربەدەر و ئاوارە بووە. بەڵام لە هەوڵ و تێکۆشان و خەبات دژی خوێنمژانی دەسەڵاتداری عێراق وەکوو هاوڕەگەزانی تری ساتێک ئارام و قەراری نەبووە.

بەڵێ، بێکەسی کورد لە نامەیەکدا بە منی نووسیبوو کە نیشتمانی جوان و پڕ پیت و بەرەکەتی عێراق کە لە ڕاستیدا گوڵستانێکی پڕ ڕەنگ و ڕازاوە بووە ئێستا بووەتە گۆڕستانی کوتە ئاسنەکانی تانک و تۆپ و فڕوکە و گۆڕەپانی مین و بومبی کیمیاوی. هەموو شوێنێک تێکدراوە و خاپوور کراوە و شارەکان و گوندەکان وەکوو هیرۆشیما بە فەرمانی سەددام بوردومان کراوە و لە نێو چووە و ئەمە بەڵگەی جەنایەتی دڕندانەی دژی مرۆڤایەتی کەسانی وەکوو سەددام و پشتیوانەکانیە.

بێکەس ئەمەی زیاد کردووە کە: «بەڵێ برای من، بهێڵە ئاشکرا بڵێم کە ئەگەر بەند بەندی ئێسقانەکانم جیا کەنەوە، ئەگەر سەرمان بڕواتە سەر سێدارە، ئەگەر لە نێو بڵێسەی ئاگردا بمانسووتێنن. ئەگەر ژن و منداڵەکانمان و هەموو شتێکمان لەبەر چاوانمام بە دیلی ببەن و تالانی بکەن، و ئەگەر لە بەندیخانەکان و چاڵە ڕەشەکانی دەسەڵاتدارانی عێراق لە ژێر قەمچی و ئاسنی داخ ورد و خاپوورمان بکەن، قەت قەت لە مافی ڕەوا و خەباتی نەتەوەیی خۆمان دەست هەڵناگرین و ئەماننامە لەگەڵ بەعسی بێویژدان و سەددامی کافر واژۆ ناکەین، بەڵکوو خەباتمان درێژەی دەبێت تا دیمەنی سەرکەوتن لە باوەش بگرین و بە سەربەرزی و سەرکەوتوویی بۆ کوردستانی خۆشەویست لەوپەڕی سنووری ئێران بگەڕێینەوە و ئەو وێرانەیە جارێکی تر بکەینەوە گوڵستان... بەڵێ، برای بەرێز، بە دوای کۆمەڵکوژیەکانی شاری هەڵەبجە، دەیان کۆمەڵکوژی تر بە سەر ئێمە داهاتووە کە ئەمانە، نە یەکەمین جارە و نە دوایین جار.

لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٨ جارێکی تر دەستی چەپەڵی سەددام جەنایەتێکی تری خولقاند و سێ هەزار کەسی تر لە کوردانی هاوڕەگەزی ئێمە لە شاری عێمادیە و دەوروبەری بە بۆمبی کیمیاوی بە خاک و خوێن کێشران و هەزاران بریندار و کەم ئەندامی لێکەوتەوە. هەروەها لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٣٠ لەیەکێک لە بیابانەکانی مووسڵ

بە ناوی «ئەلحەززە» یازدە هەزار کەسی کوردی بێتاوان و بێپەنا بە یەکجار درانە بەر دەستپرێژی گوللە. هەروەها لە یەکێک لە ئوردووگاکانی سەددام کە بە شێوەی ئاڵمانی نازی بوو لە باشووری عێراق بە ناوی «ئەلبەسییە» ٥٠٠ کەس لە خەباتکارانی کوردی لە بەر چاوی خەڵک لە سێدارە دران. ئێستاش نزیکەی ٢ میلیۆن کەس لە ئوردووگاکانی هیتلێری عێراق لەگەڵ مەرگدا دەستەویەخەن.

هەروەها کە دەزانن ٨٠ هەزار کورد لەو ١٥٠ هەزار ژن و پیاو و منداڵەی کە مەجبوور کران بچنە تورکیا و بینە پەنابەر لە سنووری نێوان دوو وڵاتی عێراق و تورکیە لە سەرمای ١٥ دەرەجە ژێر سفر بە درێژایی شەوان بە بێجلوبەرگ و خۆراک چاوەڕێ مەرگن. بەڵام ئێمە نە لەم شتانە دەترسین و نە ترسێکمان هەیە. ئێمە درێژە دەدەینە ڕێگای خۆمان و ئەم دروشمە پیرۆزە دووپات دەکەینەوە.

یان کوردستان یان نەمان.»

برای کوردمان بێکەس پارچە هۆنراوەیەکی جوانی بۆ منداڵانی کورد بە ناوی «وەسیەت بۆ منداڵانی کورد» نووسیوە و ناردوویانە کە ئینشائەڵلا لە کتێبی شاعێران چاپی دەکەین.

**٣٧- گورگان ٦٧/١٠/٢٧:** لەلایەن برای بەڕێز و کرێکاری زەحمەتکەش بەڕێز بەرات سەعادەتزادەی زیندنلوو کە لە دەرگەزەوە بۆ کار و تێکۆشان بۆ گورگان ڕۆیشتووە و بە هێزی باسک و بە ئارەق ڕشتن ژیانێکی بە شەرەف دەگوزەرێنن، نامەیەکی جوان و پڕ ناوەڕۆک بە کورمانجی گەیشتووە کە لە موتاڵای سێهەمین بەرگی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد هەستی خۆیان دەربڕیوە و پارچە شێعرێکی دلڕفێنیان بە شێوەی ژێر کردووەتە تام و چێژی نامەکەی خۆی:

کورمانجم دی خۆشحاڵ، منیش خۆشحاڵ بووم و پێکەنیم
لە شەوقی شادمانی، باڵم دەرهێنا و بۆ ئەملا و ئەولا فڕیمتا
چاوی من کەوتە مێژوویی کورمانج
تاقەتم نەما و حەیران بووم، چاوم لەملا و لەولا کرد
ئەی خەڵکینە، مێژووی کورمانج دڵی ئێمەی ڕوون کردەوە

حاڵی ئێمە باش بووەوە وەکوو نەخۆشێک کە چاک بووە
ئازایان ومێرخاسان جارێکی ترهەستاون و گیانێکی تازەیان وبەرهات
ئێسقانەکانیان جارێکی تر لە گۆڕدا زیندوو بوونەوە[٢٢٥]
ئەگەر ئێمە لە بیر چوو بووینەوە جارێکی تر هاتینەوە یادەکان
سپاست دەکەم ئەی خوای مەزن و بەخشەندە
«بەرات» دەڵێت قەڵەم تۆ مێژووت نووسیوە
تۆکوردی
کورمانجت سەربەرز کرد، خوایا رەحمەتیت بدات ئەی «کەلیم»

٣٨- باختەران (کرماشان): نامەی زۆر دڵ بزوێن و پڕ لە هەستی برای خۆشەویستمان بەڕێز شێخ عەلی ئەکبەر باچوانلوو کە لە فەقیکانی زانای گوندی سەنگلی قووچانن و هەموو ساڵەکانی شەڕیماڵوێرانکەری داسەپاوی عێراق لە ژێر ناوی بەسیجیەکی موئمێن و موخلیس لە بەرەکانی گشتی ڕۆژئاوای وڵات بەشداری کردووە.

بەڕێز شێخ عەلی ئەکبەر خزمەتێکی شایانی تریان کردووە و ئەویش ئەوەیە کە دوو بەڵگەی قەدیمی لە عەشیرەتی ئوستاجلویان بۆم هێنا کە تا ئەو کاتە نەمزانیبوو ئوستاجلوەکان لە کام شوێنی خوراسان نیشتەجێ کراون. ئوستاجلوکان لە سەردەمی شاعەباس لە بەرانبەری ئوزبەکەکان بە توندی بەرگریان کرد و تا دوایین هەناسە خۆڕاگرییان کرد کە لە بەرگی یەکەم لاپەڕەی ٤٣ لە ناساندنی ئوممەت خان ئوستاجلوو باسی کرا. لەو ڕۆژگارە بە دواوە ئیتر هیچ هەواڵێک لەوان بە دەست نەهاتووە. ئەم برا زانایە، سەرەڕای ناردنی بەڵگەکان لەمەڕ ئوستاجلووکان کە لە بەرگی پێنجەم چاپ دەبێت نووسیویانە «ئاغای تەوەحودی من عەلی ئەکبەر چووپانی (ڕزوانی) بەش بە حاڵی خۆم لە ئاسەوارە بە نرخەی ئێوە (بەرگی سێهەم) کە لە ڕاستیدا بۆ کوردەکانی خوراسان ناسنامەیەکە، سپاس دەکەم. متمانەم هەیە

---

[225]- ئاماژە بە ئایەی ٧٦ سوورەنی یاسین.

که خەڵکی کورد هیچ کات زەحمەتەکانی شەو و ڕۆژی ئێوە بۆ چاپی ئەم ئاسەوارە بە نرخە لە بیر ناکەن... هیوادارم خوای مەزن تەمەن درێژی بە ئێوە پێشکەش بکات تا ئەوەیکە لە زیندوو کردنەوەی مێژوو و فەرهەنگی زمانی کورمانج دەست بکەن بە تێکۆشان و لێکۆڵینەوە و چالاکی زۆرتر. چونکە ترسام مەرگ مەودا نەدات ئەم هەلەم بە باش زانی و لە جبهەوە نامەیەکی ڕێز لێنان پێشکەشتان دەکەم. و لە کاتی دوعا و نوێژ، ساغی و سەلامەتی ئێوە لە خوای گەورە داوا دەکەم کە ئێوە بۆ ئێمەی کورد زیندوو ڕابگرێت. (ئاواتەخوازی دیدارتان عەلی ئەکبەر چووپانی (باچیانلوو).)

منیش لە جێگای خۆم لە خوا داواکارم ئەم برامانە و هەموو سەربازانی تێکۆشەرمان ساغ و تەندروست و سەرکەوتوو بن و دوژمن سەرکوت بکەن. بەڕێز چووپانی پارچە هۆنراوەیەکی جوانیان بە کوردی بە ڕێ کردووە کە بە هۆی زۆر بوونی نووسراوەکە لە جێگایەکیتردا چاپی دەکەین.

**٣٩- قووچان ٦٧/٩/١٤**: هاوڕێ و مامۆستا و ڕێ پیشاندەری باشم بەڕێز ئاغای حوسەین حاجیزادە ئووغازی و برایان چیپر حاجیزادە پێکەوە نامەیەکی پڕ لە دڵسۆزیان نووسیبوو و فەرمووبوویان:

لە لاپەڕەی ١٥٧ی بەرگی سێهەم لەمەڕ قەباڵەی کوێستان وشەی «کەلەم» هاتووە کە «شاهگولدی» لە تایفەی ئولکانلووەکان بوون، لە حاڵێکدا کە «شاهگولدی» عەشیرەتی ئێمەیە. هیوادارم لە بەرگی داهاتوو لێکۆڵینەوەیەکی زۆرتر بکرێ و بەم هەڵە چاپیە ئاماژە بکرێت.

سەرۆکی بەڕێزم ئاغای حاجیزادە: شاهگولدیەکان لە بنەڕەتدا هەمان عەشیرەتی ئولکانلوون کە بەو جۆرەی کە باس کرا لە کاتی هاتنی شاتەهماسب سەفەوی (کوڕی شاسولتان حوسەین) بۆ چیای (ئارمووتەلی) ئەوان بەم ناوە ناوبانگیان دەکرد، بەلام عەشیرەتی ئێوە کە ئێستا هەشت پشتە لە ئووغاز نیشتەجێن و لە بەرگی دووهەم لاپەڕەی ١٥٥ هاتووە بە «مندالانی حوسەین ئووغان» دەناسرێن کە ئووغان بوونی ئەوان هەڵەیەک بەڵکوو خورافیە چونکە

تایبەتمەندیەکانی زمانی و جەستەیی عەشیرەتی ئێوە هیچ پەیوەندیەکی لە بواری ڕۆخسارناسی لەگەڵ ئەفغانەکان نیە.

هەرچەند کە ئەفغانەکانیش لقێکن لە نەتەوەی کەونارای ئێرانی مەزن. بەڵام بۆچی لەم دواییانە عەشیرەتی ئێوە بە شاگولدیەکان ناسێنرا و بەڵگەیەک لەبەر دەستدا نیە، بەڵام بەو لێکۆڵینەوە زۆرانەی کە بەدیهات دەرکەوت کە ئەو برە پارەیە کە لە لاپەڕەی ١٥٧ی بەرگی سێهەم ئاماژەتان پێ کرد پەیوەندی بە شاهگوڵدیەکانی ئێوەوە هەیە، نە شاهگوڵدیەکانی ئولکانلوو.

٤٠- **ئاشخانە (بجنوورد)** ٦٧/١٠/٣: برامان ڕۆستەم عەلی شەعبانی قەهرەمانلوو نووسیویانە کە هەر سێ بەرگی کتێبی ئێوەم خوێندەوە و سپاسی زەحمەتەکانی ئێوە دەکەم کە خەڵکی کوردی خوراسانتان شاد کرد. ئێمە لە عەشیرەتی گەورەی قەهرەمانلووین و گەورە پیاوانی ئێمە حاج ڕەزاقولی و حاج جەعفەرقولی شەعبانی قەهرەمانلوون. و ئێمە لە بنەڕەتدا لە گوندی دوین شیروان هاتووین بۆ ئاشخانە. ئامۆزای من مەهدی شەعبانی لە ڕێکەوتی ٦١/٣/٢٠ لە عەمەلیاتی بەیتولموقەددەس لە خوڕڕمشەهر شەهید کرا و برام سوهراب شەعبانی لە ڕێکەوتی ٦٧/٦/١ لە نەورۆزدا بە دوای ئاگربەست بە دەستی عێراق بە دیل گیرا. هەروەها کوڕی حاج ئێبراهیم شەعبانی قەهرهەمانلوو لە عەمەلیاتی موسلیم ئێبنی عەقیل بێسەر و شوێن کراوە.

خۆمیش بە ناوی سەربازی ئەرتەشی ئێران ٢٦ مانگ لە بەرەکانی شەڕ بەشداریم کردووە و تا ڕادەیەک ئازایەتیم لە خۆمەوە نیشاندا و بەعسیەکانم سەرکوت کرد کە لەلایەن ئەرتەشەوە بڕوانامەی ئازایەتیم وەرگرت... ئێمە قەهرەمانلووی ئاشخانە بە دڵ ئاوەڵاییەوە چاوەڕێی ئێوەین کە بێن بۆ ئاشخانە و ئێمە سەربەرز بکەن. وێنەی لاپەڕە ٤٥٧ی بەرگی سێهەم کە لە کوردەکانی قەهرەمانلوو هەڵتانگرتووە و دوو ژن و سێ پیاو لە تەنیشت یەکەوە نیشان ئەدات (لە بەینەی حوسەین خاکشوور ناسراو بە حوسەین قەمی) نەفەری لای ڕاست کچە ئامۆزای خۆمە کە چەند ساڵ نەیانم دیبوو، بە بینینی وێنەی ئەو خۆشحاڵ بووم و

جارێکی تر سپاستان دەکەم.

٤١- تاران ٦٧/١٠/١٥- لە تارانەوە بەڕێز سەید عەبدولکەریم هاشمی مەرغزاری قووچانی کە هاوشاری زانا و پسپۆڕی خۆمە و زانـایی و لێهـاتوویی لـە باوکیـەوە بـە میرات بردووە، نامەیەکی تێر و تەسەل بە خەتێکی خۆش بۆ من ناردووە کە بە هـیچ شێوەیەک ناتوانم کورتی بکەمـەوە، بـەڕێزیان فەرموویانـە: نـازانم بـە چ شـێوەیەک هەستی دەروونی خۆم دەرببڕم. ئەوەی کە ئاشکرایە ئەوەیە کە هـەوڵ و تێکۆشـانی ئێوە هەر کوردێک وەها دوچـاری شـانازی کـردن دەکـات کـە ناتوانێـت هەسـت و شەوقی خۆی ڕابگرێ، و لەم پەیوەندیەدا هەر ئەم هەسـتی شـانازی کردنـە هـانی منی دا کە هەرچەندە خاوەنی قەڵەم و زانایی و بیرمەندی نیم بەڵام تا ڕادەیەک کـە بتوانم هەستی تێکەڵاو لەگەڵ سەربەرزیم بە خامەی دەسـتم بێنمـە سـەر کاغـەز و پێشکەشتانی دەکەم.

لەم دواییانە کە سەفەرێکم کرد بۆ قووچان و مەشهەد، یەکێک لە هاوڕێیانم ئـەو چاکەیەی دەرحـەق مـن کـرد و بـەرگی دووهـەم و سـێهەمی کتـێبی بـە نـرخ و لێکۆڵەرانەی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانی گەیاندە دەستم. هەر ئەو شەوە لـە ماڵی خۆشکم زۆربەی لاپەڕەکانیم چاو لێ کرد و خوێندمەوە و بە شـەوقێکی زۆرەوە دیم کە ئێوە بەم هەموو زەحمەت و قەبووڵکردنی ئەو هەموو ئاستەنگ و دژواریـەکی سەفەر کردن و زۆرێک کەم و کـوڕی مـادی و مەعنـەوی تـر وەهـا زەحمـەتێکیان قەبووڵ کردووە و وەها مێهرەبانیەکتان نەک تەنیا دەرحەق بە کوردەکانی خوراسـان بەڵکوو دەرحەق بە هەموو ئێران ئـەنجامداوە و ئـەوانتان بـە خۆیـان ناسـاندووە، زور شانازیم پێوە کرد، بە شەوقێکی زۆرەوە دوو بەرگی ناوبرام موتاڵا کرد. ئەوەم دی کـە ئێوە ئەوەی کە هەر کوردێک لە دڵیدایە ئاشکراتان کردووە. ئێـوە ئـەو هێـزەی کـە بتوانێت دەماری بەستوو باز بکات و خوێنی کورد بوون لـە ناویـدا وەگـەڕ بخـات بـە لێکۆڵینەوەکانی خۆتان وەگەڕتان خستووە. نامهەوێ قەڵەم لـە ڕێگایـەکی نابـەجێ بوورێنم و ناتوانم ڕاستیەکان لەبەر چاو نەگرم. چونکـە ئـەوەی لەمـەڕ هەوڵـەکانتان بنووسرێت و بگووترێت هەر کەمە و بۆ منیش جێگەی شانازیە کە یەکێک لەو چەنـد

میلیۆن کوردەم کە لە ناو لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوە بە نرخەکانتان خۆم دەبینم و لە فیداکاری و گیانبازییەکان و لە خۆ بوردووییەکانی قارامانەکانتان بەشدارم. ئەو کاتەی کە منداڵێکی کەم تەمەن بووم دایکم چیرۆک گەلێکی لە کوردەکانی هاوڕەگەز و جێگەی ژیانیان و عەشیرەتە جۆربەجۆرەکان بە تایبەت چیرۆکی (توحفەگوڵ)[226] و تورکان خاتوون، عەوەزخان، ئاراز موحەممەد و جەجووخان بۆم دەگێڕایەوە[227] و لە هەمان سەرەتاکانی منداڵیەوە لەگەڵ ئەم ناوانە ئاشنا بووم، بەڵام تێپەڕ بوونی ڕۆژگاری و... ئەو خوێنە کوردیەی لە دەمارەکاندا بەست و ئەو ئازادی و ورەبەرزی و هەوڵدانەی ڕەنگە لە مندا نەکەسانیتر گەیاندە کەمترین ئاستی خۆی. بەڵام گەوهەرە بە نرخەکانتان بە تیشک هاویشتنی لە ڕادەبەدەری خۆیان سەرەڕای ئەوەی زۆر جار فرمێسکی شادی لە چاومدا هێنایە خوارەوە خوێنی بەستووی نێو دەمارەکانمی لە ناخمدا وەگەڕ خست.

هیوادارم لەو ڕێگایە کە هەنگاوتان هەڵگرتووە تا ئەو ڕادەیە لێ بڕاوانە و سەرکەوتوانە بڕۆنە پێشەوە کە کوردەکانی سەرانسەری جیهان لە ئاوێنەی باڵانوێنی جیهانی کتێبەکەتان خۆیان ببیننەوە و بناسنەوە. لە کۆتایی بە هەر شێوەیەک کە بە باشی دەزانن لە قووچان بە ڕێگای تەلەفۆنی ٢٨٥٢ لەگەڵ باوکم ئاغەی حاج سەید حوسەین هاشمی مەرغزاری کە دڵیان لێوانلێوی هەست و خۆشەویستی نەتەوەی کوردە پەیوەندی بگرن تا بەڵکوو هێندێک لە هەواڵ و بیرەوەریەکان لە بەرگەکانی داهاتوودا کاریگەر بێت.سەبەرز و سەرکەوتوو بن، دەستان بە گەرمی دەگوشم. (عەبدولکەریم هاشمی مەرغزاری ١٥ی بەفرانباری ٦٧.)

ئەمنیش لە سەرنجدان و ورد بوونەوەی زۆری بەڕێز ئاغەی هاشمی ڕێز دەنێم و

---

[226]- لە بەرگی سێهەم لاپەڕەی ٢٤٢ی چیرۆکی هاتنی توحفە گوڵم بۆ ناو چیمەنزار نووسیبوو کە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ ئەو بەشە. چیمەنزاری خاخیانلوو زێدی باوکی بەڕێز هاشمیە.

[227]- ئێستا لە جیاتی ئەو چیرۆکانە و ئەفسانەکانی قارەمانی ئێمە ئێرانیەکان داستانگەلی جۆربەجۆری ناڕەسەنی نامۆ شەو و ڕۆژ بۆ منداڵانی ئێمە لە ڕادیۆ تەلەویزیۆنەوە بڵاو دەکرێتەوە کە دەبێتە هۆی سڕینەوەی فەرهەنگی ڕەسەنی ئێمە.

سپاسیان دەکەم و ئەوەش زیاد دەکەم من لە ڕابردوودا لە قووچان تا ئەو ڕادەیە کە بەختەوەری ئەوەم ببوایە هەمیشە لە پێشگای بە نرخ و جێ بایەخی ئاسەواری باوکی زانا و شاعێر و بیرمەندیان کەڵکم وەردەگرت و قسەی بەڕێزیان وەکوو بڵێسەی ئاگر دەروونمی دائەگیرساند. قەت لە بیرم ناچێتەوە کە ڕۆژێک لە خزمەتیان بووم و گوێم دەدایە قسەکانیان و هەروەها خوالێخۆشبوان وەکیل ئوغازی و حەبیبوڵلاخان ناسر لەشکەر هیوەدانلوو دانیشتبووم و بە وردی گوێم دەگرت... بەڵێ برای بەڕێز ئەو وتە پڕ ناوەڕۆک و شیرینانە بوو کە منی هێنا سەر ئەو باوەڕە کە خامە شکاوەکەم هەڵگرم و لە سەر لاپەڕەکانی کاغەز بخشێنم، هەرچەند کە لێهاتوویی پێویستم بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە نەبوو و ناشبێتم. بەڵام من لە هەژاری خۆم نەترسام، چونکە دەمدی ئەوانەی کە سەرمایە و توانایی زانستی زۆریان هەیە بە چاوی سووکەوە سەیری ئەم شتانە دەکەن.

نامەی جوان و ڕازاوەی برامان هاشمی منی هێنایە سەر ئەو بڕوایە هەرچی زووتر لە مەشهەدەوە بەرەو قووچان بکەومە ڕێ و بە ئیزن گرتن لە باوکی زانا و بلیمەتیان، بەختەوەری دیداری ئەو بەڕێزە کە لەم کاتەدا خانەنشین کرابوون ببێتە نەسیبم، ئەو بەڕێزە منیان بە باوەشی ئاوەڵا و خۆشەویستی تەواو قەبووڵ کرد و قسە هاتە سەر ئەوەی مێژوو و فەرهەنگ و فولکلۆری نیشتمان و خەڵکی قووچان و ئازایەتیەکان و میوانداری دۆستی ئەوان و...

زۆر تەوەر بوو کە نووسیانم تا هەر کام لە جێگای خۆی چاپ بکرێت ئێستاش پارچە هۆنراوەیەکی جوان کە نیشاندەری هەستی پاکی جەنابیانە و لە ساڵی ۱۳۴۲ کە شەڕی ساردی ڕادیۆی و پڕوپاگەندەیی نێوان ئێران و سۆڤیەت لە ئارادا بوو، و ڕووسەکان لە ڕادیۆکانیان قسەی ناشایستیان دەدایە پاڵ نەتەوەی ڕەسەنی ئێران، چونکە سەربەرزی کوردی و هەستی بەڕێزیان بیستن و وەڵامنەدانی ئەم قسە هیچ و پووچانەی بە باش نەدەزانی. قەسیدەیێکی جوانیان هۆنیوەتەوە و خستیانە سەر زمانەکان کەوا دێتە پێش چاو کە پارچە شێعرێک کە لە ساڵی ۱۳۴۲ لە وەڵامی درۆزنانی ڕادیۆمسکۆ (کە دەیگووت بەشی هەرە زۆری نەتەوەی ئێران لە برسان بە

خواردنی ڕیشەی گیاکان دەژین) لە زمانی عەشیرەتی زەعفەرانلوو ترابێت.

**٤٢- مەهاباد- ٦٧/٩/٢٥**- نامەیەکە لەلایەن برای زانا و ڕووناکبیر و وەرگێڕمان و نووسەری پایەبەرز، بەڕێز **سەید موحەممەد سەمەدی** کە تا ئێستا ئاسەواری جۆربەجۆر لەلایەن بەڕێزیان چاپ کراوە و هەر وەک ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردی و فارسی فەرموویانە: «شک لەوەدا نیە کە بەشێک لە مێژووی هەر نەتەوەیەک بە دەست پیاوان و ژنانی بە ناوبانگ بە هەڵدانی ئالای زانست و فەرهەنگ پێک دێت، بەڵام بە داخەوە لەم بارەوە بە ڕادەی پێویست نووسەری توانامان نەبووە و لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ نەتەوەکانی تر دەبێ دان بەودا بنێین کە لاوازی سیاسی و فەرهەنگیمان بووە و هەر لەم ڕووەوە زیانی زۆرمان لێکەوتووە. چۆنکە زۆربەی ڕاستیەکان نەنووسراون و یان لەو پەڕی ناپیاوی و خەیانەتدا بە بێڕەحمی بە دەست بە کرێگیراوانی زەمانەوە چەواشە کراون و یان زۆر بەڵگەنامەی گرینگ کە بە هۆی سەرنجنەدان لە گۆشەی ماڵەکان یان دڕاوەیان سووتێنراوە یان بە شێوەیەک ڕۆخساریان تێکچووە کە ئیتر شیاوی بەهرە هەڵگرتن نین. هەر لەم ڕووەوەیە کە بایەخی کاری ئێوە زۆرتر لە هەر شتێک بەرچاوە و ئێوە توانیووتانە بە هەوڵ و تێکۆشانی زۆر هێندێک لەم بەڵگانە کۆکەنەوە و لە نەمان ڕزگاریان بکەن.

بە بێ هیچ جۆرە تەعارف و پێدا هەڵگوتنێک دەڵێم: کارەکەتان وەکوو زیندوو کردنەوەی مودوویەک وایە. چونکە بنەمای ژیانی نەتەوەیەکتان زیندوو کردووەتەوە و بەردی بناغەکەتان داناوە، ئێستاش وێڕای سپاس لە هەوڵدانی بێهاوتای ئێوە نامەکەم بە پاڕانەوەیەک لە شاعیری توانای کوردی هاوچەرخ بەڕێز مەلاکەریم هونەرمەند (فەدایی) کە لە کۆتایی چیرۆکی لاس و خەزاڵ هونیوویانەتەوە کۆتایی پێدێنم و ئێوە بە خوا دەسپێرم کە سەرکەوتووتان بکات. دەبێ وەبیر بێنمەوە کە بەڕێز فەدایی کە لە نێو کوردەکانی ڕۆژئاوای وڵات بە فێردەوسی سەردەم ناوبانگیان دەرکردووە هۆنراوە زۆریان لە بەستێنەکانی جۆربەجۆر هۆنیوەتەوە کە هۆنراوەکان و بەسەرهاتێک لە بەڕێزیان لە کتێبی «گوڵستان کوردستان» لە بەشی شاعیرانی

کورد چاپ دەبێت. ناوبراو لە ساڵی ١٣٧٠ی کۆچی لە گوندی سی‌سەر لە دەوروبەری سەردەشت لە دایک بووە. شانازی ئاشنایی لەگەڵ بەڕێزیان لە کۆنفرانسی فەرهەنگی کورد لە مەهاباد لە ڕەزبەری ١٣٦٥ بووە نەسیبی من.

٤٣- **بیجنوورد**- ٦٧/١٠/١٨- لە دامەزراوەی پەروەردەی مامۆستایان بەڕێز ڕەسوول موحەممەدیان وێڕای دەربڕینی هەستی خۆیان ویستبوویان کە چۆن دەتوانرێ دەورەی کامڵی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان دەست دەخرێت.

لە وڵامی ئەم برامانەوە دەڵێم کە بە هۆی نەبوونی یارمەتی و دەرفەتی ماڵی بە داخەوە نەمتوانی هەموو بەرگەکانی ئەم کتێبە بە جارێک چاپ بکەم و بڵاوی بکەمەوە بۆیە هەر کاتێک دەرفەت و ئیمکانی ساڵی دابین بکرێت بەرگەکانی تریش بە پێ ڕێزبەندی مێژوویی لە چاپ دەدرێن.

٤٤- **تاران**- بونیادی فەرهەنگی نەیشابوور- مامۆستا فەرەیدوون جونەیدی نەیشابووری کە لە خوای مەزن داواکارم هەمیشە بیانپارێزێت و زانست و زانایی و تێکۆشان بۆ پەرە پێدانی فەرهەنگی ئێران زەوی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زۆرتر بکات، وەکوو ڕابردوو مێهرەبانی خۆیانیان دەربڕیوە نامەیەکی شیرینن و پاراویان لەوبەری بەرزایی دەماوەند بۆ داوێنەکانی کوێستانی شایجان و بینالوود بۆم ناردووە کە بۆ ئێوە سەروەران دەیلێمەوە:

سڵاو بۆ دەنگی بەرزی کورمانجی ئێران، بۆ بانگەوازی هەستانە سەر پێ کوردانی خوراسان، کەلیموڵڵا تەوەحۆدی.

سڵاو بۆ تاقە کوڕی کورد کە لە هەموو ناخ و دەماری خۆی خۆشەویستی کوردان و ئەوینی ئێران هەیە و بە گرتنە ئەستۆی ئەرکێکی ئاوەها گرینگ لەم سەردەمە پڕ لە ئاڵو گۆڕە ساتێک لە ژیانی خۆی بێ‌بەهرە و ئاکام تێناپەڕنێت و هەموو دڵ و گیانی لێوانلێوی لێکۆڵینەوە و زانستە و دڵی پڕ لە هەستی لە سینگی نەسرەوتووی بووەتە کوانووی ئاگر کە گیانی ماندووی کورد و کورمانج بە تین دەکات و وزەی پێدەبەخشێت، تا هەستن و پێگەی خۆیان لە فەهەرنگ و مێژوو

ئێرانی مەزن جارێکی تر پیدا بکەن و بۆ گەیشتن بە ئاواتە گەورەکانیان هەمیشە لە پانتای فەرهەنگ و مێژوو و شانازییەکانی ئێران حازر بن و ئاگاداری گیان و دەروونی ئێران بن... سلاو بۆ کوڕی لێهاتووی کوردە کەلیمولّلای خۆشەویست و نازدار.

دەفتەری سێهەمی «کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان» کە لەگەڵ ڕێزت بۆ منت ناردبوو و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لەبەر چاوانی نیگەرانم دانا و یەک بە یەکی لاپەڕەکانیم بۆن دەکرد، بۆنی گەلای تازەی پوونگەی لێواری کانیاوەکان و ڕووبارەکانی دەدا. هەر ڕستەیەکی کە دەمخوێند نیشانەیەک لە ئازایەتی و پیاوەتی و خۆڕاگری پیاوان و ژنانی کوردی پێوە دیار بوو.

لە هەر دیمەنێکیدا شەپۆلی نیگای کوردەکان قسەی لە بڕیاری پاک و لێبڕاوانەیان لە ڕێگای پاراستنی ئایینەکانی ئازادیخوازی و قارەمانیەتی دەکات... بەڵام هەر کاتێک دەڕوانمە لاپەڕەکان و لە پڕ چاوم بە دیمەنی شوخێکی نازداری کورمانج دەکەوێت کە لە نێو چیمەنزارەکانی کوێستان خەرمانەیەک گوڵی بە داوێن هەیە و پەردەیەک لە شەرم بە سەر چاوانیدا کشاوە و بە ئەسپانی و مەزنایەتی دەڕوانێتە سووچێک ڕەنگە دەڕوانێتە منداڵەکانی ڕەنگە بە گوڵ و شەونم ڕەنگە بە مێگەلە مەڕەکانی، ڕەنگە بە هیواکان و ئاواتە دوورەکانی... ڕەنگە خەریکە دەنگی کەلیم دەبیست کە لە کوێستانەکانی خوراسان پەنگ دەخوات کە «      ».

فرمێسک لە چاوانم قەتیس دەمێنێت و نیگام دەکەوێتە سەر ئەم وێنەیە و دەنگی تۆ دەبیسم کە ئامۆژگاری ئاسکەکانی کورمانج دەکەی کە فریوی زەرق و بەرق و ڕواڵەتی ڕۆژئاوا نەخۆن و بە داب و نەریتەکانی ئێرانی و ئایینەکان، شێوەکان و بابەخەکانی کورد دڵ ببەستن و بزانن کە تاقە گەوهەری فەرهەنگ و مێژوو و ڕەگەز و زمانی ئێرانی هەزاران جار جوانتر و مەزن‌تر و پڕ بایەخ لە نامۆ بوون و لە خۆ نامۆ بوونە.

نەریتەکان، ئایینەکان، چێژن و بۆنەکان، زمان، جلوبەرگ، ئازادیخوازی، بیرکردنەوە چاک و تیکۆشان دەبێ بپارێزرێن و شانازییان پێوە بکرێت و لە گەڵیاندا ژیان بکرێت و بسپێردرێنە منداڵان و نەوەکانی داهاتوو...

کەلیم‌گیان، بەڵام ئایا پاراستنی هەموو ئەمانە ناکەوێتە ئەستۆی هێندێک لە پیاوانی کوردی نیشتەجێ شارەکان؟

ئایا باشتر نیە ئێمەش خۆمان ئامادە بکەین تا کۆمەڵگای کوردی بگەینینە نێو شەقامەکان و ئیدارەکان. ئایا باشتر نیە کە لەم ڕێگایەدا ئێمەش یارمەتیدەری ژنەکان بین کە هەمیشە پارێزەر و نگابانی هەموو داب و نەریتەکان و بایەخەکانی هونەری و فەرهەنگی ئێمە بوون؟ چاوت ماچ دەکەم فەرەیدوون.

هیوادارم قسە بە نرخ و دڵنشینەکانی زانای پسپۆڕمان فەرەیدوون جونەیدی لەسەر ئێمەی هەڵاتوو لە فەرهەنگی خۆمان کاریگەر بێت.

٤٥- **دیواندەرە**- کوردستان ٦٧/١١/٧- برای زانامان بەڕێز عەبدوڵڵا مێعماری لە ئیدارەی موخابەراتی دیواندەرەی ڕازاوە و جوانی کوردستان وەها نووسیویانە: مامۆستای هێژاو بەڕێزم ئاغەی تەوەحۆدی سلاوێک بە بایەخی قەڵەم و بە گەورەیی مێژوو و بە سەرکەشی جیای زاگرۆس پێشکەش بە ئێوە... و هیوادارم هەمیشە قەڵەمتان هەوراز پێو بێت و ڕوو نەکاتە نشیو و لە ناوچوون.

بەرگی سێهەمی کتێبی ئێوە رۆحێکی تازەی خستە جەستەی منەوە و منی چەندین ساڵ بردەوە سەردەمی لاوی و توانایەکی تازەی بە من بەخشی. بە ڕاستی دەستان خۆش بێت کە هەوڵەکانی ئێوە شیاوی ڕێز لێنانە. چۆنکە نووسراوەکانتان مرۆڤ لەگەڵ خۆی بۆ ناو هەموو عەشیرەتەکان و خێڵەکان و پاڵەوانان و ناوداران و زانایان و داب و نەریتەکانیان دەبات، بە ڕاستی دەستان نەیشێت کە ئاسەوارێکی پڕ بایەختان پێشکەش خوێنەرانی خۆتان کردووە. دیواندەرە- براتان میعماری

٤٦- **پاوە**- کوردستان- ٦٧/١١/٨- نامەیەکە لەلایەن برای زانامان کە چەند کتێبیش بە دەستی بەڕێزیان بە چاپ گەیشتووە. وێنەیەک لە خۆیان و وێنەیەکی دڵڕفێن و جوانیان لە شارە جوانەکەی پاوە بۆمان ناردووە و نووسیویانە:

٠٠٠ بۆ زانای بلیمەت و لێکۆڵەر بەڕێز مامۆستا کەلیموڵلا تەوەحۆدی سلاو و ڕێز لە بەرزایی چیا سەرکەشەکانی هەورامان سلاوێک پێشکەشتان دەکەم کتێبەکانی پڕ بایەخ و بە نرخی بەڕێزتان جێگای سەربەرزی و شانازی هەر کوردێکی

موسوڵمانە لە هەموو جیهان.

ڕاستە کە ئێمە بە شێوەی چیرۆک و ئەفسانە لە باپیرانی خۆمان بیستوومان کە کۆمەڵێک لە کوردەکانی زۆر لێکراوی کوردستان، بوونەتە قوربانی ئامانجی چەپەڵی شاکان و بۆ ناوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران دوور خراونەتەوە بەڵام هیچ کات بیرمان لەوە ناکردەوە کە نەوەیەکی پاک لەم ڕەچەڵە کە خەباتگێڕە هەستێت و خامەی خۆی بخاتە گەڕ و ئەدیبانە و لێکۆڵەرانە بایەخەکانی لە بیر کراوی نەتەوەیەکی قارەمان لە مێژوو زیندوو بکاتەوە و پێشکەشی نەتەوەی شۆڕشگێڕی ئێمە بکات، بەڵام ئەم ڕاستیە گرینگە بە دەستی کەلیمی خەباتگێڕ هاتە دی. نەتەوەی موسوڵمانی کورد و بیرمەندان و لێکۆڵەران لەم جووڵانەوە فەرهەنگیە پێشکەوتووە لە خوراسان ڕێز دەنێن و بە ناوی بەڵگەیەکی پڕ بایەخ و مێژوویی و پرشنگدار بۆ نەوەکانی داهاتوو سەیری دەکەن و بە لێکۆڵینەوەیەکی بە کەڵک و تۆمارکردنی مێژووی بۆ خۆیان دەزانن. ئەوپەڕی پێشکەوتن و سەرکەوتنی بیر کردنهوە کە لە بیر و بڕوای پاکی ئێوە سەرچاوە دەگرێت لە بەرانبەر ئیسلام و کوردستان لە کتێبەکانتانا بە ڕوونی دیارە و ئەمە هەر ئەو شتەیە کە نەتەوەی خەباتگێڕی کورد ساڵهایە تینووی ئەم جۆرە بیرۆکانەیە لە تۆمارکردنی مێژووی خۆی، و هەروەها ئەم زانایییە و پرشنگداربوونە لەوبەری سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران هیچ کات لە بیر نەکراوە و ئەم هەنگاو هەڵگرتنەیان کردووەتە نموونەیەکی بە نرخ بۆ هەموو بیرمەندانی کورد لەسەرتاسەری جیهان لە ناساندنی ئەم نەتەوە و زۆر لێکراوە. ڕێزم هەیە بۆ قەڵەمی. هەمیشە زیندووت و دەستانی ماندوو نەناست. من بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە بەم چەند ڕستە کەم بایەخە لە بەرچاو گرتنی حەدیسی پیرۆزی پێغەمبەر سپاسی خزمەتەکانی ئێوە بکەم و خۆشحاڵی خۆم سەبارەت بە بەردەوامی بایەخەکانی فەرهەنگی شۆڕشی ئیسلامی لە ناو کوردانی موسوڵمان و بە غیرەتی خوراسان دەر ببڕم. ئەم بابەتە کە کوردانێکی قارەمان لە خوراسانەوە لە خەبات دژی زۆرداری و داگیرکەری لە شەڕی داسەپاو دژی گەورەترین دوژمنی خۆیان لە مێژوودا «سەددامی بەعسی ئەفلەقی شەڕفرۆش»

بەشداریان کردووە و زۆر گوڵی پەڕپەڕیان لە ناو گوڵە ئاڵەکانی شـەهیدانی شۆڕشـی خوێنینی ئیسلامی پێشکەش کردووە، هیچ کات لە بـیر نابەینـەوە، یادیـان بـەڕێز و پیرۆز بێت. خوای مەزن ئێوە بۆ خزمەتی هەرچی زیاتر بە کوردانی موسوڵمانی ئـەو نیشتمانە سەرکەوتوو و سلامەت بکات، وێنەیەک لە شاری قارەمانپەروەری پاوە بـە ناوی خەڵات پێشکەشتان دەکەم، هیوادارم جێگای ڕەزامەنـدی ئێـوە بێـت، لەگـەڵ ڕێزم. (جێگری فەرهەنگی بونیادی شەهیدی شارستانی پاوە- بەهرام وەلەدبەیگی)

٤٧- **تاران**- ٦٧/١١/١٠- بەڕێز دوکتۆر **ئیرەج ئەفشار** یەزدی بەرپرسی بـەڕێزی گۆڤاری پڕ بایەخی ئایەندە و نووسەری تێکۆشەر و ماندوو نەناس کە حەقی گـەورە و زۆریان بە سـەر هـەموو ئێرانیـەکان هەیـە، هـەروەها لەگـەڵ نامەکـەیان خوازیـاری ژمارەیەک لە بەرگی سێهەم بوون کە پێشکەشیان کرا.

٤٨- **شـنۆ**- **٦٧/١٢/٢٩**- بـرای زانـا و هێژامـان بـەڕێز **ئەحمـەد ئەحمـەدپوور** بەرپرسی کتێبفرۆشی نالووسی لـە شارسـتانی شـنۆی کوردسـتان فەرموویانـە کـە وێڕای پیرۆزبایی گەیشتنی ساڵی نوێ: (بە ئاگاداری ئێوە دەگەینم کە لە سـەفەرێک کە لەم دواییانە بۆ تاران کردم سەرنجم ڕاکێشرا بۆ کتێبی بە نرخی کۆچی مێژوویـی کورد بۆ خوراسان) خەڵـکی شـنۆ لـە ڕووی هـۆکری زۆر ڕۆژانـە چەنـدین جـار بـۆ وەرگرتنی ئەم کتێبە دێن بۆ کتێبفرۆشی و...

٤٩- **مەشهەد**- ٦٨/١/١- برای کوردی ئێراقی بـەڕێز **ئـەیوب هاشـم مـیرۆزی** جەنایەتەکانی سەددام لە کوردستانی عێراق: نامەیەکی دڵتەزێنە لە لایـەن یـەکێک لە براکانی کوردی بارزانیمان کە دانیشتووی خوراسانی ئەم برایە کە هاشـم میرۆزیـە لەگەڵ زۆربـەی برایـانی تـر وەکـوو بـەڕێزان تەحـسین و جـەمیل و عەبـدولقادر و ئێبراهیم و عسمەت هاشم و... کە لە شـارەکانی مەشـهەد و توربـەت حەیدەریـە و شیروان و قووچان و شوێنەکانی تر پەرتەوازەن و بە ژیانی دوور لە نیـشتمان درێـژە دەدەن. ئەم خۆشەویستانە و زۆربەی بنەماڵەکانی تری کوردی عێـراق ساڵـهایە کـە لەگەڵ هاتنە سەر کاری ڕژیمـی ئەفلـەقی و دژە مرۆڤـانەی عێـراق، لـە سـەردەمی حەسەن ئەلبەکر بە تایبەت سەددامی جەنایەتکار لە ماڵ و نیشتمانی خۆیـان ئـاوارە

کراون. بەڵام ئێمرۆژە بارودۆخی ئەم ئاوارانە زۆرتر لە هەر سەردەمێکی تر دڵتەزێن‌تر و جێگەی داخە چونکە بەو جۆرەی کە دەزانین، سەددامی جەنایەتکار بە شێوەی بەردەوام شارەکان و گوندەکانی کوردستانی عێراق بوردومانی کیمیاوی دەکات تا ئیتر هیچ ئاسەوارێک لە کورد و کوردستان لە عێراق نەمێنێت و ئەو نیشتمانە بکاتە ناوچەیەکی عەرەبنشین.

بەڵام ئەو لە هەڵەدایە چونکە هەتا کوردێک زیندوو بێت ئەو ئەم پڕ هەوراز و نشێوی خۆیان، هەزاران دیکتاتۆری خوێنمژی وەکوو ڕەزاشا و ئاتاتورک و تەیمووری لەنگیان ناردووە بۆ ناو گۆڕستان ئەمە نە یەکەم کەسیانە و نە دوایین کەس. ئەم جەنایەتکارەش کە وەکوو سەگێکی هار کەوتوەتە گیانی خەڵک بە زویی بە هۆی ئەو هەموو کۆ مەڵکوژیە سزا دەدرێت و خوێنی شەهیدانی لە خوێن شەلاڵی هەلەبجە ئەویش تووشیاری چارەنووسی هیتلەر و ئێستالین دەکات.

ئێمە کوردەکانی خوراسان لە کۆڕی پرسە و ڕێزلێنانی ڕێو ڕەسمی ساڵیادی نەمر مەلا موستەفا بارزانی مەزن و هەلەبجە بەشداریمان کرد، نە تەنیا ئێمەی کورد، بەڵکوو زۆربەی خەڵکی دڵپاکی خوراسانیش لەم ڕێوڕەسمانە بەشداریان دەکرد و مەرگ و نەمانیان بۆ سەددام و ئەفلەقیەکان داوا دەکرد کە بوونەتە هۆی ئەم هەموو جەنایەتە. لەم ڕووەوە برامان ئەیوب هاشم بە نوێنەرایەتی لەلایەن کوردەکانی عێراقی دانیشتووی خوراسان، نامەیەکی پڕ لە خۆشەویستیان بۆ من نووسیوە کە لەم ڕێوڕەسمانە بەشداریمان کردووە، لە حاڵێکدا کە ئێمە کوردەکانی خوراسان بە پێ چەند هۆکارێک بە ڕاستی شەرمەندەین و نەمانتوانیوە ئەم قەرزە بەم بەڕێزانە بدەینەوە هەرچەند ئەو زەبر و زەنگەی کە لەوان دەکرێت و ئەم قامچیانە کە لەوان دەدرێت ئێمە بە جەستە هەستی پێدەکەین و هەروەها فەرموویانە: لەم ڕووەوە ئەرکی سەرشانی هەر کوردێکە لە هەر کوێ لە جیهان بەرانبەر بە ئێوە کە لە چاپ و بلاو بوونەوەی ئەم سێ بەرگە کتێبە بایەخدارەی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان یارمەتییان بدات کە خزمەتێکی گەورەی هونەریە بۆ ئەوان کە ئاوارەکانی نێو مێژوون. منیش بە ناوی کوردێکی ئاوارە بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانی سپاس و

پێزانینی خۆم و براکانی تری کوردی خوراسان پێشکەشتان بکەم و لە هاتنی بەڕێزتان و براکانی تری کوردی خوراسان بۆ دەهەمین ساڵیاری ڕێبەری گەورەی کورد مەلا موستەفا بارزانی و دووهەمین ساڵیادی نەمر ئیدریس بارزانی کوڕی گەورەی ئەو ڕێبەرە و هەروەها لە یەکەمین ساڵیادی کارەساتی دڵتەزێنی هەلەبجە کە لە ڕێکەوتی ١٣٦٧/١٢/٢٩ لە مەشهەد لە مزگەوتی ئیمام حوسەین(ەخ) بەڕێوە چوو و بەشداریتان کردبوو و بە هۆنراوەکانی دڵنشین و وتار خوێندنەوەی هەست بزوێنی خۆتان دڵی زامداری ئێمەتان ئارام کردەوە سپاس دەکەم.

بـرای کـوردم قـووڵایی و بەرفرەیی جنایەتەکانی سەددام لـە ڕێکـەوتی ١٩٨٨/٣/١٦ی زایینی (بەرانبەر بە ڕەشەمەی ١٣٦٧) کـە لـە شـاری هەڵـەبجە (هیرۆشیمای کوردستان) ڕوویداوە شتێک نیە کە قەڵەم بتوانێت نەخشی بکات یان زمان توانای وتنەوەی بارودۆمخی نالەباری ئەو بوردومانە وەحشیانەی نیە کە ژنان و پیاوان و منداڵان و گیانلەبەرانی بێتاوان و گیاکان و دارەکان لە چرکە ساتێکدا وونە خوێن و خۆڵەمێش و دووکەڵ و هەموو شتێک کۆتایی پێهات. ١٦ فرۆکەس شەڕکەری عێراق لە ئاسمانی هەلەبجە بە دەرکەوتن و نەعرەتەیان کێشا و هەموو شتێکیان کاول کرد. پێنج هەزار کوردی بێتاوان و بێپەنا کوژران، ١٠ هەزار بریندار کە زۆربەیان نە دەستیان هەبوو نە لاق و یەک لە دوای یەک گیانیان لە دەست دا بە شێوەیەک کە دەیزانن ٤٤ کەس لەو بریندارانەیان گواستەوە بۆ مەشهەد و لە نەخۆشخانەکانی ئیمام ڕەزا و قائم لە ژێر چاوەدێری بوون.

**ماکەکانی کیمیاوی ناسراو لەم بوردومانە بریتی بوون لە:**

١. گازەکانی خەردەڵ ٢. سیانۆر ٣. گازی تێکدەری ئەعساب کە هەر سێ جۆری ئەم گازانە لە بوردومانی هەڵەبجە لە مەترسیدارترین بومبەکانی کیمیاوین کە هەتاکوو ئێستا دژی مرۆڤایەتی بە کار هاتوون. برام کەلیم، نە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نە مافی مرۆڤ، نە ویژدانی مرۆڤایەتی هیچ کام لەم جەنایەتەی سەددام تەنیا بۆ جارێکیش خەمناک نەبوون و وڵاتانی بێویژدانی عەرەبیش بوونە یەکدەنگ کە ئەم کارەساتە درۆیە و قەت کوردستان بوردومان نەکراوە. برای بەڕێز

ئـەم قـسە و شـایەتی دانی بـە درۆوە و ناپیاوەتیـەکانی عەرەبـەکانی بـە ڕواڵـەت موسوڵمان و موسڵمانەکانی تری جیهـان ئێمـە دەکوژێـت و ئێـشەکەی لـە ئێـشی بوردومانی سەددام جەرگ بڕترە. هەموویان یان بێدەنگ بوون یـان حاشـایان کـرد. چەند ژن و منداڵ لە نەخۆشخانەی مەشهەد گیانیـان لـە دەسـت دا، ئەوانـەش کـە مابوون بە تەواوەتی کەم ئەندام و بێ‌دەست و لاق بوون. دووکەسیان کە لاو بـوون و خوێندکاری فەوق لیسانس و دوکتۆرا بوون کە لە ئورووپا دەیاخوێند و بۆ تێپەڕانـدنی پشتوودانی چەند ڕۆژە گەڕابوونەوە بۆ عێراق کە دوچاری وەها چارەنووسـێک بـوون. بەڵێ ئەمە بوو نامەی برای کوردمان بەڕێز مـیرۆزی، بـەڵام ئـەوەی کـە خۆمـان لـە نەخۆشخانەی مەشهەد و لە کاتی چاو پێکەوتن دیمان زۆر دڵتەزێن بـوو و ئەوەیکـە زۆرتر لە هەموو شتێک دڵتەزێنتر و جەرگێڕتر بوو و فرمێسکی لە چاوی من هێنایـە خوارەوە، منداڵێکی پەنج شەش ساڵان بوو کە لە سەر تەختی نەخۆشـخانە کـەوتبوو و سۆرۆمێک بە جەستەیەوە بوو، بە دژواری نەفەسی دەکێشا و ئیتر هیچ.

١- من و چەند کەس لە برایانی کوردی خوراسـان کـە بـۆ چاوپێکـەوتنی ئـەم خۆشەویستە لە خوێن شـەلالانە بـۆ سـەردانیان ڕۆیـشتبووین و ئـەوانمان لـە سـەر تەختەکانی نەخۆشخانەی قائم‌بینی دوچاری وەها داخ و کەسـەرێک بـووین کـە بـە سەختی توانیمان لە سەر پێ ڕاوەستین.

پرسیارم کرد کە دایکی و باوکی ئەم منداڵە لە کوێن. یەکێک لە برینـداران کـە لاوێکی تەمەن ٢٦ ساڵە بوو بە من ناسێنرا کە باومی منداڵەکە بـوو بـەوم وت، بـەڕێز گیان تۆ کە بارودۆخت باشتر دەتوانی بڕۆی، و دایکی ئەم منداڵە بهێنی بۆ دێرە تـا بۆ دواپین جار ڕوومەتی خوێنینی جگەرگۆشەکەی ببینێ و ماڵئاوایی لەگـەڵ بکـات ئەو بە چاوی پڕ لـە گریانـەوە وتی: دایکـی لـە چ شـوێنێک بدۆزمـەوە. ئەگـەر لـە بوردوومانەکەدا نەکوژرابێت لە کامە ئوردووگا و نەخۆشخانە بیدۆزمەوە، تۆ نـازانی کـە چی بە سەر ئێمە داهات و بە چ شێوەیەک مالوێران کراین...

ئێمە لە حاڵێکدا کە دەگریان نەخۆشخانەمان بـە جـێ هێـشت. ئێـستەش کـە ساڵێک لەو ڕۆژە تێدەپەڕێت و خـەریکم ئـەو بیرەوەریانـە دەنووسـم فرمێـسک لـە

چاوانم دێته خوارەوە و لاپەڕەکانی کاغەز تەڕ دەکات. من تا کاتێک کە زیندووم هیچ کاتێک یاد و بیرەوەری ئەو منداڵە بریندار و بێتاوانە کە نەتوانی دایکی ببینێت و نە دایکی توانی لە ئاخرین ساتەکاندا دەست و لاقەکانی ئەو هەست بکات و لەگەڵیدا ماڵئاوایی بکات لە بیر نابەمەوە ئەم داخ و کەسەرە لە داخی لە دەستدانی ئەبولفەزلی کوڕم گرانتر بوو کە لە خەرمانانی ١٣٥٨ گیانی لە دەست دا. ئەم دوو کارەساتە جەرگبڕە لەگەڵ مندا دەنێژرین چونکە لە سەر ئێسقانەکانم هەڵکەندراون. ئەو منداڵە سەرەنجام گیانی لە دەست دا و تەرمەکەیان بۆ گۆڕستانی کوردەکان لە تاران بە ڕێ کرد. من هیچ دەوا و دەرمانێکم بۆ ساڕێژی ئەم زامە لەبەر دەست نیە، مەگەر ئەوەی لە خوای گەورە بپاڕێمەوە و بڵێم کە سەددامیش وەها دەرد و ڕەنجێک ببێت کە دەرمانی نەبێت و ڕۆژەکان و ساڵەکان هەر بەم شێوەیە چاوەڕوانی مەرگ بکات. بەڵێ برامان میرۆزی لە درێژەی نامەکەیان نووسیبوویان:

تەنیا وڵاتێک کە لەگەڵ ئێمەدا و هاوکاری کرد دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو کە مافی پەنابەری و جێگە و ماڵی بە ئێمە دا و بریندارەکانی ئێمەی خستە ژێر چاوەدێری و دەرمان کردن و ئاوارەکان و پەنابەرە کوردەکانی بە باوەشی ئاوەڵاوە قەبووڵ کرد و ئیزنی بە ئێمە داریۆڕەسمی پرسەی خۆشەویستەکانمان لە مزگەوتەکانی ئێران بەڕێوە ببەین هێندێک بە کوردەکان کە هەڵاتبوون بۆ تورکیە کەوتنە بەر پیلانگێڕی سەددام و دەوڵەتی فاشیستی تورکیە کە ئاوی ڕووبارەکانیان بە مادە کیمیاویەکان ئاڵاندبوو و لەم ڕێگەیەوە زۆربەی ئەوانەی کە هەڵاتبوون لە ڕێگەی ئەو ئاوەوە ژەهراوی کران و گیانیان لە دەست دا. جەنایەتی تورکیەش لە جەنایەتی سەددام کەمتر نەبوو ڕووسەکانیش کە لافی مافی مرۆڤ و کرێکارانیان لێدەدا بێدەنگ بوون و چونکە قسەیەکیان نەکرد. ئامریکاش کە بە هەموو هێزەوە سەددامی ڕاگرتبوو بە بۆنەی پارە و دۆلارەکانی عەرەبستانی سعوودی و باجێک کە لە وڵاتانی عەرەبی دەیگرت لە مەسەلەی «بەرگیری لە مافی مرۆڤ»ی دەستکردی خۆی قەت ئەم کارەساتەی نەخستە ڕۆژەڤەوە. تا ئەم رژیمانە پێکهێنەری

ڕێکخراوی نەتەوە بەکگرتووەکان بن...

برای بەڕێزم کەلیم. داوای ئـەوەت لێدەکـەم لـە قەڵـەمت و زمانـت و بـە هـەر شێوەیەک کە دەیزانی سڵاو و پەیامی ئێمە بگەینیتە چیاکانی کوردسـتانی عێـراق و بڵێن کە ئەی چیاکان خۆڕاگر و سەربەرز بن کە ئێستا ئێمە لە ڕێگای دوورەو خۆمان دەگەینین. ئێمە چەک لە دەست و بە ڕق و قـین لـە سـەددامەکان بـەرەو لای تـۆ دێین و تۆڵەی خۆشەویـستانمان دەسـتێنینەوە. سـەددامیەکان بـە حاڵـی خۆیـان ناهێلینت و لەت لەتیان دەکەین. ژنانی ئێمە کوڕانێکی تریان بۆ قوربـانی کـردن لـە ڕێگای تۆ ئەی نیشتمانی خۆشەویست بە دنیا هێناوە و پەروەردەیان کردوون، ئەمانە پێشکەش بە تۆ دەکەین و دوژمنت سەرشۆڕ دەکـەین و ئـازادی دەگەڕێنینـەوە بـۆ باوەشـت. ئـەیووب هـاشمی و کـوردە پەنابـەرەکانی تـری خوراسـان ئـەمنیش لـە ساڵیادی خەڵکی لە خوێ گەوزاوی هەڵەبجە پارچە شێعرێکم بە زمـانی کورمـانجی هۆنیوەتەوە کە لە جێگایەکی تر چاپ دەکرێت. ئەو پارچە شـێعرەش کـە شـاعیری کوردی نیشتمانمان بەڕێز کیان ڕەبانی دیرانلوو لە شاری بجنـووردەوە نووسـیبوویان خوێنرایەوە. (ئەسڵی نووسراوەی بەڕێز دیرانلوو لە لاپەڕەی ٤٤٣ کۆ کراوەتەوە.)

**٥٠- ئێسفەراین- مەنووچێهر فەڕووخی- ٦٨/١/٢٠**

برامان بەڕێز فـەڕووخی لـە شارسـتانی جـوانی ئێـسبفەراین بـە خـەتی بـەڕێز کەلیموڵڵای تەوەحۆدی وێڕای سڵاو و ڕێز و دوعـای خـەیر ئاسـەواری بـەڕێزتان لـە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی ئێران بە تایبەت هەرێمی قارەمان پـەروەری خوراسـان لە کتێبخانەی کشتی ئەسفەراین کەوتە بەر دەسـتم و خوێندمـەوە. بـێ هـیچ پێـدا هەڵاگووتنێک هەوڵ و تێکۆشانی تـۆ بـرای هێـژای کورمـانجی شـیاوی ڕێزلێنـان و جێگەی سپاسە. لە خوای مەزن داواکارم کە خزمەتەکانی ئێوە کـە هـەتا هـەتایی و نەمرن بۆ هەمیشە و سینە بە سینە ببێتە نموونە بۆ کەسـانی نیـشتمان پەرەسـت و ئەوانەی کە ئێرانی بوونیان بۆ ئەوان جێگەی شانازیە. بە هیوای ئەو ڕۆژە.

٥١- جارێکی تر هاوارێک لـە کوردسـتان، لـە هەڵەبجـە، لـە نیـشتمانی سـوور خەڵاتی خۆشەویستان بێ تاوانان.

سەقز- ٦٨/١/٢٦- برای شاعیر و نووسەرمان بەڕێز **عومەری فارۆقی** لە دووهەمین نامەی خۆیدا نووسیویە: مامۆستای لێکۆڵەر و زانا و برای مێهرەبان بەڕێز ئاغای تەوەحۆدی.

بە سڵاوی دووبارە لە کوردستانی چەوساوە و لە خوێن گەوزاو و لانکی شەهیدانی هەڵەبجە و سەید سادق و سیروان و خورماڵ و بیارە و ئەم هەرێمە کەونارا و کوێستانیە کە ئێستا کۆمەڵێک لە عەرەبەکانی نەان و بیرتەسکبە ڕێبەرایەتی هیتلێری سەردەم واتە سەددامی دڕندە ئەیانهەوێ دەست بکەن بە عەرەب کردنی و بە زوویی دەنگی ترسێنەری تەقینەوەی لە شاری جوانی قەلادزێ هەروەکوو تەقینەوەی هەڵەبجە دەبیسن وێ کولەخۆرانی بیابانی مسری و سوودانی لەوێدا دەبینن کە نیشتمانی کوردستان پێشێل دەکەن. چی بڵێم، بە قسەی فێردەوسی بە ناوبانگ:

لە خواردنی شیری وشتر و سووسمار عەرەب بەو جێگایە گەیشتووە... بەرگی سێهەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانم موتالا کرد. بە داخەوە لە جیاتی ئەوەی نامەکەم بە سپاس و پیرۆزبایی دەست پێ بکەم بە بۆنە خولقاندنی ئاسەورێکی وەها لە مێژووی کورد نامەکەم بە ئاه و ناڵە و ڕۆژڕەشی براکانمان لە کوردستانی عێراق دەست پێ دەکەم و بیر و زەینتان داخدار دەکەم، بەڵام چ بکەم تا بووە و هەیە بەشی کورد هەر مەینەت بووە و دەبێ. ئێستاش بە شایەتی ئەو بەڵگە جێ باوەڕانەی کە دیاریتان کردووە هەمووکەس دەزانن کە زنجیرە حکوومەتەکانی سەفەویە و ئەفشار و تەنانەت برایانی هاو زمان و هاوڕەگەزی زەند و دواتریش نیشتمانفرۆشانی سەرشۆڕی قاجارچییان بە سەر ئێمەدا هێناوە. نازانم ئایا لە گۆڤاری سروە وتارەکەی منتان لە ژێر ناوی «حەسەن سوڵتان هەورام و فەرهاد میرزای موعتەمێدولدە وڵە» مامی ناسرەددین شا خوێندوەتەوە یان نا؟

لە وتارەدا بە کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەکانی مێژوویی هاتووە کە ناسرەددین شا کەسێکی نیشتمانفرۆش و بە کرێگیراوی ئێستیعماری بریتانیا بووە کە بە بەڕێوە بردنی پیلانی بریتانیایەکان بە سەردەمی دەسەلاتەکانی کۆنی عەشیرەتەکان کە

پشتیوانێکی خۆڕاگر بۆ پاراستن و سەر بە خۆیی ئێران لەوێدا خەریکی عیش و نۆش بن و لە ژێر سایەی گەرم و نەرمی شۆخ و شەنگەکانی ئۆرووپا ئێران بە دوو دەستەوە پێشکەشی بریتانیای مەزن و ڕێوی فێڵبازی جیهان بکەن.

هەر لەم پەیوەندیەدا بوو کە لە سنەش کە لە ژێر دەسەڵاتی میرانی ئەردەڵان بوو و پێشینەی هەزار ساڵ میرنشینیان بوو کۆتایی هات و بە دانانی مامی خۆی فەرهاد میرزا بە ناوی حکوومەتی کوردستان دەستی کرد بە تاڵان کردنی ئەو هەرێمە. هەر بەو شێوەیە عەشیرەتی کوردی گەڵواخی کە لە نێوان دیواندەرە و سنە نیشتەجێ بوون بە یارمەتی فرۆکەکانی شەڕکەری بریتانیا و بە یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی لە ئاخرەکانی سەردەمی قاجاڕ سەرکوت کران. پەیوەندی دەوڵەتی قاجاڕ و تورکەکانی عوسمانی بووە هۆی ڕووخانی پاشای ڕەواندز کە حکوومەتەکانی کوردی باکووری خوراسان لەوانە قووچان و بیجنووردیش لەم پیلانەی بریتانیا ڕزگاریان نەبوو و لە ناو چوون. بە هەر حاڵ هەر ڕۆژە ئیستێعمار بۆ ئێمە پیلانێکی نوێ بۆ ئێمە دادەڕێژێت و بە ڕێوەی دەبات ئەم ڕۆژانەش نۆرەی هەڵەبجە بوو کە کرایە قوربانی و تا بزانین سبەی نۆرەی کێیە؟ ئێستاش لە یادی کارەساتی تاڵی هەڵەبجە و تورکیە و کۆمەڵکوژی خەڵک و کاولکاری گوندە کوردنشینەکان و لە ناو بردنی نەتەوەی کورد لە سەر ڕووی جیهان پارچە شێعرێکم هۆنیوەتەوە کە هیوادارم لە جێگای خۆیدا کە بەرگی چوارەمی کتێبەکەی ئێوەیە چاپ و بڵاو بکرێتەوە تا ئەم کارەساتە مێژوویانە لە بیر نەچنەوە و بگاتە منداڵانی داهاتووی کورد و ئەوان لەگەڵ کێشەکانی باپیرانیان ئاشنا بکات و... ئیرادەتمەندی ئێوە عومەر فارۆقی.

بەڕێز فارۆقی نامەیەکی تێر و تەسەل و پڕ لە دەردە دڵ لە ڕێکەوتی ٧٠/١/١٥ بۆم ناردووە و بسی ئاوارە بوونەکان و ڕۆژە ڕەشەکانی خۆشکان و برایانی کوردی عێراقیمانیان کردووە کە چۆن لە نێو بەرف و بۆران و سەرما بە دەست زوڵم و زۆری سەددام کە هەموو شارەکان و گوندەکانیانی بۆردوومان کردبوو و ئەوانی ئاوارەی ئێران و تورکیە کردبوو و لە تورکیەدا بە چ شێوەیەکی نامرۆڤانە لەگەڵیان

هەڵسوکەوت کرابوو، ئەم نامەیە زور دڵتەزێن و خەمناک بوو و من بە بۆنەی ئەو بەرپرسیاریە نیە کە لەم پەیوەندیەدا هەمە وێڕای داوای لێبووردن لە ئێوە خۆشەویستان ئەو نامەیە لێرە بە تەواوی دەگێڕمەوە که نووسیویانە: بە ناوی خوا- ١٣٧٠/١/١٥ نامەیەکی ئاوەلا بۆ شاعیران، نووسەران، ڕۆژنامەنووسان و ئەدیبەکانی ئێرانی. بە سلاوێک وەکوو بۆنی خۆشی ئاشنایی، ئەگەر ئەوەی که بۆ ئێوە دەیلێم بهێنیمە سەر کاغەز نە تەنیا دەبێتە مەسنەوی هەفتاد مەن بەڵکوو دەبێتە سەد مەن. بەلام لە وتار و دەرفەتە دەرفەتی ئەوە نیە. کەوا بوو بە ئاماژەیەکی بچووک ویژدانی بەرپرسان دەکەمە داوەر و لە قەڵەمی مەزنتان یارمەتی دەخوازم و هاوار دەکەم:

ئەی مرۆڤەکان، ئەی مرۆڤەکانی سەروەری گیانداران، ئەی هاونیشتمانانی دەروونپاک. من کوردم و هاونیشتمان و هاوڕەگەزی ئێوە. سەردەمانێک دیاکۆی ماد بووم. ڕۆژگارێک مۆوەبدی مۆوەبدان و سنوورپارێزی ساسان. ئەو کات بوومە ئەبوو موسلیم لە خوراسان و سەلاحەددینی ئەیووبی لە بەیتولموقەددەس و گرتنی فەلەستین. سەرەنجام لە .مامەڵەکانی سیاسی بە دەستی ئیمپریالیسمی جیهانی لەت لەت کرام و هەر بەشێک لە جەستەک کەوتە شوێنێک. ئەگەرچی من جەستەی ئێران بووم و هەم بەلامی بە هۆی بەدشانسی و پیلانگێڕی ئەمپریالیسم و تەنانەت خەیانەت یان نەزانی ڕێبەرەکان بوومە دیلی دەست عەرەبەکان و تورکەکان بەلام بە من بلێن ئێوە بۆ من کە کوردستان و بەشێک لە ئێرانم چیتان کردووە؟ سەردەمێک ئاتاتورک لە تورکیە زمانی لە دەمم دەرهێنا و مندالانی لە زکی دایکان بە نووکە ڕمبی سەربازان ڕژاندە سەرزەمی و مالمی ئاگر تێبەر دا و ئاوارەی شاخ و بیابانمی کرد و برای ئەو ڕەزاخانی قەزاق لە ئێران جلوبەرگی منی دەرهێنا و کلاوی نویخوازی کردە سەرم و لە هەموو شوێنێک منی دایە بەر قامچی حکوومەتی نیزامی و جەستەی خۆشەویستانمی بە سێدارەوە هەڵواسی لە عێراقدا، بریتانیای مەزن و داگیرکەری پیر، ڕێبەرم شێخ مەحموودی بەرزنجی بە دیل گرت و بۆ هێندووستان دووری خستەوە و بەندیخانەکانی عێراقی پڕ کرد لە ئازادیخوازانم

و خەیریەکان و لەیلاکانی لە من سەند و لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی لێیان ئەستاند و...

بەڵام ئێستا کە سەددام حوسەینی خوێنمژ دەستی هەموو جەنایەتکارانی مێژووی لە پشتەوە بەستووە ڕۆحی چەنگیز و تەیموور و شمر و یەزیدی لە خۆی شادمان کردووە و ئێوە بە چاوی بازەوە کارەساتی مەینەتباری من دەبینن و بۆردوومانەکانی هەڵەبجە و بیارە و سیروان و شوێنەکانی تر دەبینن و جەستەی نیوە سووتاوی منداڵانم لە کوردستانی عێراق دەبینن بۆ من چیتان کردووە و چی دەکەن؟ ئێستا مە لە نێو بەف و سەرما و بۆران لە چیاکانی سنووری ئێران و عێراق ئاوارە ماوم و منداڵانم ڕەق هەڵدەگەڕێن و هەر ڕۆژ سەدان کەسیان لە ژێر قوڕ و بەرف دەنێژم و ئێوەش لە تەلەڤیزیۆنەوە مەینەتیەکانی من دەبینن و تەنانەت ڕۆژئاواییەکان کە چەکی کیمیاویەن بە سەددام داوە بۆم دەگرین ئێوە بۆ من چیتان کردووە؟ ئایا من مافی ئەوەم نیە لە ئێوە پرسیار بکەم کە بە چ هۆیەک زۆرتر لە نیو سەدەیە کە منتان لە بیر چووەتەوە و تەنانەت پارچە هۆنراوەیەکتان بۆ ڕۆژڕەشی و چەوساوەیی من نەهۆنیوەتەوە و قەڵەمێک و هەنگاوێکتان بو دەربڕینی ڕەنجەکانم هەڵنەگرتووە؟ ئێوە کە بە بۆنەی سووتانی پەپوولەیەک لە دەور مۆمێک یان ناڵەی بولبولێم لەسەر چڵی گوڵێک سەدان دیوان و شێعر و وتارتان نووسیوە و سەدان خاروار کاغەزتان ڕەش کردووەتەوە بۆچی تەنیا لاپەڕەکتان بۆ من و بۆ خۆشەویستانی لە دەست چووم نەنووسیوە و تاقە دێڕێکتان لە شین‌گێڕان و ڕۆژڕەشیم نەهۆنیوەتەوە و نەنووسیوە؟

ئێستا ئێوە ئەی شاعیران و بێژەران و ڕۆژنامەنووسان و نووسەران و ئەدیبانی ئێرانی هاونیشتمانم، ئەگەر ئێوە لە دادگای مێژوو دادگایی بکرێن، چی وڵام ئەدەنەوە؟

ئێوە دیتان ئەو ژنە لاوەی کە دوای بە دونیا هاتنی منداڵەکەی لاقی منداڵەکەی گرت و هاویشتیە نێو ڕووباری بە گرمە و لرفە و وتی: بڕۆ ئەی خۆشەویستی من، بڕۆ ئەی جگەرگۆشەم لە ئاوەکانی سەرد و پڕ جۆش و خرۆش

بێدەنگ و سەرد بە تا وەکوو منی بەدبەخت و ئاوارە سەر لێشواو و پەرێشان نەبی!!
بەڵێ خۆشەویستان منیش وەکوو ئێوە بۆ کوردستانی خۆشەویست کارێکم ئەنجام نەداوە، بەڵام ئێستا کە ئەژنۆی خەمباریم بە سینگەوە ناوە و شین‌گێڕی خۆشەویستانم دەکەم، چاوەڕوانیم لە ئێوە ئەوەیە بە قەڵەمتان، بە هۆنراوەتان، بە سروودتان سەرەخۆشی لە من و لە خۆشەویستانی لە دەست چووم بکەن و ببنە مەرهەمێک بۆ سارێژ بوونەوەی برینەکانم. سەقز. برتان فارۆقی

**٥٢- فەرانسە- پاریس- بەڕێز دوکتۆر عەبدوڵلا مەردۆخ** ١٩٨٨/١٢/٣٠-

بەڕێز دوکتۆر مەردۆخ کە یەکێک لە لێکۆڵەرانی کورد لە دەرەوەی وڵاتە نامەیەکیان بە خەتی جوانی خۆیان لە فەرانسەوە بۆ من لە دوو نۆرە نووسیوە و ناردوویانە کە بە جێگەی داخم زانی کە خوێنەرانی نامە جوانەکەیان خرایە بەرچاو. بەڵام بە داخەوە کە بەڕێزیان بەڵێنی خۆیانی بە جێ نەهێنا و ئەو کتێبانە کە فەرمووبوویان بە زەحمەتێکی زۆر بۆیانم دابین کرد و ناردم و چەند نامەشم نووسی کە لانی کەم ڕابگەینن کە گەشتووەتە دەستیان بەڵام هیچ خەبەرێک نەبوو. بەڵام بەڕێز دوکتۆر پاپۆلی کە لە فەرانسەوە هاتبوون فەرموویان کە کتێبەکان گەیشتووەتە دەستیان. ئەم هەڵسوکەوتەی بەڕێزیان دڵی منی ئێشاند. بەڕێزیان لە نامەی یەکەم لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/١٢ فەرموویانە: «زانای بەڕێز جەنابی ئاغای تەوەحۆدی ئۆغازی... ماوەیەکی زۆرە لەگەڵ نووسراوە پڕ بایەخەکانی ئێوەدا ئاشنام. ئێستاش بۆ کۆکردنەوەی کتێبێکی گرینگ دەربارەی «مێژووناسی کوردی» پێویستیەکی خێزرام بە ئاسەواری ئێوە لەمەڕ مێژووی کوردانی خوراسان هەیە، مخابن هەموو پشکنین و گەڕانێکی من بۆ دۆزینەوەی ئەو کتێبانە لە ئورووپا ئاکامێکی نەبوو. تکایە ئەگەر بۆتان دەکرێ هەر دوو بەرگی ئاسەواری خۆتان بۆم بنێرن...» و لە نامەی دووهەم کە دەقی ئەوەتان بینی لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/١٢/٣٠ نووسیویانە: «ئێوە وەکوو مێژوونووسێک لە کوردەکانی خوراسان بۆ خوێنەرانی کورد خاوەنی گرینگیەکی زۆرن، بە تایبەت ئاسەواری ئێوە لە مێژووی کوردەکانی خوراسان جێگای خۆی هەیە.
هەروەها ناونیشانی یەکەمی ئێوەم لە [بەڕێز دوکتۆر پاپۆلی یەزدی] یەکێک لە

ماموٚستایانی زانکوٚی مەشهەد وەرگرت... دووهەمین ناونیشانی ئێوەشم لە هاوڕێ هێژام بەڕێز سەید موحەممەد سەمەدی وەرگرت. بوٚ زانیاریتان ڕادەگەینم کە لەم دوایانەدا لەلایەن بەڕێز تێوٚکرمان کە زمانناسی ناوداری ڕووسە کتێبێک دەربارەی زمانی کوردەکانی خوراسان لە ژێر ناوی... [بڕوانتە دەقی لاتین] بڵاو کراوەتەوە. ئەوەی کە گرینگە ناوڕوٚکی ڕووداوەکان و چیروٚکەکانی ئەم کتێبەیە کە ئێوەیان هاورێیانتان دەتوانن وەریانبگێڕنەوە، ئەم دەقانە بە خەتی لاتینی نووسراون.»

بە هەر حاڵ منیش چاوەڕێ بووم کە بەرگی سێهەم لە کتێبی کوٚچی مێژوویی کورد بوٚ خوراسان لە ژێر چاپ بێتە دەرەوە تا بوٚیان بنێرم.

سەرەنجام ئەم ئەرکە گرینگە کوٚتایی هات و دەورەیەک لە کتێبەکانی خوٚم و دەورەیەک لە کتێبەکانی بەڕێز میرینەم بوٚیان لە ڕێکەوتی ٦٧/١٢/٣ بە ڕێگەی پوٚست بوٚ پاریس نارد. بەڵام ئێستا هەرچی من و بەڕێز سەید موحەممەد سەمەدی نامە دەنووسین کە ئاغای دوکتوٚر لانی کەم ئەگەر کتێبەکان گەیشتووتە دەستتان بە ئێمەی ڕابگەینن وڵام نادەنەوە. ئەم بێڕێزیەی جەنابیان بووە هوٚی ئەوەی کە بوٚ یەکێک لە زانایانی کوردی خەڵکی ئوکراین کە یەکێک لە کوٚمارەکانی پێشووی سوٚڤیەتە و کتێبەکەمیان بە مەبەستی لێکوٚڵینەوە داوا کردبوو کتێبەکەم نەنێرم. چونکە وتم مەگەر من مەلا نەسرەدینم کە هەم کتێب بکڕم و هەم خەرجی پوٚست کردنەکەی بدەم. بەڕێزیان پێ زوٚرە ڕابگەینێت کە گەیشتووەتە دەستم؟

٥٣- **قووچان**- نامەیەک بێڕێکەوت لەلایەن برای پڕ لە هەستمان بەڕێز مەهدی شوجاع دەروونگەری. ئەم برامانە بە دوای هەواڵپرسی نووسیویانە، داواکارم دەقی سەرەکی نامەکەم بخوێننەوە. هەڵبەت من دوو جار نامەکەم خوێندەوە، بەڵام نامەکە لە چوار لاپەڕەدا بە کاغەزی گەورە نووسرابوو کە زوٚربەی مەسەلەی شەخسی و پەیوەندی بە خوٚیانەوە بوو. ئەو شتەی کە بووە هوٚی گلەیی بەڕێزیان ئەمە بوو کە بوٚچی لە شەڕی دەروونگەر کە لە نێوان جەجوو و ئەو یاخیانە کە لەلایەن ڕووسەکان پشتیوانی دەکران و لەودا عەلی ئەکبەر پەهلەوان موجریگی کوژرا نووسیومە دەروونگەریەکان ساویلکە بوون... باسێکی تر ئەوەیە کە خوالێخوٚشبوو سارم

دەرگەزی کە هەر ئەو میرزا مەحموود خانە لە سەیدەکانی ئەو مەڵبەندەیە، بە هـۆی ئەوەیکە ویستوویەتی بەشێک لە زەوینەکانی دەروونگەریەکان بە زۆر داگیر بکـات و خوالێخۆشبوو قوربان نادری کە کەسایەتیەکی بە وتەی بەڕێزیان چالاک و خەڵکی و باش بووە لە بەرانبەریان ڕاوەستاوە و لە ئاکامدا بە دەستی پیـاوانی سـارم بـە تـەوەر کوژراوە و هەتا ئەو ڕۆژەی خوالێخۆشبوو قوربان موحەممەد نادری زیندوو بـوو هـیچ کەس نەیدەوێرا تەریاک یان تەنانەت جگەرە بکێشێت و...

ئەمنیش دەڵێم، خوا باومی ئەم کەسانە بخاتە بەر دلۆڤانی خۆی کە ڕۆیـشتن و نەیاندی کە دەروونگهر کەوتۆتە چ حاڵ و ڕۆژێک. من خۆم لە ساڵی ١٣٦٦ ڕۆیـشتم بۆ گوندی موحەممەد تەقی بەگ کە بەڕێزیان ئاماژەیان پێ کـرد و شـەوم لـە ماڵـی بەڕێز موحەممەد موحەممەدزادە ڕابوارد بە داخەوە بەڕێزیان لە کاتی شەودا دەرگای ماڵەکەیان قفڵ کرد و کاتێک من هۆکاری ئەم کارەم پرسی وتیان کـە هـەر هـەموو ۳۵۰ بنەماڵەی دوچاری چارەنووسی ئەوان نەبین دەرگای حەوشـەکە قفـڵ دەکـەم و...

ئەمـە بـووە هـۆی خـەمباری مـن و هاوڕێیـانم. هیـوادارم بـە دوای هـەوڵ و تێکۆشانی برایانی سپای پاسداران و هیزی ئینتیزامی کە لە گەلالەی وەلعادیـات بـە کاری دەهێنن. ئەم گوند نشینانە بەڕێزانەمان کە ژیانیان کـەوتووە تـە مەترسـی لـە ناوچوون ئەم عادەتە تەرک بکە و بگەڕێنەوە بۆ تێکۆشان و کار و چالاکی و داهێنـانی خۆیان.

هەروەها بەڕێز شوجاع نووسیبوویان کە براکەی بە ناوی کیانووش لە بـەرەکانی شەڕی داسەپا و دژی عێراق شـەهید کـراوە کـە ئێمـە و هـەموو خوێنـەران سـڵاو دەنێرین بۆ ڕۆحی شـەهیدانی خۆشەویـستمان کـە لـە بـەرەکانی شـەڕی داسـەپاو شەهید کران و هیوادارین خوای مەزن ئەوان غەرقی دەریای ڕەحمەتی خۆی بکـات و سەبر و خۆڕاگری بداتە کەس و کار و بنەماڵەکانیان.

**٥٤- تاران** ٢٨/١٠/٦٧- برای زانا و نووسەری کورد بەڕێز **سەدیق سـەفیزادەی بۆرکەیی** کە زۆر ئاسەواری بە نرخیان چاپ و بڵاو کردووەتەوە ڕوو لە من فەرموویانە:

شتێک کە دەبێ بیڵێم ئەوەیە کە جێگای سەرسوورمانە کە لەم سێ بەرگ کتێبەی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان یادێکتان لە ئەبوو موسلیم خوراسانی نەکردووە نازانم بۆچی؟

ئەبوو موسلیم خوراسانی ناوی بێهزادان کوڕی وەنداد هورمۆز لە تۆرمەی گوودەرزی کوردە. لەساڵی ٩٨ی کۆچی مانگی لە گوندی فەندین سەر بە مەڵبەندی مەرڤ [لە خوراسانی گەورە] لە دایکبوو و لە سەردەمی لاوەتی سەرەتا لە خزمەتی ئیمام عەبباس کاری پێ سپێردراو لەلایەن ئەوەوە کرایە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەی ئەرکی سەرشانی خۆی و لەوێدا لەشکەرێکی کۆکردەوە و لە ساڵی ١٣١ی کۆچی مانگی دەستی بە سەر خوراساندا گرت و سەرەنجام زنجیرەی بەنی ئومەییەی لە ناو برد و خۆی لە ساڵی ١٣٧ی کۆچی مانگی بە دەست دەوانیقی خەلیفەی عەبباسی بە شێوەیەکی ناجوامێرانە کوژرا و تەرمەکەی خرایە ناو ڕووباری دیجلە کە هەموو دەیزانین و...

ئەبوو دەلامە شاعیری عەرەب کە لە دەرباری مەنسوور خزمەتی دەکرد سەبارەت بەو هۆنراوەیەکی وتووە و بە هۆی ئەوەیکە ئەبوو موسلیم کورد بووە گاڵتەی پێ کردووە: واتە ئەی ئەبوو موجریم (ئەبوو موسلیم ئایا خوای گەورە ئەو شتەی کە بە بەندە خۆی بەخشیوە و مەنسووری کردووەتە ڕێبەر و گەورەیی پێداوە دەتوانی لە ناوی ببەی؟ تۆ لە سەردەمی مەنسوور ویستت خەیانەت بکەی و باوکانی کوردی تۆش هەر بەو شێوەیە ناپاک بوون بە پێ وتەی ئەبوو دەلامە و نووسراوەکانی مێژوونووسان ئەبوو موسلیمی خوراسانی کورد بووە و وەها دەردەکەوێت کە کوردەکان لە سەرەتاکانی ئیسلام و پێش ئیسلام لە خوراسان ژیاون.

١. هەڵبەت ڕوانگەی بەڕێز حاج شێخ عەزیروڵڵا حەمزەکانلوو قووچانی کە لە گەورەترین زانایان و خوراسان ناسانە و بە حەق ناسر خەسرەوی سەردەمی خۆیە ئەم بۆ چوونە بە هێنانەوەی بەڵگە دەسەلمێنێت. هیوادارم کتێبی خوراسانی گەورەی ئەوان هەرچی زووتر چاپ و بڵاو بکرێتەوە تا ئێمە لە توێژینەوەکانی بەرین و بە نرخیان کە بەڵگەی باوەڕ پێکراویان لە گەڵە بەهرەمەند بین، ئەو کات ڕوون

دەبێتەوە کە چی بە سەر کوردەکانی سەردەمی ساسانی کە سنوورەکانی خوراسانیان دوای بەهرامی چووبین دەپاراست هات؟ هەروا کە مێژووناسان نووسیویانە عەشیرەتەکانی شوانکارە بازرنگی کە [بەختیاریەکانی ئێستا لە نەوەکانی ئەوانن] لە مەڵبەندی فارس خەریکی ئاژەڵداری و شوانی بوون و ئەردەشیری بابەکان کە زنجیرەی دەسەڵاتی ساسانی بە دیهێنا. لە عەشیرەتی کوردی بازرنگی بووە[228] و شک لەوەدا نیە کە کوردەکانیش لە مێژە لە خوراسان ژیاون و ئەبوو موسلیم لە نێو ئەواندا گەشەی کردووە، بەو هیوایە کە لەم پەیوەندیە لێکۆڵینەوەی زۆرتر بکەن.

تەوەری دووهەم کە شیاوی گوتنە ئەوەیە یەکێک لە شاعیرانی سەدەی دوازدەهەم بە ناوی ئەلماس خان کورد کەندوولەای (١١٨- ١٩١ کۆچی) هەلبەستێکی هەیە بە ناوی نادرنامە کە سەرکەوتنەکان و شەڕەکانی نادرشای لەودا هۆنیوەتەوە. ئەڵماس خان خۆی یەکێک لە سەردارانی نادر بووە و لە شەڕی نادر لەگەڵ تۆپاڵ شا ڕێبەرایەتی چەند لەشکەری لە ئەستۆ بووە. کاتێک هەواڵی کوژرانی نادری لە شەڕ لەگەڵ عوسمانی بیست ئەویش بە ناچار گۆڕەپانی شەڕی بە جێ هێشت و بەرەو ئێران پاشەکشەی کرد. نادریش کە بۆ یارمەتیدانی ئەڵماس خان هاتبوو چونکە زانی کە ئەڵماس خان پاشەکشەی کردووە ڕێگەی بەغدای گرتە بەر و ئەو شارەی داگیر کرد کاتێک هەواڵی سەرکەوتنی نادر گەیشتە ئەڵماس خان جارێکی تر گەڕایەوە بۆ لای نادرشا و داوای لێ کرد بیبەخشێ و دەست لە کارکێشانی خۆی ڕاگەیاند. نادریش ئەو داواکاریەی ئەوی قەبووڵ کرد و ئەم گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی کەندوولە لە نزیکی کرماشان و چەند ئاسەواری بە نرخی کۆ کردەوە کە یەکێک لەوانە نادرنامەیە ئەڵماس خان لەم ئاسەوارەی خۆی لە بەشداری چالاک و بەرینی کوردەکانی خوراسان لە شەڕ لەگەڵ تۆپاڵ پاشا قسە دەکات و دەڵێت:

---

228- ڕوانگەی خوالێخۆشبوو مامۆستا ڕەشید یاسمی لە کتێبی مێژووی ڕیشەی ڕەگەزی کورد ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت.

لە قسەکانی ئەو وا دەردەکەوێت کە لەشکەرەکانی قووچان و کەلاتی نادری لەم شەڕانە بەشداری چالاکسان هەبووە.

هەرچەند کە تەنیا ناوی عەشیرەتی عەمادلووی هێناوە، بەلام لە شوێنەکانی تر لە عەشیرەتەکانی تری کوردی خوراسانیش ناو دەبات و باسی ئەوانیش دەکات. حوسەین حوزنی موکریانی مێژوونووسی بە ناوبانگی کوردیش لە کتێبی «کورد و نادرشا»ی خۆی هێناویە کە ئەگەر کوردەکانی خوراسان نەبوون نادر هیچ کات ناگەیشتە سەرکەوتن و دەسەلاتداری و...»

بەڕێز بۆرەکەیی فەرموویانە: ئەم کتێبەم لە سەردەمی مێر منداڵی کاتێک کە لە عێراق خەریکی خوێندن بووم خوێندووەتەوە ئەگەر ئەو کتێبەتان نیە بۆتانی بنێرم. منیش وتم: چاکە و پرسیار؟ لە کار خێر پێویستی بە فاڵ گرتنەوە نیە. بەخشین دەبێ بە تەواوی بکرێت.

٥٥- شیروان- هۆنراوەی سەرەوە لەلایەن برای هەست ناسکمان بەڕێز ڕەمەزان سەییاح جەلالی لە مامۆستایانی پەروەردە و فێر کردنی شیروان و مامۆستای وانەکانی جوگرافی و مێژوو بۆ تام و چێژی نامە جوانەکەیان نووسیویانە کە وەرگێڕانەکەی بەم شێوەیە:

مەرزێ گازێ[٢٢٩]، مەرزێ گازێ    دەنویسم لە کار غازێ

دەشینمە سەر ئەغازێ[٢٣٠]    مینێ «کەلیم» چی دەخازێ

[229]- گاز: بەرزایی. هەوراز. دوندی چیا کە پێچەوانەکەی دەبێتە «نال» واتە ژێردەستە. خوار. ئەم وشانە لە نێو خەلکی لاین و جەلالی بەم واتایانە دەگوترێت. لە شوێنەکانی تری کورمانجنشین نەختێک جیاوازی لە واتاکان هەیە.

[230]- ئوغاز کە هەمان ئەبقاز، ئابقاز دێتە ئەژمار گوندی شوێنی لە دایک بوونی نووسەری کتێبەکەیە و دەبێتە ناوەندی عەشیرەتی کیکانلوو شارەدێ سیوکانلووە. من لە بەرگی یەکەمدا نووسیبووم کە ڕەنگە وشەی «ئوغاز» لە «ئوغوز» ناوی سەرۆک خێلی تورکانی «غوز» گیراوە کە هێشتا لە قسە

ئــەی بــەرزایی چیــا، بــەرزایی چیــا ئەوەی لەدڵم دێتەدەرلەسەر کاغەزدەینووسـم

ئــەو دەنێــرم بــۆ مەڵــبەندی ئۆغــاز تــا بــزانم و ببیــنم کــەلیم چــی دەوێــت

بەڕێزیان نووسیویانە کە بە دوای موتـالای بـەرگی دووهـەم کـە کارەسـاتەکانی مێژوویی جیابوونەوەی مەڵبەندی جوانی فیروزەی لە خوراسان لە خۆ گرتبوو شـەو و ڕۆژ چاوەڕوانی گەیشتنی بـەرگی سـێهەم بـووم کـە ببیـنم کۆتـایی ئـەم کایـە و چارەنووسە ڕەشە مێژووییە بە کوێ گەیشتووە. بەختەوەرانـە ئـاواتم بـە دی هـات و هەر ئەمڕۆ بەرگی سێهەمی کتێبەکەی ئێـوەم کـرِی، نـازانی چ خۆشـی و هەسـتی خۆشحاڵی بە من دەستی دابوو. لـە خۆشـیان ئـەو شـەوە تـا کـاتژمێر یـەکی دوای نیوەشەو بە خەبەر بوو و هەتا لاپەڕەی ٢٠٠ موتاڵام کرد کە ئیتر چاوم مانـدوو بـوو و من ناچار بووم موتالای باقی کتێبە کە بخەمـە ڕۆژی داهـاتوو بـە ڕاسـتی دەسـتان خۆش بێت بۆ نووسینی ئەم کتێبە کـە فەرهـەنگ و هونـەر و مێـژوو و جوغرافیـای ئێمەی لە خۆ گرتووە و زیندووکەرەوەی داب و نـەریتی کورمانجـە. بـەڵام چەنـدێ دێرێکیش لە پەیوەندی لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتی خۆم بۆتان بنووسـم تـا ڕوانگـەی ئێوە چی بێت؟ بە دوای موتاڵای کتێبەکـەی ئێـوە حـەزم کـرد بـزانم کـە لـە کـام عەشیرەتم و کاتێک لەگەڵ دایە گەورەم و بە ساڵاچووانی تر قسەم کـرد دەرکـەوت کە من لە عەشیرەتی کووران لە عەشیرەتی جەلالیم کە لـە فـیرووزە دەرکـراوین و ئێوە لە بەرگی دووهەم و سێهەمی کتێبەکەتان لـە سـەری قسـەتان کـردووە. دایـە

نەستەقەکان خەڵک دەڵێن «ئوغوز گووتیە» واتە ئوغوز وتوویە. بەڵام بـە هـۆی بەڵـگەکان و قەباڵـە کۆنەکان کە دوای بڵاو کردنەوەی بەرگی یەکەم بە دەست هات دەرکەوت کە ئێرە بە هۆی ئولەنگزار بوون و هەبوونی رووبارەکان و کانیەکان و گۆمەکانی زۆری ئاو جێگەی ژیانی قـاز و سـۆنە و مـراوی بووە، و هەر بەم هۆیەوە بە ئابقاز کە هەمان ئابغـازە ناوبـانگی دەرکـردووە و ئیمـرۆژ خەڵـکی ئۆغـاز دەڵێن. لە دەفتەرەکان و دیوانە حوکمیەکان لەم ساڵانەی دواییدا «ئوغاز» نووسراوە. کە وشەی «او» هەمان ئاو لە شێوەزاری خوراسانیەکانە، سەرەڕای وشەی «غاز». ئاف غاز= ئابخاز.

گەورەم کە لە دایک بووی فیرووزەیە دەڵێت:

ئێمە بە دوای شۆڕشی کۆمۆنیستی ڕووسیە لە ساڵی ١٩١٧ی زایینی دڕ دونگ بووین کە لە ڕووسیە بمێنین یان بگەڕێینەوە بۆ ئێران زۆربەی خەڵکی فیرووزە (هەروەها کە لە زمانی خوالێخۆشبوو نووسیوتانە) هەر لەم خەیاڵەدا بوون تا ئەوەی کە دیمان ڕۆژێک ڕووسیەکان سێ مریشکیان سەر بڕیوە و لە سەر دەروازەی شاری فیرووزە هەڵیانواسیوە. یەکێک لە مریشکەکان پەڕەکانی پێوە بوو، دووهەمیان نیوەیەک لە پەڕەکانی لێوە کرابوو، سێهەمیان بە تەواوەتی ڕووت کرابوو و پەڕی پێوە نەمابوو. ڕووسەکان خەڵکیان لە گۆڕەپانی فیرووزە کۆ کردەوە و وتیان: هەرکەس دەیهەوێ بڕواتەوە بۆ ئێران وەکوو مریشکی پەڕدار وایە یانی دەتوانێت هەمومو سەرمایەی خۆی کە شیاوی ڕاگواستنە لەگەڵ خۆی ببیات و بڕوات. هەرکەس مانگێکی تر بڕوات دەتوانێت وەکوو مریشکی دووهەم نیوەیەک لە دارایی خۆی ببات و ئەوانەی کە شەش مانگی داهاتوو کۆچ بکەن دەبێ وەکوو مریشکی سێهەم ڕووت و قووت هەموو شتێکی خۆیان بە جێ بهێڵن و بڕۆن.

ئەم کارەی ڕووسەکان کە مەترسیەکی سەرەکی بۆ داگیرکردن و تالانکردنی دارایی خەڵک بوو ئێمەی دوچاری ترس و پشڵەژان کرد و ناچار بووین دوای ماوەیەک وەکوو مریشکی دووهەم نیوەیەک لە دارایی خۆمان هەڵبگرین و لە فیرووزە کۆچ بکەین و بە ڕێنوێنی بەڕێز حاج دەوڵەت نامانلوویی لە ڕێگای باجگیرانەوە بڕۆین بۆ شیروان و لە کەناری عەشیرەتی کووران کە پێشتر لە فیرووزە دەرکرابوون و لە قۆلجووق (گولجووک) دەژیان نیشتەجێ بووین. هەروەها دایە گەورەم یادێک دەکات لە داری چناری گەورەی فیرووزە کە ئێوە لە لاپەڕەی بەرگی سێهەم ناوتان هێناوە و وێنەی ئەو دارەتان لەگەڵ کچانی جوانی کورمانجی فیرووزە لە بەرگی دووهەم لاپەڕەی ٤٨٠ چاپتان کردووە و من دەبینم کە هەر کاتێک ناوی ئەم چنارە و سروشتی جوانی فیرووزە دەبات فرمێسک لە چاویدا قەتیس دەمێنێت. ئەو دەڵێت ئەگەر حەوت نەفەر پیاو باوەشیان ئاوەلا بکردایت و دەستیان بدایە دەستی یەکتر بە سەختی دەستیان دەگەیشتە ناوقەدی ئەم دارە. کەلیمگیان ئێمە

ئێستا لە شیروان لە شارۆچکەی تاڵەقانی دەژین. ئەگەر سەردانێکی ئێمە بکەن زۆر سپاستان دەکەین و دایە گەورەم دەتوانێت لە بیرەوەریەکانی جوانی فیرووزە زۆر چیرۆکی دڵڕفێنتان بۆ بگێڕێتەوە. ئەمنیش وێڕای سپاس لە برای کوردی جەلالیم و دایە گەورەیان هیوادارم بتوانم سەردانیان بکەم و بیرەوەریەکانی دڵڕفێنی فیرووزە لە زمانی بەڕێزیانەوە ببیسم. (بە ئاواتی ئەو ڕۆژە.)

٥٦- تاران- ٦٧/١٢/٦- برای زانا و ئەیب و بیرمەند و نووسەری تێکۆشەری کورد بەڕێز ڕەئووف تەوەکۆلی کە بە هۆی سەفەری زۆر بۆ ناوچە کوردنشینەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و موتاڵای زۆریان دەربارەی مێژوو لە مێژووی ئێمەدا خاوەنڕا و ئاگادارن و ئەمن هەمیشە لە مێهرەبانی بێ‌کۆتایی بەڕێزیان و مامۆستایانی تری کوردمان بەهرەمەند بووم و دەبم، لە نامەیەکدا بەم شێوەیە مێهرەبانی خۆیان بەرانبەر بە شاگردانیان دەربڕیوە سەر نامەی نامە بە ناوی «الله»

بادی سەبا دەخیلەک واسڵ کە ئەم پەیامە

دەمێکە لێک بڕاوین وەعدەی دوعا و سەلامە

واتە: ئەی بادی سەبا دەستم بە دامانت، ئەم پەیامەم ڕابگەینە؛ چۆن ماوەیەکە لە یەکتردا بڕاوین و ئێستا کاتی دوعا و سڵاو گەیشتووە.

برای زانا، کاک کەلیموڵڵا تەوەحۆدی! جارێکی تر سڵاو. دووبارە بای سەبا لە هەرێمی خوراسان و لە نیشتمانی ئەبوو موسلیمی کوردی خوراسانی و ئەمیر حوسەین خان شوجاعولدەولە و ئازار موحەممەد و جەجووخانەکان و توحفە گوڵەکان، مزگێنیەکەی ئێوە واتە بەرگی سێهەمی کتێبی «کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان»ی بۆ ئێمە هێنا. ماچم کرد و لە سەر سەرم دامنا. جارێکی تر ئافەرین و هەزار ئافەرین بۆ ئێوە، کە ماندوویەتی و بێ‌هیوایی و بێ‌هێزیتان بە کایە گرتووە و هەروەها بەردەوام لە سەمەرەی بیرمەندی و نووسین کە وەکوو بەری داری خوێنی شەهیدانەیە زاری لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیتان شیرین کردووە و

مێژووی پڕ لە شانازی باپیرانمـان لـە ڕێگـای پارێزگـاری لـە سـنوورەکانی ئێـران و خەباتی ماندوونەناسانە و بەردەوامیان دژی بێداری و داگیرکـەریتان لەسـەر تەوێـڵی مێژوو نەخشاندووە. لە بەرگی سێهەم لە تـاڵان کـردنی و ڕاو و ڕووتی ئاسەفولدەوڵـە والی خوراسان و گزیر و نۆکەرەلکانی پەردەتان لاداوە و ئەم حاکمە مەحکوومەتان لە بـەردەم مێـژووی خوراسـان بـە خەڵـک ناسـاندووە و زوڵـم و چەوسـاندنی دژی کوردەکانی تێکۆشەری قووچان و دەرگەزی لە لاپەڕەی ٢٦٥ و بەدیل گـرتنی بـاس کردووە. بە خوێندنەوە لاپەڕی ٢٧٨ و وڵامدانەوەی لاوازی دەسەڵاتدارانی بێ‌عـەقڵ و چاونەکراوەی سەردەمی قاجاڕ لە بەرانبەر وەها کارەسـاتێک زۆرتـر ئاگـادار بـووم. بەشێک لە ئاوازی «بولبولی بەیانی» هۆنراوەی خوالێخۆشبوو مەلەکولشوعەرای بەهار کوردی دوبنەلی کە لە سەردەمی ڕەزاخانی پەهلەوی هۆنیویەتەوە وە بیرم هات لـەو جێگایەدا کەوتوویەتی:

بولبولی بەیانی دەست بە خاڵە داخ و کەسەری من نویٚ کـەرەوە زوڵـمی زاڵـم زەختی ڕاوچی، هێلانەتی کردە وێران

تۆ برای بەڕێزم کەلیموڵڵا، بولبولی بەیانی ئێمـە، بـە وتـنی ڕاسـتیەکانی تـاڵ و ستەمێک کە لەلایەن ناجوامێران بـە دژی کوردەکـانی هـەرێمی خوراسـان کـراوە، کوڵی دڵمت تازە کردەوە و بـە هـۆی ڕووداوی بەخـشینی شـارەدێ کوردنـشین و جوانی فیرووزە بە دەستی ناسرەددین شای قاجاڕ بە ڕووسـەکان (لاپـەڕەی ١٠٦) و کوژرانی سەردار ئەرەس موحەممەد (ئاراز موحەممەد) جەلالی (لاپـەڕەی ٢٣٩)، لـە سێدارە درانی حەسەن و بەگ موحەممەد (لاپـەڕەی ٢٤٥)، کـوژرانی جـەجووخان (لاپەڕەی ٤١٧) و گوللەباران کردنی کوڕەکەی (قەدەم یار) لاپەڕەی ٤٢٩ کە هـەموو ئامانە بە دەستی ڕووسەکان ئەنجام دا، داخی منت تـازە کـردەوە و تـازەترت کـرد و ڕق و قینت بەرانبەر بە چەوسێنەران و داگیرکەران زۆرتر کرد لە لایـەکی تـرەوە بـە هۆی گیانبازی و حەماسە خولقانـدنی شـەهیدانی نـاوبراو و شـەڕەکانی شـێرەژنێک وەکوو توحفە گوڵ لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووسەکانی داگیرکەر (لاپەڕەی ٢٤٣) کە بە پێشکەش کردنی خوێنی پاکیان جیهانێکی پڕ لە شانازییان بۆ مێژوویی پـڕ لـە

کارەساتی کوردستان خولقاند. زامی دڵم نەختێک سارێژ بوو.

شتێکی تر ئەوە کە هاواری لاوێکی کورد کە دەزگیرانەکەیان بە دیلی بردبوو (لاپەڕەی ٢٨١) و ناڵەی و هەڵاتنی و ڕوو لە شاخ و بیابان کردنی چیرۆکی خامباری فەرهاد و لە ئەوینی شیرین، وامێق لە دووری عوزرا و مەجنوون لە دووری لەیلی و مەمە لە غەمی زین لە شاکاری کوردی ئەحمەدی خانی و بیرم هێنایەوە. بە کورتی دەبێ بڵێم، کەلیمگیان کتێبی ئێوە کاتێک خوێنەر وەگریان دەخات، کاتێک دەیخاتە پێکەنین و هێندێ کات هەستی دەبزوێنێت و تووڕەی دەکات. تۆ بە خولقاندنی ئەم شاکارە فەرهەنگیەت ڕابردووی پڕ لە شانازی هەزاران کوردی خوراسان، گیلان، مازەندەران، سیستان و بەلووچێستان و پاکستان و هیندووستانت لە نەمان و لە نێو چوون ڕزگار کردووە و بە هەموو کەس ناساندووە.

ئامۆژگاری زانایانەت بۆ کچێکی کورد لە ژێر ناوی خانگێ من کورمانج لە لاپەڕەی ٤٦٥ بۆ پاراستنی جلوبەرگ و داب و نەریت و ڕێورەسمی فەرهەنگی چەندین هەزار ساڵەی بە جێماو لە باپیران و پارێزگاری لەو ئامۆژگاریەکە کە هەرکەس بە پێ پابەند بوونی خۆی بە ئاریایی بوون و شەرافەتی نەتەوەیی خۆی بە هەر کوێ جیهان کە هەیە دەبێ بە کاری ببات و بیکاتە گۆوارە لە گوێ خۆیدا.

تەوەحۆدی عەزیز، سەبارەت بە ئەم کارە گەورەیەت هەرچی بڵێم کەمم وتووە و نەمتوانیوە مافی شیاوی خۆت پێشکەش بکەم. دەستت خۆش بێت و خوای مەزن هەمیشە یار و هاوڕێت بێت ئامین. هاوڕێتان موحەممەد ڕەئووف تەوەکولی بانەیی.

لە کۆتاییدا یەک دوو هەڵەی چاپیتان پێ ڕادەگەینم. لاپەڕەی ٤٢. چوار دێڕ بە ئاخر «١٣٠٨» دروستە. لاپەڕەی ٥٢١. سێ دێڕ بە ئاخر شێخ مەحموود ڕێبەری شۆڕشی نەتەوەیی کوردەکان دژی ئیستێعماری بریتانیا خەڵکی بارزان و بارزانی نەبووە و بەرزنجیە.

٥٧- **کرماشان**- ٦٧/١٢/١٨- ستار نیازی. برای پاسدارمان لە هێزی هەوایی سپای پاسداران کە ناوی ستاری نیازیە و لە کوردەکانی شاملوو دانیشتووی کەلاتەی بالی (باری) وێڕای نامەیەکی پڕ لە هەست و خۆشەویستی نووسیویە: لە سروشتدا با

چاوی پڕ لە گریان وەکوو دڵۆپەکانی باران کە فریشتەکان لە ئاسمانەوە پێشکەشمانی دەکەن، وشەیەکم شیاوی ئێوە پەیدا نەکرد لە ئاکامدا دڵی خۆم بە چەقۆی خۆشەویستی شەق دەکەم و دڵۆپە خوێنێک کە دێتە خوارەوە وەکوو سڵاوێک پێشکەشتانی دەکەم بەڵێ برای من تەوەحودی من پێشتر نامەیەکم لە بەرەکانی شەڕی داسەپاوی عێراق لە کوردستان بۆتان نارد، بەڵام لە بەرگی سێهەم ناوێکی نەبوو. بە داخەوە بەرگی یەکەمی کتێبی ئێوەم لە خوراسان و کوردستان و باختەران و تاران و لە هیچ شوێنێکی تر دەست نەکەوت من ئێستا لە کرماشان لە هێزی هەوایی سپاس پاسداران خەریکی خزمەت کردنی نیشتمانم شیاوی وەبیر هێنانەوەیە، باپیرم ئاقاخان سەردار کەلاتەی باڵی بوو. ئێوە بە خوای گەورە دەسپێرم.

لە وڵامی هاوشاری خۆشەویستم نیازی ڕادەگەینم کە نامەی پێشتری بەڕێزم نەگەیشتووەتە دەستم. ولە وڵامدانەوەی بەڕێزیان و بۆ قەرەبوو کردنەوە وێنەیەک بە باپیریان ئاقاخان کە لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی شا چاپ کرابوو و بە ئاقاخان سمێڵ دەناسرا لە بەرگی حەوتەم چاپ دەکەم.

٥٨- **عیشق‌ئاباد (مانە)**- ٦٧/١٢/٢٥- برای بەڕێزمان موحەممەدڕەزا نەزەری دیرقانلوو. دانیشتووی عیشق‌ئاباد سەر بە مەڵبەندی بجنوورد بە کوردی نووسیویانە: برام کەلیم سڵاوی خوای گەورەت لێ بێ تەندوستیت بە ئاوات دەخوازم و هیوادارم هەمیشە خۆش و سەربەرز بیت بەو هیوایە، ئەم برامانە سەرەڕای بانگهێشتی ئێمە بۆ گوندەکانی خۆیان دیرقانلوو و هەروەها عیشق‌ئاباد فەرموویانە، من یەکێک لە خوێنەرانی ئاسەواری بە نرخی ئێوە و لایەنگرانی پێداگری کتێبەکانی ئێوەم. چونکە ئەمە ئێوە بوون کە وەکوو پیاوێکی ئازا هەستان و کوردی کورمانجی خوراسنتان بەو جۆرەی کە شیاوە بە براکانی تری هاونیشتمانی تورک و فارس ناساند. من بە خۆم شانازی دەکەم کاتێک دەخوێنمەوە کە باوکام و باپیرانمان بەو شێوەیە ئازا و نەترس بوون و لە بەرانبەر داگیرکەران و زۆر بێژان ڕاوەستاون...

ماوەیەک لەمەوبەر لە خزمەتی شاعیری کورد زمان و برای خۆشەویستمان

بەڕێزکیان ڕەبانی دیرانلوو بووم، بەڕێزیان فەرموویان کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر مامۆستای پایەبەرز، تەوەحۆدی بە بجنوورد بوون، نازانن چەندە ئاه و حەسرەتم هەڵکێشا کە نەمتوانی بگەیمە خزمەتیان و...

هەروا کە وترا گوندی ئێمە بە ناوی دراقانلوو یان دیرقانلوو ناسراوە و لە باکووری گوندی بەدرانلووی بجنوورد لە شیعرێکی قووڵدا هەڵکەوتووە و باخی زۆری هەیە کە لە کانیاوەکانی جوان و گەوارای چیاکانی ئاخور داغ ئاو دەخۆنەوە و لە تایبەتمەندیەکانی ئەم گوێندە ئەوەیە کە لە نێوان چەند گوندی تورک‌نشین هەڵکەوتووە، ... گوندی تورکمان‌نشینی گوودری سەلاخ لە باشوور و گوندی تورک زمانی فەخرەددین لە باکوورە، بەلام دراقانلوو لەم نێوەدا کورد زمانە لە دراقانلوو پیرە پیاوێکی بە ساڵا چوومان هەیە کە لە هاتنی ئەمیرجان موحەممەدخان قاجاڕ دولو قسە دەکات و دەڵێت ئەو کاتەبەو ئەمیر قەسابیان دەوت کە لە نێو گوندی قەجەر و دیرقانلوو و حەوت کەس لە کوردەکانی گوللەباران کرد و دوایی ڕۆیشت بۆ ئاشخانە و تورکمەن سەحرا...

ئێوە لە بەرگی دووهەم لاپەڕەی ٣٢٠ فەرمووتانە: کە دیرقانلوو لە عەشیرەتەکانی خێڵی شادلووە و بە ساڵاچووانی ئێمە دەڵێن ناوی ئێرە لە بنەڕەتدا شیوی قانلوو واتە دۆڵی خوێنین بووە، چونکە هەمیش تورکمانەکان هێرشیان دەکردە ئێرە و شەڕ ڕووی ئەدا و زۆریەک لە هەر دوولا بە خاک و خوێن دەکێشران، داواکارم بیروڕاتان لەم بارەیەوە بفەرموون.

(ئەمن لە وڵامی ئەم برایە عەرز دەکەم لەمەڕ هاوناو بوونی زۆربەی گوندەکان یان عەشیرەتەکان و خێڵەکان بە ڕاشکاوی ناتوانرێ بۆ چوونێک بوترێت، ئیمکانی هەیە ئەو بۆ چوونەی بە ساڵا چووان دروست بێت و مومکینە ئەو بیر و بۆچوونە کە دەرم بڕیبوو کە دیرانلووکان و دیرقانلوو پەیوەندی هەیە بە هەمان دیران و دیرکان لە قەفقازیە کە دوای ئەوەی هاتوون بۆ خوراسان ئەم ناوانەیان لە سەر گوندەکانی خۆیان پاراستبێت) برای بەڕێزم نەزەری ئەوەشیای زیاد کردووە: تیرەکانی ژێرەوە لە دانیشتوانی دیرقانلووی ئێمەدا نیشتەجێن:

۱. **قەرەباشلوو** (کە دانیشتوانی سەرەکی دیرقانلوون و لە عەشیرەتەکانی شادیلوون).

۲. **وری** (ورانلوو) کە ئەمانە لە عەشیرەتی زەعفەرانلوون و ناوەندی ئەوان لە نێوان قووچان و ڕادکان و چنارانە.

۳. **ئێسفەهانی**- کە دەڵێن باپیرانیان لە ئێسفەهانەوە هاتوون.

٤. **ئوزبەکی** (کە وادیارە لە عەشیرەتەکانی شکست خواردووی ئوزبەک بە دەست کوردەکان بن).

۵. **بەحری**- کە دەڵێن باپیرانی ئەوان لە بەحرەینەوە هاتوون.

٦. **تەمانلوویان تەمەیی**. (ئەمانەش لە عەشیرەتی ڕەشوانلوو لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بجنوورد و سەر بە مەڵبەندی شیروان زەعفەرانبوون) بە سپاس لە برامان نەزەری ڕۆژی ١٤ی خاکەلێوەی ۱۳۷۰ ڕۆیشتم بۆ عیشقئاباد کە بگەیمە خزمەتیان بەڵام لە بەختی بەد بۆ سەفەر چووبوون بۆ گونبەد قابووس.

۵۹- **ئێسفەهان**- ٦٧/١٢/٢٦- نامەیەکە لە برایەکی کورد زمان کە لە ئێسفەهانەوە پۆست کراوە و وێڕای دەربڕینی هۆگری و خۆشەویستی فەرموویانە، من بەرگی سێهەم لە کتێبی ئێوەم بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە تاوتۆی کردووە. واژۆی ئەم نامەیە وا دیارە ئەمە بێت: حەکیم هیتۆکی.

بەڵام ئەم برا بەڕێزە هێندێ وتەیان لە نامە چوار لاپەڕەییەکەی خۆی هێناوە کە چونکە زۆرتر لایەنی سیاسی لە خۆ دەگرێت و بە پێچەوانەی ڕەوتی کارەکەی منە، بۆیە ناتوانم لێرەدا بیهێنم و دەتوانن قسەکانی دڵی خۆیان لە یەکێک لە چاپەمەنیەکانی ناوەوە یان دەرەوەی ئێران بە چاپ بگەینن.

٦۰- **کارت پۆستاڵێکی** جوانە بە واژۆی یەکێک لە خۆشکان یان برایانی کورد کە پیرۆزبایی نەورۆزی ساڵی ٦٨ یان لە من کردووە. واژۆی نامەکە بەم جۆرەیە. کوردێک واتە یەک نەفەر کورد. نەورۆزی ۱۳٦۸ و ۲٦۸۸ی مێژوویی کوردی»

جێگای وەبیر هێنانەوەیە کە مێژووی کوردی کە لە مێژووی زایینی و کۆچی موسڵمانان کۆنترە پەیوەندی هەیە بە گرتنی وڵاتی لیدی و داگیر کردنی ئەو وڵاتە

بە دەستی مادەکان (کوردەکان). کە لە نێوان دوو ئاودا (مزبوپۆتامیا) هەڵکەوتبوو و بە دوای ئەوەدا سەر بە خۆیی و مانەوەی وڵاتی لیدی بۆ هەمیشە لە گەردوونەی مێژوودا کۆتایی پێ هێنرا. کوردەکان مێژووی خۆیان لەم ڕۆژەوە دەست پێ کردووە. بەڵام موحەممەدڕەزا شای پەهلەوی بە بۆنەی ڕق و قینێک کە لە کوردی هەبوو، نە تەنیا ویستی ناوی کوردستان لە پارێزگای ئێستای کوردستان کە ناوەندەکەی شاری سنەیە بڕێتەوە بەڵکوو چیژنە دەسکردەکانی ٢٥٠٠ ساڵەی خۆی لە زنجیرە دەسەڵاتی نیوە کوردی هەخامەنەشی دەسپێکرد و پادشاکانی ماد کە یەکەمین دامەزرێنەرانی شاهەنشاهی ئێران بوون، پشت گوێ خران و لە مێژووی ئێران پاکتاویانی کرد و لەبەرانبەر گۆڕی کورۆش کە دایکی ئەو ماندانای ناو بوو وتی: کورۆش منم شای شاکان!! بە ئاسوودەیی بخەوە کە ئێمە بە خەرین و نەخەوتووین.

دوایی دیمان کە چۆن بە خەبەر بوو و هەڵات و کورۆشی بێچارەی لە خەودا بە جێ هێشت و پۆستەکەی بە جێ هێشت. کورۆش کاتێک لە خەو هەستا کە پاسدارەکان دەورەیان دابوو، سەریکی لەقاند و وتی: هەی، هەی شاهەنشای ئاریامێهر!!

٦١- **تاران**- برای زانا و ڕووناکبیرمان بەڕێز **نەبەرد جاف** کە خۆی خێزانی زانایان لە ڕووناکبیرانی ئێمەن، وێڕای ناردنی کارت پۆستاڵێکی جوان بە بۆنەی هاتنی نەورۆزی کەونارای ٦٨ ئارەزوویان کردووە کە کتێبەکانی ترم لەم ساڵەدا چاپ و بلاو بکەمەوە.

٦٢- **کەرەج**- کارتی جوانی خۆشکی هێژا و زانا و شاعیرمان ناز ناز لاجانی بارزانی لە شارستانی کەرەج- عەزیمیە- کۆلانی بارزانیەکان- گەیشت.

بەڵام ئەم کارتی پیرۆزبایی خۆشکی بەڕێزمان، ئەمساڵ ڕەنگێکی تری هەیە، ڕەنگی خوێن. ڕەنگی جەنایەتی سەددام لە هەڵەبجە، ڕەنگی بێدەنگ بوونی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرانبەر زۆر و ستەمی ئێستێعمارگەرانی جیهان لە سەنەتەوە زۆر لێکراوە بندەستەکان. کارت پۆستاڵەکە وێنەیەکە لە بوردوومانی شاری هەڵەبجە کە بە هۆی جەنایەتی سەددام زۆرتر لە پێنج هەزار ژن و منداڵ و

پیر و لاوی لە خوێندا گەوزان و دەیان هەزار کەس بریندار و کەم ئەندام بوون.

خۆشکی بەڕێزمانت نازناز کە بە ڕێکەوت لە بەهاری ٦٨ بەختەوەری دیتنیان وێڕای بنەماڵەی هێژا و خۆشەویستیان بە نەسیبی من بوو، پێشتریش شێعرێکی جوانی بە بۆنەی چلەمین ڕۆژی گیان لە دەستدانی قارەمانی گەورەی کورد مەلا موستەفا بارزانی بۆم ناردبوو کە لە بەرگی سێهەم لاپەڕەی ٥٢٠ چاپ کرا ئێمەش لەبەرانبەردا بۆ ئەو خۆشکە ئاوارەیە و زۆر لێ کراوانی تری مێژوو بە تایبەت کوردەکان لە عێراق هیوای سەرکەوتنمان هەیە و لە خوای گەورە داواکارین کە دوژمنی خوێنمژی ئەوان سەددامی یەزید لە ناو ببات و لە زیلدانی مێژوو بنێژێت.

٦٣- **کەرەج- ١٩٨٨/١٢/٢٦- نێچیروان بارزانی-** نامەیەکی جوانە بە خەتی کوردی کە لەلایەن برای خەباتگێڕمان کە هێندی کەس بە هەڵە ناوەکەیان بە نەو شیروان بە کار دێنن. نێچیروان بە مانای ڕاوچیە. نێچیروان کوڕی نەمر ئیدریس بارزانی کوڕی مەلا موستەفا بارزانی قارەمانی مەزنی کوردی و برازای بەڕێز مەسعوود بارزانی ڕێبەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی عێراقە، چونکە نامەکە بە کورمانجی نووسراوە پێویست بە وەرگێڕان ناکات و دەقی سەرەکی نامەکە چاپ دەکرێت.

٦٤- **قووچان-** ١٣٦٨/١/١٢- برامان بەڕێز **سوهراب فەرهادی تۆپکانلوو** نووسیویانە: ڕۆحی جەجوو شاد بێت- هەر بژی کەلیمی حەماسە خولقێن (ئەم نامەیەمان پێشتر لە بەشی بە سەرهاتی جەجووخان هێنا).

٦٥- **کەرەج-** ٦٨/١/٣١- زانای پایەبەرزی کورد **بەڕێز ڕەشید کەیخۆسرەوی** وێڕای سەرنج و خۆشەویستیان لە نامەیەکی لێکۆ لەرانە و ١٠ لاپەڕەیی وتەی زۆریان لە پەیوەندی لەگەڵ شوێنی لە دایک بوونی ڕۆستەم پاڵەوانی ناوداری ئێران و چای شوغاد نووسیوە کە بۆ کورتبوونەوەی وتەکەیان تەنیا ناویانی هێناوە و هیواداریـن هەر چی زۆرتر لێکۆڵینەوەکانیان کە بەڵێنیان دابوو تەواوی بکەن و خوێنەرانی ئاسەوارە بە نرخەکانیان بەهرەمەند بکەن. بەڕێزیان بەڵێنی دا لێکۆڵینەوەی خۆی تا گەیشتن بە ئاکامی باش لە زیویەی کوردستان کە پێدەچێ

شوێنی پەروەردە بوونی ڕۆستەم بێت درێژە بدات.

چونکە توانیویانە شانامەیەکی کۆنی کوردی لەو مەڵبەندە بدۆزنـەوە شـیاوی وە بیر هێنانەوەیە کە بەڕێز کەیخۆسرەوی بە نووسینی کتێبی بە نرخی خۆی بـە نـاوی «سەردەمی بێخەبەری» زۆر ڕاگەیندراوی توێژینەرانە و بە نرخیان لە هەرێمی زێویە خستووەتە بەردەست خوێنەرانی مێژووی کـەونارای ئێـران و ئێـستا مـزگێنی چـاپ کردنی لە ناکاوی دووهەمین کتێبی خۆی لەم پەیوەندیەدا داوە کـە بـە تایبـەت بـۆ مێژووی کوردستان بە کەڵکە، چونکە سەرخستن و تەواوکەری مێـژووی کوردسـتان بە دەستانی بە کرێگیراوی دەرباری لە هـیچ کردەوەیـەکی ناجوامێرانـە و نامرۆڤـانە کۆتاییان نەکردووە و...

بەڕێز کەیخۆسرەویش کە دڵی پڕ لە کوڵی لە کـردەوەی مێـژوو نووسـانی بـەو شێوەیە هەیە ڕوو لە من فەرموویانە: تەوەحۆدی بەڕێز: لە دەست کێ نەناڵێم، و مـن لەم بارەوە سفرەی دڵی خـۆم بـۆ ئێـوە دەکەمـەوە و قـسەی دڵـی خـۆم بـۆ ئێـوە دەگێڕمەوە کە ئێوە بە ڕاستی بوونەتە یەکێک لە مەتەرێزەکانی بەرگیری لـە مـاف و ڕاستی و سەلماندنی ڕۆڵی کوردان لە بەرگیری لە نیشتمان و هـەبوونی ئێـران و بـە چاپکردنی ئەم سێ بەرگە کتێبـەی خـۆت ئـەرک و بـەر پرسـیاریەتی نەتـەوەیی و نیشتمانی خۆت بە ئەنجام گەیاندووە، نازانن کاتێک کە یەکێک لە سـێ منداڵـەکەم بەرگی سێهەمی گەیاندووە، نازانن کاتێک کە یـەکێک لـە سـێ منداڵـەکەم بـەرگی سێهەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانی ئێـوەی بـۆ جێـژنی لـە دایـک بوونی من وەکوو خەڵات هێنابووی لە دیتنی ئەو کتێبـە چەنـدە خۆشـحاڵ بـووم و چەند شاگەشکە بووم...[٢٣١]

شانازیەک وەکوو بوون لە کەناری ڕووبـاری هیرمەنـد و لـە خزمـەت بـەڕێز دوکتۆر ئیرەج ئەفشار سیستانی نووسەری هێـژای ئێمـە کـە مـن هەمیـشە لـە خوشەویستی و دڵ ئاوەڵایی بـەڕێزیان و هـەموو و سـەروەران و خۆشەویـستانی سیستان و بە لووچێـستان سـپاس دەکـەم و هەرێمـەدا بـوو، لـە کـەناری ئـەم

231- نامەی پێشووی بەڕێز کەیخۆسرەوی لەم پەیوەندیەدا لە بەرگی سێهەم چاپ کراوە.

خۆشەویستانە ببوو بە گوڵستان و...

ئێمەش هیوادارین بەڕێز کەیخۆسرەوی و ئەفشار و هاوڕێیانی تر لە هەر کوێ کە هەن هەمیشە لە گوڵستان و لە کەناری گوڵ و بولبول و شاد و کامەران بن.

٦٦- تاران- ٦٨/٢/١١- برامان عەبدولسەعید ئەماموویردیرزادەی تایانلوو کە لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی بەیگ لە شارەدێ بیچیرانلوون نووسیویانە: برای بەڕێز کەلیم، بە کار بردنی نازناوی زانا و ڕووناکبیر و لێکۆڵەر و مامۆستا و هتد، لە بەرانبەر کاری جوان و بە نرخی ئێوە شتێکی تازە نین، لەم ڕووەوە بۆ ئەوەیکە ئەم نازناوانە کەلێم مەحەنە نێوانمان من بە هەمان ناوی برایانەی عەشیرەتی خۆمان لەگەڵتان دەدوێم.

کەلیم گیان! بە بۆنەی ئەو هەموو زەحمەتانە کە دەیکێشن و ئەو ئاسەوارە بە نرخانەی کە دەیانخولقێنن سپاستان دەکەم و ماندوو نەبوونیتان پێدەڵێم و هیوادارم خوای مەزن یارمەتیتان بدات لە خوای گەورە داواکارم یارمەتیتان بدات بۆ ئەوەی شەو و ڕۆژ درێژە بدەنە تێکۆشانی فەرهەنگیتان و ئێمە لاوانی کورمانج زۆرتر لە جاران لە ئاسەواری بە نرخی پیاوی مەزن و شانازی خولقێنی کۆمەڵگای کوردەواری بە تایبەت خوراسان بەهرەمەند بین...

بە بڕوای من کارێ کە ئێوە کردووتانە و دەیکەن بایەخەکەی زۆرترە لە کتێبخانەی ٢٧ هەزار بەرگی خوالێخۆشبوو مامۆستا ئەمیر تەوەکۆل کامبووزیای زەعفەرانلوو کە مامۆستای باستانی پاریزی فەرموویانە: بە ڕاستی ئەو کەسانەی کە ئەم پیاوە گوندنشینە سەرسووڕ هێنەرەیان نەدیوە زەرەریان کردووە... بەڵگەم بۆ سەلماندنی قسەکانم ئەوەیە کە ئەو خوالێخۆشبووە سەرەڕای ئەوە کە کورد بوو و هاونیشتمانی، بەڵام نەیتوانی بچووکترین هەنگاو بۆ فەرهەنگی خەڵکی ئێمە بە تایبەت عەشیرەتی کورمانج هەڵبگرێ... ئیتر ئەوەیکە لە پەیوەندی لەگەڵ چاپ و بڵاو کردنەوە ڕێزمان و فەرهەنگی کوردی هەوڵ بدەن کە خەڵکی بەڕێز و هۆگری فەرهەنگی کورمانج لە نووسینی دەقی کوردی دوچاری هەڵە و سەر لێشێواوی نەبن.

ئەمنیش وێڕای سپاس و ڕێز لە برامـان تایـانلوو و خۆشەویـستانی تـر مـزگێنی دەدەم کە بە زوویی داواکاریەکانیان جـێبـەجێ دەکرێـت و جـارێکی تـر بەڵـێنیان پێدەدەم کە تەنیا ساتێک لە تێکۆشان و هەوڵدان ڕاناوەستم، تا بەر پرسیاریەتی خۆم لەبەرانبەر ئەو خۆشەویستانە بە ئاکام بگەینم و لەگەڵ ئەوەیکە ئێستا کـاتژمێر یـەکی دوای نیوەشەوە کە ئەم نامەگەلە دەخوێنمەوە و وڵامیان دەدەمەوە.

٦٧- **بیجنوورد- گوندی تۆپچنار-** ٦٨/٢/٢١- برای بەڕێزمان بیـژەن ڕەیحـانی شـادلوو لـە گونـدی توپچنـاری بجنـوورد نامەیـەکی سـاکار و پـڕ لـە هەسـت و خۆشەویستی کە تایبەت بە خەڵکی ئازا و عەشیرەتی ئێمە بە فارسـی و کورمـانجی لە ژێر ناوی سپاس و ڕێز لێنان بۆم نووسیوە کە بە سپاس لە بەرێزیان چەند بەشـێک لەم نامە جوانە و پاراوەیان بـڵاو دەبێتـە کـە نووسـیویانە: سـڵاو و ڕێـز پێـشکەشیان دەکرێ قەبووڵ بکەن، ماوەیەک بوو کە هەواڵی بـە چـاپ گەیـشتنی کتێبێـک لـە پەیوەندی لەگەڵ مێژووی کوردم بیستبوو، بـەڵام هـەرچی لـە شـاری بجنـوورد بـە دوایدا گەڕام نەمدۆزیەوە. ڕۆژێک لە شەقام تێدەپەڕیم کە دیم ڕێزێکی درێـژ دیـارە، وامزانی کۆپێنی هێلکە یان نوقل و شیرینی ڕاگەیندراوە کە خەڵک ئـا بـەو شـێوەیە ئاپۆرەیان داوە، چوومە بەرەوە و پرسیم چی بووە؟ وتیان: چاوەڕوانی کڕینی کتـێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان دەکەین. من کـە وامـدەزانی خـەو دەبیـنم، بـە خێرایی خۆم گەیاندە ئاخری ڕیزەکە و نۆرەم گرت و سەرەنجام توانیم ژمارەیەک لـە بەرگی سێهەمی کتێبە بە نرخەکەتان بە دەست بخەم...

من لە دوو لەیەنەوە خۆشحاڵ بووم، یەکێک ئەوەیکـە وەهـا کتێبێکـی گرینـگ سەبارەت بە نەتەوەی ئێمە نووسراوە و دووهەم ئەوەیکە ئاسـتی ئاگـاهی و گەشـەی فیکری خەڵکی ئێمە و هۆگری بە فەرهەنگ و مێژوو ئەوانی مەجبوور کـردووە، ڕێـز ببەستن کە درێژترە لە ڕیزی کەلوپەلی کوپێنی و...

برام کەلیم، نازانم بۆچی بەرنامەکانی فەرهەنگی و هونەری و مێژوویـی کورمـانج ناگەیننە نێو تێلێڤیزیۆن، لە حاڵێکدا لە شارەکانی باکووری خوراسان لە سەدا هەشـتا و نەوەدی کوردن، بەڵام هیچ بەرنامەیەک بۆ ئەوان لە تێلـڤیزیۆنەوە بـڵاو نابێتـەوە و

سەرنجیان نادەن و... ئەی کەلیم، ئەی خۆشەویستی کورمانج ئێمە ناتوانین سپاسی هەوڵەکانی تۆ بکەین. بەڵام لە تۆ داوا دەکەن حیزبێکی کورمانجی پێک بێنی، کە هەبوونی حیزبێک بۆ ئیمە لە هەر شتێک پێویستترە[232] چونکە بە پێکهێنانی حیزب ئاستی فەرهەنگی خەڵک دەڕواتە سەر و لە هێزەکانی نووستوو و پرژ و بڵاو لە ڕێگای باشتر کردنی بارودۆخی سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری وڵاتەکەمان باشتر دەتوانرێ کەڵک وەربگیرێت. یەکێک لە برایانی چادرنشینی کاوانلوو کە لە گوندی ئێمە نیشتەجێن لە ڕووداوەکانی مراوەتەپپەی تورکمەن سەحرا لە سەرەتاکانی شۆڕش زۆر بە سەرهاتی دەگێڕایەوە کە ئەگەر کوردەکانی ئێمە لەوێدا بەشداری چالاکیان نەبوایە، بارودۆخی سیاسی شارستانی گونبەد کاووس و تورکمەن سەحرا زۆر خراپتر لەوەی دەبوو کە بوو، و کوردەکان وەکوو باسکی بە هێزی شۆڕش لە پێشەوەی جووڵانەوەکانی دژی شۆڕش لەو هەرێمەدا هاتنە دەر و دوژمنیان بە چۆکداهێنا...

برای بەڕێز تەوەحۆدی، جارێکی تر ئامۆژگاری ئەم کەسانە کە فریویان خواردووە بکەن کە تا دێن بۆ شار زمان و فەرهەنگ و جلوبەرگی نەتەوەیی باپیرانی خۆیان لە بیر نەبەنەوە و بە فارسی قسە کردن بە شێوەی دەست و پا شکاو وای بۆ نەچن کە ئێستا کە بوونەتە فتارس و لە خۆبایی بن. بەم جۆرە کەسانە بڵێن کە ئێوە دەبێ لە دوکتۆر ئەمانولڵاخان شادلوو فێر بن کە ١٦ساڵ لە وڵاتی ئاڵمان دەرسیان

---

[232]- لە وڵامی ئەم برایە دەڵێم کە حەتمەن بیستووتانە کە حیزبی ئیسلامی کورمانج بە دوای سەرکەوتنی شوڕشی ٥٧ لە قووچان بە دەستی ئێمە دامەزرا، بەڵام ئەوانەی کە هەستی لە خۆبایی بوون بوون پاوە نخوازییان هەمیشە کاریگەری لە سەر هەستی فەرهەنگی و بەرپرسیاریەتی نەتەوەییان هەیە نەیانتوانی ئێکە تەحەمول بکەن و دیارە بیستووتانە کە چۆن لە گەڵ ئێمەدا هەڵسوکەوتیان کرد؟ ئێمە ئێستا چاوەڕوانین ئاستی گەشەی فیکری خەڵکی ئێمە تا ڕادەیەک بڕواتە سەر کە بتوانن خۆیان لە مافەکانیان و فەرهەنگەکەیانم بەرگیری بکەن. بێجگە لەمە بە وتەی خوالێخۆشبوو ڕەحیمیان هیچ کات ئێزنی ئەوە بە ئێمە نادەن کە حیزبی یەک میلیۆنی دابکەزرێنن، چۆن لە هیچ جێگەیەک لە ئامریکا و ئوروپا و وڵاتانی تری جیهان وەها جەماوەرێک لە ژێر ناوی حێزبێک کۆ نابنەوە.

خوێندووه، باوکانی ئەوانیش هەموویان ئیلخانەکانی خوراسان بوون، بەڵام کاتێک چاوی بە نەخۆشەکانی دەکەوێت لەگەڵ کوردەکان بە کوردی، تورکەکان بە تورکی، تورکمانەکان بە تورکمانی و فارسەکان بە فارسی قسە دەکات و قەت لە خۆبایی نیە. ئاخر خۆ مرۆڤ بوون و شەرافەت بە گۆڕینی زمان بە دەست نایە. مەگەر زمانەکانی تر چییان لە زمانی کوردی زۆرترە کە هێندێ کەسی فریوخواردوو ئێدەکۆشن منداڵەکانیان بە کوردی قسە نەکەن؟ کەلیم‌گیان! تۆ بولبولی ئێمەی، دەنگی ئێمە بە گوێ خۆشکان و برایانی تری ئێمە بگەینە. بجنوورد- تۆپچنار- بیژەن ڕەیحانی

٦٨- **تاران- ٦٨/٢/٢٩- سوهراب وەحدانی بجنووردی** دراقانلوو (درّه قانلوو)- نامەیەکە دوور و درێژ و لە ٨ لاپەڕەدا پڕ لە هەست و هاودەردی لە برامان بەڕێز سوهراب وەحدانی بجنوورد کە دانیشتووی تارانن. بەڕێزیان بۆ تەواوکەری خۆشەویستی خۆیان بەرانبەر بە من ژمارەیەک لە کتێبی «خوراسان و ماوراءالنهر» نووسراوەی ئا. بلینیتسکی وەرگێڕاوی دوکتۆر وەرجاروەندیان بە من پێشکەش کرد کە سپاسیان دەکەم. نامەی بەرڕێزیان زۆرتر لە بەستێنی نامەی هاوشاریەکەیان و هاوعەشیرەتەکەیان بەڕێز بیژەن ڕەیحانی بوو کە چۆن خەڵکی کوردی خوراسان بەرانبەر بە پاراستنی زمان و فرهەنگەکەیان لە هێندی بواردا کۆتایی دەکەن.

بەڕێزیان فەرموویانە: من بە ئەرکی خۆم دەزانم کە لەم کارە مەزنەی ئێوە بۆ پاراستنی فەرهەنگ و مێژووی بە نرخ و بە بیر کراوی ئێمە سپاس بکەم. چونکە من تا کاتێک کە کتێبەکانی ئێوەم نەخوێندبوو، نەمدەزانی باوکانی ئێمە چەندە بەدبەختی و چارەڕەشییان کێشاوە و چەندە خۆشەویستانی خۆیانیان لە دەست داوە تا ئێران ئەمرۆژە بەو شێوەیە ماوە. سڵاوتان لێ بێت کە چاوی ئێمەتان زۆرتر کردەوە. ئەمە تەنیا هەستی ئێمە کوردەکانی خوراسان بەرانبەر بە ئێوە نیە بەڵکوو لە تاران هاوڕێ زۆرمان هەیە کە خەڵکی ڕۆژئاوای وڵات و هەروەها برایانی لوڕ و بەختیاری کە بە ئاگاداریەوە لە کاری ئێوە و بایەخی داهاتووی ئەو کارە ڕێز دەنێن...

من لە ئێوە وەکوو کوردێک داوا دەکەم خۆتان لە خزمەت فەرهەنگ و زمان و مێژووی نەتەوەی لە بیر کراوی ئێمە بنێن و لەوەیکە ئەبولفەزلی خۆشەویستت لە

دەستداوە نیگەران مەبە هەر دێر لە کتێبی ئێوە بۆ نەتەوەی ئێمە ئەبولفەزلێکە...

**٦۹- تاران- ٦٨/٣/٥- بەڕێز باقر باقرزادەی سیوکانلوو** (ئوغازی) برامان بەڕێز باقرزادە کە خوێندکاری بەشی کارزانی پاراستن و بووژاندنی لەوڕگاکانە. بە بۆنەی دەربڕینی هەستی پڕ لە خۆشەویستی خۆیان و برای بەڕێزیان ئاغای خەلیل باقرزادە دەکە هەمیشە یار و یارمەتیدەرم بوون. (سپاس دەکەم)

**۷۰- خوڕڕەمئاباد لوڕستان- بەڕێز ئیرەج موحەڕیڕ- ٦٨/٣/٦**

برای زانا و نووسەری پسپۆڕمان بەڕێز موحەڕێز لە لوڕستان نامەیەکی تێر و تەسەل و ۱۱ لاپەڕەییان نووسیوە و ناردوویانە کە ئەم زەحمەتی نامەنووسینەیان تەنیا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لایەنگری لە ڕادە بەدەر بە کەلەپووری فەرهەنگی و ئیتر هیچ.

ولامێکم دایەوە بە نامەکەیان کە پڕ بوو لە هەست و خۆشەویستی و عەرزم کرد کە لە بەهاری ئەمساڵدا سەفەرێکم کرد بۆ ناوچەکانی قەزوین و ئەمووت و عەمارلووی گیلان و سەبارەت بە کوردەکان و لوڕەکانی ئەو هەرێمە دەستم بە لێکۆڵینەوەیەکی گرینگ کرد.

بەڕێزیان فەرموویانە کە چەگنیەکان لە تیرەی لوڕن نە کورد. و ئەمە کە خوالێخۆشبوو شەرەف خان بدلیسی لە شەرەفنامەدا لوڕەکانی وەکوو تیرەیەک لە چوار هۆزی سەرەکی کورد ناودێر کردووە، کە پەیوەندی بە ڕەچەڵەکی سەرەتای ئەوانەوە هەیە ئەگینا لوڕەکان کە چەگنیەکانیش بەشێکن لەوان، مێژووی پڕ لە ەوراز و نشیوی خۆیانیان هەیە و...

ئەمنیش لە ولامی ئەم برایە دەڵێم کە تبلیسی لە شەرەفنامەدا تیرەکانی لوڕی جیا لە چەگنیەکان کە کوردن لە قەڵەم داوە. هەروەها کە وتم وشەی مێژوویی کورد ناوڕوکێکی کۆنتر و بەرفرەتری هەیە. کورد، هەمان مادی کەونارایە. واتە کوردەکانی ئەمڕۆژی سەرتاسەری جیهان+ لوڕ+ بەختیاری+ بەلووچ.

بەلووچەکان زۆر زووتر لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەلات هاتوون. ئێمڕۆژە کە دەڕوانینە شێوەزار و ڕۆخسار و ئاهەنگی قسە کردن و ئاخافتنی ئەوان، ئەم ڕاستیە زۆرتر

هەستی پێدەکرێت و پێویستیەکی زۆرتری بە لێکۆڵینەوە هەیە. من لوڕەکان لە کوردەکان زۆر جیاواز نازانم. مەودای جوغرافیایی بووەتە هۆی گۆڕانکاری لە زمانی سەرەتایی ئەوان، لوڕەکان بۆ پێویستی ڕۆژانەیان زۆر وشەیان داناوە. بەختیاریەکان کە لەولاترەوە دەژین هێندێ وشەی تر و... هەروەها کە کوردەکانی خوراسان کە نزیکەی ٥٠٠ ساڵە جیا بوونەتەوە زۆر وشەی تریان داناوە. کوردەکانی عێمادلوو کە نادرشا نزیکەی ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە خوراسان بردوویانیە بۆ گیلان، ئێستا هێندێ وشەی تایبەت بە خۆیانیان هەیە کە جوغرافیا هۆکاری سەرەنکی ئەوەیە.

کەوابوو لە ڕیشەی ڕەگەزی کورد و لوڕ و بەختیاری و بەلووچ کە لە سەردەمی کەونارا یەکێک بوون جێگای قسە نامێنێت و ئەمە کە هەرکامەیان ڕۆڵ و مێژوویەکی جیاوازیان لە بارودۆخێکی جوغرافیایی جیاواز هەبووە جێگای شک و گومان نیە.

بەڵام سەبارەت بە چەگنیەکان کە لە تیرەی لوڕن یان کورد وترا کە لوڕستان لە ناوەندەکانی سەرەکی کورد و لوڕ بووە و نووسەرانی قەدیم بە تایبەت لە سەردەمی سەفەوی هەموویان چەگنیەکانیان کورد داناوە و نووسیویانە.

ئەمنیش شانازی دەکەم کە لە چەگنیەکانی خوراسانم چ لوڕ بن چ کورد. چ گوڵی سوور بن چ گوڵی سپی. دەستمان بگاتە کاری لێکۆڵینەوە دەکەین، هەوڵ ئەدەین دەستمان بگاتە بەڵگە و نووسراوی جێ باوەڕی مێژوویی و لە ڕێگای ناسینی خەڵک کە بۆ خۆی لقێکە لە زانست، سەرکەوتنی زۆرتر بە دەست بهێنین.

ئەمن کتێبەکەی بەڕێز دوکتۆر ئەفشاری سیستانیم کە فەرمووتانە موتاڵام کردووە[٢٣٣]. بەڕێزیان لە هاوڕێیانی زانا و جێگەی شانازی منن. ئەمن کتێبێکم لەبەر دەستدایە لە سێ بەرگ لە ژێر ناوی (فێلەکان و عەشیرەتەکان و جەماوەرناسی ئێران) کە ئەگەر بتوانم چاپی بکەم وڵامی زۆر لە داخوازیەکانی خوێنەرانی هێژا دەداتەوە. بۆیە دەقی سەرەکی نامە تێر و تەسەلەکەی بەڕێزتان لەگەڵ ئەو

---

233- پێشەکیەک لە سەر ناسینی خێڵەکان و کۆچەرەکان و تیرەی عەشیرەتەکانی ئێران- ئێرەج ئەفشار سیستانی. تاران ١٣٦٦.

نەخشانەی کە ناردبووتان چاپ دەکرێت. نووسراوەکانی تریش لەو کتێبەدا کە باسم کرد چاپ دەکرێت.

هەروا دەمهەوێ بە یارمەتی خوای گەورە لە بەهاری ساڵی ۱۳٦۹ بۆ درێـژەدانی لێکۆڵینەوەی هەرچی زیاتر سەردانێکی چەکنیەکانی قەزوین و کوردەکانی عەمارلوو و لوڕەکانی ئەو هەرێمە بکەم و دواییش ئەگـەر هـەلێک ڕەخـسا، حەتمـەن دێم بـۆ لوڕستان مەڵبەندی قارمانانی شـانازی خـولقێن و دەسـتی خۆشەویـستانی کـورد و لوڕی ئەو هەرێمە ماچ دەکەم.[۲۳٤]

ئێستاش نامەی برای بەڕێزمان لە لوڕستان:

بەڕێز ئاغای تەوەحۆدی خۆشەویست سڵاوتان لێ بێت.

وێڕای ڕێز و سڵاو و بـە خزمـەتتان ڕادەگـەینم کـە لـە بانەمـەڕی ٦٨ لەلایـەن یەکێک لە هاوڕێیانی لایەنگرێ ئەدەبیات لە لوڕسـتان بـەرگی دووهـەم و سـێهەمی کتێبی بە نرخی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بـە شـێوەی ئەمانـەت گەیـشتە دەستم ناوەرۆکی کتێبی ئێوە بۆ خەڵک بە گشتی بە نـرخ و شـیاوی خوێندنەوەیـە. بیری بەرز و هەستی پاکی ئێوە بەرانبەر بە ئێرانی خۆشەویست بە تایبـەت ڕەگـەزی کورد منی هێنایە سەر ئەو باوەڕە کـە گـەرمترین پیرۆزبـایی خـۆم ئاراسـتەی ئێـوە بکەم.

---

[234]- بە داخەوە پێش لە بەرنامەی کەوتنە ڕێ من بۆ ناوچە نـاو براوەکـان ز ەوی لـەرزەی ئـاخری گەلاوێژی ساڵی ٦٩ ڕوویدا و گیلان و ڕوودبـاری عـەمارلوو و مـەنجیل و لووشـان و تـا ئاسـتێکیش نزیکەی قەزوینی وێران کرد و ئەو هەموو جوانیەی ئەو گوندانە و ئاسـەوار و کەلـەپووری فەرهـەنگی خەڵکی لە ناو برد. شارە جوانەکانی لووشان و مـەنجیل هـەموویان لـوڕ و کـوردی چـەگنی بـوون. عەمارلووی ڕوودبار کوردەکانی عەمارلووی خوراسان بوون. لە نێوان زەنجان تا بەنـداوی سـفیدڕوود هەموویان کوردی کرماشانی بوون. بە هەر حاڵ هەرچی لەو ناوچەدا کوژرا و هەبوو هەشتا لە سەدی ئەوان کورد و لوڕ بوون و منی زۆرتر لە هەر کات خەمبار کرد. چونکە ساڵێک لەمەوبەر میـوانی ئـەو خەڵکەر باش و میوانداره بووم کە جل‌وبەرگەکانیان زۆر جوان بـوون، بـە داخـەوە فیلمێـک کـە لـە جل‌وبەرگ و پیشە دەستیەمان و شێوەی ژیان و گوندەکانیان و بـە تایبـەت لـە ڕوودبـار و جیرنـدە گرتبووم لە کاتی چاپ کردنی لە ناو چوو و منی زۆر خەمبار کرد.

بێشک ناوەڕۆکی ئەم کتێبە زۆر لایەنی تاریکی مێژوو ڕوون دەکاتەوە. و ئەمە خۆی شیاوی ورد بوونەوەیە. بەڵام وەکوو هاوڕییەکی دێرین و نزیک بۆ نەهێشتنی بڕێک لەو بەشانەی کو گوماناوین بە تایبەت لە بەرگی دووهەمی کتێب هێندێ تەوەرتان بە شێوەی ڕاستبینانە عەرز دەکەم. لە لاپەڕەی ٦٣ بەرگی دووهەمی کتێبی ناوبراو چەگنیەکانی دانیشتووی قەزوینتان وەکوو ڕەگەزی کورد لە قەڵەم دابوو و هەر لەم کتێبەدا زۆر جار چەگنیەکانی دانیشتووی خوراسان وەکوو کوردنشینان دراون. ڕەنگە زانیاری باشتان لەبەر دەستدا نەبێت کە لە ناوەڕاستی شارستانی خوڕڕەمئاباد ناوچەیەکی بەرین شوێنی ژیانی عەشیرەتی گەورەی چەگنیەکانە. بە شێوەیەک کە ئەمە یەکێک لە بەشەکانی گرینگی شارستانی خوڕڕەمئاباد دێتە ئەژمار و هەر بە ناوی (چەگنی) ناسراوە. عەشیرەتی چەگنی هەر لە کۆنەوە لە لوڕستان ژیاون و نیشتەجێن و بە زاراوەی ڕەسەنی لوڕی قسە دەکەن.

بە پێ وتەی بە سالاچووانی چەگنی: هێندێک لە چەگنیەکانی لوڕستان لەسەردەمی شاتەهماسبی سەفەوی بۆ ناوچەکانی خوراسان کۆچ دراوەن (کە لە لاپەڕەی ١٠٥ی بەرگی دووهەم بە لەبەر چاو گرتنی کتێبی شەرەفنامەی هۆکاری نیشتەجێ بوونی ئەوانتان لە خوراسان ناو بردووە) هێندێک تریش لە سەردەمی ئاقا موحەممەدخان قاجار لە خوڕڕەمئابادەوە بۆ هەرێمی قەزوین کۆچیان کردووە. هەروا کە لە لاپەڕەی ١٠٥ی بەرگی دووهەمی کتێبەکەتان لە بوداغ (بوداق خان چەگنی) کە خۆی و کوڕەکانی هەموویان لە سەرتاسەری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران عەمارەت و دەسەڵاتدارییان بووە یادتان کردووە. ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ کتێبی «جوغرافیای نیزامی لوڕستان» لە نووسینی ڕەزمئازا و لاپەڕەی ١٥٧ بخوێنیتەوە، دەبینین کە یەکێک لە تیرەکانی گرینگی دانیشتوانی سەرەکی ناوچەی چەگنی خوڕڕەمئاباد بە ناوی بوداق ناوبانگیان دەرکردووە. شیاوی وتنە کە هێندێک کەس لەسەر ئەم باوەڕەن کە چەگنیەکانی خوڕڕەمئاباد لە سەدەی ١٠ی کۆچی لە ناوچەی «دڕڕەشەهر» هاتوون بۆ ئەم ناوچەیە. «دڕڕەشەهر» لە ڕابردوودا یەکێک لە ناوچە گرینگەکانی لوڕستان بووە و خەڵکەکەشی لە کۆنەوە بە زاراوەی لوڕی

قسەیان کردووە ئەگەر ئەم بۆچوونە دروست بێت وا دیارە هێندێک لەوانە بە کۆچ کردنی خۆیان درێژەیان داوە لە سەردەمی‌شا...

**٧١- تاران ١٣٦٨/٤/١٥:** داراب بەیگ ئەسەدوڵلاهی (لەک)

نامەیەکی ڕازاوەیە و بە من نازناوی «خان» دراوە.

ناو براو لە شاعیران و نووسەرانی ناوداری ناوچەکە و هاو شاری بەڕێز ئیرج موحەرەرە.

••• برای بەڕێزم کەلیم!

ماندوونەبیت، ئاسەوارەکانتم لە پیشانگای کتێبی تاران بینی لە بەشی مەشهەد ئەوەش بەرگی دووهەم و سێهەمی کۆچی مێژووی کتێبەکە.

منیش‌بەڕەگەز کوردی لەکی ئەلشتەرم (نێوان کرماشان و خوڕڕەم‌ئاوا)

زۆر سەربەرزم بە سەر بەرزیتان.

چەند پارچە شێعری خۆی و شاعیرانێک وەک: خوالێخۆش بوان، مەنووچێهر کوولیوەند، مەلا مەحەممەد حەسەن کوولیوەند.

بە قوربانی ئێوە بم: داراب بەیگ، تاران، حێشمەتوددەوڵە

برای شاعیر و نووسەرمان داراب بەیگ کە ١٠٠ تمەن پارەی بۆ کڕینی بەرگی یەکەم ناردووە لە بەر نەبوونی کتێبەکە دوایی کە چاپ بووە بۆیان بنێرم.

**٧٢- کەرەج ١٩٨٩/٤/٢٢:** مامۆستای زانا و بلیمەت مەلا قادر لاجانی کە لە کەرەج بە خزمەیتان گەیشتم. دوو منداڵی هەیە بە ناوی کوردگوونە و ناز ناز لاجی و شێعرەکانیان لە بەرگی سێهەم چاپ کراوە.

بەڕێز لاجانی ئیستا کە وەزیری ئەوقافی حکوومەتی هەرێمی کوردستانە.

**٧٣- بجنوورد ١٣٧٦/٦/١٥:** حەیدەر حەیدرەیان کۆنە ئووغاز (سیوکانلوو)

ناو براو لە چالانی سەرزەوینی خوراسانە و نووسیوویانە:

••• برای من، ئەمن وەکوو سیوکانلوویەک شانازی بە تۆوەدەکەم کە وەکوو کەسێک لە عەشیرەتی سیووکانلوو توانیووتانە خزمەتێکی هەرە گەورە بکەن بە مێژوو و کولتووری کورد. خزمەتەکەتان دەست کەمێکی لە خزمەتەکانی فیردەوسی

نیە. («حەیدەر حەیدەریان سیووکانلوو»)

**٧٤- تاران ١٣٦٨/٦/١٦:** برای زانامان بەڕێز تەوەکولی بانەیی لە نامەی دووهەمی خۆیاندا.

پسمامی خۆشەویست کاک کەلیم:

... لێکۆڵینەوەکانتان لە مەڕ کوردستان جوانە، کەسانیتر بە چاوێکیترەوە بۆ کوردستان دەڕوانن، کەسانی وەک تۆمان دەوێ تا ڕاستیەکان ڕوون ببێتەوە. لەم ڕۆژانە لە پارکێک پیرە پیاوێکی کوردی خەڵخاڵی ئازەربایجانی نی ڕۆژئاوام بینی، گوتیان ئێمە ١٧ گوندی کرمانجین لە بەشی سنجیدی خەڵخاڵ، باپیرانمان دەڵێن نادر ئێمەی دوورخستووتەوە بۆ ئەم ناوچەیە.

گوندەکانمان برێتین لە: لمبوو، گوڵستان، موورستان، دوودەخانە، کەلار ئاغ بولاغ، موستەفالودە، خالقانی، بەلگوکانی، میرغەردان، حاجی لوو، دێی لوڕ، پیران و بە عەشیرەتەکەی ئێمە دەڵێن شاترانلوو ... .

برای خۆم پاش لێکۆڵینەوە زانیم کە تەنیا خواڵخیۆشبوو ڕەزم ئارا لە بارەیانەوە نووسیوویانە و بە داخەوە بە تورک ناساندوویانی و تەنیا سێ گوندیانی بە کورد ناساندووە.

**١- لەمبەر Lombar:** لە گوندەکانی سەر بە کێوی بەشی هەر و ئاباد، کوێستانی، سەرد. دانیشتوانی ٥١٣ کەسن و کورد و شیعەن.

**٢- ئاغ بولاغ:** ٢٨٧ دانیشتووی هەیە و کوردی شیعەن.

**٣- داوود خانە:** ١٣٧ دانیشتووی هەیە و مەکۆی ئیلی شاتراناوویە[٢٣٥] و شیعەن ئێستا ئەو جوگرافیاناسانەی ئێران لە ناساندی ئێمە وا دەڵێن با منیش شتێکی

---

[235]- برای بەڕێزم! من بەهاری ئەمساڵ (٦٨) کە بۆ لێکۆڵینەوە چووم بۆ نێوان کوردەکانی عەممالوو لە دەڤەری ڕوودبار و ئەلەمووت لە نێوان قەزوین و گیلان و وسیتملەوێیشەوە بڕۆمە خزمەتی براوخوشکانی شاترانلووی خەڵخاڵ؛ بەلام نەمتوانی بڕۆم، وائەزانم نادرشا ئەم کوردانەی لە خوراسانەوە ڕاگوێزابێت. باسی ئەمیری عەشایری خەڵخاڵ هاوچەرخی میرازا کووچەک خانی جەنگەلی و بارودۆخی کوردەکانی خەڵخاڵ لە کتێبەکانی بیرەوری و بەلگەکانی ناسر ڕەوایی. بە یارمەتی ئیرج ئەفشار یەزدی داهاتووە. دوایی لە کتێبی عەشایری ئێران چاپی دەکەم.

کەنینی بۆ تۆ بنووسم:

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی مێژوناسی ناوداری کورد کە پێش ڕاپەڕینی گەلانی ئێران (پەنایان بە من هێنابوو) و پاشان گەڕایەوە بۆ کوردستانی عێراق (زێدی خۆی) جارێک لە بەغداد لە دووکانەکەی بەشیرموشیر دانیشتبووین کە دوکتۆر خەزنەدار گوتیان:

ئەمشەو ڕادیۆ گوتی: جەماوەری چین لە ٦٠٠ میلیۆن تێپەڕی (٣٠ساڵی ڕابردوو)

بەشیر موشیر گوتی: ڕاستی دۆکتور، نەیگوت چەندیان کوردن.

دوکتۆر گوتی: بەشیرگیان کورد لەوێ چی دەکات.

ببورە زۆرقسەم کرد کاک کەلیم

سەرکەوتوو بی

ڕەووف تەوەکولی بانەیی

**٧٥- ئازەربایجان ڕۆژئاوا سەردەشت ١٣٦٨/٥/١٤:** براماان وەهاب مەحموودی کە گوتوویانە تکایە بەشێک لە کتێبەکانتان بۆمان بنێرن.

**٧٦- تاران، سەرۆک وەزیری ١٣٦٨/٥/٢٠:** برای زانا و نووسەری زانامان بەڕێز کیانووش کیانی حەفت لنگ (کورد بەختیاری) مودیری ناو خۆی وەرزنامەی عەشایری ئێران، پاش سپاس نووسیوویانە:

دەبێ ڕابگەیەندرێ ئە و وتارەتان «زەوینی کوردەکان خوراسان لە ٤٠٠ ساڵی ڕابوردوو» لە وەرزنامەی ژمارە ٦ چاپ کراوە و ژمارەیەکی ئاراستەی ئێوە دەکرێ، هیوا دارم جێی ڕەزامەندی ئێوە بێت.

هەر وەها دەبێ ڕای بگەیەنم لە بەر ئەوەی خەریکی کۆ کردنەوەی وتەی منداڵانی عەشایری ئێرانم. تکا کارم یارمەتیم بدەن.

چاوەڕێ یارمەتیتان، کیانووش کیانی حەفت لنگ

**٧٧- دەرەگەز زیندیلوو ١٣٦٨/٦/١٣:** کاک شەعبان سەبری کومبلانلوو لە نامەی دووهەمی خۆی نووسیوویانە:

چەند ڕۆژێکە کارێکم پەیدا کردووە و خەریکی کارم، ئێمە کرمانجی بلووکین، تکایە بۆمانی ڕوون بکەنەوە ئێمە لە کام ئیلین[٢٣٦].

قەلخانیەکان دەڵێن ئێمە کوردین و زووتر لە یەکیەتی سۆڤیەتدا بووین کە هاتووینە دەرەگەز و زمانمان بووەتە تورکی و باوکانمان گوتوویانە لە بنەڕەتدا کرماشانین.

بەرگێ لە شێعرەکانی عەید موحەممەد زیندنلوو ئاراستەتان دەکرێ.

شاوان کومکیلانی ژەدەرەگەزێ

**٧٨- دەماوەند ١٣٨٦/٦/١٥**: برای کوردی جابانی دوکتۆر عەلی ئەکبەر قەدیمی کە نووسیوویانە، پرژ و بڵاوی کوردەکان لە دەوروبەری دەماوەند و خوار و وەرامین و گەرمسار و ڕوودەهێن هەتا دامغان بەم شێوەی خوارەوەیە:

کوردەکانی کورد بەچە، لە ڕوودەهێن و تاران و چەند بنەماڵەیەک لە دامغاندان کوردەکانی پازووکی لە گەرمسار و ئەیوانەکی و وەرامین، حاتەم پازووکی لە نێوان کەویر و لە ٥٠ کیلۆمەتری گەرمساردا دەژین و زۆر ڕێژی هەیە لە نێوان خەڵکدا کوردەکانی جابان لە دەماوەند و چوارسەد بنەماڵەن و لە چەند گونددا دەژین و تایفەکانیان بریتی لە: سفکانلوو، تووشکانلوو، شادلوو، زەعفەرانلوو. ناو براوان لە دەماوەند و گەرمسار و وەرامین و تا نزیکی سورخەی سمناندا دەژین.

**٧٩- کاشان ١٣٦٨/٧/١٢**: برای کوردی عیراقیمان بەڕێز عەبدولجەبار کە نامەیەکی تریان لە بەرگی سێهەم لە چاپ درا. ناوتان لە دڵی هیچ کوردێکدا پاک ناکرێتەوە.

**٨٠- تاران ١٣٦٨/٧/١٨**: نامەی مامۆستای گەورە و نووسەری ناوداری کورد، بەڕێز دوکتۆر موحەممەد تەقی ئیبراهیمپوور کە زۆر ڕێزیان بۆ کارەکەی من داناوە.

**٨١- شیروان**: برای خوێندکارمان پژمان ئیبراهیمی سیووکانلوو کۆنە ئۆغاز لە

---

[236]- برای خۆم بلوولیەکان هەر ئەو پەلوولیانە یان پەهلەوانلووانەیەکە لە بەرگی دووهەمی بەڵگەکاندا چاپ کراون کە لە تەنشتی کێوی هەزار مەسور دەوربادام و ئیمامقولی و باشووری ڕۆژئاوای شیروان دان.

نامە شێعرییەکەیاندا منیان خەجاڵەت کردووە و لەم نامەیـەدا باسـی کـۆچی دوایـی خوالێخۆشبوو قادر قولی خانی قومارییان کردووە کە باوەگەورەیانە، نـاوبراو سـەرۆکـی عەشیرەتی سیووکانلوو بوو.

**٨٢- تاران ١٣٦٨/٧/٣٠:** نامەیەک کە لە بە ڕێز دوکتۆر عەزیز موحەممەد پـوور و گلەی کردووە کە هاتووتە مەشهەد و سەردانی ماڵی ئێمەی کردووە و من لـە مـاڵ نەبووم.

**٨٣- شیراز ١٣٦٨/٨/٢٤:** بەڕێز دوکتۆر سەداقەت کیش مامۆسـتای زانـستگای شیراز کە کتێبی زۆریان نووسیوە و بۆ وەرگرتنی کتێبی بەرگی سێهەم ڕەزامەنـدیان دەربڕیوە. لەم کارە نوێیەمدا لە کارەکانتان کەلکم وەرگرتووە و دەمەوێ لە کارەکـانی ئێوە خوێندکارەکانم کەلک وەربگرن. (دەست و چاوتان ماچ دەکەم)

**٨٤- تاران:** گوڵان ٦٨، گۆڤاری سەیر و سیاحەت.

لە گۆڤاری سەیر و سیاحەت، ساڵی دووهەم —ژمـارەی ٦ – گـوڵانی ١٣٦٨ بـە سەر پەرشتیاری بەڕێزدا و ودبەهرامی و لە لاپەڕەی ٣٢ سەبارەت بە بەرگـی سـێهەم وەها نووسراوە:

«... لەم کتێبەدا نووسەر بنەمای کارەکەی خۆی لە سەر کۆکردنەوەی مێـژوو و فەرهەنگی و جوگرافیا و فولکلۆری کوردانی خوراسان داناوە و بەڵگەکانی بە جوانی لێک داوەتەوە»

**٨٥- ئازاد شار:** نووسینگەی ڕاگواستنی موسافری ٢ی مازەندەران.

بەڕێز ئەحمەد ڕەزاتاجی لە کوردانی شادلووی ئێسفەراین و کە لـە دایکـەوە لـە کوردانی ئیزانلوویە، لە لاپەڕەی ٥٥١ی بەرگـی سـێهەمدا چـاوم بـە وەکـەوەت کـە قوربانقولی کەریمی شـەرانلـوو پاڵـەدانی قووچـان، فـەرهـاد شـەعبـانی میلانلـووی ئێسفەراینی شکست داوە.

دەبێ بڵێم کـە فـەرهـاد میلانلـوویی نیـە و دیرانلوویـە و خـەڵـکی سـارمێرانی ئێسفەرانیە و کوڕی خوالێخۆش بوو بـەهـادور پـەهلـەوانی کـوڕی بـەرات پاڵـەوانی دیرانلوو. عەلی پاڵەوانیش لە عەشیرەتی بادلوو و خەڵکی گوندی حەسار باغییە.

تا قمێک لە دانیشتوانی ئێسفەراین لە عەشیرەتی زەنبیل بافەکان بوون... .
که بەڕێز دەوڵەت ئابادی لە کتێبی کەلیدەردا ئاماژەی پێی کردووە.
٨٦- پاریس: دوکتۆر پاپلی یەزدی مامۆستای زانکـۆی مـەشـهەد لـە بـەرواری ٢٠ی پووشپەڕی ١٣٦٨ دانووسیوویانە:
برای زانام کەلیموڵلا تەوەحودی!
پاش سڵاو و هیوای سەرکەوتن بۆ ئێوە.
کتێبە بە نرخەکانتانم بینی و گەشامەوە.
من لە گەڵاڕێزانی پارەوە لە پاریسم و کارو بارم زۆر خراپە و تاڕادەی کارەگەرێک مووچە وەرناگرم. دووریتان ئازارم دەدا. چەند جار کتێبەکە نانم خوێندەوە بە تایبەت بەرگی سێهەمی، بەڵگەی زۆرم سەبارەت بە غەدری دژ بە کـوردەکـان لـە سـەدەی ١٥ی زایینەوە کۆ کردووتەوە وەک زلمی شاعەبباس لە کوردانی موکری و دەمـەوێ لە کتێبێکدا کوێ بکەمەوە و لە چاپی بدەم.
هیوادارم فەرهەنگی گوندەکان و شوێنەوارە ئایینەکانی وڵات کە من نووسـیوومە گەیشتبێتە دەستتان. هەر بەڵگەیەکتان بوێ لە پاریسەوە ڕەوانەی ئێوەی دەکەم.
لە کونفەرانسێکدا سەبارەت بە مێژووی سەفەویە بەڕێز دوکتۆر عەبدوڵلا مەردوخ سڵاوی بۆتان دەنارد تا نەورۆزی ١٣٦٩ لە پاریس دەمێنمەوە. وابزانم سالـی داهـاتوو بۆ ژاپۆن دەچم.
بۆ گۆڤارەکەم و کورانی خوراسان دڵم دەسووتێ. بە سپاسەوە پاپلی یەزدی.
لە پەراوێزی نامەکەیاندا نووسیوویانە:
لەو بەرگی سێهەمەتان چەند ڕەخنەدشم هەیـە کـە دوایـی پێتـانی دەڵـێم بـە تایبەت باسەکانی ل ٤٧٢ دەبوای وانەنووسرێت و ڕەخنـەی تونـد لـە هـا و وڵاتیـانی دانیشتووی ئوروووپانەگـیردرێ و وانـەزانـین هـەموویـان خـراپن و خـۆش گـوزەران ڕیازی‌زانی گەورەی فەرانسە بەڕێز ڕەشتیە و ١٦ کەس لـە ئێرانیـەکـان لـە پیـاوانی لێزانی مووشەکی ساتەرنن.
سپاس بۆ دوکتۆر پاپلی لەو نووسراوە مەبەست خزمەتەکانی دوکتۆر شادلوو بـوو

کە قەت خزم و نەتەوەکەی خۆی بە جێ نەهێشت.

٨٧- **زاهیدان:** خاتوو سادقە زەعفەرانلووی کتێبخانەی کامبووزیا و فیلسووفی کەویرە پاش ئاراستە کردنی بەرگەیەک لە بەرگی سێهەم بۆ کتێبخانەی کامبووزیا و سەبارەت بە ئەوان چەند لاپەڕەیەکم نووسیووە. خاتوو سادقە بەرگێکی لە کتێبی «هۆی وێرانی بەلووجستان» نووسراوەی مامۆستا کامبووزیا هاوڕێ وێنەیەکی ئەوان کە سپاسیان دەکەم.

٨٨- **شەهرڕەزا ١٣٦٨/١٠/٦:** بەڕێز ڕەحمانیان حەقیقی کە لە نووسەران و شاعیرانی هاوچەرخ و لە بەرگی سێهەمدا ناساندوومانە و گلەیان لەوە بووە کە بەرگی سێهەمیان تا ئیستا وەرنەگرتووە.

٨٩- **تاران:** ڕێکخراوەی پەرەی فەرهەنگی ئێران

بەڕێز دوکتۆر تەوەسوتی مودیری گشتی ئەو ڕێکخراوەیە پاش ڕێزیان، گلەیان لە نەبوونی بەرگی سێهەم هەبووە.

٩٠- **شیروان:** موحەممەد ڕەزامەنسووری لە عەشیرەتی خدری سیووکانلوو کە باوکیان بە هۆی هاتنە خواری دەوری شاری باجگیران لە ساڵی ١٣٤٩ هاتوونەتە شیروان و موحەممەد ڕەزا لەوێ پێگەییشتووە و ئێستا لە خەت خۆشان و شاعێرانی گەورەی ئەوێیە.

٩١- **شیروان ١٣٦٨/١٠/٢:** خوشکمان فەهیمەی عەلایی قەهرەمانلوو لە نامەکەیاندا شەرمەزاریان کردووم و بە تەواوی هەر ئافەرینیان بۆ گوتووم، منیان بە شانازی کوردان داناوە.

خانکی من! فەهیمە، خانگی کورمانج، تۆ نزانی کوکاغازێ تەچیجوور من شادکر ساکو، هوون نکاوسەودا بوونە، هوون ئامۆزگارێ خرەدمەند و ئاگایی خەڵکی مەنە هوونن کۆ گەرێ ژەنکاها داهینا چرێ شەوتن و ساخزانێ نەمە پەرتو ئەفشانی بکەن تا ئەوانا لە ئایدندە وە مێژوو فەرهەنگێ پڕ بار خا ئاشنە بوون.

برانگی قچک وە: کەڵیحێ کورمانج دیسا ئومیدوارم دیوانێ کورمانجی «جەعفەر قولی زەنگەلی» ژی، وە خاندی وی.

**۹۲- ئەهواز:** زانستگای چەمران، بەڕێز دوکتۆر ڕۆحانی کە سپاسیان کردووم.

**۹۳- بجنوورد ۱۳٦۸/۱۰/۱٤:** خوشکی عەزیزم! سوغرا ئەحمەدی کە هیوای سەر کەوتنی بۆ خواستووم.

**۹٤- ئێسفەهان:** زانای بەڕێز، گەورەم ڕەجایی زەفرەیی کە ڕیزی زۆریان گرتووم.

زانای خۆشەویستە بەڕێز کەلیموللا تەوەحودی!

لە چەند گۆڤاردا سەبارەت بە کتێبەکەتان کەسانێک نووسیبوویان کە زۆر گەشامەوە.

منیش زۆر سپاسی ئەو بەڕێز دەکەم.

لە چە ند یادداشتی زانستیانەی ئەوانیش کە سەبارەت بە ردەکانی قووچان و خوالێخۆش بوو مولا موحەممەد زەفرەیی کە هاوکات لە سەردەمی دەرباز بوونی سام خان زەعفەرانلوو لە بەندیخانەی قەجەری لە قووچان بووە و چەند کتێبی باشیشی نووسیوە.

هەروەها تاقمێک وێنەی ئێران کاری خوالێخۆش بوو حوسێن مەحبووبی ئەردەکانی چەند وێنە لە قووچان و خەڵکی ئەو دەڤەرە.

چەند وتار لە دوکتۆر موحەممەد حەسەن گەنجی و بەهاریکاری دوکتۆر جەواد سەفی‌نژاد بە سەر دێڕی.

۱- لە ئێلی زافەرانلوو، شیروانی کچ سەری پڵنگە، ئیتلاعات حەوتەیی، ژمارە ۵۱۵/۱۳۳۱/۳/۳۱

۲- لە بجنوورد لاوان لە شەوی زەماوەنددالەگەڵ گای مەست شەڕدەکەن.

۳- لە عێشق ئابادەوە تا قووچان — لورد کەرزەن — گۆڤاری خوێندنیەکان، ژمارە ۳۹ ساڵی چوارەم ۱۳۲۳

**۹۵- مراوەتەپە:** برای ئاژەڵدار و چادرنشینمان بەڕێز موحەممەد موحەممەدی لە عەشیرەتی ئالخاس لە مراوەتەپە. کە سپاس خۆیان ئاراستە کردووم.

**۹٦- شیروان:** مەعسوومە موحەممەدزادە بوولەغانی:

برانگیّ کەلیم! سڵاو دەوێژم. ژەخادیّ دەخازم کومەختەیی فاش و تـەندروسـت بویی ئومیدوارم کۆزمان و فەرهەنگیّ کۆرمانجی لە گشتیّ دەزیّ بەلابکیی.

ناو براو لە ڕادیو خوراسان گلەی کردووە کە بایەخ بە کوردانی ئـەو دەڤـەرە نـادا من خوشم چەند بار نامەم بۆ ڕادیۆ نووسیووە؛ بەڵام بیّوڵام ماوەتەوە.

**٩٧- زانستگای تاران ١٣٦٨/١٢/٥:** برای بەڕێزمان قەدیرئـەفرونـد خوێنـدکاری مێژووی هونەر کە لە نامەیەکدا کە بە کرمانجی نووسیوویانە ڕێزی زۆریان گرتووم.

**٩٨- زانستگای ئازادی ئیسلامی شیراز:** سەرۆکی زانستگا بەڕێز عەلی موەحیـد لە نەبوونی کتێب لەو زانستگایە گلەیان کردووە.

**٩٩- سـنە:** نامـەیـەک لـە ڕێکخـراوەی ڕێنـوێنی پێداویـستەکـانی پارێزگـای کوردستان کە برامان نژادیان خستوویانە ڕیّ پاش سڵاو لە داخرانی ڕێکخـراەکـەیـان ترساون.

**١٠٠- مەشهەد ١٣٦٨/١٠/١٠:** برای زانامان موحـەممـەد حـەسـەن زەینـەل زادەی قووچانی کە گاڵتە و گـەپـەکانیـان زۆر جوانـە و بـەم بۆنـەشـەوە چـەنـدین ڕەخنەیان بۆم ناردووە.

یەکیّ لەوانە ئەویە کە دەڵیّ لەو سیّ بەرگەدا من تەنزم نەبـینی و زۆر جیـددی بوون. منیش سپاسی ئەوان دەکەم و شوکور کە نەبوومە گاڵتە جاڕیان.

**١٠١- سنە:** ١٣٦٨/١٠/١٠: برای بەڕێزم کاک سابر مەحموودی کـوڕ شـاعێری گەورە مامۆستا تەوفیق مەحموودی«وەستا»

٠٠٠ سڵاوێک لە کانگای دڵمەوە و لە گوڵەباخەکانی کوردستان بـۆ کرمـانج لـە خوراسان بۆ دایکی مامۆستا بۆ دایکی کەلیم،

دایکی کوردی خۆشەویستم هەر بژی بۆ ڕۆڵەت

زۆر شانازیی بە ئەو کتێبەوە «کوچی مێژوویی کورد بۆ خراسان» دەکەم.

بە خوێندەوەی بەرگی دووهەم فرمێسکی چاوانم دادەبارێن.

بە خوێندنەوەی ل ٦٠٢ (نووسەرانی کورد) و یستم ناوی چەند شـاعیری کـورد بنووسم و بەڕیّ بکەم بۆتان، بە داخەوە بەرگی یەکەمم نەبینی ... .

لە نامەکانی‌تردا سەر گورشتەی دوو شاعیری کورد بە ناوەکانی میرزا ئـەحمـەد موحەممەدی و وەستا تەوفیق مەحمـوودی (بـاوکی خـۆی) بـۆم نـارد کـە کتـێبی «گوڵستان کوردستان» چاپ دەکرێ.

هاوکات دوو وێنەی لە دووشێرە ژن واتا مەستووری ئەردڵان و قـەدەم خـەیـری سوڕ و چەند تاری باوکیانی ناردووم سەبارەت بە نەورۆزی ١٣٦٩.

١٠٢- ڕەشت: هەڤالم، بەڕێز غولامڕەزا والی زادە و ژنەکەیان میترا عـەممـارلوو کە لە بەرگی پێنجەمدا باسیان دەکرێ.

١٠٣- کرماشان: نامەی مامۆستای هێـژا مـەحیـەددیـن سالـحی کـە پـڕە لـە خۆشەویستی و هاوڕێ نامیلکەیەک لە شێعر و سەرگورشتەی خۆیان.

١٠٤- بجنوورد: نامەیەکی هاوبەش لە بەڕێزان دیپـەنـاو ژنی دلۆڤـانیان فاتحـە قەراچوربوو.

١٠٥- نامەی حەسەن بەبری: لە ئاشخانەوە کە نووسیوویانە گوندەکانی باڵاکێو، چەمگەردان و ئەحمەدئاوا و عەباس ئاوای ئاخاڵ بە گشتی کورمانجن.

١٠٦- نامەی خەلیلی ڕۆستەمی کە سپاسی منیان کردووە.

١٠٧- تاران: نامەی ڕەحمەتوڵلای ئاغاجانی لـە کـوردانی ئامـارلوو و داوای ٢٠ بەرگ لە بەشی یەکەمیان کردووە و بەڕێم کرد.

١٠٨- شـیروان: بـرای خۆشـەویـستمان بـەهمـەن هووشمـەنـد کـە کتـێبی «جیوگرافیای مێژوویی شیروان» نووسراوەی موحـەممـەد ئیـسماعیل مـوقیمی‌یـان خوێندەوە و زۆر دڵگەیر بوون لە نووسەرەکەی هەر وەک خەڵکانی دی.

دەبێ بۆنزێ ترمێ چون نووسەری ئەو کتێبە تورکن بەو بۆنەوە وایان نووسیوە.

بە تاقمێکی ئاماژە دەکەم:

١- ناوبراو لە ل ١١٠ گوندەکانی جریستانی وەک پالکانوو کـە دوانـزە گونـدن و هەموویان کرمانجن و ناوبراو گوتوویە کورد و تورکن

٢- لە خشتەی ل ١١٢ گوندی ئەوڵلا ئاوای ژووررووی بە تورک ناو بردووە.

٣- لە خشتەی ل ١١٣ گوندەکانی بوزئاوا و حسێن ئاوای بە تورک ناساندووە.

٤- لە خشتەی ل ١١٤ گوندی ئەمان ئاوای بە تورک ناساندووە و ئەم گوندە یادگاری ئەمانوڵلاخانی زافەرانلووی باوەگەورەی خانەکانی شیروانە و کەچی قەت تورکیان تێی دانیە.

٥- لە خشتەی ١١٨ گوندی ئیستەخری بە تورک ناساندووە.

٦- لە لاپەڕەی ١٣٥ دانووسەر گوتوویە خەڵکی شیروان بە گشتی تورک زمانن «من دەڵێم نووسەر باش وا بوو دەینووسی شیروان، تەورێزی دووەمە و بەس.

٧- ناو براو، عەشایر و پێخۆر و کایەی کورمانجیش داوەتە پاڵ تورکەوە.

بە سپاسەوە برای بچووکتان بەهمەن هووشمەند

چاو خشاندنێک بە سەر کتێبی بێبایەخی «جیوگرافیای مێژووی شیروان» پاش نامەی بەڕێز هووشمەند خێرا چووم ئەو کتێبەم کڕی و ڕاستەو ڕاست هووشمەند زۆر کەس نووسیووە، ناوبراو بە یارمەتی دوکتۆر پاپلی ئەو کتێبەی نووسیوە و من بڕوام نەدەکرا پاپلی پاڵپشتی لێوە بکات.

من بە بەڕێز پال دەڵێم.

نووسەر لە لاپەڕەی ١٥ نووسیوویە هەموو شتێکم بە پێی بەڵگەداناوە و هێناومە، من دەپرسم کام بەڵگەو لە گوێیە.

من ٥٠٠ بەرگ بەڵگەی شیروانم هەیە ئێوە چتیان لایە ناوبراو دەڵێنی شیروان پێش زایین بنیات نراوە بەچ بلگەیەکەوە دەیسە لمێنی.

لە ٢٠٥ سە بارەت بە ناوی شیروان دەڵێن شیروان واتە شێرێکی دڕندە کە لە دوایێنی باکووری کێوی ئەغزقاپووقلی دایە.

گرتمان تۆ ڕاست دەکەی ئەم شیروانە کورد دروستی نەکردووە.

ئەی شیروانەکانی لوڕستان، کردستان، باشوور و باکوور و ئەو بەری چۆمی ئەرەس چی لێ دەکەی؟ ئەگەر شیروان تورک بوون، سەردار و خانەکانی کێ بوون.

هەروەها دەڵێ شیروان لە نێوان ساڵەکانی ٣١ و ٣٢ی کۆچی کەوتە دەستی موسڵمانەکان.

لە لاپەڕەی ٣٧ هەوڵتان داوە ئیمامزادەیەک بخەنە شیروان و بۆ ئەم مەبەستە

دەڵێن سوڵتان مەحموودی غەزنەوی لە خەودا بینی کە ئیمام زادەی هەیە و پاشان ساز کرا بۆی.

بەڕێزمان حەبیبوسیەریشی بە درۆزن ناسیوە.

باش وایە خەڵکی خۆیان دادوەری بکەن.

## کتێبی جوگرافیای مێژووی شیروان بۆچی چاپ کرا

نووسەری ئەم کتێبە کە لە لایان بەڕێزان دوکتۆر عەباس سەعیدی ڕزوانی و دوکتۆر پاپلی و دوکتۆر ڕەزا ڕەحمانی فەزلی ... ساپۆرت کراوە. لە کتێبنامەکەی سپاسیانی کردووە و لە جێگری بەڕێزی فەرهەنگی ئاستانیش سپاس کردووە.

من خۆم (نووسەر) چوومە خزمەت دوکتۆر سەعیدی و باسی چاپی کتێبی سەرەخسی خۆمم کرد کە دەستی ڕەدیان نایە سەر سینگم و ئێستا پاڵپشتی ئەم کارە بێ بەڵگەیە دەکەن.

دوکتۆر سەعیدی کە زۆر حەزرەت ڕەزای خۆش دەوێ، کتێبەکەی من بە ناو نیشانی «ئیمام ڕەزالەفەرهەنگی کرمانجیدا» چاپ ناکا.

یان بۆچی ئیزن بە بڵاو بوونەوەی کتێبی کۆچەکەم نادەن.

لە ئاکامدا گویتان بەو مەرجەی ئیزن بە بڵاو کردنەوەی دەدرێ کە ٣٧ لە سەدی کتێبەکە بدرێتە بارگای ئیمام ڕەزا.

بە ڕاستی ئەم خزمەتەیان زۆر گەورە بوو (!!!)

## هەڵەکانی بەڕێز موقیمی

هولاکووی مەغول کاتێ کە تەورێزی گرت پەیامی‌دا دەبێ هەمووی ئێران بە تورکی بدوێ، وەک ئەوەی کە ئێستا کوردەکانی دەنبەلی و شوقاقی بە کوردی ناتوانن قسە بکەن، ئەم موقیمیەش وەک باوەگەورەی خۆی (هولاکووی) کردووە بۆ شیروان.

من لە خشتەیەکدا هەڵەکانی ڕاست دەکەمەوە، ولامی هەموانیش دەوەمەوە.

| ژمارە | گوند | ڕێژەی بنەماڵە | بڕوای موقیمی | ڕاست کردنەوەی هەڵەکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئالخاس | ٩٣ | کورد - تورک | کورد |
| ٢ | پالووکانلووی ژوور | ٤٦ | کورد – تورک | کورد |
| ٣ | پالووکانلووی خوار | ٦٩ | کورد – تورک | کورد |
| ٤ | ژاندارمری گەلیل | – | کورد – تورک | کەسی لێ نیە |
| ٥ | تەخت | ٢٦ | کورد – تورک | کورد |
| ٦ | چیورمە | ١٩ | کورد – تورک | کورد |
| ٧ | کالتمانلوو | ٢٩ | کورد – تورک | کورد |
| ٨ | دووڵەدانلوو | ٤٦ | کورد - تورک | کورد |
| ٩ | زیندینلوو | ٢ | کورد – تورک | کورد |
| ١٠ | سیل سیرانلووی ژوور | ٤٣ | کورد – تورک | کورد |
| ١١ | سیل سیرانلووی خوار | ٣٨ | کورد – تورک | کورد |
| ١٢ | کورکانلووی ژوور | ٤٤ | کورد – تورک | کورد |
| ١٣ | کۆسە | ١٥٨ | تورک | کورد - تورک |
| ١٤ | میلانلووی ژوور | ٧٤ | تورک | کورد |

هەروەها سەبارەت بە دەوروبەری شیروان بە ناوەندی ئەڵلائاوا کە ٦٠ گوندە و ٣٦ گوندی جەماوەری نیە و ٢٤ گوندی دیکەش نووسەر ٨ گوندیانی بە کورد و ١٦ گوندیانی بە تورک و فارس ناساندووە.

بۆ ناوچەی زوارم دەڵێ ٧ گوندی کورد و ٣ گوندی تورکن و دەبێ بڵێم ٧ گوندی کورد و گوندێک تورک و ٢ گوند کورد – تورکن. ناوچەی زیارەت کە داگری ١٧ گوندە و نووسەر ٩ گوندیانی داوە کورد و پاشماوەکەیانی بە تورک و فارس ناساندووە.

کە دەبێ بڵێم کورد ١٢ گوند و تورک ٢ گوندە.

فارس (بەربەری) گوندێک.

بەربەر و تورک گوندێک.

بەربەر و تورک و کورد گوندێک.

**ناوچەی قۆشخانە:**

کە هەر دوو گوندی بورزانلووی خوار و ژوور کوردن و ناوبرا دەڵێ: کورد – تورکن.

ناوچەی سیووکانلوو (سیبکانلوو)

گوندی ئۆغازی کە ١٨٤ گوندە و تەنیا ٨ گوندی تورکە کە ناوبراو دەڵێ: کورد – تورکن.

خەڵکی ئەو ناوچە بەم ڕێژەیە.

گوندی کوردنشین ٢٧      گوندی تورکنشین ٢

خشتەی گوندەکانی شیروان بەم شێوەی خوارە داڕێژراوە.

| ژمارە | ناوچە | ژمارەی گوندی | کورد | تورک | فارس | کورد تورک | کورد فارس | ترک فارس | لە هەر سێ گرۆپ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | تەگمەدان | ٢٨ | ٢٨ | – | – | – | – | – | – |
| ٢ | جریستان | ١٨ | ١٧ | – | – | ١ | – | – | – |
| ٣ | ئەڵلائاوا | ٢٤ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٥ | ١ | ١ | ١ |
| ٤ | زوارم | ١٠ | ٧ | ١ | – | ٢ | – | – | – |
| ٥ | زیارەت | ١٧ | ١٢ | ٢ | ١ | – | – | ١ | ١ |
| ٦ | سیووکانلو | ٢٩ | ٢٧ | – | – | ٢ | – | – | – |
| ٧ | قۆشخانە | ٣٠ | ١٣ | ١١ | – | ٦ | – | – | – |
| ٨ | گلیان | ٢١ | ١١ | – | ٥ | ٣ | ٢ | – | – |
| **گشتی گوند** | | ١٧٧ | ١٢٥ | ١٨ | ٨ | ١٩ | ٣ | ٢ | ٢ |

نووسەر دەڵێ شیروان بە سێ زمانی کوردی و تورکی و فارسی دەدوێن.

کە ٤٩/٣ لە سەدی تورک.

٣٦/٦ لە سەدی کورد.

١٤/٢ لە سەدی فارس.

کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیەولەو خشتەیەکدا ڕوون دەبێتەوە لە بەر ئەوەی شاری شیروان هەر لەو گوندانەی کە ناوبراون پێک هاتوون.

موقەدسی سەبارەت بە دوەین دەڵێ:

دوەینیەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی شیروانیخوراسان لە عەشیرەتی شادلوون.دەی ئەو نووسەرە چی بوو بە سەر کورد و تورکەوە.

جەناب موقیمی لە زۆر شوێندا لە کۆچی مێژوویی کەڵکی وەرگرتووە و بە بێ ئەوەی سەرچاوەکە ناو ببات.

خەڵکی خۆتان بینە دادوەر

این عکس را به یاد مرحوم سعیدی چاپ می‌کنم که پس از صفحه‌بندی کتاب به
رحمت ایزدی پیوست یادگاری از گردش علمی و تحقیقی در مورد جاده ابریشم در رباط
شرف سرخس ـ اردیبهشت ۱۳۶۹ از چپ آقایان: دکتر سعیدی، پاپلی، ابریشمی، روشنی
زعفرانلو، توحدی، تکمیل همایون

شجاع‌الدوله آخرین ایلخانی زعفرانلو - از کتاب جغرافیای تاریخی قوچان - شاکری ص ۹۷

بسم الله الرحمن الرحیم

حضور دانشمند محبوب و محترم و محقق دلسوز کرد: حضرت آقای کلیم الله توحدی وفقه الله علی ما یحبه و یرضا

از سرزمین مقدس کردستان، به یار کردان خراسان درود میفرستم و بر شما که سلاله پاک و دلسوز این قوم نجیب هستی سلام و احترامات زائد الوصف را تقدیم میدارم و توفیق سعادت بیشترتان را در راه خدمت بکرد و کردستان از خداوند تبارک و تعالی خواستارم.

نوع تحقیقات بسیار دلسوزانه و محققانه آنحضرت که حاکی از کمال صداقت و حقیقت گوئی و انجام شرائط صله رحم با کرد است حقایق که زبان حال همه ملت کرد است مورد ستایش و تحسین و تشکر فوق العاده میباشد. آری:

ز هر خاکی که بوی عشق بر خاست — یقین دان تربت لیلی در آنجاست.

گرچه آنطور که شاید و باید در باره کردهای خراسان با اطلاع نبودیم، خوشبختانه با انتشار کتابهای تاریخی و تحقیقی شما که از قلم توانای یک کرد خالص و مخلص تراوش کرده، با همه اجدادش، همه خواسته‌ها برآورده شد و همه نقیصه‌ها برطرف گردیده است و آنچه ما می‌خواستیم شما همه را نوشته‌اید. خداوند با آنجناب توفیق بیشتر و سلامتی را عنایت فرماید که همواره سعادت و ترقی برای قوم خود افتخار آفرین باشید.

البته مردم کرد به وقت غارت [illegible] تمام و زبده طوایف اصیل کرد و کوچانیدن آنها از کردستان بخراسان از یاد نبرده و همواره این دوری و نقل و انتقالات با تأثر خاطرشان ساخته‌اند. و اکنون ما خوشحالیم که شما با انتشار کتابهای تاریخی این گسستگی و دوری را هرچه کمتر باز پیوند ملی و خدمت [illegible] موفق و شناخته‌اید.

و چون در جلد دوم تاریخ: حرکت تاریخی کرد به خراسان خواسته‌اید که اهل قلم کرد شرح حال و نمونه آثارشان را برایتان بنویسند. منهم برای اینکه دعوت شما را لبیک گفته و در جمع این دعوت شدگان باشم. اینک نیز برای شرح حال و نمونه آثار خود را ارسال خدمت نمودم. که در آن دیار از من یادگار باشد. والسلام علیکم و رحمة الله و برکاته

نشانی: باختران، بلوار [illegible] کوچه ۱۱۹ [illegible] پلاک ۳۱ [illegible]

« بمناسبت نخستین سالگرد فاجعه حلبچه »

# چه کنم

بغض بگرفته گلوی قلم را چه کنم؟ — هم نژادم شده آواره صحرا چه کنم؟

قوم مظلوم من، ای کرد ستم دیده دهر — مانده ام از تو جدا زین غم گویا چه کنم؟

خنجر خشم برون کن ز نیام و برخیز — تو مگو آب گذشته ز سر ما چه کنم؟

مبتلا گشته به رنجی که ترا درمان نیست — شده است همدم تو درد و بلاها چه کنم؟

در حلبچه تن تا دل زده طفلان است — کرده است خون جگر و دیده دل اشک چه کنم؟

بی گنه گشته شهید پیر و جوانان این قوم — بدتر از شمر و یزید اند در آنجا چه کنم؟

من بدرگاه خدا عجز تو نالم همه دم — تو بگو من ز خدا غیر تمنا چه کنم؟

آه برآمد ز نهاد همگان همچو کیان،

یا بدین دل مگر از غصه تسلا چه کنم؟

کیان راجی

درانلو بجنورد ٦٧,١٢,٢٦

بقیه اخبار داخله شیروان

از سواران ولیخان هنوز خبری نرسیده خداوند بزودی انتظار آنها را دارد

دیروز مازور روس و مازور رسم بطرف بجنورد حرکت کردند

از قضیه مذکور تا دو روز دیگر مراجعت نمایند [illegible] بواسطه آمدن [illegible]

اشرار از خاک شیروان متفرق گردیدند دیروز [illegible]

صاحب منصب و سی نفر سوار نظام وارد شدند چون سوار باید [illegible]

خاک شیروان اشرار را تعاقب و دستگیر نماید حکومت

بشرح تلگراف فعلی از قوچان جایزه خواسته است

۱۸ حمل [illegible]

# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

نووسینی: کەلیموللا تەوەححودی

وەرگێڕانی: عەدنان بەرزنجی

بابەت: مێژوویی

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج

تیراژ: ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ۵۰۰۰دینار

ژمارەی سپاردن: ۱۹٤۹ ی ۲۰۰۹

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ۲۰۰۹

کوردستان -سلێمانی

www.serdam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە: kteb@serdam.org



سەرچاوە/ حرکت تاریخی کرد بە خراسان

مؤلف: کلیم الله توحدی (کانیمال)، چاپ: سازمان چاپ مشهد، ناشر: مؤلف ، مشهد ۱۳۷۱ ایران

| | | |
|---|---|---|
| ٥١٢- یادو ئاوات و دەردە کورد | مەحمود زامدار | |
| ٥١٣ - مایا | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٥١٤-زانست و فەلسەفە ڤیداییەکان | هاوبیر کامەران | |
| ٥١٥- جیهانبینیی شۆپنهاوەر | میهرداد میهرین | هونەر عەبدوڵڵا |
| ٥١٦- کۆماری ترس | کەنعان مەکییە | حەمە رەشید |
| ٥١٧-فەرهەنگی پۆلەتیکس | | هاوکار حسێن |
| ٥١٨- ئەلمونجید بە کوردی | | جەلال مەحمود عەلی سوبحان |
| ٥١٩-ناسیۆنالیزمی عەرەبی | د.ئەلبێرت عیسا | |
| ٥٢٠- کورد لە سوریا | کەریم یەڵدز | شاهۆ قادر خانزاد |
| ٥٢١-نیتشە و پاش تازەگەری | د. محەمەد کەمال | |
| ٥٢٢- سووکەڵەیی لە تاقەت بەدەری بوون | میلان کۆندێرا | عەتا نەهایی |
| ٥٢٣- فەلسەفەی هیگڵ | د. محەمەد کەمال | |
| ٥٢٤- عەتر | پاتریک سویسکیند | کەریم پەرەنگ |
| ٥٢٥- مێتافیزیک | ئەریستۆ | د. محەمەد کەمال |
| ٥٢٦-کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان (بەرگی سێیەم) | کەلیمولڵا تەوەحوودی | عەدنان بەرزنجی |
| ٥٢٧-کاتیگۆرییەکان | ئەریستۆ | د.محەممەد کەمال |
| ٥٢٨-خوێنەرەوەکە | بێرنارد شلینک | پێشەوا فەتاح |

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ۲۰۰۹

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێرانی |
|---|---|---|
| ٤٧٣-کامێرای چاوەکانم | عومەر عەلی ئەمین | |
| ٤٧٤- وڵاتێکی نوێ لە دەرەوەی پەنجەرەکەمدا | تیۆدۆر کەلیفەتیدس | بەیان ناسیح |
| ٤٧٥-کەرکوك بەرەو دواڕۆژێکی نادیار | د.نوری تاڵەبانی | |
| ٤٧٦-خوێندنەوەی چەند شاکارێکی جیهانی | چنوور نامیق حەسەن | |
| ٤٧٧-سڵاو لە کێ بکەم؟ | کۆمەڵێ نووسەر | مەجید عەزیزی |
| ٤٧٨-مشتومڕ لەگەڵ مێژوودا | هاری کریسلەر | عەزیز رەئووف |
| ٤٧٩-فەلسەفە لە مێژوودا | ئانفین ستیگن | فەڕوخ نێعمەتپوور |
| ٤٨٠-ماناو دەلالەتە شاراوەکانی دەق | دانا عەسکەر | |
| ٤٨١-بیرەوەرییەکانی مارشاڵ ژۆکۆف | مارشاڵ ژۆکۆف | شێخ عەلی شێخ محەمەد بەنا |
| ٤٨٢- خۆشی پیشەی من نییە | محەمەد ئەلماغوت | حسێن لەتیف<br>کارزان عەلی |
| ٤٨٣-پەیوەندی | ئۆشۆ | محەمەد ئەحمەد |
| ٤٨٤- تەون | شێرکۆ بێکەس | |
| ٤٨٥-بۆ سیاسەت، بە سیاسەت | د.محەمەد سەبیلا | هەڵکەوت عبدوڵلا |
| ٤٨٦-سەرهەڵدانی ڕۆمانی ئینگلیزی | ئەیان وات | رەووف بێگەرد |
| ٤٨٧-کۆماری ئەفلاتون | ئەفلاتون | د.محەمەد کەمال |
| ٤٨٨-بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا | هاوژین صلیوە عیسا | |
| ٤٨٩-ئیلیادە | هۆمیرۆس | حەمە کەریم عارف |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٩٠-راپرسی چییە؟ | فریتز شورن | مەجید ساڵح |
| ٤٩١-ناودارانی میوزیکی جیهانی | زۆزك قەرەداغی | |
| ٤٩٢-کورسی و بەها درامییەکان | ئەحمەد سالار | |
| ٤٩٣- جۆناسانی نەورەس | ریتچارد باخ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٩٤-گەنجینەیەك لە داستان | کۆمەڵێ نووسەر | م. ئارام |
| ٤٩٥-مرۆڤ بە چی دەژی؟ | تۆڵستۆی | ئاوات عەبدوڵڵا بابان |
| ٤٩٦-سەرەتاکانی سۆسیۆلۆژیا | کۆمەڵێ نووسەر | شوان ئەحمەد |
| ٤٩٧-وەرزەکانی بەرزەخ | کۆمەڵێ نووسەر | سەعید سلێمانی |
| ٤٩٨-مۆزەخانەی ئەتنۆگرافی | فاروق حەفید | |
| ٤٩٩-مۆدێرنەکان | رامین جیهانبگلو | ئازاد بەرزنجی |
| ٥٠٠- ژیان کورتە | یۆستین گۆردەر | ڕێبوار سیوەیلی |
| ٥٠١- ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا | سەردار عەزیز | سەردار محەمەد |
| | سەلیم حوسنی | |
| ٥٠٢- زایەڵەی شێخێکی دیکەی ڕاپەڕیو | | حەکیم مەلا ساڵح |
| ٥٠٣-ئینسایکلۆپیدیای گشتی | یاسین سابیر ساڵح | |
| ٥٠٤-پـۆلێنکردنی فـۆرم و پەیـژەکانی مۆسیقای کوردی | سەلاح رەووف | |
| ٥٠٥- پەیـــوەندی پێـــشینان و هەنـــدێ زاراوەی کوردی و ئینگلیزی | شـــەوکەت مەلائیـــسماعیل حەسەن | |
| ٥٠٦- پەپوولەکان | کاکەی فەلاح | |
| ٥٠٧- بەرەو کەناری شێرزەیی | رەووف بێگەرد | |
| ٥٠٨-نواندن لە سینەمادا | ماری ئالن ئۆبراین | عەلی کەریم |
| ٥٠٩-پیرەمێرد و زەریا | ئێرنست هێمنگوای | شێرکۆ بێکەس |
| ٥١٠-عەشقی سەر شۆستە | مستەفا مەستور | جەبار سابیر |
| ٥١١-پەردە _ چاو | رەزا عەلی پوور | |
| | شاهۆ مەحموودی | |